**سەرنووسەر**

پ.د. محەمەد مەعرووف

جێگری سەرنووسەر

پ.د. جەبار قادر

دەرهێنەری نووسین

کەمال غەمبار

دەستەی نووسەران

د. ئازاد ئەحمەد مەحموود

د. سەباح رەشید

د. ڤیان سلێمان حاجی

د. هۆشەنگ فاروق

## لەم ژمارەیەدا


| | |
|---|---|
| * فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان | ٥ |
| لێژنەی مێژوو | |
| * ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لە بنیاتنان و جوانکردنی شیعر | ٣٣ |
| م.ی. هاوژین صلیوە عیسا | |
| * لایەنی نەرێنی هەست دەربڕین لە زمانی کوردیدا (جنێودان) بە نموونە | ٦١ |
| د. شلێر ڕەسوڵ بەرزنجی | |
| * بیرو باوەڕی ئەشعەری لە عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی | ٩١ |
| د.ابراهیم احمد شوان | |
| * شێخ مارف بەرزنجی ژیانی و ناوەرۆکی هونەرە ئەدەبییەکانی | ١١٣ |
| ئا: پرۆفیسۆری یاریدەدەر | |
| * هەڵوێستی شاری هەولێر لە کودەتای بەکر سدقی ١٩٣٦ | ١٤٦ |
| مەهدی محەمەد قادر | |
| * کوردستانی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم تا ساڵی ١٩١٨ | ١٧٧ |
| کامەران محمد حاجی | |
| * سیستەمی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی | ٢٣٥ |
| د.عبدالله خورشید عبدالله، د.عارف حیتۆ عبدالرحمان، | |
| هیوا حسن محی الدین، احمد رشید خورشید. | |
| * دەستپێکێك لەبارەی (زمانپارێزی) سیاسەتی زمانی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا... | ٢٩١ |
| پارێزەر: طارق جامباز | |
| * سەفەرنامەی ولیام هوید بۆ کوردستان ساڵی ١٨١٧ | ٣٥٩ |
| د. نەجاتی عەبدوڵلا | |
| * هەندێك ڕا و بۆچوون لەسەر دکتۆرا نامەیەك..... | ٣٩٢ |
| کەمال نوری مەعروف | |
| * ئەم کتێبەم خوێندەوە – مێژووی ناودارانی کورد | ٤٣٠ |
| محەمەد عەلی قەرەداغی | |
| * ادارة اربیل في عهد مظفرالدین گوگبوری من خلال کتاب قلائد الجمان | ٤٤٧ |
| د. محسن محمد حسین | |
| * التنمیة الریفیة وأثرها في الواقع الجغرافي الزراعي لقضاء شقلاوة | ٤٦٦ |
| لاڤە سامع جوهر | |
| * رسالة في تاریخ الأسرة البرزنجیة | ٥١٢ |
| الدکتور عماد عبدالسلام رؤوف | |
| * قراءة في کتاب الاستشراق برؤیة شرقیة | ٥٥٣ |
| کمال غمبار | |
| * ڕاپۆرتی خولی یەکەمی ئەکادیمیا ٢٠٠٧، ٢٠٠٨ – ٢٠١١ | ٥٦٨ |
| د. ئازاد ئەحمەد | |

# فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان

**لێژنەی مێژوو**

## بەشی چوارەم

**پێشەکی :**

لە دوای بڵاوکردنەوەی بەشی یەکەم ( ژمارە ١٦) و بەشی دووەم (ژمارە ١٧) و بەشی سێیەم (ژمارە ١٨)ی گۆڤاری ئەکادیمی وا لەم ژمارەیەدا بەشی چوارەم زاراوە مێژووییەکان بڵاو دەکەینەوە. وەکو لە پێشەکی بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێکرد، ئەم زاراوانە لە لایەن ئەندامانی لێژنەی مێژووەوە لە ئەکادیمیای کوردی ئامادە کراون. لە ژمارەکانی داهاتوودا بەشەکانی تری ئەم زاراوانە بڵاو دەکەینەوە.

لەم بەشەدا ئەو زاراوانە بڵاودەکەینەوە کە بە پیتەکانی (ص، ض، ط، ع، غ، ف) دەس پێدەکەن.

**سەرۆکی لێژنەی مێژوو**
**لە ئەکادیمیای کوردی**
**پ. د. جەبار قادر**

## پیتی (ص)

**صاجلو (تورکی):**

پرچن، ئەمە ناوێك بوو عوسمانییەکان بۆ کوردە ئێزیدییەکانیان بەکاردەهێنا لەبەرئەوەی زۆربەیان پرچیان درێژ بوو.

**صاحب الديوان (عەرەبی):**

سەرپەرشتیکاری دیوان، وەك دیوانی نووسین و دیوانی تایبەت و دیوانەکانی تر، وە سەرۆکایەتی نووسەران و کارمەندانی تری ناو دیوانی دەکرد.

**صاحب الزمان (عەرەبی):**

نازناوێکە بۆ (محەمەدی مەهدی) یان (مەهدی چاوەڕوانکراو) لای شیعەکان.

**صاحب قران (عەرەبی):**

یەکێکە لە ناسناوەکانی پاشا و سوڵتانەکان کە لە نامە شاهانەییەکاندا لە پاڵ ناسناوەکانی تردا دەنووسرا. بە واتای صاحب القرن دێت واتا تاقانەی سەدە بە وەرگرتنی لەو فەرمایشتەیە کە دەفەرموێ هەر سەد ساڵێك خوا کەسێك دەنێرێت کە ئەم دینە نوێ بکاتەوە. جێگەی سەرنجە بنەماڵەیەکی ناوچەی (سلێمانی)ش بەناوی (ساحێبقڕان) ناسراون.

**صادر الأفرنج (عەرەبی):**

جۆرە باجێك بوو لە دەوڵەتی مەمالیك، لەسەر بازرگانە فەرەنگەکان دەسەپێنرا، کە کەلوپەل و کاڵا بازرگانییەکانیان دەهێنا بۆ شاری ئەسکەندەریە. بڕی باجەکە بە پێنج یەك ٥/١ دەخەملێنرا.

**صاروجە (تورکی):**

زاراوەیەکە بەم سەربازە نازێك و پێکانە دەگوترا کە لە سەردەمی عوسمانیدا هەبوون.

**صاریق (تورکی):**

مێزەر یان مەندیل (عەمامە)ی زانایانی ئایینی. صاریقچی: بەم کەسە دەگوترا کە ئەم مێزەرانەی دروست دەکرد یان دەیفرۆشت.

**صاغ (تورکی – کوردی):**

ساغ، تەواو، تەندروست، بێ خەوش، لە ڕووی زاراوەییەوە بەکار دەهات بۆ:

١- جۆرە پارەیەکی عوسمانی   ٢- پایەیەکی سەربازی کە لە سەردەمی پاشایەتی لە میسر هەبوو.

**صاغ علوفەچی** (**کوردی – عەرەبی – تورکی**):

زاراوەیەکە لە سەردەمی عوسمانی بەکار دەهات بۆ یەکێك لە ئەسپ سوارەکانی ئەو گرووپەی کە پێیان دەگوترا (علوفەچی) واتا سەربازی کرێگرتە، کە لە بنکەی تایبەتی جێگیر ببوون بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانەی لە لایەن سوڵتانەوە پێیان دەسپێردرا.

**صاغ غَربا بلوكي** (**کوردی –عەرەبی – تورکی**):

هێزێکی سوارەی عوسمانی بوون ، کە لە بنکەی تایبەتی جێگیر دەبوون بە مەبەستی جێبەجێکردنی هەر کارێکی کە پێیان دەسپێردرا بە زووترین کات، ئەفسەرێك بە پلەی «بلوك ئاغاسی» سەرکردایەتی دەکرد.

**صاغ قول** (**تورکی**):

باڵی ڕاستی سوپا (لە سەردەمی عوسمانی).

**صالمة** (**تورکی**):

پاسەوانی هەمیشەیی لە بنکەکانی سوپا. (لە سەردەمی عوسمانی).

**صالمه جوقداري**(**تورکی – فارسی**):

ئەم ئەفسەرەی سەرکردایەتی پاسەوانە هەمیشەییەکانی دەکرد.

**صالمه قَره قوللقجي** (**تورکی**):

کۆمەڵێك سەرباز بوون کە بەردەوام شەوانە دەگەڕان و دەسووڕان.

**صامسون** (**تورکی**):

سەگێکی زەبەلاح بوو کە تورکەکان لە کۆندا لە شەڕ بەکاریان دەهێنا.

**صاندار** (**تورکی – فارسی**):

پارێزگاری خەزێنە و بەرپرسی ژمێریارییەکەی بوو لەدەوڵەتی عوسمانی.

**صایه** (**تورکی**):

جۆرە جلێکی تایبەت بوو بەم فەرمانبەرە عوسمانییانەی ڕادەسپێردران بە کۆکردنەوەی سەرانەی میر.

**صبيان الحجر** (عەرەبی):
زاراوەیەکە لە سەردەمی فاتمییەکان بەکار دەهات بۆ گەنجانێك کە ئامادەکراو بوون و خاوەن ئەسپ و کەرەسەی پێویست بوون، ئەرکی لە ناکاویان پێدەسپێردرا بە زووترین کات ئەنجامیان دەدا.

**الصحابه** (عەرەبی):
هاوەڵانی یان یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ).

**صدر** (عەرەبی):
گەورەترین پایەی ئایینی بوو لەدەوڵەتی سەفەوی، هاوتای (شيخ الاسلام) بوو لەدەوڵەتی عوسمانی. دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ (ملاباشی).

**صدر الاسلام** (عەرەبی):
سەرەتای ئیسلام، مەبەست سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفە راشدینەکانە.

**الصدر الاعظم** (عەرەبی):
سەدری ئەعزەم، لەدەوڵەتی عوسمانی و هەندێ جاریش لە ئێران بۆ مەزنە وەزیر یان سەرۆك وەزیران بەکاردەهات.

**صراع الثقافات** (عەرەبی):
ململانێی کلتوورەکان، هەڤرکیا رۆشنبیریا. مەبەست ئەو کێبڕکێیەیە کە لەنێوان شارستانیە جیاوازەکان لەئارادایە بەتایبەتی شارستانی ئەورووپی ڕۆژئاوایی و شارستانی ئیسلامی ڕۆژهەڵاتی.

**صرد** (فارسی - کوردی):
هەر وشەی (سارد)ی کوردی و فارسییە ، لە سەردەمی ئەییوبی بۆ ناوچە ساردەکان وات کوێستانەکان بەکاردەهات. بەشێوەی کۆ دەیانگوت (صرود).

**صُرّة أميني** (توركی - عەرەبی):
لە سەردەمی عوسمانی بەکار دەهات بۆ ئەمینداری خەزێنە و بەرپرسی ئەم پارە و پوولەی بۆ حیجاز دەنێردرا بۆ دابەشکردنی بەسەر میرە عەرەبەکان لە وەرزی حەج، هەروەها بەسەر سەیدو ئەشرافەکانی مەککە و مەدینەدا.

**صلة الدم** (عەرەبی):
پەیوەندی خوێن، پەیوەندی خزمایەتی.

**صليب صلبوت (عەرەبی):**

گەورە ترین خاچ بوو لای گاورەکان، چونکە پێیان وابوو کە پارچە تەختەیەکی تێدایە لە پاشماوەی ئەم خاچەی حەزرەتی عیسای لەسەر لە خاچ دراوە.

**صناع القرار (عەرەبی):**

زاراوەیەکی نوێیە بۆ بڕیار بەدەستان بەکاردێ.

**صنم (عەرەبی):**

بەو بتانە دەگوترا کە لەبەرد دروست نەکرابوون، واتە لەدار یان شتی تر دروست کرابوون.

**الصهيونية (عەرەبی):**

زایۆنیزم، بزووتنەوەیەکی تایبەت بە جوولەکەکان بوو، کە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بوو بەوان لە فەلەستین. لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەچالاکی دابوو . ناوەکەی لەچیای (سەهیۆن) هاتووە.

**صوباشي (تورکی):**

پایەیەکی سەربازی بوو لەدەوڵەتی عوسمانی، لە شارەکاندا وەك فەرماندەی پۆلیس وابوو. بەڵام لەقەزاکاندا ڕۆڵی زیاتری دەبینی، چونکە لەگەڵ قازی بەهاوبەشی قەزاکەیان بەڕێوە دەبرد.

**صوباشيلق (تورکی) :**

ئەو بەشەی سەنجەقێك بوو کە لەلایەن (صوباشی)یەوە حوکم دەکرا لەدەوڵەتی عوسمانی.

**صول (تورکی):**

لەزمانی تورکی دەکاتە (چەپ) واتە لای چەپ، بەڵام پلەیەکی سەربازیش بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**صولجان (فارسی):**

(چوگان) بوو لەبنەڕەتدا، دارێکی درێژ بوو ئەسپ سواران یاری تۆپێنیان پێدەکرد.

**صول قول (تورکی):**

باڵی چەپی سوپا (لە سەردەمی عوسمانی).

**صول قول ئاغاسی (تورکی):**

سەرکردەی باڵی چەپی سوپا، هاوکات جێگری سەرکردەی سوپا بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**صولاق (تورکی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی واتای شێوازی کۆنی جەنگی دەگەیاند، هەروەها گوزارشت بوو لە تیر هاوێژانی پاسەوانی سوڵتانی.

**صولَق (تورکی):**

زاراوەیەکی سەردەمی مەمالیك بوو، گوزارشت دەکات لە توورەگەیەکی پێست کە جەنگاوەر لە لای چەپی کەمەری خۆی دەیبەست.

**صَوم کَمر (تورکی – فارسی):**

پشتێنێکی قوماشە کە سەربازی عوسمانی لە کەمەری خۆی دەئاڵاند.

**صو ناظري (تورکی – عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی گوزارشتی دەکرد لە یەکێك لە ئەفسەرانی کارگوزاری دەرەوەی کۆشك کە ئەرکەکەی سەرپەرشتی کاروباری ئاو بوو لە ئەستەنبول.

**صیوان (فارسی – کوردی):**

سەیوان، چەتر، گوزارشت بوو لە چادری گەورەی شاهانە.

## پیتی – ض -

**ضَبط کاتبي (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ نووسەری ڕاپۆرت و بەخشنامەی ناو دادگا بەکار دەهات.

**ضبط نامە (عەرەبی – فارسی):**

دۆسیەی ڕاستکراوە و ئامادەکراوی دادگاکانی سەردەمی عوسمانی.

**ضبطیة ،زبطیة (عەرەبی):**

کەسانێکی چەکدار بوون کە ئەرکیان پارێزگاری کردنی ڕێکوپێکی سوپا بوو لەکاتی پێشڤەچوونیدا، بۆ پاراستنی ڕیزەکان و ڕانەکردنی سەربازان لە شەڕ.

**ضرّابي باشي (عەرەبی – تورکی):**

سەرۆکی خانەی لێدانی دراو بوو لە سەردەمی عوسمانی.

**ضَرب خانە (عەرەبی – فارسی):**

خانەی پارە لێدان، بەناوبانگترین ئەم شوێنانەی لە سەردەمی عوسمانی پارەیان تێدا لێدەدرا: ئیستانبول، قاهیرە، حەلەب، بەغداد، ئامەد... بوون.

**ضَرب خانة أميني (عەرەبی – فارسی – عەرەبی):**

سەرڕاستی (ئەمیندار)ی خانەی پارە لێدان بوو لەدەوڵەتی عوسمانی کە سەرپەرشتیاری لێدانی دراو بوو بۆ چاودێری کردنی سەنگەکەی و بێ خەوشیی.

**ضريبة (عەرەبی):**

باج، بڕێك پارەیە کە دەوڵەت لە هاوڵاتیان وەری دەگرێت ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بەرامبەر سوودمەندبوونیان لەم کارگوزارییانەی کە دابینی دەکات بۆیان.

**ضريبة الخميس (عەرەبی):**

لەشەرعی ئیسلامدا، ئەم باجەیە کە خەزێنەی دەوڵەت (بیت المال)ی پێ دەوڵەمەند دەکرێت، ڕێژەکەشی بریتییە لە پێنج یەکی ئەم بەرهەمە کە لەناخی زەوی یان لە ناخی دەریا دەردەهێنرێت وەك: کانزاکان و مرواری و عەنبەر.

**ضُلمة (تورکی):**

لە بنەڕەتدا لە وشەی (طولامق)ی تورکییەوە هاتووە کە بە مانای پێچ و سووڕانەوە دێت. بەڵام مەبەست لێی جلێکی کۆنی لە پێشەوە کراوە بوو، ژن و پیاو لە بەریان دەکرد، ئەویش جلێکی درێژ بوو کە پشتێنێکی خەت خەت لە ناوەڕاستیدا دەبەسترا.

**ضمان القراريط (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەم باجە دەگوترا کە لە هەر کەسێك وەردەگیرا لەکاتی فرۆشتنی زەوییەك یان موڵکێك تەنانەت ئەگەر لە مانگێکدا چەند

جارێکیش ئەنجام درابا. بەڵام دواتر ئەم باجە هەڵوەشێنرایەوە بەهۆی ئەم ستەمەی پێوەی دیار بوو.

**ضمان المغاني (عەرەبی):**

زاراوەیەکی سەردەمی مەمالیك بەم خاوەیە دەگوترا کە لە هەر کەسێك وەردەگیرا کە نیازی ئاهەنگ سازکردنی هاوسەرگیری هەبووایە، تەنانەت لە گۆرانیبێژ و سەماکارانی ئاهەنگەکەش وەردەگیرا.

## پیتی – ط –

**طاپو (تورکی):**

زاراوەیەکە بەم بەڵگەنامەیە (کۆمپیالە)یە گوتراوە کە مانای مافی دەسەڵاتی تەواو بە سەر زەویوزار دەگەیەنێت؛ دواتر بەم فەرمانگەیە گوتراوە کە تایبەتە بە تۆمارکردنی خانوو بەرە و زەویوزار.

**طابور (تورکی):**

لە (طابقور)ەوە هاتووە، کە لە زمانی تورکی کۆن بەم ڕیزە گالیسکەیە گوتراوە کە لەسەر شێوەی چوارگۆشە دەوەستان و هەریەکەیان بەزنجیر بەوی تریان بەسترابوو کە وەکو قەڵای لێدەهات. لە سەردەمی عوسمانی بە یەکەیەکی سەربازی دەگوترا کە لە چوار بلۆك پێکدەهات کە یەك لەسەر چواری لیوایەك بوو، و ئەفسەرێك بە پلەی «بیگباشی» سەرکردایەتی دەکرد.

**طابور تڤنگ لر (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات بۆ چینێك لە سەربازانی پیادە کە کارەکەیان نۆژەنکردنەوەی قەڵاکان و پاراستنیان بوو.

**طابوق (فارسی):**

وشەیەکی بە عەرەبیکراوی فارسییە بەمانای خشتی سوورەوەکراو دێت.

**طابیّة (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە قوللەی بازنەیی دەگوترا.

**طابیّة یَماقي (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی واتای پارێزەری قەڵاکانی دەگەیاند.

**طارقة (لاتینی):**

لە سەردەمی ئەییوبی و مەملوکی وەك زاراوە بە جۆرێك لـە قـەڵغان یـاخود زرێ دەگوترا.

**طارم (فارسی):**

واتا خانووی لە دار دروستکراو، لە سەردەمی مەملوکی بەم خانووە دەگوترا کـە لە دار دروست دەکراو بنمیچەکەشی لەسەر شێوەی گومەزێك دروست دەکرا بـۆ دانیشتنی سوڵتان.

**طاس پاراسی (تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەو بەخشینە بەکار دەهات کـە لـەنێو پێکهاتـەکانی ئینکـشاری ئـەنجام دەدرا، ئـەوەبوو مووچـەی ئینکـشارییەکان بەشـێکی لـێ دەبـڕدرا بـۆ ئـەم سـندوقە کـە دواتـر بـۆ تـەواوکردنی کەموکورتییـەکانی ئۆرتـە (بڕوانە: مـادەی ئۆرتـە) یـان بـۆ دابینکردنـی چـەند پێداویـستییەکی ڕابـواردنی ئەندامانی ئۆرتە خەرج دەکرا.

**طاقیم (یۆنانی) Taghma:**

تاقمە، واتا کۆمەڵێکی تەواو یان گرووپێك، کۆمەڵە کەسانێك کە بە ئەنجامـدانی یەك کار هەڵدەستن.

**الطاولة المستديرة (عەرەبی):**

مێزی بازنەیی یا مەسەی گلۆڤەر، ئەمـە بـۆ دانوسـتانێك بـەکاردێت کـە لەچـەند لایەنێك پێکهاتبێت نەك تەنها دوولایەن.

**طاووق (تورکی) :**

واتا: مریشك یان پەلەوەر ؛ شیش طاوق بەمانای مریشکی سوورەوەکراو دێت.

**الطائفة الأويراتية:**

ئەم تەتەرانە بوون کە لە سەردەمی مەمالیك هاتبوونە میسر و وڵاتـی شـام کـە دواتر بە تێپەڕبوونی کات بوون بە بەشێك لە سوپای دەوڵەت.

**الطِباق (عەرەبی) :**

تاکەکەی (طبقة)یە بە واتای بارەگای سەربازە مەملوکەکان لە قـەڵای (جەبـەل)

لە قاهیرە دەهات هەر یەکێ لەم بارەگایانە پێگەی ئەو مەملوکانە بوو کە لە وڵاتێکی دیاریکراو هێنرابوون.

**طبانجة (فارسی):**

واتا دەمانچە، کە چەکێکی ئاگرینی سووك بوو، یەکێك بوو لە چەکە بەکارهێنراوەکانی سەردەمی عوسمانی.

**الطّبائعي (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بە نوژداری نەخۆشییەکانی هەناو دەگوترا.

**طَبَر (فارسی) :**

واتا تەور یان تەورزین، یەکێك بوو لە چەکەکانی سەردەمی مەملوکی و عوسمانی، شاری (طبریا)ی فەلەستینیش لەمەوە هاتووە.

**طبردار ، طبردارية (فارسی):**

وشەیەکی لێکدراوی فارسییە، یەکەمیان (طبر) کە تەورە دووەمیشیان (دار) واتا خودان یان هەڵگر، واتا تەور لە دەست یان تەورهەڵگر، لە سەردەمی مەمالیك چینێکی سەربازی بوون که یاوەری سوڵتان بوون.

**طبلخانه (عەرەبی – فارسی):**

وشەیەکی لێکدراوە بەشی یەکەمیان عەرەبی و دووەمیشیان فارسییە، واتا شوێن و خانەی تەپڵ، لە سەردەمی مەمالیك بۆ کۆگەی تەپڵ و ئامێرە میوزیکییەکانی تایبەت بە نۆرە و کەژاوە سوڵتانییەکان بەکار دەهات.

**طرّاد (عەرەبی):**

جۆرێك بوو لە کەشتییە جەنگییەکان کە بەزۆری بۆ بارکردنی ئەسپ و سوارەکان بەکار دەهات.

**طِراز ، ترز (فارسی):**

واتا شێوە. بەم پۆشاکە دەگوترا کە بە چەندان شێوەی جوان و ڕەنگین و ڕازاوە دەچنرا، بەتایبەتی ئەم جلوبەرگەی کە ڕازابۆوە بە نووسینی هێما و نیشانە و کەزوی چنراو بە نووسین، ئەمە جلوبەرگی سوڵتان و پیاو ماقووڵانی فەرماندەکانی مەمالیك بوو، دواتر وشەکە بۆ ئەم کارگەیەی کە ئەم جۆرە جلوبەرگە نەخشێنراوانەی لێ دروست دەکرا بەکار دەهێنرا. هەروەها (خانەی

چنین و نەخشاندن)یشی پێدەگوترا. شایانی باسە زۆرجار لە کوردەواریدا بە هەندێك لە کاڵاو جل و بەرگ کە نایاب و بەرچاو بن دەگوترێ (تەرز).

**طراقچی، طرقچی (تورکی):**

(طرق) واتا شانەو (چی) ئامرازی دانەپاڵە لە زمانی تورکی، بەم کەسە دەگوترا کە شانەی دروست دەکرد یاخود دەیفرۆشت.

**الطّرح (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەم باجە دەگوترا کە لەسەر کرمی ئاوریشم وەردەگیرا لە کەناراوی کیسرەوان لە جەبەل لوبنان.

**طُرخان (تورکی):**

واتا نایاب و ڕەسەن، لە سەردەمی مەمالیك گوزارشتی لەم فەرمانە (مەرسوم)ە سوڵتانییە دەکرد کە تیایدا هاتبوو خاوەن مەرسومەکە لە هەر شوێنێك حەز بکات نیشتەجێ ببێت هەر کاتێکیش حەزی کرد بە جێی بهێڵێت، ئەمەش دوای بەخشینی لە خزمەتکردن.

**طرُمبجي – طُرُمبەجی Trmoba (ئیتالی – تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەم فەرمانبەرە دەگوترا کە تایبەت بوو بە کوژاندنەوە و ڤەمراندنی ئاگر.

**طرّیدة (عەرەبی):**

جۆرێك بوو لە کەشتییە سەربازییەکان کە لە ڕۆیشتن زۆر خێرا بوو، بۆ هەڵگرتنی ئەسپ و سوارەکان بەکار دەهات.

**طریقة (عەرەبی) :**

تەریقەتی سۆفیگەری.

**طسلاقچی (تورکی):**

(طسلاق) واتا ئەم شتەی کە وێنەی هەیە بەڵام ڕاستیی نییە. بەم کەسە دەگوترا کە وێنە و قالبی ئامادەکراوی بۆ داڕێژتن دروست دەکرد.

**الطُشت خانە (فارسی):**

بەم جێیە گوتراوە کە جل و بەرگ و سەرین و پێخەف و بەرماڵ و شمەکی سوڵتانی تیادا پارێزراوە. دیارە ئەم وشەیە دەستکاری کراوی (تەشت)ە کە لە

کوردی و فارسیدا بۆ دەستشۆر بەکار هێنراوە، واتە ئەم دەفرەی کە دەست و دەموچاوی لەسەر دەشۆردرێت.

**الطُشت دار (فارسی):**

یەکێك بووە لە خاوەن پایە بچووکەکانی سەردەمی مەمالیك، تایبەت بوو بەم تەشتەی دەستی لەسەر دەشۆردرا یان ئەم تەشتەی شتومەك و جلوبەرگی سوڵتانی تیادا دەشۆردرا.

**ططر، ططري:**

کۆمەڵێك بوون لە تەتەرەکان کە لە سەردەمی عوسمانی پۆستەچیەتییان دەکرد بەهۆی ئەسپەوە، سەرەڕای ئەوەش فەرمان و بڕیارە سوڵتانییەکانیشیان دەگەیاندە ئەم شارانەی لە پایتەختەوە دوور بوون؛ بە ڕەقی و وشکیش ناسراوبووە هەروەها کارەکانیان تایبەت نەبوو تەنها بەکارە سوڵتانییەکانەوە بەڵکو هەر وەزیرێك دەستەیەکی لەم (تەتەریانە) هەبوو کە ژمارەیان لە نێوان ٥٠ ـ ٦٠ کەس دەبوو.

**طُغراء (تورکی):**

واتا هێما، دروشم. نیشانەو هێما دەستنووسی کەسایەتییەکی ئەفسانەیی سوڵتانی سەلجوقی بوو. دواتر بە تێپەڕ بوونی کات بوو بە دروشمی دەوڵەت، هەروەها گوزارشتی لە واژۆو فەرمانی سوڵتانی و مۆری سوڵتان دەکرد. مۆری فەرمی سوڵتان بوو لەدەوڵەتی عوسمانی کە بەڵگەنامە فەرمییەکانی پێ مۆر دەکرا.

**طُغرال التون (تورکی):**

دراوێکی ئاڵتونی بوو کە سوڵتانی عوسمانی مستەفای دووەم لە ساڵی ١٦٩٥ز لێیدا، کە لە یەکێك لە دوو ڕووەکانی نیشانەو واژۆی سوڵتانی (واتا: طغرا)ی لەسەر بوو.

**طُلْب (کوردی):**

لە سەردەمی ئەییوبی بەم میرو فەرماندەیە گوتراوە کە سەرکردایەتی (٢٠٠) سواری کردووە. لە سەردەمی مەملوکیش بەم تیپە مەملوکییە گوتراوە کە

تایبەت بووە بە یەکێك لە میرەکان و ژمارەی سەربازەکانیشی لە گۆڕەپانی جەنگدا لە نێوان ٧٠ — ٢٠٠ کەس دەبوو.

**الطلبة :**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بۆ هاتنی سەربازەکان بۆ لای پشکینەری هەرێم بەکار دەهات کە هەرچی بیانویستبا بەسەریاندا دەسەپاند کە بینووسێت، جا ئەوەی دەیانویست هەق بایە یان نا.

**طُنبَرچی Tonberean (فرەنسی – تورکی):**

(طُنبَر) ئەم گالیسکەیە بوو کە دوو یان چوار تایەی هەبوو کە ئەسپ یان ئێستر ڕایدەکێشا بۆ بار گواستنەوە بەکار دەهێنرا، و (چی) ئامرازی دانە پاڵە لە زمانی تورکی. (طُنبَرچی) واتا شوفێری یان دروستکەری ئەم جۆرە گالیسکانە.

**طواشي (تورکی):**

واتا کۆیلەی خەسێنراو. لە سەردەمی مەمالیك بەم خزمەتکارە خەسێنراوانە دەگوترا کە لە کۆشکی سوڵتان و لە بەشی ژنانی کۆشك خزمەتیان دەکرد. ڕێزیان لێدەنرا و قسەشیان دەڕۆیشت، و کەسێکی بە تەمەن سەرۆکایەتی دەکردن کە لە ناوداران بوو پێی دەگوترا (شیخ الطواشیة).

**الطّوّاف (عەرەبی):**

پۆلیسی نا فەرمی بوون، کە بەسەر شوێنەکان و کێڵگەکاندا دەگەڕان بە مەبەستی دابینکردنی ئارامی و ئاسایشیان.

**طَوالة (عەرەبی):**

لە وشەی ((طویلە))ی عەرەبییەوە هاتووە، کە لە سەردەمی مەمالیك واتای شوێنی داکردنی ئاژەڵانی دەگەیاند، بە کوردیش هەر (تەویلە)ی پێدەگوترێت. هەروەها بە جۆرێك لە پۆشاك گوتراوە کە لەسەر پشتی ئەسپ دادەنرا.

**الطوائف (عەرەبی):**

لە هەرێمەکانی لوبنان بەم خێڵە دەرەبەگە سەرەکییانەیان دەگوت کە لە کاروباری ڕامیاری وڵاتدا گوێیان لێ دەگیرا.

**طوب قاپو سراي** (**فارسی – تورکی – فارسی**):
وشەیەکی لێکدراوە لە سێ بڕگە پێکهاتووە یەکەمیان واتا (تۆپ) و دووەمیشیان واتا (دەرگا)، سێیەمیشیان واتا کۆشك. یەکێکە لە بەناوبانگترین کۆشکەکانی سوڵتانە عوسمانییەکان لە ئەستەنبوڵ، ئێستاش، یەکێکە لە بەناوبانگترین موزەخانە ئیسلامییەکان لە تورکیا.

**طوبجی آغاسی** (**فارسی – تورکی**):
واتا سەرۆکی تۆبچییەکان، لە سەردەمی عوسمانیدا بە تیپی تۆپهاوێژ (آوجاق المدفعیة) دەگوترا.

**طوبْرا قلي سواري سي** (**تورکی**):
جۆرێك بوون لە سوارە خۆجێیەکان کە ئەرکیان وەرگرتنی (دەیەك) بوو لە خاوەن زەویوزارو دەرەبەگەکان لەکاتی جەنگدا. وە پێیان دەوترا ئەمیندارەکان (الأمناء)

**طوخ ، طوغ، توغ** (**تورکی**):
بەمانای کلکی قەتاس (کە مانگایەکی کێوی بوو لە وڵاتی تبت) دەهات تورکەکان ئەم کلکانەیان بە ئاڵاکانیانەوە دەکرد، دواتر گۆڕا بە کلکی ئەسپ، کە لەسەر شێوەی ئاڵا یان دروشمی تیپێکی سەربازی دیاریکراو بەکار دەهێنرا، یاخود بۆ گوزارشتکردن لە پلە و پایەیەکی سەربازی کە بەم شێوەیە ڕێکخرابوو:

- **یەك تەوغ**: نیشانەی میری سنجەق بوو.
- **دوو تەوغ**: نیشانەی بەگلەربەگ بوو.
- **سێ تەوغ**: نیشانەی وەزیر بوو.
- **پێنج تەوغ**: نیشانەی (الصدر الاعظم) بوو.
- **حەوت یان نۆ تەوغ**: نیشانەی سوڵتان بوو.

وەلەکاتی لادانی یەکێك لە پایەکەی ئەوا ئەو نیشانانەی لێ دەسەنرایەوە دواتر سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٠٨ ـ ١٨٣٩ ز) ئەم دروشمانەی هەڵوەشاندەوە.

**طورانجي باشي لر** (**توركی**):

لە سەردەمی عوسمانی بەم یاسایانە دەگوترا کە شێوازی کۆکردنەوەی منداڵە کریستیانەکانی ڕێکدەخست بۆ ئەوەی بیانخەنە ڕیزی سوپای ئینکشاری.

**الطوطمية**:

تۆتەمیزم، پەرستنی خوداوەندی دایك. بیروباوەڕێکی کۆنی مرۆڤ بوو.

**طوغانجي** (**توركی**):

لەسەردەمی عوسمانی بەو کەسانە دەگوترا کە باڵندەی ڕاویان بۆ سوڵتان و دەست و پێوەندەکەی بەخێو دەکرد. هەروەها بە یەکێك لە گرووپەکانی سەربازی عوسمانی دەگوترا کە بەناوی (قوّاصە)ش دەناسران.

**طولمة بُغجه سراى** (**توركی**):

یەکێك بوو لە کۆشکەکانی سوڵتانە عوسمانییەکان کە دەکەوێتە بەشی ئەوروپای شاری ئیستانبول و دەیڕوانییە سەر گەرووی بسفۆر.

**طولون** (**توركی**):

ماناکەی (مانگی چواردە)یە. هەروەها ناوی (ئەحمەدی کوڕی طولون)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی طـۆلۆنییە لە میسر.

**طومار Tomorios** (**یۆنانی**):

واتا نووسراوی پێچراو، نامە. دیارە وشەی (تۆمار)ی کوردیش هەر لەمە وەرگیراوە.

**طومان** (**مەغۆلی**):

بەم سوپایە دەگوترا کە ژمارەی ئەندامەکانی دە هەزار کەس بوون یاخود ئەم ڕووبەرە زەوییەی کە دە هەزار سەربازی لێ وەردەگیرا.

**طومروق آغاسي** (**توركی**):

لە سەردەمی عوسمانی بە سەرۆکی بەندیخانە دەگوترا.

**طَيلَسان** (**فارسی**):

لە (تالسان) هاتووە کە جلێك بوو زانایانی تایبەت دەیانپۆشی.

## پیتی – ع -

**عادت أغنام، عديتى اغنام (عەرەبی):**

لەسەردەمی عوسمانی بەجۆرێك لە باج و سەرانە دەگوترا کە لە شوانکارەکان و دانیشتوانی دێهاتەکان وەردەگیرا و مەڕ و ماڵاتی دەگرتەوە.

**عالمگیر (عەرەبی – فارسی):**

واتا وڵاتگیر، ناسناوی یەکێك لە ئیمپراتۆرەکانی دەوڵەت بابری بوو لە هیندستان کە ماوەی حوکمڕانییەکەی لەنێوان ساڵانی(١٦٥٩ ـ ١٧٠٧ ز) بوو.

**العالي (عەرەبی):**

ناسناوێکی ڕێزلێنان بوو لە سەردەمی مەملوکییەکاندا بۆ گەورەپیاوانی سەربازی و کارگێڕی بەکاردەهات.

**عالي جناب (عەرەبی):**

نازناوێك بوو بۆ بانگکردنی پادشا و سوڵتان و گەورە پیاوانی دەوڵەت بەتایبەتی لە ئێران.

**عبادة الظواهر الطبيعية (عەرەبی):**

پەرستنی دیاردە سروشتییەکان وەك ڕۆژ و مانگ و باران، ئایینێکی کۆنی مرۆڤ بوو.

**العتق (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەم پارچە دراوە شکاوە مسییانە دەگوترا کە لەشوێنی پارە لێدان لێنەدراوە، و لەگەڵ فلوسی لێدراو (مسکوك) بەکاردەهێنرا.

**عجمى اوغلان (عەرەبی – تورکی):**

ئەو منداڵە ئەوروپییانەی ژێردەسەڵاتی عوسمانی بوون کە تازە هێنرابوون بۆ ئەوەی ببنە هێزی ئینکشاری.

**عدالت نامة (عەرەبی – فارسی):**

بڵاوکراوەیەکی سوڵتانی بوو تیایدا سەرپێچی یەکێك لە بەرپرسانی لە ویلایەتەکان ڕادەگەیاند لەسەردەمی عوسمانی.

**العرّادة (عەرەبی):**

لە سـەردەمی عوسمانیـدا بـەم ئـامرازە جەنگییـە دەگـوترا کـە لـە مەنجـەنیق بچووکتر بوو وە بەردی پێ دەهاوێژرا بۆ نیشانە دوورەکان.

**العرّاضة (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بۆ ئەم گوللە ئاگرینانە بەکاردەهات کە تایبەت بوو بە بۆنەکانی خۆشی و شادی وەك جەژنەکان یاخود پاش سەرکەوتنەکانی سوپا.

**العراقان (عەرەبی):**

بەهەردوو شاری کوفە و بەسرە دەگوترا، لەسەردەمی دەوڵەتی ئیسلامدا.

**عَرَبة چی اوجاقی (عەرەبی – تورکی):**

یەکـەی گالیـسکەکان کـە گرووپـی دووەمیـان پێـك دەهێنـا لـە سـەربازانی تۆپهاوێژ؛ ئیشیان ڕاکێشانی تۆپـەکان و دابینکردنـی خزمـەتگوزاری پێویـست بوو بۆیان.

**عُربون ،أربون (یۆنانی):**

بەم بڕە پارەیە دەگوترا کە فرۆشیار پێشەکی لە بەهای کاڵاکە دەیدا بـەر لـە تەواو بوون و ئەنجامدانی پرۆسەی فرۆشتنەکە.

**العرش (عەرەبی):**

تەخت، کورسی، تەختی پاشایەتی.

**العَرَض (عەرەبی) :**

لـە سـەردەمی مـەمالیك بـۆ ئەمـە بـەکاردەهات کـە پـەرتووکێك دانەرەکـەی لەبەردەم یەکێك لە گەورە زانایان بیخوێندبایەوە و زاناکەش مۆڵەت (اجازە)ی پێ دەبەخشی.

**عُرف (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەم مێزەرانە دەگوترا کـە هەنـدێك لـە زانایـانی ئـاینی شوێنە فەرمییەکان لەسەریان دەنا.

**عَزَب (عەرەبی):**

پیـاوی سـەڵت ،بـێ هاوسـەر (ڕەبـەن). لـە سـەردەمی عوسمـانی بـە هێزێکـی سەربازی دەگـوترا کـە لەگەنجـە سـەڵتەکان پێکـدەهات، هەنـدێکیان لـەهێزی دەریایی و هەندێکیش لە لەشکردا خزمەتیان دەکرد.

**عِزبة (توركی):**

لە "ایربە"ی تورکییەوە هاتووە بەمانای کێڵگەی تایبەتی دێت، لە سەردەمی عوسمانی و دواتریش لە میسر باو بوو.

**عساكر بلوك المعية (عەرەبی –توركی – عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە پاسەوانانی تایبەت و یاوەرانی دەستە لەشکرێك (کتیبە) دەگوترا.

**العساكر الدُشمان (عەرەبی – فارسی – كوردی):**

وشەیەکی لێکدراوە، یەکەمیان سوپا و سەربازگەل دەگرێتەوە و لە دووەمیان (دوژمن)ــە کە وشەیەکی فارسی و کوردییە. لە سەردەمی عوسمانی بە سەربازانی دوژمن دەگوترا.

**عسعس أوجاقي (عەرەبی – توركی):**

وشەیەکی لێکدراوە، یەکەمیان واتا پاسەوان و دووەمیش واتا (تیپ). لە سەردەمی عوسمانیدا بەم چینە سەربازە دەگوترا کە ئەرکیان گەڕان و سووڕان بوو لە شەوەوە تاکو بەیانی، بۆ چاوەدێری کردنی ڕەوشی گەڕەکان و قۆڵبەستکردنی تاوانباران و سەرپێچیکارانی سیستەم و بنەماکانی شەریعەت، هەروەها پێویست بوو کە پارێزگاری لە سەرۆك وەزیران (الصدر الاعظم) بکات لە ڕۆژانی هەینی کاتی ڕۆیشتن بۆ بەجێهێنانی نوێژی هەینی.

**العصائب السلطانية (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیکدا بەم ئاڵا زەردە بە زێڕ چنراوانە دەگوترا کە هێما و نیشانەی دەسەڵات و پادشایەتی بوون.

**عصبة الامم (عەرەبی):**

کۆمەڵەی نەتەوەکان، ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە بوو کە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی لەلایەن وڵاتە زلهێزەکان دامەزرا، بۆ بەرقەرارکردنی ئاسایشی جیهانی. بەڵام لەئەنجامی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی هەڵوەشایەوە و دواتر (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان) شوێنی گرتەوە.

**العَصر** (عەرەبی):

واتا گوشین لە سەردەمی مەمالیکدا بە جۆرێك لـە جۆرەکـانی ئەشـکەنجەدان دەگـوترا بـە مەبەسـتی ناچـارکردنی تاوانبـاران بـۆ دانپێـدانان. شـێوازەکەش وابوو، کە ئەم کەسـەیان دەهێنـا و دەیانخستە نێـوان دوو پارچـە تەختـە و پاڵەپەسـتۆی تونـدی دەخـرا سـەر تـا ئـەو ڕادەیـەی خـەریك دەبـوو گیـانی دەرچـێت، ئینجـا دەردەهێنـرا و داوای دانیـان بـە تاوانەکـەی لێـدەکرا و ئـەم پرۆسەیە دووپات دەکرایەوە تا ئەو کاتەی دانی پیا دەنا.

**عصر التوليب** (عەرەبی – فرەنسی):

مەبەست سەردەمی سـوڵتان ئەحمـەدی سـێیەمی عوسمانییـە (١٧٠٣ ـ ١٧٣٠ ز)، کە سەرەتای ڕەوتێکی بابەتییانە بـوو لـە دەوڵـەتی عوسمـانی، هـەروەها دەستپێکی هەوڵەکانی وەرگرتنی کلتـووری ئـەورووپی بـوو هەرچـی ناوەکەشـە لەمەوە هاتووە کە لە سـەردەمی ئـەم سـوڵتانەدا چـاندنی گـوڵی (توليـب) لـە ئەستەنبۆل گەشەی کردبوو، هـەروەها هێمایـەك بـوو بـۆ ئـەو گەشەسـەندنەی شیعر و هونەر کە لەم سەردەمەدا بەخۆیانەوە بینیوە.

**العصر الجاهلي** (عەرەبی):

سەردەمی نەفامی، مەبەست سـەردەمی پـێش ئیسلامە لـە نیمـچە دوورگـەی عەرەب.

**العصر الحجري** (عەرەبی):

چاخی بەردین، یەکێکە لەسەردەمەکانی پێش مێژوو (واتـە پـێش پەیـدابوونی نووسین) کە تیایدا مرۆڤ زۆربەی کەرەستەکانی خـۆی لەبـەرد دروست دەکـرد بۆیە بەم ناوە ناسرا.

**عصر فجر السلالات** (عەرەبی):

سـەردەمی سـەرهەڵدانی بنەماڵـە فـەرمانڕەواکان، سـەردەمێکی هـەرەکۆنی مێژووی عیراقە کە ماوەی نێوان (٢٩٠٠–٢٣٧٠ پ.ز) دەگرێتەوە. سەردەمێکی بووژانەوەی شارستانی میزۆپۆتامیا بوو کە تیایدا زمـان و کلتـووری سـۆمەری زاڵ بوو، چونکە بنەماڵە فەرمانڕەواکان زۆربەیان سۆمەری بوون.

**العصر المعدني** (**عەرەبی**):

چاخی کانزایی، یەکێکە لەسەردەمەکانی پێش مێژوو کە تیایدا مرۆڤ کانزای ناسی و هەندێ کەرەستەکانی خۆی لێ دروست کرد.

**عصر النهضة** (**عەرەبی**):

سەردەمی بووژانەوە، ڕێنیسانس، مەبەست ئەو سەردەمەیە کە سەدەکانی ١٥–١٦ز دەگرێتەوە لە ئەوروپا، کە بەقۆناغی گواستنەوە دادەنرێت لەنێوان سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی نوێدا. چونکە ئەم سەردەمە گۆڕانکاری زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنا لە سەرجەم بوارەکاندا ، بەتایبەتی لە بوارەکانی زانست و ئەدەب و هونەر.

**عصمت لو** (**عەرەبی – تورکی**):

ناسناوێك بوو بۆ ئافرەتانی پایە بەرز و ناودار و شاژن بەکاردەهات.

**عطوفتلو** (**عەرەبی – تورکی**):

لەسەردەمی عوسمانیدا ناسناو بوو بۆ خاوەن پلە و پایە بەرز و باڵاکان.

**علاقات الانتاج** (**عەرەبی**):

پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، بریتییە لەو پەیوەندییە بنەڕەتییانەی کە لەنێوان مرۆڤ دێتە ئاراوە لەکاتی کرداری بەرهەمهێناندا، وەك مەرجەکانی کار و دابەشکردنی بەرهەم.

**العلامة السلطانية** (**عەرەبی**):

لە سەردەمی عوسمانیدا بەکاردەهات بۆ ئیمزا یان نیشانە یان مۆری تایبەتی سوڵتان کە لە گشت نامە و فەرمان و بڕیارەکانی دیوانی سوڵتان بەکاردەهات و شەرعیەت و خاوەنداریێتی ئەو سوڵتانەی دەگەیاند.

**علامة اليهود** (**عەرەبی**):

لە سەردەمی مەمالیکدا بۆ جلوبەرگی تایبەت بە جوولەکەکان بەکاردەهات کە سەرپێچێکی زەرد بوو جوولەکە (قەررائییەکان) لەسەریان دەنا و، سەرپێچی سووریش تایبەت بوو بە جوولەکەکانی سامیرە.

**علایلی** (**تورکی**):

گرووپێك بوون لە سەربازان لە سەردەمی عوسمانیدا.

**العُلُج (عەرەبی):**

زاراوەیەك بوو بە چەتە دەریاییە نا موسوڵمانەکان دەگوترا.

**عَلَمدار (عەرەبی – فارسی):**

هەڵگری ئاڵا بوو لە کەژاوە سوڵتانییەکان.

**علوفة (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە مووچەی سەربازان و مەدەنییان دەگوترا، کە لەسەر بنچینەی کرێی ڕۆژانە ئەژمار دەکرا، دواتر وای لێهات هەر سێ مانگی کۆچی جارێك بدرێت.

**علوفه کتورن یکی چری (عەرەبی – تورکی):**

ئەم دەستە سەربازانە بوو کە ئەرکی گەیاندنی ئازووقە و پارەی سەربازەکانی ئینکشارییان لە ئەستۆ دابوو.

**عَنتري:**

جۆرە جلوبەرگێکی سوپای عوسمانی بوو.

**العهد الجديد (عەرەبی):**

نووسراوەکانی پاش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا، واتا ئنجیل.

**العهد القديم (عەرەبی):**

نووسراوەکانی پێش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا، واتا تەورات.

**عهدنامه (عەرەبی – فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی بە بەڵگەنامەی پەیمان و ڕێکەوتنەکان دەگوترا.

**العُهدة (عەرەبی):**

دەستەواژەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەم ناوچەیە دەگوترا کە تیایدا دەرەبەگ دەسەڵاتی دادوەری و کارگێڕی و سەربازی بەسەر دەست و پێوەندەکانی هەبوو، و میری فەرمانڕەوا بۆی نەبوو دەست بخاتە ناو کاروباری ئەم ناوچەیە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو دەرەبەگە.

**عوارض (عەرەبی):**

لە سەردەمی عوسمانی بەم باجە لەناکاوانە دەگوترا کە دەوڵەت دایدەسەپاند کاتێك دەستەوەستان دەبوو لە ئاست دابینکردنی خەرجییە

لەناکاوەکان بۆ نموونە وەکو خەرجییەکانی شەڕێکی لەناکاو.

**العوانية** (**عەرەبی**):

لە سەردەمی عوسمانی بە چینە خەڵکێك دەگوترا کە میری فەرمانڕەوا بەکاری دەهێنا لە یارمەتیدانی بۆ قسە هێنان و بردن لەنێو خەڵك و بەدەمەوە هەڵبەستن تاکو باش ئاگاداربێت لە ڕەفتار و گوفتاریان و دواتر باش کۆنترۆڵکردنیان.

**عيّارجي** (**عەرەبی – تورکی**):

لەسەردەمی عوسمانی بە سەرپەرشتیاری پێوان و کێشان دەگوترا.

**العيدّية** (**عەرەبی**):

زاراوەیەك بوو لە لوبنان لە سەردەمی عوسمانی بەواتای ئەم باجە ناڕاستەوخۆیە دەهات کە پێکهاتبوو لە قاوە و شەکر و سابوون کە دەرەبەگەکان لە بۆنە و جەژنەکان بەسەر جووتیارانیان دەسەپاند.

## پیتی – غ –

**غاردیان باشی** (**تورکی**):

سەرکردەی دەستە لەشکری دەریایی بوو، لە سەردەمی عوسمانی.

**غازی** (**عەرەبی**):

موجاهید، جەنگاوەر لەپێناو ئیسلام. یەکێك بوو لە ناسناوەکانی سوڵتانە عوسمانییە بەراییەکان، ئەوانەی بۆ خۆیان سەرکردایەتی شەڕەکانیان دەکرد.

**غازی جدید** (**عەرەبی**):

جۆرێك بوو لە دراوە زێڕەکانی سەردەمی عوسمانی.

**غازی قدیم** (**عەرەبی**):

جۆرێك بوو لە دراوە زێڕەکانی سەردەمی عوسمانی.

**غازیان روم** (**عەرەبی – تورکی**):

لە سەردەمی سەلجوقییەکان بەم پێکهاتە ئاینییە ـ سیاسییانە دەگوترا لەسەرجەم ناوچەکانی ئەنادۆڵ بڵاوبووبوونەوە، و لەم جەنگاوەرە تورکمانە

موسڵمانانە پێکهاتبوون کە خۆیان تەرخان کرد بۆ شەڕ لەپێناو خودا، وە پێش دامەزراندنی سوپای ئینکیشاری لە سەردەمی سوڵتان ئۆرخان (١٣٢٦ ـ ١٣٦٠ ز)، بەشێك بوو لە پێکهاتەکانی سوپای عوسمانی.

**الغاشية (عەرەبی):**

لە سەردەمی مەمالیك بەم زینە دەوترا کە لەپێست دروست دەکرا و بەزێڕ دەچنرا، ئەوەی لێی ڕوانیبا وای دەزانی لەزێڕ دروست کراوە، لە کەژاوەکاندا لەپێش سوڵتان هەڵدەگیرا.

**غربا طائفةسي (عەرەبی – تورکی):**

لەسەدەی شازدە بەو کەسانە دەگوترا کە لە ئەنادۆڵ نە زەوی و نە کاریان هەبوو.

**الغُراب Corvette(فرەنسی):**

کەشتییەکی جەنگی کۆنە کە پێشەوەکەی تیژ بوو و سەوڵ و چارۆگەی هەبوو، لە سەردەمی مەمالیك و عوسمانیدا باو بوو.

**غُرش– غروش، قرش – قروش (ئەڵمانی):**

جۆرە دراوێك بوو لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات.

**غزو (عەرەبی) :**

هێرش و شاڵاو بەناوی ئیسلام.

**غّفارة (عەرەبی):**

جۆرە پێبژاردنێك بوو کە کەسانی خراپەکار و شەڕاوی لە فرۆشیار و خاوەن زەویوزارەکانیان وەردەگرت لە بەرامبەر دەستدرێژی نەکردنە سەر کەلوپەل و بەروبوومەکان.

**غلیون: Galeon (ئیسپانی):**

جۆرە کەشتییەکی جەنگیی زەبەلاح بوو، ئیسپانییەکان زێڕ و زیو و کەلوپەلی گرانبەهایان لێ بار دەکرد. عوسمانییەکانیش بۆ یەکەم جار لە سەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤٨١ ـ ١٥١٢ ز) دەستیان کرد بە دروستکردنی ئەم جۆرە کەشتییە.

## پیتی – ف -

**فارِە (فارسی):**

بە ئاژەڵی چاك و زیرەك و مەشقپێکراو دەگوترا.

**فاشیزم (ئیتالی):**

فاشیزم، سیستمێکی سیاسی خۆسەپێنەر و داپلۆسێنەر بوو کە لەسەر بناغەی ڕەگەزپەرستی دامەزرابوو. زاراوەکە لەناوی ئەم پارتە هاتووە کە لەماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا بەسەرۆکایەتی (مۆسولینی) حوکمڕانی ئیتالیای کرد.

**فامیة:**

لە سەردەمی مەمالیك بۆ فرۆشیارانی ئازووقە و دانەوێڵە بەکاردەهات.

**فانید (فارسی):**

جۆرە شیرنەمەنییەك بوو.

**فتح (عەرەبی):**

وشەیەکی عەرەبییە لەڕووی زمانەوە واتای کردنەوە دەگەیەنێ ، مەبەست کردنەوەی دەروازەی شارەکانە بەهێزی سەربازی. لە سەردەمی بەرایی ئیسلام و دواتردا بۆ داگیرکردن یان دەست بەسەرداگرتن بەکاردەهات.

**فَتحنامە (عەرەبی – فارسی):**

ئەم نووسراوە یاخود پەیامە بوو کە سوڵتان بۆ هەرێم و ویلایەتەکانی دەنارد بۆ خۆشحاڵی دەربڕین بەبۆنەی سەرکەوتنی سوپای دەوڵەت لە شەڕێکی دیاریکراودا، یاخود فەرماندەی لەشکر دەینارد بەهەمان بۆنەوە.

**الفتوّة (عەرەبی):**

زاراوەیەکە لە سەردەمی عەبباسی بەم کۆمەڵە لاوە نیمچە ڕێکخراوانە دەگوترا کە شەرواڵی تایبەتییان لەبەربوو.

**فتوّتلو (عەرەبی – تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی وەك ناسناوێك بۆ ئەم کەسانە بەکاردەهات کە خاوەن پایەی چوارەم و پێنجەم بوون هەروەها مولازم و یوزباشییەکان (کە سەرکردایەتی سەد سەربازیان دەکرد). هەروەها بە (موفتی)یش دەگوترا.

**فتوی (عەرەبی):**

دەرکردنی بڕیارێك یاخود ڕوانینێك سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو لە لایەن دەزگایەکی ئاینی یاخود کەسایەتییەکی زانستی ئاینی ئیسلامدا. لەسەردەمی عوسمانیش هەمان زاراوە بەکاردەهات بۆ وەڵامێك یان جوابێکی نووسراو کە لەلایەن شێخی ئیسلام یان موفتییەکانی تر دەردەچوو بۆ پرسیارێك لەبارەی مەسەلەیەکی شەرعی.

**فَتوی خانە (عەرەبی - ،فارسی):**

لە سەردەمی عوسمانی خانەی فەتوادان بوو کە لە پایتەخت و هەرێمەکان هەبوو.

**فخامتلو (عەرەبی - تورکی):**

لە سەردەمی عوسمانی وەك ناسناوێکی گەورەیی بە سەرۆك وەزیران (الصدر الاعظم) و فەرمانڕەوایانی میسر لە بنەماڵەی محمد علی دەگوترا.

**فخر السادات الکرام (عەرەبی):**

ناسناوێك بوو دەبەخشرایە شێخەکانی تەریقەتە سونییەکان و زانایانی ئایینی و سەیدەکان، لە سەردەمی عوسمانی.

**فدّان (سریانی):**

لە بنەڕەتدا بەواتای گاجووت یاخود هەوجاڕ دەهات، هەروەها یەکەیەکی پێوانەی ڕووبەرە کە دەکاتە ٤٠ × ٤٠ باڵ ، یان یەك دۆنم.

**الفدّاوي ، الفدّاوية:**

تلیاکخۆرەکانی شیعەی ئیسماعیلی بوون کاتێك یەکێکیان ڕادەسپێردرا بە تیرۆرکردنی کەسێك، ئەگەر کوشتبای ئەوا کارەکەی ئەنجامداوە، بەڵام ئەگەر سەری نەگرتبا ئەوا خۆی دەکوشت. ئەم کۆمەڵە لە سەردەمی ئەییوبیدا هەبوون، دواتر لە سەردەمی مەمالیك خۆیان خستە ژێر فەرمانی سوڵتانەکانیان کە کاری نهێنی هەمە چەشنیان پێدەسپاردن.

**فدولە خوران کاتبی:**

لەسەردەمی عوسمانیدا بەم کەسە دەگوترا کە ناوی هەژاران و بێ باوکانی تۆمار دەکرد بۆ نان و خۆراك پێدانیان.

**فِراش خانە** (**عەرەبی – فارسی**):

لە سەردەمی مەمالیك بەکاردەهات بۆ ئەم کۆگایەی جۆرەها ڕایەخ و مافوور و چادری تێدا بوو کە سوڵتان و دەست و پێوەندەکانی لە گەشتەکانیاندا یاخود لەکاتی مانەوەیان لە دەرەوەی قەڵای جەبەل لە میسر پێویستیان پێی دەبوو.

**فرانُق** (**فارسی**):

لە وشەی "پەروانگ"ی فارسی وەرگیراوە بە مانای لای پێشەوەی سوپا یاخود پێشەنگی سوپا. لە سەردەمی مەمالیك بە نامەبەر و هەڵگری نەخشە دەوترا.

**فَرتَنە** (**تورکی**):

بە مانای گەردەلوول و ڕەشەبای توند دەهات کە شەپۆلەکان بەرز دەکاتەوە و دەریا دەورووژێنێت و لە وشکانیشدا تۆز و خۆڵ زۆر بڵاو دەکاتەوە. لە ڕووی مەجازیشەوە بۆ فیتنە و ئاژاوەنانەوە لەنێو خەڵك بەکاردێت. لەناو کوردیش باوە.

**فِرجیة** (**عەرەبی – تورکی**):

جۆرە پۆشاکێکی سەردەمی مەمالیك بوو.

**فَرسخ** (**فارسی**):

لە بنەڕەتدا (فەرسەنگ)ـە، یەکەیەکی پێوانەی ماوەیە کە دەکاتە سێ میل، هەروەها بەرامبەر نزیکەی شەش کیلۆمەترە. یان بە وردتر بڵێین ٨/٥کم دەبێت.

**فِرقاطة Fergata** (**ئیتالی**):

جۆرە کەشتییەکی دەریایی بوو لە سەردەمی عوسمانیدا.

**فرمان** (**فارسی**):

فەرمان، بڕیاری سوڵتانی عوسمانی.

**فَرمان همایونی** (**فارسی**):

(فرمان) واتا مەرسوم وبڕیار، (هەمایون) واتە پیرۆز، مەبەست فەرمانی سوڵتانە. بریتی بوو لەم فەرمانەی کە سوڵتانی عوسمانی دەری دەکرد بۆ

بەخشینی ماف و جیاوك یان هەر مەسەلەیەكی تری پەیوەست بە وڵات.

**فرملاتی:**

بەم كەسە دەگوترا كە ئەركی ئاوپێدانی خەڵكی پیادە بوو یاخود ئەوانەی لەناو دامەزراوە و شوێنە ئاینییەكان بوون، هەروەها بەرپرسیارێتی دابینكردنی ئاوی بۆ ئەم شوێنانە لە ئەستۆدا بوو.

**فرند (فارسی):**

جۆرە شمشێرێك بوو لە سەردەمی ئەییوبی و مەمالیكدا.

**فەرەنگ (فرەنسی):**

یەكەیەكی دراو بوو لە فەرەنسا و سویسرا بەكار دەهێنرا، هەروەها لە سەردەمی داگیركاریدا لە سوریا و لوبنانیش بەكاردەهات كە دەیكردە پێنج قرش.

**فلس** Follis **(یۆنانی):**

پارەیەكی كانزایی بوو لە مس دروست كراوە، هەروەها بەم پارەیەش دەگوترێت كە بەهاكەی كەمە.

**فلسفة التأریخ (یۆنانی – عەرەبی):**

فەلسەفەی مێژوو، ئەو زانستەیە كە بەچاوێكی گشتگیرانە سەیری ڕووداوەكانی مێژووی مرۆڤایەتی دەكات، بۆ دۆزینەوەی تێڕوانینی گشتی لەبارەی ئاراستەی مێژوو و هێزە بزوێنەرەكانی .

**فَلَقـة (توركی):**

فەلاقە، ئامرازێكی ئەشكەنجەدان بوو، كە ئەشكەنجەدراو بە قاچەكانی هەڵدەواسرا بۆ لێدانی بنی پێی. لە سەردەمە جیاوازەكانی ئیسلام بەكارهاتووە بەسەردەمی عوسمانیشەوە.

**فَلِنطة (توركی):**

جۆرە تفەنگێكی بچووك بوو، سوارەكانی سوپای عوسمانی بەكاریان دەهێنا.

**فلوري، فلورین (فرەنسی):**

پارەیەكی زێڕی ئەوروپییە لە بنەڕەتدا لە فلۆرەنسای ئیتاڵیا لێدراوە بەڵام لە وڵاتانی حوكمڕانی عوسمانیدا باو بوو.

**فندق**، **Fondica, Fonuc** (**ئیتالی**):

لە بنەڕەتدا بەم باڵەخانەیە دەگوترا کە لەچەند نهۆمێك پێکهاتبوو، بازرگانە ئەوروپییەکان لە شارەکانی ڕۆژهەڵات تێیدا دادەبەزین.

**فودلە خوارگان** (**تورکی – فارسی**):

چینێك لە سەربازان بوون، ئەرکیان بەخێوکردنی منداڵانی ئینکشاریە بوو کە باوانیان لەکاتی خزمەتی سەربازیدا لەدەست دابوو.

**فورسة** (**تورکی**):

لە سەردەمی عوسمانی بەم کەسانە دەگوترا کە سەوڵەکانی کەشتییەکانیان لێدەدا کە زۆربەیان لە دیلەکان یاخود لە تاوانباران بوون.

**فوطـچی** (**فارسی – تورکی**):

لە سەردەمی عوسمانی بەم کەسە دەگوترا کە لە گەرماوە گشتییەکان کاری دەکرد و ئەرکی دابەشکردنی پەشتەماڵ بوو بەسەر خۆشۆرەکاندا.

**فولاذ** (**فارسی – کوردی**):

واتا (پۆڵا) ، جان پولاد (جنبلاط) واتا گیانی پۆڵایین.

**فیــلور** (**تورکی**):

لە سەردەمی عوسمانی بەم کۆمەڵە کەشتیە بچووکانە دەگوترا، کە ئەرکەکەی بریتییە لە مسۆگەر کردنی پەیوەندی لە نێوان ناوەندە پاسەوانییە دەریاییەکان، هەروەها بۆ گواستنەوەی پۆستی دەریایی خێرا.

# ڕۆڵی وشه هاوواتاكان له بنیاتنان و جوانكردنی شیعر

نووسینی:م.ی. هاوژین صلیوه عیسا
زانكۆی كۆیه – فاكەڵتی زانسته مرۆڤایەتییەكان و پەروەردە
سكوڵی زمان- بەشی زمانی كوردی

## پێشەكی

بێ گومان زمان یەكێكه لەپێكهاتـەكانی بونیـادی شـیعر، شـاعیر لەگـەڵ زمـان ڕووبەڕوو دەبێتەوە، لەڕێی زمان خۆی خاڵی دەكاتەوە، لـەو ئیلهامانـەی كـە بـۆی دێت، وەك چـۆن كەرەسـتەی مۆسـیقاژەن ئـەو ئامێرەیـە كـە ژەنینەكـەی لەسـەر ئەنجام دەدات، یـان وەك چـۆن وێنەكێـشێك كەرەسـتەكەی فڵـچەو بۆیـەو ڕەنگـە، كەرەستەی شاعیریش زمانـە، واتـا چـۆن هونەرمەنـدێكی نیگـاركێش لـەڕێی برێـك ڕەنگ كە بەشێوەیەكی هونەری تێكەڵیان دەكات و تابلۆیان لـێ دروسـت دەكـات، بەڵام كەسێك لە هونەری شێوەكاری نەزانێت ناتوانێـت لـەو بۆیـەو ڕەنگانـە سـوود وەربگرێت و تـابلۆی جـوان بنەخـشێنێت و هونـەری لـێ دروسـت بكـات، بەهـەمان شێوە شاعیر هەر زمانەكـەی نێـو كۆمـەڵگا بـەكار دەهێنێـت و شـیعری لـێ خـەڵق دەكـات، چـونكە وەك شـێوەكارەكە شـاعیریش شـارەزایی هەیـە لـە هونـەری بینـاكردنی شـیعرو لەچـۆنیەتی پێكـەوەنان و گونجانـدن و بەمۆسـیقا كردنـی شیعرەكەی.

نەزار قەبانی دەڵێت: (( زمان منی داگیر كردووە، داگیركردنێكی سـەرتاپایی، تەواو لە هەموو لایەك دەورەی داوم ... گوڵ زمانە، ئەستێرە زمانە، درەخت زمانە دەموچاوی ئافرەت و لەش و لاری زمـانن، پێكـەنین زمانـە)) [1] كەواتـە مەبەسـتی نەزار قەبانی ئەوەیە كاتێك شاعیر لە هەریەك لەو بابەتانەی ژماردوویەتی لەبابەتی

تریش بدویَ له ڕێی زمانەوە دەتوانێت گوزارشتیان لێ بكات، جگەلە زمان هیچ كەرەستەو شتێكی تری لەبەردەست نییە هەستە پەنگ خواردووەكانی خۆی پێ دەربب‌ڕێت .

بێ گومان وشە هاوواتاكانیش ڕۆڵێكی بەرچاو دەبینن لەجوانكردن و دروستكردنی شیعر هەر لەشیعری كلاسیكییەوە تادەگاتە نوێترین شیعری ئەمڕۆ، چونكە شاعیری سەركەوتوو ئەو شاعیرەیە كە شارەزاییەكی باشی لە زماندا هەبێت و وشەی زۆرو زەبەند بزانێت و هاو واتای زۆر وشەش بزانێت، چونكە كاتێ شاعیر دەكەوێتە خەیاڵی نووسین و ئیلهام بۆهاتن ئەوكاتە وشەكان بەخەیاڵی دادێن و شیعر دروست دەبێت .

شاعیر تەنها لەڕێی زانینی وشەی زۆرەوە شیعر خەلق ناكات، واتە شاعیرێك چەندان وشەی ناو فەرهەنگەكان لەبەر بكات، تەنها بەمە شیعری جوان نانووسرێت، بەڵكو دەبێت لایەنەكانی تری شیعریش فەرامۆش نەكات وەك: مۆسیقا،خەیاڵ، بیر، هەست و نەست و سۆزو واقیع، ڕاستە وێنەكێشێك ئەگەر بیەوێت تابلۆیەكی جوان بنەخشێنێت پێویستی بەزۆر جۆری ڕەنگ هەیە، ئەگەر ڕەنگەكانی كەم بوون ناتوانێت زۆر جوان و كامڵ ئیشەكەی ئەنجام بدات، شاعیریش وایە تا زمانی دەوڵەمەندتر بێت ئەوەندە بەسەر پرۆسێسی شیعر نووسیندا زاڵ دەبێت، بەمەرجێ لایەنەكانی تەكنیكی شیعر نووسین فەرامۆش نەكات، بەشێوەیەكی تر بڵێین دەستەلاَتی بشكێت بەسەر لایەنەكانی تری پێكهاتەكانی شیعر.

ئامانجی ئەم لێكۆڵینەوەشمان خستنە ڕووی چەندین نموونەی شیعری و بەدەرخستنی ڕۆڵی وشە هاوواتاكان لە جوانكردن و خەڵقكردنی شیعرو بەخشینی مۆسیقای ناوەكی و دەرەكییە .

هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتەش لەبەر گرنگیی بابەتەكە بوو كە تائێستا لێكۆڵینەوەی لەم شێوەیە نەكراوە، بۆیە ئارەزووم كرد كاری لەسەر بكەم.

لێكۆڵینەوەكەش سنوورێكی دیاریكراوی نییە، بەڵكو بەگوێرەی ئەو نموونە شیعرانەیە كە شێوەی جیاجیای لەخۆ گرتووە، ئامانجی لێكۆڵینەوەكەش خستنە ڕووی بەها و گرنگی وشە هاوواتاكانە بۆ شاعیر. بەو نموونانە دەردەكەوێت ئەو

شاعیرەی فەرهەنگی بەهێزبێت و هاوواتـای زۆر بزانێت چەند دەتوانێت بەسەر پرۆسەی  شیعر نووسیندا زاڵ ببێت.
گیرو گرفتی لێکۆڵینەوەکەش ئەوەبووە کە بۆ دۆزینەوەی ئەم هەموو جۆرە شیعرە جیاوازانە گەڕان و ماندووبوونێکی زۆری ویستووە.

ستراکتوری لێکۆڵینەوەکەش ئەوەیە کە بەسەر دوو بەشدا دابەشم کردووە: لە بەشی یەکەمدا: باسی پێناسەو چەمکی وشەی هاو واتامان کردووەو لەگەڵ هۆکاری دروستبوونی وشە هاوواتاکان ئەوانیشمان دابەش کردووە بەسەر سێ تەوەرە، یەکەم: دیاردەی زمانەوانی خۆی، دووەم: بوونی دیالێکتی جۆراو جۆر لەنێو زمانێکدا، سێیەم: پەڕینەوەی وشەی بێگانە زۆر جار دەبێتە شوێنگرەوەی وشەی خۆماڵی .

بەشی دووەم: بەسەر هەشت تەوەر دابەش کراوە، یەکەم: باسی ڕۆڵی وشە هاوواتاکانمان کردووە لە جوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعر، بەنموونە ڕوون کراوەتەوە، دووەم: ڕۆڵی جووتە وشەی هاوواتا لەجوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعر،  سێیەم: ڕۆڵی وشە بێگانەکان لەجوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعری کلاسیکی،  چوارەم: ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لەجوانکردنی مۆسیقای دەرەکی شیعر، پێنجەم: ڕۆڵی وشە بێگانەکان لە دروستکردنی سەروای شیعری،  شەشەم: ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لە جوانکردنی شیعری ئازاددا، حەوتەم: بەکارهێنانی وشەی نوێ لەبری وشە کۆنەکان، هەشتەم: چڕکردنەوەی مەفهوومێك لەنێو وشەیەکدا.دوای خستنە ڕوو و ڕاڤەکردنی  ئەو بابەتانەش چەند ئەنجامێکمان خستۆتە ڕوو کە لەمیانەی لێکۆڵینەوەکەمان پێی گەیشتووین،  دواتریش پەراوێزو سەرچاوەکانمان خستۆتە ڕوو لەگەڵ کورتەی باس بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

**بەشی یەکەم**

**١- پێناسەو چەمکی وشەی هاوواتا :**

هاوواتا وشەیەکی داڕێژراوە، لەپێشگری (هاو)+(واتا) پێکهاتووە، هاو: مانای پێکەوە، لەگەڵ ئەو، دەگەیەنێت، وەك دەڵێن (هاوبیر) واتا (لەگەڵ بیری ئەو)، هاوکار، هاوناز، ...هتد، کەواتە هاوواتا ئەوەیە دوو وشە یان چەند وشەیەك هەمان واتایان هەبێت و لەبری یەکتری بەکار بهێندرێن و هەمان مانا ببەخشن، هەندێ

جار دەشیَ بەگوێرەی ڕستەكان ماناكانیان بگۆڕێن،بۆنموونە وشەی (خۆر) هاو واتای (هەتاو)و( ڕۆژە)، بەلاَم هەتاو ( ڕۆژ)یش دەبنەوە فرە واتا واتای تر دەبەخشن، خۆر بەواتای ( گلَ) یش بەكاردێت، ڕوژ بەواتای ڕۆژەكانی حەفتەش بەكاردێت.

كروز cruse دەڵێت ((هاوواتا بریتییە لەپێوەندی نێوان وشەكان بەمەرجێك ئەم وشانە سیماو واتاكانیان لە بنەڕەتدا هاو واتابن، بەلاَم هەندێك جار سیما لاوەكییەكانیان لەگەلَ یەكتردا جیاواز دەبن )) [٢] زۆر جار دەبینین وشە هاوواتاكان لە مانایەك زیاتر دەبەخشن، كە دەڵێین ( ڕۆژوشەو ) كەواتە لێرە ڕۆژ لە بەیانییەوە تا ئێوارە دەگرێتەوە، لێرەدا ڕۆژ بەواتای خۆرەتاو نەهاتووە، هەتاو مانای تیشكی خۆر دەبەخشێت، لەڕاستیدا گڕوتینی خۆرەكەیە نەك خودی خۆر، بەم شێوەیە وشە هاوواتاكان مانای یەكتریان هەیە، بەلاَم زۆر جار یەكێك لە وشە هاوواتاكان مانای تر دەبەخشێت.

**هۆكاری دروستبوونی وشە هاوواتاكان:**

**١- دیاردەی زمانەوانی خۆی**

هەموو زمانێك وشەی هاوواتای هەیە،چونكە زمان بوونەوەرێكی زیندووەو هەمیشە لە گەشەكردندایە، زۆرجار وشەیەكی نویَ پەیدا دەبیَ لەبری وشەیەكی تر بەكاردێت و وشە كۆنەكەش قسەپێكەرانی خۆی دەبێت خۆی دەپارێزیَ، كەواتە بۆناوی شتێك، درەختێك یاخود دیاردەیەك...هتد چەند وشەیەك دروست دەبێت، هەر وشەیەك كە لەدایك دەبێت وێنەی شتێكە، كە ئێمە دەڵێین (بەرد) وێنەی بەردمان دێتەبەرچاو، چونكە پەیوەستەپێیەوە، ئەگەر لەداهاتوو وشەیەكی تر بەكار هات لەبری بەرد خەڵك بەكاریان هێنا دەچەسپێت و واتای ئەو وەردەگرێت .

زۆر جار دەبینین لەنێو دیالێكتێكی زمانی كوردی چەندین دەربڕین و وشەی جیاواز هەن، لەگەلَ دەوروبەرەكەی جیای دەكاتەوە، زۆر جار هەندیَ وشە هەیە تەنها لەگوندێك یا چەند گوندێك بەكار دێن، لە گوندەكەی نزیك خۆی ئەم وشانە بەكار نایەن، بەڵكو لەبری ئەوانە وشەی تر بەكار دێن، كەواتە دەبینین لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر لە شارۆچكەیەكەوە بۆ شارۆچكەیەكی تر ئەوە بەرچاو دەكەوێت، واتا لەناو تاكە دیالێكتێكدا چەندین وشەی هاوواتا هەن.

### ٢- بوونی دیالێکتی جۆراوجۆر لەنێو زمانێکدا

بێ گومان زمانی کوردی کە لەچوار دیالێکتی گەورە پێکدێت، هەریەك لەم دیالێکتانە چەندین شێوەزار ( بێچووە) زاری تیَ کەوتووە، کەواتە ئەگەر واز لە بێچووە زارەکان بهێنین کە چەند لقێکی بچووکن و دەڕژێنە نێو ڕووباری دیالێکتەکانی خۆیانەوە، کە زۆر جار گۆڕانەکە لە وشەکان کەمە زیاتر لە فۆنەتیك و شێوازی دەربڕینە.

گومانی تێدا نییە زمانی کوردی بەهەموو دیالێکتەکانیەوە دەڕژێنە نێو ڕێژگەی دەریایەك کە بەهەموویان کوردستان پێکدەهێنن، بەلآم نکۆڵی لەوە ناکریَ هەر دیالێکتێك تائاستێکی زۆر وشەو فەرهەنگی خۆی هەیە، ئێمە بۆ دەڵێین کورد چوار دیالێکتی هەیە، چونکە بۆ هەر شتێك و دەربڕینێك بەلانی کەمەوە چوار جۆر وشە هەیە زۆر جار لەوەش تێپەڕ دەکات، جگەلەوەی هەر چوار دیالێکت جاری وەها هەیە جیاوازن،هەمان وشە لەنێو تاکە دیالێکتێکیش وشەی هاوواتای هەیە، هەموو ئەو وشانەی کە هەمان مانا دەبەخشن لەدیالێکتەکانی تر دەبنە هاوواتای یەکتر،بۆ نموونە: وشەی (هەیڤ) لەکرمانجی سەروو واتای (مانگ)ی کرمانجی ناوەڕاستە، بۆ پرۆسەی شیعر نووسین شاعیر دەتوانێت سوود لە هەموو دیالێکتەکان وەربگرێت لەمشتومالکردن و جوانکردنی شیعرەکانی .

ئەم وشە هاوواتایانە جگە بۆ شیعر بۆ نووسەرانیش شێوازی جوان بەنووسینەکانیان دەبەخشن، بۆ نموونە: نووسەرێك لەنووسینی وتارێکدا پێویستی بەوە دەبێت دووجار وشەی وەرگێڕان بنووسێت، ئەوا جارێك (وەرگێڕان )و جارێکی تر( پاچڤە کردن ) بەکار بهێنێت شێوازەکەی جوانتر دەبێت، یاخود لە وتارێکدا جارێك (هەیڤ) و جارێك (مانگ ) بەکار بهێنێت ئەوا وتارەکەی چێژبەخش و جوانترو ڕەنگاڵەتر دەبێت، ڕاستە هەردوو وشەکە یەك مانایان هەیە، بەلآم وەك دوو سێوی زەردو سوور کە لەنێو سەبەتەیەکدا دانرابن زۆر جوانترن لەوەی کە هەردوو سێوەکە یەك ڕەنگ بن، ڕاستە هەردووکیان سێون، بەلآم ڕەنگ و ڕوخساریان جیاوازە، بەم شێوەیەش شاعیر سوود وەردەگریَ لە دیالێکتەکان بۆجوانکردنی مۆسیقای شیعری و شێوازی دەربڕین،لە ئەنجامی بەرز و بڵندی و لێکدابڕان و تێکەڵاو نەبوون دیالێکت دروست دەبێت.

### ٣- پەڕینەوەی وشەی بێگانە بۆ نێو زمانی نەتەوایەتی

بێ گومان هیچ زمانێك لە جیهان نییە سەد لەسەد خۆی بێت، بەڵكو وشەی بێگانەی تێ كەوتووەو پەڕیوەتە ناوی،بۆنموونە: زمانی عەرەبی و زمانی فارسی و زمانی ئینگلیزی ...هتد هەریەك لەو زمانانە سەد لەسەد خۆیان نین،بەڵكو وشە لە دراوسێكانیان و لەجیهان و لە وڵاتانی تری تێ كەوتووە،هەندێ لەم وشانە گۆڕاون هەندێكی تر فۆنەتیكی زمانە نوێیەكە وەردەگرن،هەندێكیشیان وەكو خۆیان دەمێننەوە، زمانی كوردیش وەك زمانەكانی تری جیهان،وشەی بێگانەی تێ كەوتووە، بەتایبەتی وشەی فارسی و عەرەبی، جا لە شیعری كلاسیكی بەئەنقەست و بۆ سنعەتكاری بەكاریان هێنابێت،یا لە قسەی ڕۆژانەی خەڵك عەفەوی هاتۆتە نێو زمانی كوردی، هەندێك لەم وشانە،وەك دەڵێن كوردێنراون لەوانە وشەی (ثابت) ی عەرەبی ئێمە بە(سابت) گۆی دەكەین، وشەی( شەهید) كە وشەیەكی عەرەبییە لەهەر چوار دیالێكتەكانی زمانی كوردی بەهەموو شێوەزارەكانیانەوە وشەی بەرامبەرمان نییە، زۆر وشەش هەیە هەر وشە عەرەبییەكەیە ڕۆژانە خەڵك بەكاری دەهێنن .

لە ڕاستیدا ئەم وشانە بەو مەفهوومەی كە هەیە وشەی هاوواتا نین بەنیسبەت زمانی كوردی،چونكە وشەی بێگانەن، بەڵام لەو كاتەدا دەبنە هاوواتا كاتێ كەسێك دەیەوێت لەنێو ڕستەو گوتەكانیدا وشەی عەرەبی بەكاربهێنێت ئەم وشەیە دەبێتە بەدیل و موڕادیف و شوێنگرەوەو هاوواتای وشە كوردییەكە، بۆیە بمانەوێ و نەمانەوێ شوێنی هاوواتا دەگرنەوەو وەك وشە كوردییەكان هەمان مەفهووم دەگەیێنن.

ئەگەر لەڕوانگەی شیعری كلاسیكییەوە لێ بڕوانین، ئەم وشە بێگانانە ڕۆڵێكی زۆریان بینیوە لە دروستكردنی شیعری كوردی،ئێستاش وشەی بێگانە لە بەرهەمە ئەدەبییەكان و لە وتارە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكان ....هتد لە قسەی ڕۆژانەش كەم و زۆر بەكار دەهێندرێن.

زمانی هەر نەتەوەیەك پێهاتەیەكە لەم شێوازە:

دیالێكتی زمانێك ( زمانی ستاندارد) + وشەی دیالێكتەكانی تری هەمان زمان + وشەی وڵاتانی دراوسێ+ وشەی وڵاتانی جیهان = زمانی نەتەوەیەك

**بەشی دووەم**

**١- ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لەجوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعر**

مۆسیقا بەشێکی گرنگی شیعرە،مۆسیقا سیحرێکی تێدایە کە هەموو مرۆڤێك ئارەزووی لێ دەکات و لە شیعریشدا ڕۆڵێکی مەزنی جوانکاری دەبینێت،((یەکەم ئاکاری ڕوخساری شیعری لای هەر شاعیرێك لە سەرەتادا زمان و دەربڕینە، ئنجا لایەنی تەکنیك و فۆڕمی ئەو دەربڕینانەیە کە ئەزموونی شاعیری تیادا بەرجەستە دەبێت و خۆی لە هونەرەکانی کێش و قالبە کێش و سەرواوە دەدۆزێتەوە))[٣] مۆسیقای ناوەکی پێوەندی هەیە بەوشەو پیتەکانی ناوەوەی دێرە شیعرەکان،چۆنیەتی ڕێکخستن و پێکەوەنانی وشەکانیش هونەری خۆی دەوێت،((ئاوازێکی تر لەئارادا دەبێت کە ئاوازی ناوەوەی هەڵبەستەکەیە، ئەم ئاوازەش بریتییە لە نەغمەی دەنگەکان و لێکدان و پێکەوە گونجاندنیان و پاش و پێش خستن و بەکارهێنانی هەندێ لە ئامرازە زمانییەکان بە جۆرێکی ئەوتۆ زۆر جار لەکێشەکان کاریگەرتر دەبێت)) [٤]

شاعیری بەهرەدارو بەسەلیقە دەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ وشەکاندا بکات و بەشێوەیەکی وا تێکەڵیان بکات و ئاوێتەی یەکتریان بکات، شاعیری بەسەلیقە هەوڵدەدات جگەلە مۆسیقای دەرەکی، گرینگی بەمۆسیقای ناوەکیش بدات، مۆسیقای ناوەکیش بەشێکی پێوەندی هەیە بە سەروسەلیقەو مامەڵەکردن لەگەڵ وشەکان بەشێکی تریشی پێوەندی هەیە بە بەهێزی زمانی شاعیر لەزانینی موڕادیفاتی زۆر، بۆ هەر وشەیەك وشەیەکی تر یاخود زیاتر، چونکە وشە موڕادیفەکان هەمان مۆسیقایان نییە، بۆ نموونە وشەی (گەلا) (پەلك) هەمان مانایان هەیە،بەلام مۆسیقاو پێکهاتەیان جیاوازە، (گەلا) جگەلە واتای خۆی فرەواتایشی دروست کردووە، لەم ساڵانەی دوای ڕاپەڕین بۆ ( دۆلار) یش بەکارهاتووە.

بێ گومان گواستنەوە و فراوانبوون و تەسکبوونەوەش لە زماندا ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە بەخشینی مەدلولی تر بە وشەکان، گواستنەوە بەو واتایەی فۆڕمێك لە سەردەمێکدا واتایێکی تایبەتی هەبووە بەتێپەڕبوونی کات لە سەردەمێکی تردا واتاکەی بەشتێکی تر دەگۆڕێت بەهەمان فۆڕم و شێوە،

بۆنموونە ( تەرەس) لە سەردەمانێکدا ڕێبەری ئاینی بووە، بەتێپەڕبوونی کات و لاوازبوونی ئاینەکە و هاتنی ئاینی نویَ وشەی ( تەرەس) واتای جوێنی بەخشی .

سەبارەت بە تەسکبوونەوەش بەو واتایەی پێشتر دەربڕینێك بۆ چەند شتێك بەکار هاتووە، بەڵام ئێستا تەسك بۆتەوە بۆ نموونە:(جل) لە ناوچەی کۆیە بەو پارچە قوماشە دەوترێت کە دەخرێتە سەر پشتی مانگاو تاژی و...هتد کەچی لە سلێمانی بەمانای جل و بەرگ دێت وەك: لە ڕستەی (ئیمڕۆ جلم کڕی) ((تەسکبوونەوە واتا دیاریکردنی قەوارەی واتاو بەتایبەتی ئەوەی دەقەکانی بەکار هێنانەکەیەتی، بۆنموونە (چرا) بۆناولێنانی هەموو چرایەك و ( گڵۆپ)ی کارەبایش بەکار دەهێندرا و ئیمڕۆ بەزۆریی پەیوەستە هەر بە (چرا)وە ئەمەیان تایبەت بوونی قەوارەی واتا نوێیەکەیە بەرامبەر بەواتا کۆنەکە)) [٥]

کەواتا سەردەمانێك (چرا) هاوواتای گڵۆپیش بووەو لەبری یەکتری بەکار هاتوون.(( وشەیەك واز لە واتا گشتییەکەی خۆی دێنێ و پسپۆڕی لە واتایەکی تەسکتردا پەیدا دەکات، لەوانەشە وشەکە هەردوو واتاکەی بپارێزێ لە هەمان کاتدا بەواتایەکی تر، هەندێ جار واتایەکی گشتی هەبێت و هەندێ جاریش بەواتایەکی تەسکتر بەکاربێت، بۆنموونە وشەی (نان) فراوان بۆتەوە لەبنەڕەتدا وەك لە هەندێ فرێزدا دەردەکەوێ بەواتایەکی فراوان بەکارهاتووە و هەموو جۆرە خواردنێکی گرتۆتەوە (نانی پێ پەیدا ناکرێ ) بەدوای ناندا وێڵە، نانی مەبرە، نانی خۆی و منداڵی بڕی ...هتد ئێستا شانبەشانی ئەم واتا فراوانە، وشەی نان لەکوردی ئەمڕۆدا بەواتای (کولێرە)ش دێ وەك لەم بەکار هێنانەدا دەردەکەوێ : منداڵەکەی نارد نان بێنێ [٦]

فراوانبوونەوە بەو واتایەی لەپێشدا فۆڕمێك بەیەك واتا بەکار هاتووە و دواتر فراوان بۆتەوەو واتای تری بەخشیوە (( فراوانبوونەوەی واتا بەگشتگیرییەکەیدا دیارو ئاشکرایەو دەناسرێتەوە ( بڕوانە/شین/لە/شینایی/دا) گواستنەوەی واتا ئەنجامی بەکارهێنانی میتافۆڕی دەربڕینەکانە. بڕوانە، بۆنموونە، ناوی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بەواتاو ناوەڕۆکی گوێزانەوەوە بۆ ئەو چشت و کەرەستانەی،کە مرۆڤین یان مرۆڤی نین،وەك /قاچ/ لە قاچی کورسیدا و /چاو/لە چاوی عەلادیندا و /لووت/ لە/لووتکە/و لووتی شاخدا و /باڵ/ لە باڵی فڕۆکەدا

و/...پەیوەنـدی دروسـتبوونی /پەپوولـە/ی پارچـەو بـەرگی ژنانـە بەپوولەکـەی ماسی))[٧]

ئێستا زۆر وشەمان هەیە هێشتا ئـەم حاڵەتـەیان بەسـەردا نـەهاتووە، ڕەنگـە لـە داهاتوو مانای ترو مەدلوولی تر وەربگرن و ماناکەیان بەرەو فراوانـی بـڕوات.((ئـەم کارە پێچەوانەی واتا تەسکبوونەوەیە، لێرەدا وشەکە بەتێپەڕبوونی کات واتایـەکی فراوانتر پەیدا دەکات و دیاردەیەکی گەورەتر دەگرێتەوە بۆنموونە وشەی (بـڕۆین) لە بنەڕەتدا بۆ مانـای (لـەوەڕگا) هـاتووە ئێـستا واتاکـەی فـراوانتر بـووەو هـەموو شتێکی پێویست دەگرێتەوە))[٨]

نالی دەڵێت:

**ئەلا ئەی ئاسکی ناسك، بە باسك**

**شکاندت گەردەنی صەد شێری شەرزە**

**ئەلا ئەی نازەنین ئاهوو،بە باهوو**

**دڵی صەیادی خۆت هێنایە لەرزە...**[٩]

کاتێ سـەرنجی ئـەم شـیعرەی نـالی دەدەیـن لـەڕووی مۆسـیقای دەرەکییـەوە زۆر مۆسیقادار نییە، چونکە نیوە دێڕی یەکەم بەپیتی (ك) کۆتایی دێت، نیـوە دێـڕی دووەمی دێری یەکەم بەپیتی(ە) کۆتایی دێت، دەبینین تەنها نیوە دێـڕی دووەمـی دێڕی یەکەم،لەگەڵ نیـوەدێڕی دووەمـی دێـڕی دووەم (ە) کۆتـایی هـاتووە، بـەڵام کاتێك خوێنەر ئەم شیعرە دەخوێنێتەوە هەست بـەهیچ جـۆرە لەنگییـەك ناکـات، بەڵکو زۆر مۆسیقادار دێتە بەر چاوی.

ڕاستە هەرچوار نیوە دێڕەکە لەسـەر یـەك کـێش دانـدراون، بـەڵام ئـەوەی ئـەم شیعرە شیرین و جوان و ڕازاوە دەکات ئەوەیە شـاعیر مامەڵەیـەکی جـوانی لەگـەڵ مۆسیقای ناوەکی شیعرەکە کردووە، لـە نیـوەدێڕی دێـڕی یەکـەم شـاعیر هەرسـێ وشەی (ئاسك، ناسك، باسك) یەك لەدوای یەك ڕیز کردووە، هەریەك لـەم وشـانەش لـە دوو بڕگـە پێکهـاتوون، بەرامبـەر ئەمـە موڕادیفـاتی ( ئاسـك، مـامز، ئـاهوو) دەزانێت،بەڵام بەمەبەست ئەمەی کردووە ئەگەر شاعیر لەبری ئاسك مـامزی بـەکار بهێنایە (مامز، ناسك) کە دەکەونە تەنیشت یەك ئەم جوانی و مۆسیقایە نابەخشن،

ڕاستە وشەی ( ئاسك، مامز، ئاهوو) هەمان مانا دەبەخشن، بەلاّم مۆسیقایان جیاوازە.

شاعیر لەدێڕی دووەمی نیوەدێڕی یەکەم ئاهووباهووی بەکارهێناوە ئەگەر بێت و ئاڵوگۆڕی لەنێوان دێڕی یەکەم و دێڕی دووەم بکەین تەنها لەگۆڕینی ناوی (ئاسك و ئاهوو) واتا ئاهووەکە بچێتە جێی ئاسکەکەو بەپێچەوانەشەوە، دەبینین مۆسیقای شیعرەکە تێکدەچێت و ئەو جوانییەی جارانی نامێنێت، ڕاستە واتاکەی ناگۆڕێت، بەلاّم جوانییەکەی دەشێوێندرێت، لەم نموونەیەوە بۆمان دەردەکەوێت زانینی وشەی هاوواتای زۆر بۆ شاعیر گرینگییەکی زۆری هەیە بە بەخشینی مۆسیقای جوان بە بنیاتی شیعرەکە.

بەڕای ڕەخنەگری کەسانێکی وەك سارتەر ((شیعر هەر ئەو زمانەیە کە خۆی لە بازنەی خۆیدایەو لە ئاکامی تێکشکاندنی زمانی باودا لەدایك دەبێت)) [١٠] واتە شاعیر هەرئەو وشانە بەکار دەهێنێت کە کۆمەڵگاکەی خۆی بەکاری دەهێنن . تێکشکانی زمانی باویش بەوە دەبێت شاعیر ئەم وشەو مانایانە بەناو فلتەرەکانی خەیاڵ و بیرو ئەندێشەو هەست و نەست و مۆسیقادا ببات، بۆئەوەی ئەم زمانە باوە بخەملێت و لە ئاکامی ئەم هەموو هەڵشێلان و داشێلانەدا شاعیر دەتوانێت شیعری بەرز بخولقێنێت.

## ٢-ڕۆڵی جووتە وشەی هاوواتا لە جوانکردنی مۆسیقای ناوەکی (سەروای ناوەوە)ی شیعر

زۆرجار دەبینین کەسێك قسە دەکات و چەندین وشە دەردەبڕێت کە هەمان مانایان هەبێت بەکارهێنانی مۆسیقا ناوەکییەکە وا دەکات کە جوانیی خۆیان نیشان بدەن لەنێو شیعریش هەر وایە ((ئاوازی ناوەوە ئەو مۆسیقایە دەگرێتەوە لەئەنجامی چەندین جار دووبارەبوونەوەی چەند دەنگێك (چ بزوێن بن یا نەبزوێن) یاخود لەئەنجامی ڕێکخستن و بەدوایەکداهاتنی وشەو دەستەواژەو ڕستەکانی ناو دێڕە شیعر پەیدا دەبێت)) [١١] ئەم مۆسیقا ناوەکییەش سیحری جوانی شیعرەکەیە و نایابیی شیعرەکە پیشان دەدات ((هەست و سۆزو تاقیکردنەوەکانی شاعیر بەهۆی ئاوازی ناوەوە دەردەبڕێت )) [١٢] چونکە شاعیر هەموو هەست و سۆزی

خۆی بەم چەند دێڕە شیعرەو مۆسیقاو وێنـەکانی نـاوەوە دەبەخـشێت، هـەروەها بەکارهێنانی جووتە وشەی هاوواتا مۆسیقای ناوەکی شیعر جوان دەکات.

رەسووڵ سوڵتانی لە شیعری (خەلآت )دا دەڵێت:-

**گوڵەکەم بێرەوە شێواوە لەدووریت نازی ئەوین**

**بەنیگات بمخەرە سەر ڕێڕەو و ڕێبازی ئەوین** (١٣)

لەم دێڕە شیعرەدا ڕێڕەو و ڕێباز هەمان مانایان هەیـە، بـەلآم چـونکە وشـەکان مۆسـیقین لەپیتـەکانی (ڕ،ێ،ڕ) یـەك دەگرنـەوە، جوانییـان بەشـیعرەکە داوەو مۆسیقای ناوەکی بۆ دروست کـردووە، ئەگـەر لـەدەرەوەی ئـەم شـیعرە ئـەم دوو وشەیە کەمێك واتاکانیان جیاواز بن، ئەوا لەم دێڕە شیعرە هەمان واتایان هەیە.

لەنموونەیەکی تر مەحوی دەڵێت:-

**ئەوەی دڵدار و دولبەرمە کەوا دەڕوا لەبەر چاوم**

**بەدونیا بۆچی دڵ نەتوێتەوە ئەڕوا لەبەرچاوم** (١٤)

هەردوو وشەی ( دڵدار و دولبەر) لەم دێـڕە شـیعرە هـەمان مانایـان هەیـە، کـە بـەواتای ئەڤینەکـەی خۆشەویـستەکەی دێت،بـەلآم شـاعیر بـۆ پێکـەوە بـەکاری هێنـاون، تـاوەکو مۆسـیقای نـاوەکی شـیعرەکە بـەهێز بکـات هـەروەها بـۆ جەختکردنەوەو تەئکیدکردنەوەشە لەهەمان کاتدا.

لەنموونەیەکی تردا لەتیف هەڵمەت دەڵێت:

**ورد بڕۆ دڵی من پڕ کوڵە پڕ جۆشە**

**ورد بڕۆ پەرداخی تێبینی بنۆشە** (١٥)

دیـارە وشـەی (کوڵـە)و(جۆشـە) هـەمان مانایـان هەیـە، بـەلآم شـاعیر بـۆ جەختکردنەوە بەکاری هێناون هەریەك لـەم وشـانەش لـەدوو بڕگـە پێکهـاتوون لـە دەنگەکانی (و-ۆ-ە) هاوبەشن و پێکهاتەی شیعرەکەیان جوان کردووەو مۆسیقای ناوەکییان پێبەخشیوە.

## ٣- ڕۆڵی وشەی بێگانە لە جوانکردنی مۆسیقای ناوەوەی شیعری کلاسیکی

ئـاوازی نـاوەوە دیـوی نـاوەوەی شـیعرەکە دەگرێتـەوە، کـە سـەداو دەنگدانەوەیـەکی جـوان بەشـیعرەکە دەبەخـشێت، ئـاوازی نـاوەوەش لەچـەند

بارەبوونەوەی دەنگەکان دروست دەبێت (( ئاوازی ناوەوە باشترین ڕێگایە بۆ دەربڕینی هەست و سۆز))[١٦] خوێنەریش لەڕێگەی ئاوازی ناوەوە چێژێکی زۆر لە دەقەکە وەردەگرێت ((ڕیتم پێوەندی بەلایەنی دەروونی مرۆڤەوە هەیە کاتێك مرۆڤ شیعرێکی ئاوازدار دەخوێنێتەوە ئارامی و ئاسوودەیی پێ دەبەخشێ و هەست دەبزوێنێ و دەچێتە ناخی شیعرەکەوە نزیکی دەکاتەوە لە مانای شیعرەکە))[١٧] چونکە مۆسیقا شتێکی ئەفسووناوییەو مرۆڤ حەزی لێ دەکات، بۆیە بەلەدایکبوونی شیعری ئازادیش لایەنی مۆسیقای ناوەکی بەتەواوەتی پشتگوێ نەخراو شاعیران گرینگییان پێدا .

أ- ئەگەر دوو وشە پێکوە هاتبن:- شاعیرانی کلاسیك فەرهەنگی وشەکانیان زۆر دەوڵەمەند بووە، چونکە گرنگییان بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی داوە، ((هەناسەی کورت ماوەی بەردەوامی زۆرتری هەیە، وەکو شەپۆلی کورتی دەنگ کە دوورتر دەڕوا تا شەپۆلی ناوەنجی و درێژ)) [١٨] شاعیران بۆ نووسینی شیعرەکانیان بەدوای وشەی ئاوازەدار و قافیەدار گەڕاون بۆجوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعر ، زۆر جار دوو وشەی عەرەبییان بەتەنیشت یەك هێناوەتەوە بۆجوانکردنی مۆسیقای ناوەکی شیعر.

مەحوی دەڵێت:

**دیارم دەیری عیشقە، کەجێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم**
**کەمن مشتێ چڵ و چێو بم، بەچی بم،کەڵکی کێ دەگرم** [١٩]

لەم دێڕە شیعرەدا وشەی (دیار)و (دەیر) بەتەنیشت یەك هاتوون، کە هەردوو وشەکانیش عەرەبین، دیار: بەمانای شوێن ولأت دێت، کە لە وشەی (دار)ەوە هاتووە. دەیر: واتای شوێنی ڕەبەنە مەسیحییەکان دەگەیەنێت. کەواتە ئەم دوو وشە عەرەبییە مۆسیقای ناوەکییان دروست کردووە، ئەگەر شاعیر لەشوێن وشەی (دیار) ولأتی بەکار بهێنایە مۆسیقای ناوەکییەکە وا جوان نەدەبوو چونکە، ئەم دوو وشەیە لەدوو پیتی ( د،ر) بەیەکەوە پەیوەستن و ئاوازەدارن.

ب- ئەگەر وشەیەکی بێگانەو وشەیەکی خۆماڵی بکەونەپاڵ یەکتری :-

ئەم شێوەیان لەنێو شیعری کلاسیکیدا وەها هاتووە، دوو وشە دەکەونە تەنیشت یەکتر، وشەیەکیان بێگانەیەو وشەیەکیان خۆماڵییە، بەلاّم ئەوەی بەیەکەوە پەیوەستیان دەکات مۆسیقاکەیانە.

مەحوی دەڵێت:

**ئەمن نازانم ئیتر نەفسی بەد خوو چی دەویّ ( مەحوی)**

**کە بەدکردارو بەد ڕەفتارو بەد ئەفکار و بەطەورم** (٢٠)

دەبینین وشەی کردارو ڕەفتار هەمان مانایان هەیە، بەلاّم هەردووکیان پێشگری (بەد) یان وەرگرتووە، بووین بەدوو وشەی داڕێژراو، هەردوو وشەکەش لە فۆنیمی (ا،ر) هاو قافیە دەبنەوە، لەنێوان وشەی بەد کردارو بەد ڕەفتارو بەدئەفکاردا ڕیتمێکی جوان هەیە، بەلاّم ئەگەر لەجیاتی وشەی بەد ئەفکار (بەد بیر) بوایە کە وشەیەکی کوردییە ئەوا مۆسیقاکەی ئەوەندە جوان نەدەبوو، چونکە ئەم مۆرفیمە لە فۆنیمەکانی (ا،ر) یەك دەگرنەوە، هەروەها هەریەك لەم مۆرفیمانە لە(سیّ) بڕگە پێکهاتوون، مۆرفیمی بەدبیر زۆر هاو قافیە نییە لەگەلّ مۆرفیمەکانی تر، چونکە تەنها لەفۆنیمی (ر) لەگەڵیان هاو قافیەیە، لە دوو بڕگەش پێکهاتووە .

**٤- ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لە جوانکردنی مۆسیقای دەرەکی شیعر**

مۆسیقای دەرەکی شیعر گرنگییەکی زۆری هەیە لە ڕسکاندن و جوانکردن و خوڵقاندنی شیعر بەتایبەتی بۆ شیعری کلاسیکی، چونکە شیعری کلاسیکی دەبێت کێش و سەروای تێدابێت بۆئەوەی بەجوانی خۆی پیشان بدات .((مۆسیقا هەستکردنی خوێنەر یا گوێگرە بەو ئاوازانەی کە دەنگەکانی وشەکان و جۆری هەست و سۆزی دەروون و مانای وشەکان لەئەنجامی ترپەی بڕگەکان و پێکهاتنی پیتەکاندا بەکێشی هەڵبەستەکەی دەدەن ))(٢١)

کاتیّ شاعیر ئیلهامێکی بۆ دێت دەیەوێت لە چوارچێوەی شیعرێکدا، بیرو هەست و نەست و خەیالّ و سۆزی خۆی بتوێنێتەوە، ئەو کاتەش شاعیر تەنها زمان شك دەبات بۆئەوەی خۆی خالّی بکاتەوەو شەپۆلی سۆزە پەنگ خواردووەکانی دابڕێژێت، چونکە ئەو وشانەی کە شاعیر دەیزانێت کەسانی تریش دەیزانن، بەلاّم شاعیر دەتوانێت هونەر لەم وشانە دروست بکات، لەتیف هەڵمەت

لەبارەی مۆسیقای دەرەکی شیعرەوە دەڵێت ((مۆسیقای دەرەوەی شیعر وەکو ئەو زەنگوڵە وایە کە لە ملی بەرانی ناو ڕانە مەڕ و بزن دایە هەر کە بەرانەکە جووڵایەوە دەنگی زەنگوڵەکەی دێ ...مۆسیقای دەرەوەش بەم جۆرەیە کە شیعرەکە دەخوێنینەوە هەستی پێدەکەین و گوێمان لێی دەبێت)) [22] بەهێزیی فەرهەنگی وشە بۆ شاعیر گرنگی زۆری هەیە،چونکە شاعیر دانامێنێت لە کاتی شیعر نووسیندا، ئەم وشە هاوواتایانە ڕۆڵی گرینگ دەگێڕن لە مشتومالکردن و خەڵقکردنی شیعردا، بۆ نموونە: کاتێ شاعیر نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکەی بەپیتی (ن) کۆتای دێت لە نیوەدێڕەکەی تر ئەگەر وشەکە پێویستی بەوەبوو وشەی فرمێسك بەکار بهێنین ئەوا شاعیری وشە هاوواتازان، دانامێنێت چونکە شاعیر وشەی ( ئەسرین،فرمێسك، ڕوندك، ئێستر) دەزانێت و دەتوانێت لەبری وشەی فرمێسك (ئەسرین) بەکاربهێنێت،چونکە بەپیتی (ن) کۆتای هاتووە و پەیوەست دەبێتەوە بەنیوەدێڕەکەی پێش خۆی، زۆر جار هەیە شاعیر نیوە دێڕی یەکەمی شیعرێك دەنووسێت، لە نیوەدێڕەکەی تر پەکی دەکەوێت لەسەر قافیە، وا هەست دەکات لە سەرەتاوە شیعرەکەی بەلاوازی هاتووەو مۆسیقادار نییە، بۆیە واز لە شیعرەکە دێنێت، ئەم ترووسکایەی بەمێشکیدا هاتووە،زۆر کەسیش پێی دەڵێن ئیلهام خامۆش دەبێتەوە.

((قافیە بریتییە لە دووبارەکردنەوەی چەند دەنگێکی وەك یێك یاخود ڕۆنانی کۆنسونانت و ڤاوڵەکان لەیێك یاخود لە چەند برگەیەکدا کە زۆر جار هێز لەسەرەوەو لەشوێنی دیاریکراو دەردەکەوێت)) [23] ئیستێتیکاو جوانی بەشیعر دەبەخشێت و هەست و سۆز دەبزوێنێ، چونکە مۆسیقای دەرەکی دێڕەکان پێکەوە پەیوەست دەکات ((هاوسەروا ئەوەیە کە وشەکان بەشێوەیەك هاوئاواز بن ئینجا لە کێشدا یاخود لەپیتی ڕەویەدا هاوبەش بن)) [24]

کە ئێمە لەهاوواتا دەدوێین واتای ئەوە نییە هەموو وشەیەك هاوواتای هەیە، بەلام دەتوانین بلێین زۆر وشە هەیە هاوواتای هەیە پێویستە شاعیر گرنگییان پێ بدات لە ڕێی تێکەڵاو بوون بەخەڵك و دەوروبەر، لەئەنجامی گەڕان و سووڕانی خۆی و خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیران و کتێبی جۆراو جۆر و گرنگیدان

بەفەرهەنگەکانی زمانی کوردی دەتوانێت بەشێکی زۆر لەو وشە هاوواتایانە بەرجەستە بکات .

شێخ نوری شێخ سالح دەڵێت:

**گوێ لە نوری بگرە جانا،بانەبێ تووشی زیان**

**ئیعتیمادت قەد نەبێ، هەرگیز بە ئەوزاعی جیهان** (٢٥)

لەم دێرەشیعرە دا هەردوو وشەی ( زیان، جیهان) هاوقافیەن،خۆ ئەگەر شاعیر تەنها وشەی (گێتی) بزانیایە یان ئەمەی بەکار بهێنایە،ئەوا ئەم دێرە شیعرە دروست نەدەبوو، یاخود ئێمە وشەی (گێتی) لەبەرامبەر(جیهان) دابنێین لەم دێرە شیعرە، هەمان واتا دەبەخشێت، بەلأم بەشێك لە جوانی شیعرەکە کەم دەکاتەوە، یاخود بلێین لە شیعرییەت دەکەوێت .

حاجی ئیبراهیمی شاتری دەلێت:

**نازانم دونیا بە چی دەزانن**

**وەها تێمەگەن خاوەن مەکانن** (٢٦)

لە وشەکانی (دەزانن) و (مەکانن) مۆسیقاکە وەدەر دەکەوێ، کە وشە بێگانەکە لەگەڵ وشە خۆماڵییەکە هاومۆسیقان.

**٥- ڕۆڵی وشەی بێگانە لە دروستکردنی سەروای شیعردا**

کە شاعیر ئازاد بێت لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبی و کوردی و فارسی و ...هتد بێ گومان زۆر لەم وشانە دەکەونە کۆتایی شیعرەکە یان ناوەخنی شیعرەکە لەگەڵ وشەکانی تر تێکەڵ دەبن و شیعر دەخولقێنن،((سەرواو ئاوازی شیعری زیاد دەکات و لەنگەری شەپۆلی دەنگەکانی دێرە شیعر ڕادەگرێ و دەبێ بە زایەڵەو دەنگدانەوەی دەنگە هاوجنسەکانی تری ناو هەمان دێڕ و دەنگە هاوبەشەکانی دێڕەکانی تر، سەروا، دووبارەبوونەوەی دەستە دەنگێك جۆرە ڕیتمێکی ئاوازەیی دروست دەکات و هەست و سۆزی هەڵچووی ناوەوە ڕێك دەخات بەرەو ئامانجی خۆی ئاراستەی دەکات بەتایبەتی لەخوێندنەوەی بە دەنگدا کەپێداگرتنی تێدایە لەسەر هەڵکشان و داکشانی ئاوازەکەو نیشتنەوەی لەسەر دەنگە هاوبەشەکانی دواوە))(٢٧) بۆ شاعیرانی کلاسیك بەتایبەتی شاعیرە زمان زان و بەهرەمەندەکان

دەرگای زۆریان لەبەردەم والآ بـووە لـە هەڵبـژاردنی وشـە بـۆ نووسـینی شـیعرێك، شاعیرانی کلاسیك چوار زمانیان لەبەردەست بووە بۆ داڕشتنی شیعرەکانیان.

مەحوی دەڵێت:

**لە ناکەس کارییا، خاکم بەسەر ڕۆیی بە با عومرم**
**خودا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم** (٢٨)

هەردوو وشەی (عومرم) (دەمرم) سـەروای ئـەم دێـڕە شـیعرەیان دابـین کـردووە، وشەیەکیان کوردییـە ئـەوەی تریـان عەرەبییـە، کەواتـە وشـەی (عـومر) بـووە بـە موڕادیفێـك و شـوێنگرەوەی وشـەی (تەمـەن) هەرچـەندە لـە ڕووی زمانەوانییـەوە ئەوەمان لێ قبووڵ ناکرێت بڵێین ئەم دوو وشەیە موڕادیفن بەهەرحاڵ کـاری خـۆی کردووەو بووە بەشوێنگرەوەی وشە خۆماڵییەکە. ئەگەر شاعیر وشەی (تەمەنم) ی بەکاربهێنایە،ئەوا لەنگی دەکەوتە نێو شیعرەکە، چونکە گوتەی تەمەنم پیتێـك لـە گوتەی عومرم زیاترە، گوتەی (عومرم) و (دەمرم) لە فۆنیمی (ر،م) دا هاوقافیەن، بەڵام وشەی (تەمەنم) تەنها بەفۆنیمی (م) خۆی هاوقافیە دەکات. کەواتە وشەیەك چەند پیتێکی دووبارەبێتەوە جوانترو مۆسیقادارتر دەبێت نەك بەیەك پیت.

گۆران لەم دێڕە شیعرەدا دەڵێت:

**لەبەر یەك لوقمە، یەك پل گۆشتی مەعسووم،**
**منت بۆچ کرد لەنووری دیدە مەحرووم؟** (٢٩)

دوو وشـەی بێگانـە سـەروای دەرەکییـان دروسـت کـردووە، شـاعیرانی کلاسـیکی وشەکانی سێ چوار زمانیان بەکار هێناوە بۆ هۆنینەوەی شیعرەکانیان، ئـەم وشـە بێگانانە هاوکارییەکی باشی شاعیران بووین بۆ رسکاندن و خوڵقاندنی قافیـەی زۆر بۆ شیعرەکانیان .

**٦- ڕۆڵی وشە هاوواتاکان لە جوانکردنی شیعری ئازاد دا**

کە دەڵێین شیعری ئازاد زۆر جار هەنـدێ کـەس بەهەڵـە وا دەزانـن شـیعرێکە هـیچ مۆسیقاو ئیقاعی تێدا نییە، شیعری ئازاد پەیوەست نییە بە کێشی عەرووزو کێشی

برگـەی تەواو،بـەڵکو پـشت بەکێـشی هەمـەڕەنگ دەبەسـتێت، زۆرجـار دەبیـنین کێشێکی کەم و کـزی تێدایـە قورسـاییەکان دەکەونـە سـەر مۆسـیقای نـاوەکی و وێنەی شیعری بـەرز، چـونکە جیـاوازی سـەرەکی نێـوان شـیعری ئـازادو پەخـشان تاڕادەیەکی زۆر مۆسیقایە، شـیعری ئـازاد جـۆرە مۆسـیقاو ڕێکخـستنێکی تێدایـە، خوێنـەر هەسـتی پێـدەکات، هەرچـەندە پەخـشانی سـەرواداریش هەیـە، بـەڵام سیماکانی دیارەو هەر لەشیعر جیاوازە، پەخـشانە شـیعریش تێکـەڵکردنی شـیعرو پەخـشانە لـە ناوەکەشـیەوە دیارە،واتـا کـاتێ پەخـشانە شـیعرێك دەخوێنیتـەوە هەست دەکەی لە هەندێ جومگە و شوێن شـیعرە دواتـر دەبێتـەوە پەخـشان، جـا شـەرت نییـە بەهـەمان ئەنـدازە تێکـەڵی یـەك بـن زۆرجـاریش دەبیـنین کەسـێك پەخشانێك بڵاو دەکاتەوە کە هیچ سیماو ڕەگەزێکی شیعری تێدا نییـە، کـە ئەمـە تەنها پەخشانە، بەڵام نووسەرەکەی بەپەخشانە شیعری لـە قەڵـەم دەدات، دیـارە لەمەشیان بەهەڵەداچووە.

لەشــیعری ئــازادیش وشــەی ئــاوازەدارو مۆســیقی ڕۆڵــی خــۆی دەبینێــت لەڕسکاندنیدا، شاعیر بەهەڵبژاردنی وشەیەکی مۆسیقادار لە بەرانبەر وشەیەکی تـر شیعرەکەی جوان دەکات:

عەبدوللاپەشێو لە شیعری (هیوا) دا دەڵێت:

**لە کاتێکدا**

**لە سەرەوە لە لووتکەکان،**

**تۆف و زریان لە دەوەن و داران وەردێن**

**خەمت نەبێ**

**لە بنەوە گیای نەوخیزەو گۆپکە دەردێن** [30]

((زۆرجار سـەیر دەکـەین کـە دوو دێـڕە قـسە دەکێـشین دەبیـنین لـەژمارەی برگەو ڕێکخستنی کورتی و درێژی برگەکاندا واتا لەکێشدا وەکـو یەکن،بـەڵام زەوق و شەوقێکی مۆسیقا پێك ناهێنن، کێشانەکەیان مەکینە بابەتە ... بۆیە کێش بەبێ مۆسیقا ناتەواوە)) [31] هێزی مۆسیقا بەخـشین و جـوانی ئـەم شـیعرە لـە هـەردوو وشـەی ( وەردێـن)و (دەردێـن) دایـە، چـونکە هەریـەك لـەم وشـانە لـە دوو برگـە پێکهاتوون لەپیتی (ر،د،ێ،ن) یەك دەگرنەوە ئـەم شـیعرەی بـەجوانی ڕاگرتـووە،

ئەگەر لەبری وشەی (دەردێن) وشـەی (دەڕوێـن) بـەکاربهێنین ئـەوا هـیچ لـەجوانی شـیعرەکەش کـەم نابێتـەوە، چـونکە هـەمان مانـای هەیـەو هـەمان مۆسـیقاش دەبەخشێت،بەلاّم ئەگەر موڕادیفاتی ( پەیدا دەبن، شـین دەبـن، سـەر دەردێـنن) بـەکاربهێنین، ئـەوا دەتـوانم بڵـێم تـا ئەندازەیـەکی زۆر ئـەم شـیعرە لەشـیعرییەت دەکەوێت و سیماو جوانی خۆی لەدەست دەدات شیعرەکە وەهای لیّ دێت:

**له کاتێکدا**

**لەسەرەوە له لووتکەکان،**

**تۆف و زریان له دەوەن و داران وەردێن**

**خەمت نەبیٚ**

**لەبنەوە گیای نەوخیزەو گۆپکە پەیدا دەبن ( شین دەبن)**

دیارە ئاشکرایە بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی تر دەبینین بەم گـۆڕینی وشـەیە تـا چ ئەندازەیەك شیعرەکە دەشێوێت.

**٧- بەکارهێنانی وشەی نویٚ لەبری وشە کۆنەکان**

وشەی نـویٚ، بـەواتای ئـەوە نایـەت شـاعیر خـۆی بـیر بکاتـەوەو وشـەی نـویٚ دابڕێـژێت و وشـەیەك بـەکاربهێنێت کـە هـیچ کەسـێك لـە میللـەتی کـورد بـەکاری نەهێنابێت، بـەڵکو بـەو مانایـە شـاعیر هەوڵـدەدات هەنـدیٚ لـەم وشـانە وەدەسـت بهێنێت کە پێشتر کەم بەکار هاتوون یاخود لەزمانی ئاخاوتن بـەکار هـاتبن، بـەلاّم لە دەقێکی شیعریدا بەکار نەهاتبن، یاخود موڕادیفاتی ئەو وشانە بەکار بهێنێت کە بەکار نەهاتوون،چونکە بەکارهێنانی وشـەی نـویٚ بـۆ شـیعر وەك جـل و بـەرگێکی نویٚ و جوان خۆی نیـشان دەدات، چـونکە نوێبوونـەوە لەزمانـدا نایـابی بـە شـیعر دەبەخشێت.

بـۆ نموونـە (شـێرکۆ بێکـەس) لەڕۆمانەشـیعری گۆڕسـتانی چـراکاندا کۆمـەڵیٚ وشەی نوێی بەکار هێناوە کـە لـە ئـەزموونی شـیعری پێـشتر ئـەم وشـانەی بـەکار نەهێناوە، واتا دوای ئەزموونی چل ساڵ شیعر نووسین کەپەیتاپەیتا له هەر دیوانە شیعرێك شاعیر چەند وشەیەکی نوێی هێناوەتە ناو دەقەکان، بۆ نموونە لە ڕۆمانـە شیعری گۆڕستانی چراکان ئەم وشانە هاتوونەتە کایەوە دەیانخەینـە ڕوو (گـرەژۆ:

گەلاڕێزان، گراگڕ: گڵپەو بڵێسە، گژگژە:پووش و پەلاشی بابردوو، چکچکە: دەنگی دڵۆپەی ئـاو، گاپێـڵ : پێـچی پەناگـەو گـەوەی شـاخ، گـراداڤ: گێـژەنی ئاو،گـارۆ: هێلانەی مەل لە کونی داردا، توتاك: کۆتر: قومری، پژاڵ: لکـی هـەرە بـاریکی دار، مەڕاڵ: ئاسك –مامز، دەوال: دزی شەوانە،/ تروم: نەژاد،ڕەگەز: بنەچـە،/ئەسـیار، ئێــشکگری کــاوان،/ زیگــار: شەونــشینی: شــەوارە: بێــداریو نەنوســتن و مانەوەلەشەودا، .....هتد ئەم وشانە ڕۆڵێکی زۆریان بینیوە لە جوانکردنی ڕۆمانـە شیعری گۆڕستانی چراکان.

شێرکۆ بێکەس لەم کۆپلەیەدا دەڵێت:

**ئەڵێن ژنێکی گەرمەسێر**
**داویەتیە دەشت**
**بووە بەگڕی بێ داڵدەو**
**بەتەوارێکی شێت و وێت**
**ئەڵێن بووە بەزیگاری**
**سەرقەبرانی باڵندەکان**
**بووە بە زێوانی گردی**
**دار چوالە جوانەمەرگەکان.** (٣٢)

لەم کۆپلە شیعرەدا تەنها وشەی ( زیگار) نوێیە پێشتر لە شـیعردا بەرچـاومان نەکەوتووە،ئەم وشە کوردییە لەبری وشەی شەونشینی ( شـەوارە) بـەکارهاتووە، بــەلام شــەوارەو شەونــشینیمان زۆر بیــستووە، وشــەی (زیگــار) جــوانتر دێتــە بەرچاو،بووە بەجل و بەرگێکی نوێ بۆ ئەم کۆپلە شیعرە،ڕەنگە ئەم قسەیەی مـن نزبی بێت بەلای کەسێکی ترەوە وشەی شەونشینی جوانتر بێت، یان بڵێت هەرکام لــەم وشــانە بــەکاربێت هــیچ لــە باســەکە ناگۆڕێــت، بــەلام ئەوانــەی شــیعر زۆر دەخوێننەوەو چێژی لێ وەردەگرن، ئەوەیان لا ڕوونە وشەی ( زیگار) لەبەرئەوەی تازە بەرچاو کەوتووە، بەلام دوو وشە هاوواتاکانی تر بەدەیان جار لەدەیان شـیعر بینراون و بیستراون.

شێرکۆ بێکەس لە کۆپلەیەکی تردا دەڵێت:

**من بۆخۆم قیژەی ناو چاڵ و**
**من ڕەنگی شەوی دڕندەو**
**من بۆنی جەستەی پاسفندەی**
**بەردەم سەگە ڕەشی ئەویّ و**
**ئافاتەكەی سیاساڵ بووم!** (٣٣)

لەم كۆپلەیەدا وشەی ( پاسفندە) لەبری وشەی ( ڕزیو) هاتووە، سیمایەكی كاریگەرو جوانی بەم كۆپلە شیعرە بەخشیوەو ڕەونەقداری كردووە.

ئەمە تەنها چەند نموونەیەكی بچووك بوون خستمانە ڕوو، بەڵام لەخوێندنەوەی تەواوی ڕۆمانە شیعری گۆڕستانی چراكان ئەو جوانییەمان بۆ دەردەكەوێت كە نزیكەی (١٥–٢٠) وشەی نوێی تێ كەوتووە، كە سیماو ڕوخسارێكی جوانی بەم ڕۆمانە شیعرە بەخشیوە.

**٨– چڕكردنەوەی مەفهوومێك لەنێو وشەیەكدا**

دۆزینەوەی ئەم وشانەی كەوا مەفهوومی چەمكێك دەبەخشن بۆ شیعر زۆر گرینگە، چونكە شیعر زمانی چڕكردنەوەی مانایە، لەم ڕوانگەیەوە شێركۆ بێكەس وشەی نوێی بەكار هێناوە وشەی وا كەپێشتر لە شیعر بەكار نەهاتووەو ئەم وشانەش مەفهوومێك ڕوون دەكەنەوە، بۆ نموونە وشەی (گارۆ) بەواتای هێلانەی مەل لە كونی داردا بەكاردێت، شێركۆ بێكەس لەم كۆپلەیەدا دەڵێت:

**بەچریسكەوە باڵ لێك ئەدەم و**
**كەڕەتێكی تر ئەبمە پەپووی وێرانەخاك و**
**لەناو گارۆی**
**درەختی گریاندا هەڵدەنیشم...** (٣٤)

وشەی (( گارۆ )) وشەیەكی نوێیەو هەڵگری مانای ( هێلانەی مەل لە شەقارو كونی دار دەگەیەنێت) واتا هاوواتاكە وشە بەوشە نییە، بەڵكو (گارۆ) چەمكێكی ڕوون كردۆتەوە، بەرامبەر وشەی گارۆ وشەی ترمان نییە، تەنها مەفهووم و ماناكەمان هەیە.

لەنموونەیەكی تردا شێركۆ بێكەس دەڵێت:

**لەسێهەمدا نامەی کچێ**
**کە پڕیەتی لەپەلکە گیا و لە شەونمی حەرف و**
**لە زەنگیانەی پڕشنگ و**
**بووە بە بالیفی خەیاڵێکم و**
**شەوانە پڕاڵی تەنیایی لەسەر ئەڕوێ!** (٣٥)

لەم کۆپلەیەدا شاعیر وشەیەکی لەبری مەفهوومێك بەکار هێناوە، وشەی (پـڕاڵ) ی بـەکارهێناوە کـە مانـای لکـی هـەرە بـاریکی دار دەگـەیێنێ، زمـانی شـیعریش چڕکردنەوەی مانایەکی زۆرە لە وشەی کەم، واتە ئەو موڕادیفە مەفهوومێك لەخۆی چڕ دەکاتەوە.

بەم شێوەیە دەبیـنین وشـە هاوواتاکـان ڕۆڵێکـی بـەرز دەبیـنن لـە بەخـشینی مۆسیقای ناوەکی و دەرەکی شیعرو لە نوێکردنەوەی قاوغ بەرگی شیعر لە هـەموو سەردەمەکان، شاعیری سەرکەوتوو ئەو شاعیرەیە کە لەنێو دەریـای زمانـدا قـووڵ بێتەوەو وەك نەزار قەبانی دەڵێت: بەردەوام قولاب بۆ ئەو ماسییانە هەڵبـدات کـە نەیگرتوون.

**ئه نجام:**

- وشــه هاوواتاکــان ڕۆڵێکــی زۆر دەبیــنن لــه بەخــشینی مۆســیقای نــاوەکی و مۆسیقای دەرەکی شیعر.
- جووته وشەی هاوواتا زۆرجار بەتەك یەکدا هاتوون لەو کاتەی کـه ئاوازەکانیـان وەك یەك بن، بۆ جەختکردنەوە و بۆ پیشاندانی مۆسیقای شیعری.
- وشەی بێگانه له شیعری کلاسیکی ڕۆڵی زۆری بینیوه،لەو کاتـەی لـەبری وشـه خۆماڵییــەکان بــەکار هــاتوون، مۆســیقای نــاوەکی و دەرەکییــان بەشــیعر بەخشیوه.
- وشه هاوواتاکان له شیعری ئازادیش ڕۆڵی جوانکاری خۆیان نواندووه.
- بەکارهێنانی وشەی نـوێ لـەبری وشـه کۆنـەکان هەمیـشه وەك بـەرگێکی نـوێ دەقەکه دەپۆشن و نوێی دەکەنەوه بەڕووێکی جوان خۆی نمایش دەکات.
- زۆر جـار شـاعیر وشـەیەك بـەکار دەهێنێـت کـه پێـشتر بـەکار نـەهاتبێت ئـەم وشەیەش مەفهووم و چەمکێك ڕوون دەکاتەوه.

## پەراوێزەکان :

١- نەزار قەبانی: ١٩٤
٢- پەروین عثمان عەلاف: ٨١
٣- عوسمان دەشتی(د)، شاگوڵ قوباد سلێمان: ١٥
٤- دڵشاد عەلی (د):٨٩
٥- محەمەدی مەحوی:٨٣
٦- محمد معروف فتاح:١٢٨
٧- محەمەدی مەحوی:٨٣
٨- محمد معروف فتاح: ١٢٨
٩- نالی، (دیوان) : ٤٤
١٠- دکتر کاوس حسن لی: ١٠٤-١٠٥
١١- پەخشان عەلی ئەحمەد:ل١٣٢
١٢- احمد نصیف الجنابي :١٠٧
١٣- ڕەسوڵ سوڵتانی :٣٦
١٤- مەحوی (دیوان):١٢٢
١٥- لەتیف هەڵمەت:١٧
١٦- احمد نصیف الجنابي : ص ١٠٧
١٧- سامان عزەدین :٣١٣
١٨- عەزیز گەردی:٧٨٧
١٩- مەحوی (دیوان):٢١٧
٢٠- س.پ.ل٢٢٢
٢١- عبدالرزاق بیمار:١١
٢٢- ناز ئەحمەد سەعید:٦٨
٢٣- عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا: ١٠٠
٢٤- فضل حسن عباس: ٣٠
٢٥- شێخ نوری شێخ ساڵح (دیوان) : ٣٦٩
٢٦- حاجی ئیبراهیمی شاتری: ٨٤

٢٧- عەزیز گەردی: (سەروا): ٣٩

٢٨- مەحوی (دیوان) : ٢٢٠

٢٩- گۆران: ٩٨

٣٠- عەبدوڵلاّپەشێو : ١٢

٣١- عبدالرزاق بیمار: ٩

٣٢- شێرکۆ بێکەس: ٦٠-٦١

٣٣- س.پ: ٣١

٣٤- س.پ.:١٥

٣٥- س.پ:١٨

## سەرچاوەکان

**١- کتێب: -أ- کوردی:**

- دڵشاد عەلی (د)، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا،چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی،١٩٩٨.
- نزار قەبانی، و.طه بابان، کۆمەڵە وتارێکە لە نووسینی نزار قەبانی، چاپخانەی داناز، سلێمانی،٢٠٠٠.
- نالی،(دیوان)، مەلا عبدالکریم مدرس و فاتح عبدالکریم،چ(٤)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،١٩٧٦.
- پەخشان عەلی ئەحمەد، شێوازی شیعری گۆران، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩.
- مەحوی (دیوان)، مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم، چ(٢)، چاپخانەی (حسام).
- شێخ نوری شێخ ساڵح (دیوان)، ئازاد عبدالواحید کۆی کردۆتەوەو ساغی کردۆتەوەو لەسەری نووسیوە، ب ١، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٨.
- عەبدوڵڵاپەشێو، بەرەو زەردەپەڕ، چ١، سوید،٢٠٠١.
- عەزیز گەردی، سەروا، چ١، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.
- عەزیز گەردی، ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- عبدالرزاق بیمار، کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی، چ١، چاپخانەی دار الحریة، بغداد،١٩٩٢.
- عوسمان دەشتی (د.)، شاگوڵ قوباد سلێمان، شنەی هەیبەسوڵتان، کۆبەرهەمی شیعرو نووسینەکانی جەلال جۆبار، چ١، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر،٢٠١٠.
- لەتیف هەڵمەت، دیوانی لەتیف هەڵمەت، ب١، چ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- شێرکۆ بێکەس، گۆڕستانی چراکان (ڕۆمانە شیعر)، چ٢، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

– حاجی ابراهیمی شاتری، دیوانی جاف، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی، بغداد، ١٩٨٩.
– گۆران، دیوانی گۆران، ب١، مطبعة المجمع العلمي العراقي، ١٩٨٠.
– سامان عیزەدین، بنیاتی هونەریی لەشیعری لەتیف هەڵمەت دا، چاپخانەی كەمال، سلێمانی، ٢٠١٠.
– محمد معروف فتاح، زمانەوانی، چ٣، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١١.
– محەمەدی مەحوی، زانستی هێما  هێما، واتاو واتا لێكدانەوە، بەرگی دووەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٩.

ب– عەرەبی:

– احمد نصيف الجنابي، في الرؤيا الشعرية المعاصرة، دار الحرية للطباعة، بغداد، د.ت.
– فضل حسن عباس، البلاغة فنونها وافنانها ( علم البيان والبديع)، دار الفرقان للنشر، عمان، ١٩٨٧.

ج– فارسی:

- دكتر كاوس حسن لی، گونەهای نـوآوردی در شعر معاصر ایران، چاپ اول، انتشارات:ثالث، تاران، ١٣٨٣.

٢–گۆڤار

– ڕەسولّ سوڵتانی، خەڵات، گ (ژنان)، ژ (٢٣)، ڕەزبەری ١٣٨٨.

٣ – نامه زانكۆییەكان:

– عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا، شیكردنەوەی شیعر له ڕووی زمانەوانییەوە، ماستەر، زانكۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٧.
– ناز ئەحمەد سەعید، لادان له شیعری لەتیف هەڵمەت دا، ماستەر، زانكۆی سلێمانی، ٢٠١٠.
–پەروین عثمان عەلاف، واتاو وەرگێڕان، لێكۆڵینەوەیەكی واتاسازییە، نامەی ماستەر، زانكۆی كۆیە،كۆلیژی زمان، ٢٠٠٨.

## ملخص البحث

اللغة أداة ومكونة رئيسية للشعر، لما يوحى الى الشاعر عن طريق اللغة، يحرر نفسه ويبدي مشاعره، وأستعمال المشاعر والألفاظ المترادفة والجديدة تجعل أشعاره أكثر جمالاً .

وهذا البحث الموسوم بـ : ( وظيفة الألفاظ المترادفة ) يكون في خدمة نظم الشعر وتجميله، ويتكون من مقدمة وفصلين :

**الفصل الأول :**

١. التعريف ومفهوم الكلمة المترادفة .
٢. أسباب تكوّن الألفاظ المترادفة .
أ. الظاهرة اللغوية نفسها .
ب. وجود لهجات مختلفة في لغة واحدة .
ج. دخول ألفاظ أجنبية الى لغة الأم .

**الفصل الثاني :**

١. دور الكلمات المترادفة في تزيين الموسيقى الداخلية للشعر وتجميله .
٢. دور الكلمات المترادفة الزوجية في تزيين الموسيقى الداخلية للشعر وتجميله.
٣. دور الكلمات الأجنبية في تزيين الموسيقى الداخلية للشعر الكلاسيكي وتجميله .
٤. دور الكلمات المترادفة في تزيين الموسيقى الخارجية للشعر وتجميله .
٥. دور الكلمات الأجنبية في صنع قافية الشعر.
٦. دور الكلمات المترادفة في تجميل الشعر الحرّ .
٧. أستعمال الكلمات الجديدة بدلاً من الكلمات القديمة .
٨. تكثيف المفهوم في الكلمة من كلمات تركيب ما وفي الختام عرضنا بعض نتائج مع ذكر المصادر والمراجع التي أفادت البحث، كما قدمنا ملخصا للبحث باللغتين : العربية والأنجليزية .

# Abstract

Language is an element of poetry . when a poet receives an inspiration of a poem , he resorts to language to release this feeling. The more the poet is familiar with the new words and their synonyms, the more powerful and beautiful his poem will be. Hence, this study is intended to tackle synonyms as a decorative means of the poetic art. It consists of an introduction and two chapters:

**Chapter one :**

1. The definition and the concept of synonyms .
2. Why do synonyms arise?

A. The phenomenon of self linguistics .

B. The existence of various dialects within a Language .

C. Borrowing foreign words.

**Chapter two :**

1. The synonyms role in decorating internal poetic rythm .
2. The role of dual synonyms in decorating internal poetry rhythm.
3. The role of foreign words in decoration internal music( rhythm) of classic poetry .
4. The role of synonyms in decorating external poetic rythm .
5. The role of foreign words in making up the rhyme of poetry .
6. The role of synonyms in decorating blank verses .
7. Using new words instead of old ones .
8. This study ends with some conclusions and the used sources as well as Arabic and English abstract ?

# لایەنی نەرێنی هەست دەربڕین
# لە زمانی کوردیدا (جنێودان) بە نموونە

د. شلێر ڕەسوول بەرزنجی
کۆلێژی زمان – بەشی زمانی کوردی

## پێشەکی

لێکۆڵینەوەکە بە ناونیشانی (لایەنی نەرێنی هەست دەربڕین لە زمانی کوردیدا، جنێودان بە نموونە)یە، لێکۆڵینەوەیەکی شیکارییە، فراوانی ناو نیشانەکە وا دەخوازێ، کە بە پلە یەك سوود لە هەردوو ئاستی ڕێزمانی زمانەکە (مۆرفۆلۆژی و سینتاکس) وەربگیرێت، هەرچەندە دەتوانرێ لە بواری تریش لێك بدرێتەوە، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێکهاتەی جنێودان قاڵبی جیاجیا وەردەگرێ و پێکهاتەکان لە شێوەی وشە و گرێ و ڕستە و ئیدیۆمدا دەردەکەون، ئەمانەش پێویستییان بەوە هەیە، کە شیکردنەوەی جۆراوجۆریان بۆ ئەنجام بدرێت و لە بواری جیا جیادا لێکبدرێنەوە.

هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە جنێودان شێوازێکی بەر بڵاوە و لە ئاخاوتنی ڕۆژانەدا زۆر بەکاردێت، بەڵام تا ئێستا لە زمانەکەدا لە هیچ ڕووێکەوە نە لابەلاو نە لە دووتوێی باسێکی تایبەتدا لێی نەکۆڵدراوەتەوە، بۆیە بە پێویستمان زانی، کە ئەم شێوازەش وەك هەر بابەتێکی تری زمانی شیکردنەوەیەکی ورد و زانستییانەی بۆ ئەنجام بدەین.

گرفتی لێکۆڵینەوەکە لەوەدا بوو، کە هیچ سەرچاوەیەکی تایبەت بە بابەتەکە لەبەر دەستدا نەبوو، جیا لەوەش لەبەر فراوانی بابەتەکە نەمانتوانی لە شیکردنەوەدا تەنیا پشت بە ئاستێکی زمانەوانی ببەستین. هەروەها بابەتەکە پێویستی بە شیکردنەوەی گەلێ لایەنی تر هەیە، بەڵام ئێمە تەنیا لە ڕووی زمانەوانییەوە لێکدانەوەمان بۆ ئەنجامداوە.

سنووری لێکۆڵینەوەکە لە چوارچێوەی زمانی کوردی — زاری ناوەڕاستدایە، لەبەر ئەوەش کە جنێودان وەك شێوازێکی ئاخاوتن هەمیشە بەسەر زاری ئاخێوەرانەوەیە بۆیە هەوڵ دراوە، کە بە شێوەیەکی گشتی نموونەکان لە ئاخاوتنی ڕۆژانەدا وەربگیرێن.

لێکۆڵینەوەکە لە ژێر ڕۆشنایی ڕێبازی وەسفی شیکاری ئەنجامدراوە.

ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێکهاتووە:

- بەشی یەکەم ئەم بابەتانە لەخۆ دەگرێت:

سەرەتا، چەمك و پێناسەی جنێودان، جنێودان لەڕووی زمانەوانییەوە، کەرەسەکانی جنێودان، جنێودان و ڕەگەز، ئاستەکانی جنێودان، جۆرەکانی جنێودان، هۆیەکانی دروستبوونی جنێو.

- بەشی دووەم ئەم ناونیشانانە دەگرێتەخۆ:

ڕۆنانی پێکهاتەی جنێودان بەپێی ئاستەکانی زمان، فۆڕمەکانی پێکهاتەی جنێودان، جنێودان و ئاستی مۆرفۆلۆژی، ئەو پارتیکل و مۆرفیمانەی کە بەشداری لە پێکهاتەی جنێوداندا دەکەن، پۆلینی سینتاکسی پێکهاتەی جنێودان، پێکهاتەی جنێودان و ئاستی دەنگسازی.

# بەشی یەکەم

## سەرەتا

بەکارهێنانی زمان پابەندە بە چەند دەستوور و یاسایێك، ئەم دەستوور و یاسایانەش دوو جۆرن، جۆرێکیان بەندە بە ڕۆنانی زمان خۆی: دەنگەکان، ڕێزمان، جۆرێکی تر بەندە بە بەکارهێنانی فیعلی زمان، کە دەستوورە کۆمەڵایەتییە دانراوەکان دەگرێتەوە، لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، هەتا ئەگەر هەردوو کۆمەڵگاش یەك زمان بەکار بهێنن، تاکەکانیش لە هەر کامیان بن، دەبێ پابەند بن بە یاسا و دەستوورەکانی ئەم کۆمەڵگایە، بۆ ئەوەی بە مرۆڤێکی پەسەند لە قەڵەم بدرێن. (خرما، ل ٢٤٤، ١٩٧٨).

زمان هەڵقوڵاوی ژیانی کۆمەڵایەتییە و وەك سیستەمێك لەناو کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا ئەرکی جیاجیا دەبینێت.

مەبەست لە ئەرکەکانی زمان ئەو کارانەن، کە مرۆڤ بەهۆی زمانەوە لە کۆمەڵدا جێبەجێیان دەکات، ئاشکرایە ئەم کارانە زۆر ئاڵۆز و وردن هەروا بە ئاسانی پۆلێن ناکرێن، بەگشتی زۆربەی زمانەوانان دەیکەن بە حەوت جۆرەوە، زانیاری و هەواڵ گەیاندن، پرسیار کردن، هەست دەربڕین، ورووژاندن، فەرماندان، ڕاپەڕاندن، جێ خۆشکردن. (فتاح — ٢٦ — ١٩٩٠).

ئەو ئەرکە جیا جیایانەی کە زمان دەیانبینێ لە ڕوانگەی قسەکەرەوە دەستنیشان دەکرێن، ستراتیژیەتی بەکارهێنانیش لای تاکەکان شێوازی جیا جیا دەگرێتەخۆ.

لە ئەرکی هەست دەربڕیندا گوتن دەربارەی هەستی قسەکەرە و دەربارەی خۆی یا دیاردەکانی دەوری خۆیدا دەبێ بە شێوەیەکی سەلبی یا ئیجابی. (فتاح — ٢٨ — ١٩٩٠).

ئەو کەرەسە زمانییانەی کە بۆ جنێودان بەکاردێن دەچنە قاڵبی ئەو ڕستانەی کە بە مەبەستی هەست دەربڕین بە شێوازی نەرێنی بەکاردێت، تاکەکانی کۆمەڵ لە کاتی دیاریکراودا پەنای بۆ دەبەن، بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە لەلایەن قسەکەرەوە هەستی دەورووژێنرێ کە (هەست ورووژاندنیش دوو لایەنە سەلبی و

ئیجابی) ئینجا ئەگەر هەست ورووژاندنەکەش بە لایەنی سەلبی بوو ئەوا کاردانەوەی خراپ لە کەسی بەرامبەردا دروست دەبێت و لە ئاکامدا هەڵچوون و جنێودان دێتە ئاراوە.

جنێودان وەنەبێ، تایبەت بێ بە نەتەوەیەك، بەڵکو لە هەموو جیهاندا ئەم دیاردەیە بەرچاو دەکەوێ و شێوازی جیاجیا دەگرێتە خۆ، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە بە دیاردەیەکی قێزەون لە قەڵەم دەدرێت و لە نرخ و بەهای کەسی جنێودەر کەم دەکاتەوە.

**چەمك و پێناسەی جنێودان:**

جنێودان: بریتییە لەو گوتە ناشیرنانەی، کە بۆ زەمکردن و نزمکردنەوەی بەهای مرۆڤ بەکار دەهێنرێ لە قسەکەرەوە بۆ کەسی بەرامبەر (گوێگر).

جنێودان ئەو گوتانەن کە ئازار بەکەسی بەرامبەر دەگەیەنن، جنێو پێدراو هەست بە ئیهانەکردن دەکات بۆیە زۆربەی کات کاردانەوەی سەلبی دەبێ لەسەری و بەهەمان شێوە وەڵامی دەداتەوە و دەبێ بە دەمە دەم و کەسیان ناتوانێ قبوڵی بەرامبەری خۆی بکات، ئەمەش ڕەنگە زۆر جار کێشەی گەورەی لێ بکەوێتەوە.

**جنێودان لەڕووی زمانەوانییەوە:**

وشەی جنێو لە زمانی کوردیدا بەچەند شێوەیەك دەردەکەوێت، وەك:

جنێو – جوێن – دژمان – سخێف – خەراو

وەك چاوگیش (جنێودان، جوێندان، سخێف گوتن)

وەك کەسێکیش، کە بە کارەکە هەڵسێ وشەکانی (جنێو فرۆش – زمان پیس – جوێندەر – سخێف بێژ). (هەژار ل ١٨٤، ١٩٢، ٢٠٠٢).

لە زمانی فارسیشدا بەم شێوەیە بەکارهاتووە:

دشنام ⟵ جنێو

دشنام دادن ⟵ جنێودان

بد زبان ⟵ جنێودەر (هەمان سەرچاوەی پێشوو)

لە زمانی عەرەبیشدا هەردوو زاراوەی (السب و الشتم – لە یاساشدا – قذف–) بەکاردێ و لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم دوو زاراوەیە نابینرێت[1].

**کەرەسەکانی جنێودان:**

ئەو وشە و زاراوانەی کە ئەم دیاردەیە دروست دەکەن بریتین لە:

١– **جنێو:** بەو کەرەسە و گوتە ناشیرینانە دەوترێ، کە لەناو کۆمەڵگادا بەمەبەستی جنێودان بەکاردێن و هەندێکیشیان بە کەرەسەی قەدەغەکراو (تابوو) ناو دەبرێن و لە کەسی قسەکەرەوە بەرەورووی کەسی بەرامبەر دەکرێ بەمەبەستی سووکایەتی پێکردنی، ئەم گوتانەش بەپێی کەس و کۆمەڵگا و سروشتی قسەکەر و جۆری پەروەردەکردنی و ....... تد دەگۆڕێت، وەك:

کەرە ⟵ (کەر) کەرەسەی جنێوە.

٢– **جنێودەر:** ئەو کەسەیە، کە بە کاری (جنێودان) هەڵدەستێ.

٣– **جنێوپێدراو:** ئەو کەسەیە کە جنێوەکەی ئاڕاستە دەکرێ، گرنگ نییە لە ڕەگەزی نێر یا مێ بێ و مەرجیش نییە هەموو کاتێ بەرامبەر بێ، چونکە جاری وا هەیە کە جنێو ئاڕاستەی کەسی سێیەمیش (بە تاك و کۆیەوە) دەکرێت، بێ ئەوەی ئاگای لە هیچ بێت واتە کەسی (دووەم و سێیەم) جنێوی ئاڕاستە دەکرێت، کەم جارێکیش جنێودەر هەر خۆی جنێوەکە ئاڕاستەی خۆی دەکات بەلاّم ئەمەیان زۆر بەربلاّو نییە و لەو کاتانەدا دەبێت، کە زۆر تووڕە دەبێت لە بەرامبەرەکەی و لەبەر خۆیەوە

[1] ابن المنظور، ص ٢٨، ٤٥٩، ٢٠٠٣ – ابن الحسين، ص ٥٥١، ٢٠٠٨ – الجوهري، ص ٤٦٨ – مصطفى عبدالقادر وآخرون ص ٤١١، ١٩٧٢.

سەرزەنشتی خۆی دەکات بە جنێو وەك: (مـن سـەگبابم، مـن بـێ عـەقڵم ........... تد).

**جنێودان و ڕەگەز:**

جنێودان وەك دیاردەیەك لـەنێوان هـەردوو ڕەگـەزی نێـر و مێـدا بـەکاردێت، جیاوازی لەوەدایە، کە بە شێوەیەکی گشتی، جنێودان لە نێـوان ڕەگـەزی نێـرەوە زیاترە وەك لە ڕەگەزی مێدا، ڕەنگە ئەمـەش بـۆ ئـەوە بگەڕێتـەوە، کـە سروشـتی ڕەگەزی نێر سرکترە و ڕادەی توورەیی و هەڵچوونیان زیـاترە، بێجگـە لەمـەش لـە کۆمەڵی ئێمەدا ڕەگەزی نێر زیـاتر سـەر بـەدەرەوەن و هاتوچـۆیان زۆرە و لەگـەڵ هەموو جۆرە کەسێك تێکەڵ دەبن و ئاشکراشە، کە لەناو کۆمـەڵگادا خووڕەوشـتی جیاجیا هەیە، کە جاری وا بووە ڕووداوێکی زۆر بچووك لەگەڵ یەکێك، کە تـووڕە و لەسەر بووبێت کێشەیەکی گەورەی ناوەتەوە، بێجگە لەمـەش سروشـتی کـارکردن بەکۆمەڵ لە کۆمپانیاکان و شوێنی تر جاری وادەبێت لە ئەنجامی دەمەقاڵی لەگەڵ یەکتری ئەم شـێوازە دروسـت ببـێ، بـەڵام بـە پلـە یـەك دەوەسـتێتە سـەر ڕادەی ڕۆشنبیری کەسەکان خۆیان لە هەردوو ڕەگەزدا.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە دیاردەی جنێودان لـە نێـوان ڕەگـەزی مێـدا نییـە، بەڵکو جاری وا هەبووە شەڕە جنێوی زۆر سەخت لەنێوان ئافرەتانـدا ڕووی داوە و جاری واش بووە کێشەی گەورەی لێ کەوتۆتەوە و کەم جـاریش بـووە، کـە خـوێن ڕشتنی بە دواوە بووە.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێـت، کـە لـەڕووی پێکهاتـە و گوتـەکانی جنێودانـدا ئافرەتان جیاوازن لەگەڵ ڕەگەزی نێردا، بەوەی، کە زۆر جـار ئـەم ڕەگـەزە نـاو و ناتۆرەی ناشیرین بـۆ یـەکتری دەدۆزنـەوە و جـاری واش دەبێـت گرفتەکـە گـەورە دەکـەن و ڕەگـەزی بەرامبـەر وەك (بـاوك و بـرا و خـاڵ ......تـد) دەچـنە نـاوە و کارەساتی گەورەی بەدواوە دێت.

لێرەدا پێویستە ئامـاژە بـەوەش بکرێـت، کـە بەداخـەوە هـەتا لای کەسـانی ڕۆشـنبیریش ئـەم دیاردەیـە لـە کـاتی ئێـستاشدا بـەکاردێت بـەڵام شـێوازێکی تـر وەردەگرێت و تەکنۆلۆجیای سەردەمی تیادا بەکاردێت بـۆ ئـەم مەبەسـتەش چ بـە

نووسین بێ یا بەهۆی شێواندنی وێنە و ئادگاری یەکتری و ڕەفتاری ناشیرین بە بەکارهێنانی ئامێری نوێی سەردەم وەك: (مۆبایل و کۆمپیوتەر............ تد).

دەتوانین بڵێین، کە ئەمەیان تا ڕادەیەك شوێنی ئەو جنێو و قسە ناشیرینانەی گرتۆتەوە، کە لە پێشا لەسەر دیوارەکانی ئاودەستی قوتابخانە و مزگەوتەکان و ...... تد دەنووسران، کە ئەمانە زیاتر قاڵبی جنێوی (نووسراو) وەردەگرن و لەو کاتانەدا پەنای بۆ دەبرێت کە کەسی جنێودەر نەتوانێ بە ئاشکرا بەرامبەر بە کەسی جنێوپێدراو بوەستێ لەبەر هەر هۆیەك بێت.

**ئاستەکانی جنێودان:**

ئەو گوتەو پێکهاتانەی، کە بۆ جنێودان بەکاردێن، هەمووی لەیەك ئاستدا نین لە ڕووی ناشیرینی و سووکی و خەستی بەزاندنی سنوور و داب و نەریتدا، لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە، کە هەموو کاتێك جنێودەر مەبەستی ئەوە نییە، کە بە خەستی هەستی بەرامبەرەکەی بریندار بکات.

زۆر جار کە دوو هاوڕێ یا زیاتر لە شوێنێکدا کۆدەبنەوە، تەنیا بۆ گاڵتەجاڕی و پێکەنین جنێو بە یەکتری دەدەن بێ ئەوەی مەبەستیان نانەوەی کێشەیەك بێت وەك بەکارهێنانی هەندێ پێکهاتەی وەك (درۆزن، نەفام، نامەرد، گێلە، حەیوان...... تد)، کە ئەمەش کاریگەرییەکی وای نابێت لەسەر کەسی بەرامبەر، واتە وەك نەریتێك لەسەری ڕاهاتوون، دەبێ ئەمەش لەیاد نەکرێ کە ئەمە مەرج نییە ڕەفتاری هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ بێ، ئەمەو ڕادەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کاریگەری خۆی لەم بوارەدا هەیە و جۆری پەروەردەکردنی تاکیش لێرەدا دەوری هەیە.

هەندێ جار ڕادەی توندوتیژی لە جنێوەکاندا زیاترە و لە گاڵتەجاڕی دەردەچێت و کاردانەوەیەك لەسەر کەسی جنێو پێدەر دروست دەکات، هەڵچوونی لەگەڵدا دەبێت و لە شێوەی دەمەقاڵێ بەردەوام دەبێت و جنێوەکانیش شێوازێکی ناڕێکتر وەردەگرن، ئەمەش ڕەنگە زۆر جار بەهۆی دەست تێوەردانی دەوروبەر و هاوڕێیان بارەکە ئاسایی بکرێتەوە و لەگەڵ یەکتریدا ئاشتیان بکەنەوە، جنێوەکانیش لەم ئاستەدا وەك (گەواد، سەگباب، بێ ئابڕوو ... تد).

هەندێ جاری تر کردەی جنێودانەکە سیمایەکی جیاوازتر وەردەگرێ و توندوتیژی زۆر دێتە ئاراوە و نەك هەر کاردانەوە و هەڵچوون لای کەسی جنێو پێدراو دروست دەکات، بەڵکو بە هەڵچوونێکی زۆرەوە هەڵوێستی خراپی دەبێ و تا بڵێی جنێوەکانیش شێوازی ناشیرین و پیس دەگرنە خۆیان و جنێودەر پەنا دەباتە هەندێ دەربڕین، کە قەدەغەکراون (تابوون) لەناو کۆمەڵدا وەك بەکارهێنانی (دایك و خوشك و کچی .....تد) جنێوپێدەر وەك هۆکارێك و بەکارهێنانی ئەندامانی زاوزێی هەردوو ڕەگەزەکە، کە ئەمەش دوا پلەی نارێکی کردەکەیە و زۆر جاری واش بووە لە ئەنجامی هەڕەشە و جنێودانی بەم جۆرە کێشەی گەورە دروست بووە، جنێوەکانیش وەك: تۆ ...؟..، دایکت....؟..، خوشکت...؟..، ئەوەی، کە باس کرا زیاتر ڕەگەزی نێر دەگرێتەوە.

**جۆرەکانی جنێو:**

جنێودان وەك دیاردەیەك لەو کاتانەدا پەنای بۆ دەبرێت، کە کەسەکە لەبارێکی دەروونی نائاساییدایە و شتێك لەناخیدا پەنگی خواردۆتەوە و گەیشتۆتە لووتکەی تووڕەیی کە ئیتر ناتوانێ دان بەخۆیدا بگرێت، بۆیە پێویستی بەوە هەیە، کە بەهەر جۆرێك بێت ڕق و کینەی خۆی دابمرکێنێتەوە و دەری بڕێ، لەهەمان کاتدا کاریگەری بەسەر بەرامبەرەکەیدا هەبێ و بیوروژێنێ و هەستی بریندار بکات و ناچاری بکات کە هەڵوێست وەربگرێت.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو گوتە و کەرەسانەی کە وەك جنێو بەکاردێن لەسەر چەند بنەمایەك ڕێك دەخرێن لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر جیاوازە، بەگشتی لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە دروست دەبێت:

١- جۆرێك لە جنێو لەناو کورددا هەیە، کە بەهۆی پەنابردنە بەر ناوهێنانی هەندێ ئاژەڵەوە دەبێت، کە لای ئێمە ناوهێنان و لێکچوواندنیان بەخودی کەسەکەوە بەجۆرێك لە ئیهانە و سووکایەتی پێکردن سەیر دەکرێت، وەك: کەر، سەگ، مەیموون، بەراز .... هتد. بەشێوەیەکی گشتیش وشەی (حەیوان) بەکاردێت، کە ئەمەش لە زمانی عەرەبیدا هاتۆتە ناو زمانی کوردی، لە هەندێ شێوەزاردا هەندێ ئاژەڵی تریش بۆ ئەم

مەبەستە بەکاردێت وەك (حوشتر، قەلەڕەش، کەمتیار، دێڵە بەبا، بارگین، پیسپیسۆك). (هیرانی، ٢٠٠٩، ل ٣٥).

٢- هەندێ جار جنێوەکە ئاماژەیەکە بەو کەموکوڕیانەی، کە لە جەستەی کەسی بەرامبەردا هەیە، کە بەهۆی کەم ئەندامی یا نەخۆشییەکەوە دروست بووە، وەك: شەل، کەڕ، کەچەڵ، کوێر .... تد.

٣- جۆرێکی تری جنێو بەهۆی ئەو کەرەسە و گوتانەوە دەبێت، کە لەلایەن تاکەکانی کۆمەڵەوە بەرامبەر بە سەرۆك و دەسەڵاتداران بەکاردێت بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا دەبێت، کە دەسەڵاتداران لە خەمی میللەتدا نەبن و زوڵم و زۆرداری بەرامبەر بکەن، دەتوانین بە (جنێوی سیاسی) ناوی ببەین، وەك: زۆردار، دکتاتۆر، خوێن مژ، گەندەڵ، جەللاد، خوێن ڕێژ .... تد. ئەم جۆرە جنێوە دەچێتە قاڵبی جنێوی نائاشکرا، چونکە جنێودەر ئەو هێزەی نییە، کە بتوانێ بە ئاشکرا و ڕووبەڕوو جنێو ئاڕاستەی دەسەڵاتداران بکات ئەوە نەبێ، کە هەندێ جار ئەمە بە ئاشکرا بەهۆی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە دەگوازرێتەوە.

٤- هەندێ جار لەنێوان هەندێ چین و توێژدا بە تایبەتی لە لادێکاندا هەندێ گوتەی ناشیرین بەکاردێت، کە لەڕاستیدا گوتەی جنێودانە بەلاّم لای ئەوان ئاکامێکی ئیجابی دەگرێتە خۆو پێچەوانە دەبێتەوە دەتوانین بە (جنێوی پێچەوانە) ناوی بەرین، وەك:

نێرەکەرە ⟵ واتە ئازایە

سەگە ⟵ واتە زۆرزانە

بەرازە ⟵ واتە بەهێزە یا (بە ئاسانی ئاشت نابێتەوە و رقی دانامرکێتەوە)

٥- هەندێ وشە و زاراوە لە زمانەکەدا هەن، کە هەر لە بنچینەدا بەرامبەر بە دیاردەیەکی ناشیرین بەکاردێن و خەڵکی وەك جنێو بۆ سووکایەتی پێکردنی بەرامبەر بەکاری دەهێنن، وەك:

بیژی (زۆڵ)، ڕەدووکەوتوو (بەدووکەوتی).

حەرامزادە، گەلحۆ (هیرانی، ٢٠٠٩، ل ٣٦)

٦- جنێودانی سێکسی: لەم جۆرە جنێودانەدا پەنا دەبرێتە بەر بەکارهێنانی هەندێ وشە و دەربڕین کە لەناو کۆمەڵگادا قەدەغەکراون (تابوو) و دوا پلەی بێ ڕێزی و ریسوایی کەسی جنێوپێدەر نیشان دەدات.

**هۆیەکانی دروستبوونی جنێو:**

لەناو هەموو کۆمەڵێکدا بۆ ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی ژیان بەشێوەیەکی دروست، کە لە بەرژەوەندی گشتیدا بێت، کۆمەڵە یاساو دەستوورێك، کە هەموو بوارەکان بگرێتەوە لە ئارادایە، لێرەوە سنوورێك بۆ ڕەفتار و هەڵسوکەوتی هەموو تاکەکان دادەنرێت، بۆ دابینکردنی خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵ بەگشتی، بەلام لەناو هەموو کۆمەڵێکدا جۆرە کەسانێك هەن، کە حەز بەگێرەشێوێنی دەکەن و پابەند نین بەم یاسا و دەستوورانە و هەمیشە لە هەوڵی نانەوەی کێشەی جۆراوجۆر و دروستکردنی نائارامیدان، کە ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر جێگای مەترسی و دڵەڕاوکێیە بۆ کۆمەڵ:

دیارترین هۆیەکانی پەنابردنە بەر جنێودان ئەمانەن:

١- یەکەم مەبەستی ئاشکرای جنێودان ئەوەیە، کە کەسی جنێودەر گوتە ناشیرینەکان (جنێو) بۆ سووکایەتی پێکردنی کەسی بەرامبەر بەکاردەهێنێ، بێ گومان لێرەدا هەندێ پاڵنەر یا هۆکار دەبنە مایەی سووکایەتی پێکردنی بەرامبەر، وەك ئیرەیی بردن بە کەسەکە بەهۆی جوانی، دەوڵەمەندی، کار بەدەستی و پۆستی دیار، .... تد. جێی ئاماژە پێکردنە، کە لە زۆر کاتدا پیادەکردنی ئەم شێوازە بەندە بە باری ڕۆشنبیری کەسەکان واتە نەزانین و نەخوێندەواری و دواکەوتوویی کاریگەری زۆری هەیە لەم بوارەدا.

٢- زۆر جار بەهۆی دروستبوونی کێشەیەکەوە بەهەر هۆکارێك بووبێت، خەڵکانێکی زۆر لەم شوێنە کۆ دەبنەوە، کاتێك، کە جنێودەر ئەم خەڵکانە دەبینێ بۆ ئەوەی سەرنجیان بۆلای خۆی ڕابکێشێ، خۆی قووت دەکاتەوە و دەست دەکات بە قسەی پڕوپووچ (جنێودان) بەم و بەو، جارێك لەشێوەی

گاڵتەوگەپ و جارێکی تر بەمەبەستی تۆقاندنی خەڵکەکە بەم شێوەیە ڕەفتار دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی ببینن.

٣- زۆر جار جنێودەر لە بەکارهێنانی گوتەی قەدەغەکراو (تابوو) مەبەستی ئەوەیە، کە دژ بە چەمکە باوەکانی کۆمەڵ بوەستێ. (خرما، ل ٢٤٨، ١٩٧٨).

ئەمەش بەهۆی ئەوەیە، کە ئیتر بێ ئاواتە لە سەرکەوتن لە ژیانیدا یا ئەوەتا خۆی ڕقی لە کۆمەڵە و حەز بەوە دەکات کە کێشە دروست بکات و ئاسایشی کۆمەڵ تێکبدات.

٤- هۆکارێکی تری جنێودانیش ئەوەیە، کە هەندێ جار مەبەستی جنێودەر گاڵتە پێکردنە بەوانەی کە سەر بە دەسەڵاتن واتە سووکایەتی کردن بە بەرپرسانی وەك پۆلیس و مامۆستایان و سیاسەتمەداران ..... تد، بەمەبەستی ناوزڕاندن و سووك کردنیان بەرامبەر بە خەڵك.

لێرەدا گومان لەوەدا نییە کە ئەم خاڵانە ڕێگا خۆشکەرن بۆ گەشەسەندنی بازرگانی نوکتەی نەشیاو و قەدەغەکراو ئەمەش وای کردووە، کە هەر میللەتێك شێوازی تایبەتی هەبێت لەم بوارەدا وەك ئەمریکییەکان، کە حەز بەو نوکتانە دەکەن، کە بۆ سووکایەتی پێکردنی ئافرەت بەکاردێن. (هەمان سەرچاوە).

# بەشی دووەم

## ڕۆنانی پێکهاتەی جنێودان بە پێی ئاستەکانی زمان:

ئاخاوتنی مرۆڤ لە زنجیرە دەنگێکی یەك لە دوای یەك پێکهاتووە بەهۆی کۆمەڵێك یاساو دەستووری تایبەت بە زمان لێکدراون و کەرەسەکانی ئاخاوتن بە شێوەیێکی ڕێکوپێك هاتۆتە بەرهەم.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە بیڵێین ئەوەیە، کە وشە و دەربڕینەکانی مرۆڤ لە ڕووی پێکهاتەوە لە کۆمەڵە دەنگێکی بێ تاوان پێکدێت، کە کۆمەڵگا بۆ کاتی پێویستی خۆی ئەم جۆرە مانایانەی پێ دەبەخشێ، بەڵام کەی و چۆن؟ ئەم وشە بە سوود و پێویستە دەبێتە وشەیەکی قەدەغەکراو (تابوو)؟ بە تێڕوانینی کۆمەڵ، لەڕاستیدا ئەمە کارێکی سەرسوڕهێنەرە، چونکە ئەو وشەی، کە لە بری وشە قەدەغەکراوەکە، کە گوایە وشەیەکی ڕێکوپێکە بەکارهاتووە هێندەی پێ ناچێ ئەویش دەبێتە وشەیەکی تری قەدەغەکراو بە تێڕوانینی کۆمەڵ خۆی، کە ئەمەش پاش چەند ساڵێك دووبارە دەگۆڕدرێتەوە بە وشەیەکی تر و بەم جۆرە........ (خرما، ل ٢٤٥، ١٩٧٨).

ئەرکەکانی زمان زۆرن، یەکێك لەم ئەرکانە (بەکارهێنانی زمان بۆ هەست دەربڕین و هەست وروژاندنە، کە دەتوانرێ بە یەك ئەرك دابنرێن)(فتاح، ل ٢٨، ١٩٩٠)، واتە بەهۆی لەیەکتر نزیکی هەردوو ئەرکەکە دەتوانرێ بەیەك ئەرك دابنرێن. لێرەدا دەتوانین بڵێین، ئەو ڕستانەی کە بۆ جنێودانیش بەکاردێن وەك (گەوجە، کوێرە ........ تد) جۆرێکن لە هەست دەربڕین.

لێرەدا قسەکەر دەتوانێ گوتەکانی تەنیا دەربڕینی هەستێکی خۆی بێ وەك (بەخوا ناشیرینە) بەڵام کاتێ گوتەکانی ئاڕاستەی کەسی بەرامبەر دەکات مەبەستەکە وروژاندنی کەسەکەیە، واتە (دڵی خۆش کات یان ڕاپیەڕێنێ و هەڵی بدات و ملی بشکێنێ) (هەمان سەرچاوە) کە ئەمەش کاردانەوەی لەسەر گوێگر دەبێت چ بە شێوەیەکی ئیجابی بێ یا سەلبی، کە هی دووەمیان ڕەنگە کێشە

دروست بکات لەنێوان قسەکەر و گوێگردا و کێشەکەش لە دروستبوونی دیاردەی جنێودانداندا خۆی ببینێتەوە.

**فۆڕمەکانی پێکهاتەی جنێودان:**

پێکهاتەی جنێودان وەك دانەیەکی زمانی لە فۆرمی جیاجیای وەك وشە و گرێ و ڕستە و ........ تد دەردەکەوێت، لێرەدا پێویستە ئەو یاسایانە بدۆزینەوە، کە ئەم پێکهاتەیەیان دروست کردووە و جیاوازی لەگەڵ کەرەسە زمانییەکانی تردا دەستنیشان بکرێت، لە کاتێکدا، کە وەك هەر یەکەیەکی تر سەر بە بواری ئاخاوتنە و ئاسایی لەگەڵ کەرەسەکانی تری زماندا بەکاردێت بۆیە دەبێ تیایدا پیادەی یاسا و سیستەمی ئەم زمانە بکرێت.

دەبێ سەرنج لەوەش بدرێ کە ڕەنگە هەندێ جار بەتەواوی پەیڕەوی هەموو یاسا و ڕێسای ڕێزمانی لەگەڵ ئەم پێکهاتەیەدا نەکرێت بەهۆی ئەوەی کەرەسەکانی ئاخاوتن زیاتر خۆیان بەدەست گۆڕانەوە دەدەن.

جنێودان وەك پێکهاتەیەکی ڕێزمانی ئەم فۆڕمانە دەگرێتەخۆ:

١- جنێو لە شێوەی وشەی سادە، وەك: گێل، کەر، کوێر ...............تد.

٢- جنێو لە شێوەی وشەی ناسادە، وەك: دووڕوو، بێ ئابڕوو، نەفام، نامەرد ..............تد.

٣- جنێو لە شێوەی دەستەواژەدا، وەك: بەکوێراوی چاوی، بە ملی شکاوی، چەتیوە سەرقژنە .......تد.

٤- هەندێ فۆڕمی چەسپاو لە زمانەکەدا بە ئامادەکراوی هەن کە (ئیدیۆمی) پێ دەوترێ، هەندێ لەو ئیدیۆمانە بۆ سووکایەتی پێکردنی کەسی بەرامبەر بەکاردێن، وەك: کونەبا، ئاگری بن کا ............تد.

٥- جنێودان لەشێوەی ڕستەدا، کە ئەمەش زۆربەی جنێوەکان دەگرێتەوە چونکە (کەسی قسەکەر جنێوەکانی لەشێوەی ڕستەدا ئاڕاستەی کەسی بەرامبەر (گوێگر) ی دەکات وەك (تۆ زۆر بێ ئابڕووی، نا پیاویت، دایکت ......؟...، خوشکت .......؟....... تد).

جێی ئاماژە پێکردنە کە مامۆستا هیرانی لەژێر ناونیشانی (گرێی دەروونی — داگـرتن و تـووك — ڕا لێنـەبوون) هەنـدێ کەرەسـەی دەستنیـشان کـردووە کـە لەشێوەی وشە و گرێ و ڕستەدان و، هەندێ لـەم کەرەسانە لـە شـێوەی (جنێـو) دان وەك: (کەرشـیر، ماکـەر، شـیرۆ، دەعبـا، وەحـشی، خـۆڕی، سەرسـەری ....................... تد)، هەندێکی تریش لە پێکهاتەکان زیاتر شێوازی (تووك و دوعالێکردن) دەگرنە خۆیان و لەڕووی ڕۆنانیشەوە لـە شـێوەی ڕسـتەدان، وەك: (خوایە وێرانبێ، بەقوڕێ گیرێ، ئاگرت تێ بەربێ، پێ نەگەی یاخوا، ژەهری مـاری بێ).

مامۆستا لە لێکۆڵینەوەکەدا کۆمەڵێك دەربڕینی خستۆتە ڕوو کـە بەشـێکیان وەك کەرەسەی جنێودان لەشـێوەزاری هـەولێر و دەوروبـەری بـەکاردەهێنرێن، لـە لێکۆڵینەوەکـەدا زیـاتر لێکدانـەوەی واتـای پێکهاتـەکان کراوەتـە مەبەسـت نـەك پۆلینکردن و شیکردنەوەیان بەپێی ئاستە جیاجیاکانی زمان.

### ١- جنێودان و ئاستی مۆرفۆلۆژی

دیاردەی جنێودان زیاتر بەندە بە ئاخاوتنەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەم مەبەستە لەهەموو زمانێکدا کۆمەڵێ گوتەی جیاجیای تایبەت بەم بوارە هەیـە، لـە زمانی کوردیشدا هەندێ مۆرفیم و پارتیکڵ بەشداری لەم پێکهاتەیەدا دەکـەن، کـە پێویستە لە بواری مۆرفۆلۆژیدا باس بکرێن، ئەو پارتیکڵ و مۆرفیمانەش ئەمانەن:

١- **بـێ**: ئـەو مۆرفیمەیـە، کـە لـە هەنـدێ پێکهاتـەدا دیـوی پێـچەوانە دەستنیشان دەکات، لەگەڵ کەرەسەکەدا دێت، هەنـدێ جـار پێـچەوانەی (بە) یە، وەك:

بەشەرم ←——— بێ شەرم

بەئابڕوو ←——— بێ ئابڕوو

بەهۆش ←——— بێ هۆش

زۆر جار ئەم پێکهاتانە، کە وەك جنێو ئاڕاسـتەی کەسـی بەرامبـەر دەکرێـت (هەی) لەگەڵدا بەکاردێت و جنێوەکە شێوەیەکی خەستتر وەردەگرێ و لە شێوەی هەڕەشەکردندا دەردەکەوێت، وەك (هەی بێ شەرم ........ تد).

٢- **نا:** لە زمانی کوردیدا وەك مۆرفیمی نەرێ بەکاردەهێنرێ وەك: ناخۆش، ناخۆم، ناکەس.

(نا) بەمەبەستی جنێودان دەچێتە سەر کەرەسەی جیاجیا و شێواز و مەبەستی جنێودان لەخۆ دەگرێت، وەك: ناپیاو، نامەرد، ناڕەسەن، ناحەز.......... تد.

٣- **دا:** ئەم مۆرفیمە دەچێتە سەر ڕەگی کار و مەبەستی جنێو لەخۆ دەگرێ و زۆر جاریش نزیك دەبێتەوە لە شێوازی (دوعا) بۆیە هەندێ جار (یاخوا) (خوایە) لەگەڵیدا بەکاردێت، وەك:

- داوەشێی ——— یاخوا داوەشێی
- داڕزێی ——— خوایە داڕزێی
- پێ نەگەی ——— یاخوا پێ نەگەی (هیرانی، ٢٠٠٩، ل ٣٤)

٤- **ب:** وەك پێشگری کار بەکاردێت بەڵام کارا نییە و خۆی تایبەتە بە فەرماندان بەڵام هەندێ جار بەمەبەستی جنێودان بەکاردێت وەك: بمرە، بوەڕە، بزەڕە، .......؟...... بخۆ.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت، کە یاسایەکی دیاریکراو نییە کە ئەم مۆرفیم و پارتیکڵانە پێوەی بەندبن بەڵکو زۆر جار ڕێککەوتنی کۆمەڵە و بەپێی شێوەزاری زمانەکەش گۆڕانیان بەسەردا دێت.

بێجگە لەمانەش چەند پاشگرێکی وشە داڕێژ بەمەبەستی جنێودان دەچنە سەر هەندێ کەرەسە، وەك: باز، دار، چی، خۆر، ۆ، کە .........

وەك: فێڵباز، مێ باز، چەنەباز، سیلدار، کەڵەکچی، چڵکاوخۆر، پیسۆ، پیسکە.

کەرەسەکانی جنێودان لە ئاستی مۆرفۆلۆژیدا بەشێوازی جیاجیا ڕۆدەنرێن وا لە خوارەوە هەندێ لەو پێکهاتانە دەخەینە ڕوو:

١- ناو + ناو

سەگباب، کەرباب

٢- ئاوەڵناو + پارتیکڵ + ناو

ڕەشەولاخ، تیرەمار

٣- ناوی ئەندامی لەش + ئاوەڵناو

گوێ قیت، دەم گەورە، پێ پان، چاوزەق ..............

٤- ئەندامانی لەشی مرۆڤ لەگەڵ کەرەسەی تر و دروستکردنی واتایەکی مەجازی.

زمان درێژ، لووت بەرز، مل پان، چاو چنۆك، زمان پیس ..............

٥- ناوی ئاژەڵ + وشەکانی خزمایەتی.

سەگباب، کەرداك، سەگ ئەژداد ................

٦- دووبارەکردنەوەی ناوی ئاژەڵ لەگەڵ وشەکانی خزمایەتی بە یارمەتی(ی).

کەری کەرباب، سەگی سەگباب، کەری کەر ئەژداد ................

٧- ئەو ئاوەڵناوە ناسادانەی کە وەك جنێو بەکاردێن.

ئارەق خۆر، شەڕفرۆش، دووڕوو، سەرشۆڕ، گەڕ و گول .........

٨- ئەو وشانەی، کە بەرامبەر ئەو نەخۆشییانەی، کە تووشی مرۆڤ دەبن لەگەڵ پاشگری (دار) دا، وەك:

سیلدار، وەرەمدار، ئیسقادار ............

٩- پارتیکڵی (بێ) + ناوی واتایی

بێ هۆش، بێ ئابڕوو، بێ باوەڕ .................

١٠- بەکارهێنانی هەندێ وشەی ناسادەی بیانی، کە بە ئامادەکراوی هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، وەك: ئەدەب سس، حەیاسس ...........

١١- بەکارهێنانی وشەکانی خزمایەتی وەك (دایك، خوشك ........ تد) لەگەڵ هەندێ وشەی قەدەغەکراو (تابوو) وەك:

دایك ......؟

خوشك ......؟

١٢- کورتکراوەی هەندێ ناو و یاریکردن بە پیتەکانی بەمەبەستی سووکایەتی پێکردنی بەرامبەر:

چەتۆ ⟵ چەتە
بەدری ⟵ بەدە
مستەفا ⟵ مچە

هەر ئەم ناوە کورتکراوانە زۆر جار بۆ مەبەستی بچووککردنەوە و خۆشەویستی بەکاردێن.

١٣- پارتیکڵەکان + وشەی بێگانە

بێ حەیا، بێ نەزاکەت، نائینسان، بێ عەقڵ .............

١٤- بەکارهێنانی هەندێ وشە کە وەك ناو بۆ ناونانی کاڵای بێ بەها بەکاردێت زۆر جار بەمەبەستی جنێودان بۆ سووکایەتی پێکردنی بەرامبەر بەکاردێت، وەك قۆندەرە..........

**٢- پۆلینی سینتاکسی جنێودان:**

ئاستی سینتاکس لە هەر زمانێکدا بێت ئەو یاسا و بنەمایانە دەستنیشان دەکات، کە بە هۆیانەوە لێکدانی وشەکانی زمان بۆ پێکهێنانی گرێ و گرێیەکانیش بۆ پێکهێنانی ڕستە دیاری دەکرێن. (حسەین، ل ٢٦، ٢٠٠٩).

ڕیزبەندی کەرەسەکانی ڕستە لە زمانی کوردیدا بریتییە لە (بکەر + بەرکار+ کار) جنێودانیش وەك یەکەیەکی ئاسایی ئاخاوتن مەرج نییە لە هەموو کاتێکدا یاسا و دەستوورە بنەڕەتییەکانی دارشتنی ڕستە لەخۆ بگرێت. بەتایبەتی لەکاتی جێبەجێکردنی کردەیەکی وەك جنێودانـدا، کە جنێودەر لە بارێکی دەروونی نائاساییدایە و ڕەنگە بەبێ ویستی خۆی یاری بە کەرەسەکان بکات، هەر لەبەر ئەمەشە، کە پێکهاتەی جنێودان فۆڕمی جیاجیا دەگرێتە خۆ.

گۆڕانی پێکهاتەکانی جنێودان بەم شێوەیە ڕوون دەکەینەوە:

- بێ ئابڕوو
- نا پیاو، نامەرد
- بێ ئەدەب
- هیچ و پووچ
- سەگباب

- بێ مێشك
- نا ڕەسەن
- بێ غیرەت
- چاوچنۆك

پێکهاتەکانی سەرەوە بریتین لەو کەرەسانەی کە قسەکەر (جنێودەر) بەرامبەر بە گوێگر (جنێوپێدراو) بەکاری دەهێنێ.

ئەوەی لە هەموو فۆرمەکانی سەرەوەدا دەردەکەوێت ئەوەیە، کە لەڕووی پێکهاتەوە وشەی نادەن، بەڵام قسەکەر لە شێوەی ڕستەدا ئاڕاستەی کەسی دووەمی تاك (جنێوپێدراو) یان دەکات، ئەم کەرەسانە لە ڕووی پێکهاتەوە هەندێ لە مەرجەکانی ڕستەی تەواویان لەدەست داوە، لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

لە هەموو پێکهاتەکاندا نە کارا و نە کار و نە مۆرفیمی کاتیش هیچیان دەرنەکەوتوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ڕستەی تەواو ڕەفتار دەکەن و ئاڕاستەی کەسی دووەم دەکرێن، بێجگە لەمەش لەگەڵ هەموو پێکهاتەکاندا دەتوانرێ جێناوی سەربەخۆی کەسی دووەم (تۆ) دابنرێت، ئەگەر جنێوپێدراو کەسی دووەم بێ، بەڵام دانانرێ، چونکە جنێوپێدراو بەرامبەرە. بەهەمان شێوە مۆرفیمی کاتیش دەرنەکەوتووە، با سەیری ئەم ڕستانەی خوارەوە بکەین:

- بێ ئابڕوو (ئاستی سەرەوە)
- تۆ بێ ئابڕوویت (ئاستی ژێرەوە)

لەم هێڵکارییەدا ڕوونی دەکەینەوە:




بیٚ ئابڕوو

لەم هێڵكارییەدا (تۆ)، كە (كارا) ی ڕستەكەیە خۆی و ئەو جێناوەی، كە بۆی دەگەڕێتەوە لەگەڵ مۆرفیمی (كات)دا هیچیان لە ئاستی سەرەوەی ڕستەكەدا دەرنەكەوتوون، لەبەرئەوەی، كە جنێوپێدراو كەسی بەرامبەرە بۆیە (بیٚ ئابڕوو) وەك ڕستەیەكی تەواو ڕەفتار دەكات هەرچەندە لە قاڵبی وشەیەكی ناسادەدایە.

ئەگەر هاتوو جنێوپێدراو كەسی سێیەمی تاك بوو واتە ئامادە نەبوو ئەو كاتە مۆرفیمی كاتی ئێستا دەردەكەوێت و جێناوی لكاوی سەر بە هەمان كەس دەرناكەوێت، وەك:

- نەفامە (ئاستی سەرەوە)
- ئەو نەفامە (ئاستی ژێرەوە)

لەم هێڵكارییەدا ڕوونی دەكەینەوە:




دەبێ سەرنجی ئەوەش بدرێت کەرەسەی وا هەیە، کە بۆ هەردوو کەسەکە (دووەم و سێیەمی تاك) هەمان فۆڕمی دەبێت، ئەمەش زیاتر ئەو کەرەسانە دەگرێتەوە، کە سادەن، وەك:

- گێلە. (ئاستی سەرەوە)
- (ئەو، تۆ) گێلە. (ئاستی ژێرەوە)

لەم هێڵکارییەدا ڕوونی دەکەینەوە:




لەم بارانەدا بەهۆی دەوروبەری ئاخاوتن قسەكەری زمان لە یەكتریان جیا دەكاتەوە.

ئەگەر هاتوو (كەسی دووەم و سێیەمی تاك) وەك جنێوپێدراو كۆكرانەوە واتە جنێوەكان ئاڕاستەی هەردوو (كەسی دووەم و سێیەمی كۆ) كۆ كرانەوە، ئەوا بۆ هەردوو كەسەكە هەمان فۆرم بەكاردێت، وەك:

- نەفامن. (ئاستی سەرەوە)
- (ئێوە، ئەوان) نەفامن. (ئاستی ژێرەوە)

لەم هێڵكارییەدا ڕوونی دەكەینەوە:




(نەفامن) ئاستی سەرەوە

لە ڕستەکانی سەرەوەدا مۆرفیمی کاتی ئێستا دەرنەکەوتووە، بەڵام جێناوی لکاو دەرکەوتووە.

### ٣- پێکهاتەی جنێودان و ئاستی دەنگسازی:

چۆن وشە لە ئاستی مۆرفۆلۆژیدا بەسەر مۆرفیمدا دابەش دەبێت بەهەمان شێوە لە ئاستی دەنگسازیشدا کەرت دەکرێت و کەرتەکانیش بڕگەیان پێ دەوترێ.

شیکردنەوە بەهۆی ئامێری (Spectograph) دەری دەخات، کە هێز لەسەر هەموو بڕگەکانی وشەدا هەیە، بەڵام لەسەر هەریەکێ بەڕادە و پلەیێ. (ئەمین، ل ٢٨، ٢٠٠٤).

بڕگە لە ئاستی فۆنەتیکدا بەو کۆمەڵە دەنگە دەوترێ کە لەناو وشەدا درکاندنێکی بەرزی هەبێ و بیستەر بەئاشکرا هەست بەو درکاندنە بەرزە بکات و

بتوانێ بەگوێرەی ئەو سنوورەی، کە لە وشەکەدا هەیەتی لە بڕگەکانی تر جیایان بکاتەوە. (وەیس، ١٩٨٤، ل ٨٣).

هێز لە وشەدا دەکەوێتە سەر بڕگەکان، قسەکەری زمان بەپێی زانیاری گشتی زمانەکەی دەتوانێ شوێنی هێز دەستنیشان بکات، وەك:

- کوڕ
- کوڕەکە

لە وشەی (کوڕ)دا لەبەر ئەوەی کە یەك بڕگەیە هێزەکە لەسەریەتی، لە وشەی (کوڕەکە) دا، هێزی سەرەکی لەسەر بڕگەی (کە) یە.

پێکهاتەی جنێودانیش وەك یەکەیەکی ئاخاوتن، کە فۆڕمی جیاجیا لەخۆ دەگرێ، جنێودەر دەتوانێ شوێنی هێز لەسەر بەشەکانی ئەم پێکهاتەیە دەستنیشان بکات، لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

١- ئەو فۆڕمانەی، لە شێوەی وشەیەکی سادەن، ئاسایی ئەگەر وەك جنێو بۆ کەسی بەرامبەر (کەسی دووەمی تاك) بەکارهاتن دەچێتە قالبی ڕستەوە (لە پێشەوە باس کراوە) بۆیە هێزەکە دەچێتە سەر بڕگەی یەکەم، وەك:




٢- ئەگەر هاتوو پێکهاتەکە لەشێوەی وشەیەکی لێکدراو بوو، هێزەکە دەچێتە سەر بڕگەی کۆتایی پێکهاتەکە، وەك:

- پیاو کوژ — دووڕوو — زۆر بڵێ

٣- ئەگەر هاتوو جنێوەکە لە پارتیکلێك (پێشگر) و پارچەیەکی واتادار پێکهاتبوو ئەوا هێزەکە دەکەوێتە سەر پێشگرەکە، نە مۆرفیمی کات و نە جێناوی لکاو هیچیان دەرناکەون، وەك:




دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێ، کە هەموو پارتیکڵەکان هێز وەرناگرن.

ئەگەر جنێوەکە ئاراستەی کەسی سێیەمی تاك کرا، گۆڕانکاری بەسەردا دێت، لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

- لە پێکهاتەی سادەدا هێزەکە بەهەمان شێوە لەسەر بڕگەی یەکەمدا دەردەکەوێت، چونکە جنێودەر کە لای یەکێ جنێو بەکەسی ئامادە نەبوو (کەسی سێیەمی تاك) دەدات، جنێوەکە لە شێوەی ڕستەدا دەردەبڕێ:




- ئەگەر کەسی جنێوپێدراو بوو بەکەسی سێیەمی کۆ، هێزەکە دەچێتە سەر بڕگەی دووەم (کۆتایی)، وەك:




- لە پێکهاتە نادەکانیشدا بەهەمان شێوە، ئەگەر هاتوو پێکهاتەکە لەدوو وشەی تەواو پێکهاتبوو جنێوپێدراویش کەسی سێیەمی تاك بوو هێزەکە دەکەوێتە سەر بڕگەی کۆتایی، واتە ئەو بڕگەیەی کە (مۆڕفیمی کات) ی تێدایە، وەك:



– دووڕووە      – زۆربڵێیە      – چڵكاوخۆرە

– ئەگەر هاتوو ئەم پێكهاتانە ئاڕاستەی كەسی سێیەمی كۆ كران (كۆ كرایەوە) هێزەكە لەسەر بڕگەی كۆتایی دەمێنێتەوە، كە جێناوی لكاو بەشێكە تیایدا.

– دووڕوون      – زۆربڵێن      – چڵكاوخۆرن

– ئەگەر هاتوو پێكهاتەكە لە پارتیكڵێك و پارچەیەكی تر پێكهاتبوو لەكاتی كۆكردنەوەدا بۆ كەسی سێیەمی كۆ، هێزەكە هەر لەسەر پاڕتیكڵەكە دەمێنێتەوە، وەك:

– نەفامن      – بێ ئابڕوون

هەندێ جار پێكهاتەی جنێودان ڕیزبەندی ئاسایی كەرەسەكانی ڕستە (بكەر + بەركار + كار) تێك نادات، بەڵام بەشێوەیەكی سروشتی لەو حاڵەتانەی، كە جنێوپێدراو لەگەڵ جنێودەر بەرامبەرن، جنێودەر نە ناوی خۆی نە ناوی جنێوپێدراو ناهێنێ لەهەندێ حاڵەتی كەمدا نەبێ، لەو كاتانەشدا جێناوە لكاوەكان ئاسایی ڕێككەوتن لەنێوان كەرەسەكاندا دروست دەكەن، وەك:

– دایكت ....؟... م. (وشەیەكی تابووە (كار)) واتە: من دایكی تۆ ....؟.... م.

– خوشكت....؟.. م. (وشەیەكی تابووە (كار)) واتە: من خوشكی تۆ ....؟.... م.

لەم هێڵكارییەدا ڕوونی دەكەینەوە:




دایکت+ ....؟..... + م

جاری واش دەبێت هەردوو وشەی خزمایەتی (دایك و خوشك) بەیەکەوە بەکاردێن.

پێکهاتەی وەك ئیدیۆمیش کە بە ئامادەکراوی لە زماندا بەرچاو دەکەون لێکدانەوەی واتاییان پێویستە کە ئەویش بە پێی دەوروبەر و بەکارهێنان ئەنجام دەدرێت بەپێی بوارەکانی وەك کردەی قسەیی، دەرکەوتەکان، گریمانە پێشەکییەکان .......... تد، بەڵام لەبەر ئەوەی باسەکەی ئێمە شیکارییە نەك لێکدانەوەی واتایی بۆیە پێویست بە باسکردنی ناکات.

## ئەنجامەکان

١- هەست دەربڕین وەك ئەرکێکی زمانی گشتییە، واتە هەموو مرۆڤێك بۆی هەیە هەستی خۆی دەربڕێت بە هەردوو شێوازی (ئەرێنی و نەرێنی).

٢- جۆراوجۆری کەرەسە و پێکهاتەکانی جنێودان وای کردووە کە لە شیکردنەوە و لێکدانەوەیاندا تەنیا پشت بە ئاستێکی دیاریکراوی زمان نەبەسترێ.

٣- هەروەك چۆن کەرەسە و پێکهاتەکانی جنێودان بە پێی تەمەنی کەسی جنێودەر و جنێوپێدراو دەگۆڕێت، بەهەمان شێوە جنێوەکە بێجگە لە کەسی بەرامبەر و ئامادە ئاڕاستەی کەسی نا ئامادەش دەکرێت واتە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.

٤- جنێودان وەك شێوازێك تایبەت بە تاکە ڕەگەزێك، بەڵکو لە نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرو مێدا دەبینرێت.

٥- ئەو کەرەسانەی، کە وەك جنێو بەرامبەر بەکەسەکان بەکاردێن جیاوازییان هەیە لە ڕووی ڕادەی توندوتیژی و ناشیرینی و بێ ڕێزی گوتەکاندا.

٦- وشەکانی خزمایەتی وەك دایك، خوشك ....... دەوری سەرەکی دەبینن لە دروستکردنی پێکهاتەی جنێوداندا لەگەڵ وشە قەدەغەکراوەکاندا.

٧- هەندێ ئامراز و گیرەك لە ئاستی مۆڕفۆلۆژیدا دەوری سەرەکی دەبینن لە پێکهاتەی جنێودان.

٨- لە پێکهاتەی جنێوداندا لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆربەی کات لەشێوەی ڕستەدایە، بەڵام مەرج نییە لە هەموو کاتێکدا بنەما و دەستوورەکانی ڕستەیان تێدا پیادە بکرێت، چونکە یەکەکانی ئاخاوتن زیاتر خۆیان بەدەست گۆڕانەوە دەدەن.

## سەرچاوەکان


**بەزمانی کوردی**

١– ئــەمین، وریــا عومــەر، چــەند ئاســۆیەکی تــری زمانــەوانی، چــاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٤.

٢– حسەین، شیلان عومەر، ئیدیۆم – چەشن و پێکهاتنی لە زمـانی کوردیـدا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٣– فتاح، محمد معـروف، زمانـەوانی، زانکـۆی سـەلاحەدین، کـۆلێجی ئـاداب، بەشی زمانی کوردی، ١٩٩٠.

٤– هیرانــی، ئەحمــەد، هەنــدێ گــرێ و ڕســتەی ڕێزمــانیی لــە زۆنگــاوی فەرامۆشــیدا، گۆڤــاری زماننناســی، ژ ٤–٥، تــشرینی یەکــەم و تــشرینی دووەم، کوردستان – هەولێر، ٢٠٠٩.

٥– وەیس، غازی فاتح، فۆنەتیك، ل ٨٣، ١٩٨٤.

**بەزمانی عەرەبی**

١– ابن المنظور، لسان العرب، المجلد الخامس، دار الحدیث، القاهرة، ٢٠٠٣.

٢– خرمـا، الـدکتور نـایف، اضـواء علـى الدراسـات اللغویـة المعاصـرة، عـالم المعرفة، ١٩٧٨.

## ملخص البحث

**د. شلير رسول البرزنجي**
**كلية اللغات – قسم اللغة الكوردية**

يقصد بالسب الكلام القبيح الذي يستعمل في الذم والتنقيص من الشأن، وهو اسلوب يلجأ اليه الضعيف ويتجسد في الفاظ لا تشفي الغليل بقدر ما يفقد مستخدمها (المتكلم) احترام الاخرين.

فعنوان البحث (الجانب السلبي للتعبير عن الشعور/ السب والشتم) وهو بحث تحليلى واسع يستفيد من المستويين (المورفولوجي والسينتاكسي) و يخترق احيانا حدود هذين المستويين، والسبب يكمن في مدى سعة الموضوع، ولأن مادة البحث (السب) تتشكل من مكونات عديدة كالكلمة و العقد ...... الخ و كل هذه المكونات تحتاج الى التحليل من نواحي متعددة ومتباينة.

يتكون البحث عدا – المقدمة و النتائج – من فصلين:

يتضمن الفصل الاول تمهيدا يليه مفهوم السب وتعريفه، السب من الناحية اللغوية وعناصر السب، السب والجنس، مستويات السب، أنواع السب والأسباب التي تؤدي الى ظهور السب.

اما الفصل الثاني فيتكون من:

الصياغة التركيبية للسب بحسب المستويات اللغوية واشكال صيغ السب والصياغة الصرفية، والتصنيف السينتاكسي للصيغ والسب ومستوى الصوت.

و وصل البحث الى طائفة من الأستنتاجات ثبتت في نتائج البحث التي يليها قائمة للمصادر، ثم ملخص البحث باللغة العربية واللغة الانگليزية.

Abstract

**The Negative side of expressing feeling in Kurdish Language - Swearing as an example -**

**Dr. Shler Rasool Barzingy**
**College of Languages – Kurdish department**

Swear words are considered rude or bad. They are usually used to offend people. Swearing is a style used by weaker people to fulfill their hatred and dislike. Using this style leads to loss of people's face and politeness.

The study is entitled "The Negative side of expressing feeling in Kurdish language – Swearing as an example". It is a descriptive analysis on both levels of morphology and syntax. Because of the extensive scope of the study, including the word and phrase, sometimes it takes a step further above these two levels, since these linguistic units need to be analyzed in different levels.

The study, in addition to the abstract and the conclusions, consists of two parts. The first part is and introductory section including the term and definitions of swearing, swearing in the field of linguistics, swearing tools, swearing and gender, levels of swearing, types of swearing and the factors that lead to swearing.

The second part contains structure of swearing according to language levels, the forms of swearing structure, morphological structure, classifying the morphological structure of swearing, swearing at the phonological level.

In conclusion, the findings are presented, the list of references is shown and an abstract in Arabic and another one in English are provided.

# بیر و باوەڕی ئەشعەری لە عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندیدا

نووسینی: د.ابراهيم احمد شوان
کۆلێژی زمان / بەشی زمانی کوردی

## کورتەی لێکۆڵینەوەکە

ئەم لێکۆڵینەوەیەی کە بەناونیشانی (بیرو باوەڕی ئەشعەری لە عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی)یەو بریتییە لە ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو و بنەماکانی ئەشعەری و کاردانەوەی لەسەر زانا موسڵمانەکان.

پاشان لێکۆڵەر لە عەقیدە کوردییەکەی مەولانا خالید دەکۆڵێتەوەو بنەماکانی ئەشعەریی تێدا دەستنیشان دەکاو روونی دەکاتەوە، لەوانەش : بینینی خودا، خودو سیفەتەکانی خودا، موعجیزەی پێغەمبەر (ص) شەفاعەتکردنی پێغەمبەر، ئازاردانی گۆڕ، خەلیفایەتی و هاوەڵێتی پێغەمبەر (ص)، دادپەروەری خودایی، زیادبوون و کەمبوونی ئیمان .... هتد.

مەولانا خالید باسی هەندێ کێشەی ئاڵۆزی نەکردووە وەکو : (کەلامی خودا، کەسبی بەندە)، هەروەها لەو باوەڕەیە کە ئیمامی حەسەن پێنجەمین خەلیفەکانی راشیدینەو پێغەمبەر (ص) لە میعراجێ بەچاوی خۆی خودای بینیوە.

## بەناوی خودای دڵسۆزی میهرەبان

### پێشەکی

ئەم عەقیدە کوردییەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی* بە یەکەم پەخشانی هونەری کرمانجیی خواروو حسێب دەکرێ و بۆ یەکەم جارە بەرهەمی ئایینی بە پەخشانی کوردی بنووسرێتەوە لەم شێوەزارەدا. هەروەها ئەم عەقیدەیە بەشێکی وەرگێراوە لە کتێبی (الایمان والاسلام) و هەردووکیان یەك کتێبن.**

ئەم بەرهەمە سەرەڕای ئەوەی گەلێ لایەنی ڕێزمانی و زمانەوانیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە سەرەتای نووسین بە زمانی کوردی بەگشتی ئایینی بووە. بەڵام ئەوەندە هەیە بەرهەمەکانی دیکە بەگشتی بەشیعر یان هەڵبەست (نظم) بوونە و ئەم عەقیدەیە بە پەخشان بووە.

مەلا و شێخەکانی کوردی سوننی بەگشتی لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعی بوون و لە بیروباوەڕیش ئەشعەرییەت باڵی بەسەریاندا کێشابوو، گەر سەیری ئەم بەرهەمەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بکەین دەبینین کە بەپێی بیرو بۆچوونەکانی ئەبووحسەنی ئەشعەری نامیلکەکەی نووسیوە و رایەکانی خۆی دەربڕیوە.

نابێ ئەوەش فەرامۆش بکرێ کە ئەم نامیلکەیە سەرجەم بیرو بۆچوونەکانی ئەشعەری بەخۆوە نەگرتووە و خۆی لەکێشە سەرەکییەکانی بواردووە و بە بڕوای

---

* خالیدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسەینی جاف میکایەلی کە پاشان بە مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری ناوبانگی دەرکردووە، مەلایەکی گەورە و شێخێکی پایەبەرز بووە. بەرەو هندستان چووە و تەریقەتی لەسەر دەستی شێخ عەبدوڵلای دەهلەوی وەرگرتووە، لە (١١٩٣)ی کۆچی (١٧٧٩)ز لە قەرەداخ لەدایك بووە و لە (١٢٤٢)ی کۆچی (١٨٢٧)ز لە شام کۆچی دوایی کردووە.

محەمەدی مەلا کەریم، عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆواری کۆڕی زانیاری عیراق – دەستەی کورد – ژمارە (٨)، ساڵی (١٩٨١)، ل ١٩٩.

** بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوەیە : جواد فقي علي ، الشيخ خالد النقشبندي و منهجة في التصوف ، ص ١٢٣–١٢٤

من ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نامیلکەکەی بۆ خەڵکی گشتییە و بۆیە بە پێویستی نەزانیوە خۆی لە قەرەی هەندێ کێشەی وەکو (کەلامی خودا، کەسبی بەندە، چاك و چاکتر بۆ خودا...هتد) بدا.

باسەکە لەدوو بەش پێکهاتووە :

**تەوەرەی یەکەم** : لایەنی تیۆری باسەکەیەو لە سەرەتاو مێژووی ئەشعەری دواوە و بۆچوونەکانی دیاری کردووە.

**تەوەرەی دووەم** : خاڵە سەرەکییەکان پێناسە کراون و نموونەیان لە عەقیدە کوردییەکە بۆ وەرگیراوە.

## تەوەرەی یەکەم

## ( سەرەتای پەیدابوونی ئەشعەرییەت )

هەرکە دەوڵەتی ئیسلامی پێکهێنرا و سنوورەکانی فراوان بوو، چەندەها نەتەوەی جیاواز هاتنە ناو ئیسلامەوە و کۆمەڵێ کێشەی ئایینی سەری هەڵداو دەبوایە وەڵامیان بدرێتەوە ((لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەمی کۆچی _ یاخود سەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچی _ چەند تێڕوانینێکی نوێ بۆ ئاین لەلایەن موسڵمانەکانەوە سەری هەڵدا و گفتوگۆ کردن لەسەر سەرچاوەی بڕیاردان لەسەر پرسە ئاینییەکان و فەرمانە شەرعییەکان سەر هەڵدەدا))[1].

لەسەدەی دووەمی کۆچیدا دوو چین زانای موسڵمان پەیدا دەبن، یەکەمیان ڕوو لە قورئان و حەدیس دەکات و دووەمیان ئاین بەپێی عەقڵ هەڵدەسەنگێنێ ((بیرکردنەوە لە سەدەی سێیەمی کۆچی بەرەو ئاڵۆزی چوو، دەستەیەك تەوژمێکی دژە عەقڵییان ڕێکخست و دژایەتیی عەقڵیان دەکرد و ئەمانە بە ئەهلی حەدیس ناودەبران و مالیکی کوڕی ئەنەس _ ١٧٩ ك.م _ لەوان بوو و دژی موعتەزیلەکان بوون))[2].

موعتەزیلەکان دەیانویست بنەماکانی ئیسلام لەسەر بنچینەی بەڵگە هێنانەوە و بیرکردنەوەی عەقڵانی ڕێك بخەن و خەلیفەکانی عەباسی _ مەنسوور و مەئموون _ پشتگیرییان دەکردن. لەو ماوەیەدا کەسانێك پەیدابوون و هەوڵیاندا شیرازەی لێکپچڕاوی دۆخەکە بخەنەوە سەریەك و بەهەمان میتۆدی بیری موعتەزیلەکان

وەڵامیان بدەنەوە، ئەوانەش ماتوریدی و ئەشعەرییەکان بوون. بەمردنی خەلیفە واسیق موعتەزیلەکان بەرەو کزی چوون و لەگەڵ دەست بەکاربوونی موتەوەکیل ٢٣٢ _ ٢٤٧ ك وەکو خەلیفە کەوتە دژایەتی کردنی موعتەزیلەکان و ڕووی لە ئەهلی سوننەت کرد[٣].

ئەبوو حەسەنی ئەشعەری تا تەمەنی چل ساڵی قوتابیی (علی جوبائی)ی زانای موعتەزیلە بوو و خۆشی بەیەکێك لە زاناکانی ئەو گرووپە دادەنا. بەڵام ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئەو و مامۆستایەکەی لەسەر هەندێ بیروباوەڕی ئاینی و بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ لە ماڵدا دەمێنێتەوە و بیر لە بۆچوونەکانی موعتەزیلە دەکاتەوە و پاشان لە (٣٠٠)ی کۆچییەوە لە ڕۆژی هەینی بەخەڵکی ڕادەگەیەنێ و دەڵێت: (خەڵکینە پێشتر باوەڕم بە خەلقی قورئان هەبوو و وام دەزانی کە خودا بەچاو نابینرێ، بەڵام ئێستا لەمانە پەشیمانم و لەمەودوا بەرپەرچی رای موعتەزیلەکان دەدەمەوە))[٤].

ئەشعەری کە وازی لە موعتەزیلە هێنا لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بوو :

١ – مامۆستاکەی ئەشعەری نەیتوانی وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ئەشعەری بداتەوە[٥].

٢ – شێوازی هزری موعتەزیلە بەهایەکی ڕەهایان بەعەقڵ دابوو، ئاینیش بڕوای بە غەیب هەیە غەیب و عەقڵیش لە هەموو حاڵێکدا یەك ناگرنەوە و لە ئەنجامدا عەقڵ بە پیرۆزتر دادەنرێ لە وەحی[٦].

٣ – ئەشعەری مەترسی ئەوەی هەبوو کە ئیسلام لەناوبچی و کۆمەڵگا فیتنەی تێ بکەوێ، بۆیە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەی سێیەمی دا [٧].

بەم پێیە ئەشعەرییەت ڕۆڵێکی میانڕەوی نواند لەنێوان بیری سەلەفی و هزری عەقڵگەرایی موعتەزیلی . بۆ نموونە: سەبارەت بەوەی کە گوناهی گەورە بکا و تۆبە نەکات با زۆر لە خوا ترسیش بووبێ هەمیشە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بەڵام ئاڕاستەی دووەم لەو باوەڕەن کە گوناهی گەورە کار لە باوەڕەکەی ناکات، کەچی ئەشعەرییەکان ڕێگایەکی ناوەندییان گرتە بەرو ڕایانگەیاند کە چارەنووسی ئەو کەسە بە ویستی خودا بەستراوەتەوە ، ئەگەر بیبەخشێت دەچێتە بەهەشتەوە دوای سزادانی لەسەر گوناهەکەی [٨].

## ( بنەما هزرییەکانی ئەشعەرییەت )

موعتەزیلـەکان متمانەیـەکی ڕەهایـان بـە عـەقڵ هـەبوو، بۆیـە ئەشـعەرییەکان هەڵوێستیان بەرامبەریان وەرگرت ((ئەشعەرییەت لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە عەقڵ ناتوانێت باشە و خراپە فەرز بکات و ... تەنیا خودا دەتوانێ شـتەکان فـەرز بکـا))[9]. کەواتـە لـە سـەردەمی ئەشـعەرییەکان ئـازادیی هـزری کەوتـە قـالبێکی تەسـکەوە، بـەڵام هەنـدێ لـە ڕابـەرەکانی ڕێبازەکـە ڕێگـەیان بـە لۆجیـك دا لـە بیرکردنەوەدا و جیاوازییان دانـا لـەنێوان لۆجیـك و هـزری فەلـسەفی و تەنانـەت لـە ڕووبەڕوو بوونـەوەی توندوتیـژی هـزرە فەلـسەفییەکاندا ئەشـعەرییەکان لـە ڕیـزی یەکەمی ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەن.

بنەما هزرییەکانی ئەشعەرییەکان ئەمانەی خوارەوەن:

١ – خود و سیفەتەکانی خودا.

٢ – کەلامی خودا.

٣ – تیۆریی گەردوون.

٤ – باش و باشترین بۆ کاری خودا.

٥ – چاکە و خراپە.

٦ – بینینی خودا.

٧ – کێشەی باوەڕ.

٨ – دەسەڵاتی ڕەهای خودا.

٩ – سەربەخۆ نەبوونی مرۆڤ و تیۆری کەسب.

١٠ – ئەرکی سەرووی توانا.

١١ – شەفاعەت کردن.

١٢ – پاداشت و سزا و گوناهی گەورە.

١٣ – تیۆری مەعریفە.

١٤ – چەمکی پێغەمبەری.

١٥ – موعجیزە.

١٦ – سیستەمی هۆ و هۆکرد.

١٧ – پێشەوایی و جێنشینی.

١٨ – بۆچوونی دژە عەقڵ.

١٩ – چەند بابەتێکی دیکە.

## تەوەرەی دووەم

ئەمانە تەنیا ناونیشانی بابەتە هزرییەکان بوون و لەمەودوا هەر کە هاتینە سەر عەقیدە نامەکەی مەولانا خالید بە کورتی لێیان دەدوێین. بۆ زانین مەولانا خالید ئاماژەی بە هەندێك لەم بابەتە هزرییانە کردووە نەك هەمووی.

ئێستاش بەپێی عەقیدەنامەکەی باسی یەکە یەکە لەو بنەما هزرییانە دەکەین و ڕوونیان دەکەینەوە:

١) **بینینی خودا:** هاوەڵانی حەدیس لەو باوەڕەن کە خودا لە ڕۆژی قیامەت وەکو مانگی چواردە شەو بەچاو دەبینرێت، بەڵام کافرەکان لەبەرئەو پەردەیەی نێوان ئەوان و خودا، خودا نابینن[1]. موعتەزیلەکان ئەم بینینە ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن: لەبەرئەوەی خودا لە تەن و شێوە و ڕوخسار و گۆشت و خوێن و جەوهەر و فۆرم دوورە، بۆیە بینینی مەحاڵە. ئەشعەری بەجۆرێکی دی دەڕوانێتە کێشەکە: خودا هەیە بۆیە دەبێ بە وەسفێکی تایبەت بەخۆی لە بوونەوەرەکانی دیکە جودا بێتەوە، هەموو بوونێ دروستە ببینرێت لەبەرئەوەی بوونی هەیە[11]. هەروەها دەڵێن: بۆ بینینی خودا بە چاو سێ بەڵگەی عەقڵانی هەیە:

١ – بینینی خود ا بەڵگەی خولقێنراویی خودا نییە، ئەگینا دەبوو هەموو خولقێنراوێ ببینرێت .

٢ – بینین نابێتە هۆی دروستبوونی واتایەك لە شتدا، چونکە ڕەنگەکانیش دەبینرێن بەڵام هیچ واتایەکیان تێدا دروست نابێ .

٣ – سەلماندنی بینین پێویستی بە چواندن و ڕەگەز دیارکردن و یاخود گۆڕینی حەقیقەت بۆ خودا نییە، چونکە ئێمە ڕەش و سپی دەبینین بەڵام ئەم بینینە نابێتە هۆی هاو ڕەگەزی یان لێکچوونی نێوانیان [12].

مەولانا خالید لەگەڵ بۆچوونی ئەشعەرییەکانە و پێی وایەو دەشێ لە دونیا خودا بەچاو ببینرێت، بەڵام ڕووی نەداوە و لە ڕۆژی بەپا بوونەوەش دەبێت بەڵام بەبێ لێکچوون (( چاو پێکەوتنی لە دونیا جائیزە، واقیع نەبووە، لە قیامەتدا دەبێت بە بێچوونی )) [13] لە شوێنێکی دیکە مەولانا لەو باوەڕەیە کە پێغەمبەر (د.خ) لە میعراجدا چاوی بە خودا کەوتووە بە بێچوونی وەك چۆن بەهەشتییەکان لە

قيامەتدا خودا دەبينن بـە بێـچوونی (( گەیوەتـە حـزووری خـودای تـەعالا، چـاوی پێکەوتووە وەك لە قیامەتدا چاویان پێدەکەوێ بە بێچوونی )) [١٤].

**٢ ) خود و سيفەتەكانی خودا:** ئەشـعەرییەکان بـۆ ئەمـە ڕێگەیـەکی عـەقلانییان گرتەبەر و لە خولقاندنی مرۆڤ دوان و بەپێی عەقڵ روونیان کردەوە کە مرۆڤ خـۆی خـۆی نەخولقانـدووە بـەڵکو خولقێنـەرێکی توانـا و دانـا و خـودان ویـست ئـەوی خولقاندووە [١٥] .

خود لە چوارچێوەی ویست بە دیار دەکەوێت، موعتەزیلـەکان ڕایـان وایـە کـە ((خودا لەهەموو سـیفەتێ دوورە و سـیفەتەکان لـە خـودی ئـەون، ڕواڵەتگـەرەکان خوایـەتییان وەکـو کۆمـەڵێك نـاو و سـیفەتی جـودا لـەخودی خـودا تەماشـا دەکرد)) [١٦].

ئەشـعەرییەکان ڕێگـەی سـێیەم هەڵدەبـژێرن و پێیـان وایـە کـە خـودا خـاوەن چەندین ناوو سیفەتە، بەڵام ئەم سیفەتانە نە بەشێکن لە خودی خود و نە جـودا و سەربەخۆشن لە خود، بەڵکو لەسەر خودن و لێی جودا نابنەوە [١٧].

خود نیشانەی هەبوونە، هەبوونیش دەبـێ بـە جۆرێـك هاتبێتـە دی کـە چـەند سـیفەتێکی تایبـەتیی بـەخۆی هـەبێت، بـەڵام خـودی خـودا لـەم ڕێسایە بـەدەرە چونکە خولقێنراو نییە و ئەزەلی و ئەبەدییە. ئەشـعەرییەکان دە بنـەما بـۆ خـودی خودا دادەنێن ((خودا هەیە، یەکتایە، جەوهەرینە، تـەن نییـە، دەرکـەوتراو نییـە، شـێوەیێ یـان شـوێنێکی تایبـەتیی نییـە، دەکـرێ ببینرێـت، هەمیـشە دەمێنێتەوە)) [١٨].

مەولانا خالید بە بێچوونی سەیری خود و سـیفەت و کردەوەکـانی خـوا دەکـا، چونکە خوا خۆی بێچوونە بۆیە دەبێ ئەمانەش وابن ((لـە ذات و صـیفات و فیعلـدا تەنها و بێ شەریکە، قەت ناگۆڕێت)) [١٩]، لەشوێنێکی دیکەدا ڕوونی دەکاتـەوە کـە خودا حەفت سیفەتی ئەزەلی هەیە و وەکو خودی خۆی بەهیچ شتێ ناچن و پێوانە و عەقڵ دەرك ناکرێن ((حەفت یا هەشت سیفەتی ئـەزەلی هـەموو وەك زاتـی خـۆی بێـچوونن هەیـەتی، هیـچیان وەك سـیفەتی مـەخلوقاتی نـین .... )) [٢٠]، ئـەم سـیفەتانە نیـشانەیەکیان لـە خـودی مرۆڤـدا هەیـە لەگـەڵ جیاوازییـەکی زۆری نێوانیان، سیفەتەکانیش ئەمانەن ((زیندووە، زانینە، خواهیشتە، توانینە، بیستنە، دیتنە، قسەکردنە)) [٢١].

۳ ) **<u>کـەلامی خـودا:</u>** لـەبارەی بـوونی قورئانـەوە کێـشەیەکی زۆر لـە ئـارادا بـوو، هاوەڵانی حەدیس دەیانگوت: قورئان کەلامی خودایە و حادیس نییـە، پیتـەکانیش حادیس نین و هەرچی بە حادیسی دابنێ کافرە[٢٢]. موعتەزیلەکان لەو باوەڕەن کە خودا بەتەنیا خۆی قەدیمە و هـیچ قـەدیمێکی دیکـەی لەگـەڵ نییـە و هـەر کەسـێ سیفەتێکی دیکەی قەدیم بسەلمێنێ ئەوا هەبوونی دوو خودایی سەلماندووە[٢٣].

ئەشعەری لەم بارەیەوە دەڵـێ: کـەلام یەکێکـە لـە سـیفەتەکانی خـودا، واتـا: خودا موتەکەلیمە و کەلامەکەشی قەدیمە، بەڵام بۆئەوەی دووچاری هەمان کێشەی هاوەڵانی حەدیس نەبێ کەلام دەکاتە نەفسی و لەفزی، نەفسی بەقەدیم دەزانـێ و لەفزی بەحادیس[٢٤].

مەولانا خالید وەکو ئەشعەرییەك هەموو کەلامی خودا بە قەدیم دەزانێ و پێـی وایە ئەفرێنراو نییە ((هەموو کـەلامی قـەدیمن، صـیفاتی قـائیمن بـە ذاتـی خـودای تەعالاوە، مەخلووق نین))[٢٥]، کەواتـە مـەولانا ئـەو نەرمییـەی کـە ئەشـعەرییەکان نواندوویانە لەبارەی کەلامی نەفسی و لەفزییەوە ئەم نەینواندووە و هـەر هـەمووی بە قەدیم داناوە و سیفەتێکی وەستاوە بە خودی خوداوە و لێی جودا نییە.

٤ ) **<u>موعجیزەی پێغەمبەر(د.خ):</u>** موعجیزە کارێکی لـە ڕادەبـەدەرە و گـەر لەلایـەن پێغەمبەرانـەوە بـی (س.خ) موعجیزەیـە و گـەر لەلایـەن پیـاو چـاکانەوە بێـت کەرامەتە. موعتەزیلەکان پێیان وابوو ڕووە ئەدەبییەکەی قورئان موعجیزە نییـە و نـاکرێ مـوعجیزە بەڵگەیـەك بێـت لەسـەر ڕاسـتگۆیی پێغەمبـەران (س.خ). بـەڵام ئەشعەرییەکان بەگشتی باوەڕیان بـە مـوعجیزەی پێغەمبـەران (س.خ) هەیـە و بـە تایبەتی قورئان وەك موعجیزەی پێغەمبەری ئیـسلام دەزانـن. هـەروەها باوەڕیـان وایە کە ناردنی پێغەمبەران (س.خ) لەسەر خودا واجـب نییـە، بـەڵام دوای نـاردنی دەبێ موعجیزەی بۆ بنێرێ و پاڵپشتی بکات[٢٦].

مەولانا خالید باوەڕی بە هەموو موعجیزەکانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) هەیە و قورئانیشی کردۆتـە گـەورەترینی ئـەو موعجیزانـە ((قورئـان هـەمووی بردووەتـە پاشەوە، لە هەمووان چاترە، بە ئەمەکە هەر لە ئەییامی ڕەسولوڵلاوە تـا ئیمـڕۆ و هەر تا دنیاش دەبڕێتەوە بەبێ زیادی و کەمییە و غەڵەتی نییە، عیلمی ئـەوەلین و ئاخرینی تێدایە، گەورەترین موعجیزاتی ڕەسولوڵلایە))[٢٧].

**٥ ) چەمكی پێغەمبەری:** هەموو گرووپە ئیسلامییەكان لەسەر پێغەمبەریی محەممەد (د.خ) كۆكن، بەڵام لەسەر هەندێ باسی لاوەكی ناكۆكییان هەیە. موعتەزیلەكان پێیان وایە بێگوناهیی پێغەمبەران (س.خ) كارێكی جەبری نییە، بەڵكو ئەمە سۆزێكە لە خواوە، هەروەها لایان وایە كە پایەی فریشتەكان لە پێغەمبەران (س.خ) لە پێشترە و ناردنیان لەلایەن خواوە واجب بووە. بەڵام ئەشعەرییەكان لەو باوەڕەن كە ناردنی پێغەمبەران (س.خ) لەسەر خودا واجب نییە و لەدوای هەناردنیان بە موعجیزە پشتیوانییان لێ دەكات[٢٨].

موعتەزیلەكان لەو باوەڕەن كە بەریبوونی پێغەمبەران (س.خ) لە گوناهان حەتمی نییە، گەر لێشی دوور بن جۆرە سۆزێكی خوداییە، بەریبوون لە تاوان چوار جۆرە:

١ – بەریبوونی بیروباوەڕی.
٢ – بەریبوونی بانگەشە كردن.
٣ – بەریبوونی فتوایی.
٤ – بەریبوون لە كردار و ئاكار.

لە سێ خاڵی یەكەمدا مەحاڵە و بواری هەڵە كردنی تێدا نییە، لە خاڵی چوارەم لەوانەیە تووشی هەڵە و گوناهی بچووك بن[٢٩]. بەڵام ئەشعەرییەكان پێیان وایە پێغەمبەرەكان (س.خ) لە هەموو گوناه و كارێكی خراپ دوورن.

مەولانا خالیدیش وەكو ئەشعەرییەكان هەمان باوەڕی هەیە كە پێغەمبەران (س.خ) لە گوناه و تاوان بەرین، جا گەورە بێت یا بچووك ((لە پاشانیش هیچ گوناهی گەورە و بچووكی نین))[٣٠].

**٦ ) شەفاعەت كردنی پێغەمبەران (س.خ):** شەفاعەت كردن تكا كردنی پێغەمبەرە (د.خ) بۆ گوناهكارانی ئاینەكەی. موعتەزیلەكان پێیان وایە شەفاعەت كردن گوناهكارێ لە دۆزەخ ڕزگار ناكات[٣١]. ئەم هەڵوێستە توندە لە بەرامبەر ڕای هەندێك بوو كە دەیانگوت ((پێغەمبەر و عەلی بێ مۆڵەت وەرگرتن لە خودا شەفاعەت بۆ ناموسڵمانانیش دەكەن))[٣٢]. بەڵام ئەشعەرییەكان شەفاعەتكردنی پێغەمبەر (د.خ) بەڕەوا دەزانن بە ئیزنی خودا، شەفاعەت كردنەكەش بۆ گوناهبارانە(٣٣).

مەولانا خالید وەکو ئەشعەرییەك باوەڕی بە شەفاعەت کردنی پێغەمبەر(د.خ) هەیە بۆ گوناهباران، نەك هەر ئەمە بەڵکو پێی وایە هەموو پێغەمبەران و پیاوچاکانی ئەو پێغەمبەرانە (س.خ) توانای شەفاعەت کردنیان هەیە ((هەمووان لە قیامەتدا بە ئیزنی خودای شەفاعەت دەکەن بۆ گوناهکاران و قوبوڵیش دەبێ بەڵکو صالح و ئەولیای ئوممەتیشیان وەهایە))[٣٤].

**٧ ) ئازاردانی ناو گۆڕ:** موعتەزیلەکان پرسیار و وەڵام و سزای ناو گۆڕ لە ڕووی عەقڵەوە پەسندی ناکەن[٣٥]. ئەشعەرییەکان باوەڕیان بە سزای ناو گۆڕ هەیە بە بەڵگەی ئەوەی خەوتوو لە خەوندا بێ جووڵەیە هەست بە ئازار و چێژ دەکات. مەولاناش هەمان بۆچوونی ئەشعەرییەکانی هەیە و لە دوو سێ شوێندا ئاماژەی پێکردووە، لەوانەش ((مونکیر و نەکیر مەلەکی سوئالی عەزابی قەبرن))[٣٦] هەروەها دەڵێ ((قەبریش وەهای دەگوشێت پەراسووی ڕاست و چەپی تێك دەپەڕێنێ))[٣٧].

**٨ ) حەشر کردن و بەهەشت و دۆزەخ:** غەزالی کە ڕابەرێکی ئەشعەری بووە لەبارەی حەشرەوە دەڵێت: حەشر و نەشر ڕاستن چونکە بۆ عەقڵ شیاوە و بریتییە لە گەڕاندنەوە لە دوای نەمان، ئەم کارەش بۆ خودا لە تواناداییە وەکو سەرەتای سەرهەڵدان و ئەفراندن[٣٨].

هەبوونی بەهەشت و دۆزەخ جێی کێشە نییە، بەڵام موعتەزیلەکان دەڵێن: ئێستا نین و لە ڕۆژی دوایی دەبن، چونکە هەبوونیان ئێستا زەرووورەتی نییە و پاش حیساب پێویستن[٣٩]. کەچی ئەشعەرییەکان دەڵێن: نابێ بگوترێ خولقاندنی بەهەشت و دۆزەخ بەر لە ڕۆژی حەشر بێ سوودە[٤٠].

مەولانا خالید پێی وایە مرۆڤ لەناو گۆڕەوە لە کونێکەوە سزادانی دۆزەخییان دەبینێ، هەروەها مردووەکانیش لەناو گۆڕ ڕاست دەبنەوە بۆ حەشرکردن ((ئەگەر جوابی بە دروستی دایەوە قەبری لەبۆ فراوان دەبێتەوە، کولانێکی لە بەهەشتی بە طەرەفی قەبری ئەوی دەکرێتەوە، شەو و ڕۆژ جێگەی خۆی لە بەهەشت چاو پێ دەکەوێت......ئەگەر لەجوابدا ڕاوەستا بە گورزی ئاگر وەهای لێدەدەن ....قەبریش وەهای دەگوشێت پەراسووی ڕاست و چەپی تێك دەپەڕێنێ، وە هەم لە طەرەفی جەهەننەمەوە کولانێکی بۆ دەکرێتەوە هەموو ئێوار و سبەینان جێی

خۆی چاو پێدەكەوێت لە جەهەننەمێ....ڕۆحیان بە بەردا دەكاتـەوە، لـە قەبریـدا هەڵیان دەستێنێت بە قودرەتی خۆی دەیانباتە جێگای حەشرێ))[٤١].

**٩) پـردی سیرات:** ئەشـعەرییەكان سـەبارەت بـە بیـستراوەكان لەوانـەش پـردی سیرات، پێیان وایە واجبە باوەڕیان پێ بهێنی، غەزالی دەڵێت: ((پردێكە كە بەسەر دۆزەخدا تێدەپەڕێ و لە موو باریكترە و.....هەبوونی شتێكی وەها مـەحاڵ نییـە، كەواتە دەبێ هەموو باوەڕدارێك باوەڕی پێ بێنێ، خودایێ كە بتوانێ باڵندەیەك بە ئاسمانـدا بفڕێنێـت دەشـتوانێت مـرۆڤ بەسـەر سـیراتدا بپەڕێنێتـەوە))[٤٢]. مـەولانا خالید بە دوور و درێـژی باسـی ئـەم پـردە دەكـات و نـاوی نـاوە (پـردی قیامـەت) ئەمەش ناوێكی زۆر لەبارترە لە(پردی سیرات)* ((پردی قیامەت كە پردێكە لە موو بـاریكترە، لـە تیـغ تیـژترە، بـە ئـەمری خـودای تـەعالا دەینێتـە سـەر پـشتی جەهەننەمێ، ئەمر دەكەنە هەمووان بەسەریدا رابوورن. هەر كەسێ بەهەشتی بێ، هێنـدێك وەك برووسـكە، هێنـدێك وەك بـا هێنـدێك وەك ئەسـپی لـنگ بـە سـەریدا رادەبـوورن . هەركەسـێ جەهەننـەمی بـێ پێـی هەڵدەخلیـسكێ دەكەوێتـەوە جەهەننەمەوە [٤٣].

**١٠- جێنـشینی و هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ص)** : موسـڵمانەكان لـە بـارەی جێنشینەوە ڕای جیاوازیان هەبووە و هەیە . موعتەزیلەكان لەم ڕووەوە دەبنە دوو بەش: بەشێكیان پێیان وایە كە جێنـشینی لـە ڕێگـەی دەقـەوە دەبێـت كـە پـێش وەختە دەستینشان كرابێ، بەشەكەی دیكە بۆ هەڵبژاردنی دەگێڕنەوە.[٤٤]

ئەشـعەرییەكان پێیـان وایـە كـە پێـشەوا بـەپێی ڕێكـەوتن و هەڵبـژاردنی نێـوان موسـڵمانەكان دەبـێ نـەك بـە پێـی دەقێكـی پـێش وەختـە و دیـاریكردنێكی پێشووتر[٤٥]. بۆیە دەستنیشانكردنی هەر چوار خەلیفەكان بە كارێكی چاك دەزانن و لە سەر بنەمای دانایی و فەزڵداریی هەریەكەیان دانراون[٤٦].

ئەشعەرییەكان خۆیان لەو بڕیارە ناشیاوانە دوورخستەوە كە لەبارەی تەلحە و

* (صراط) بە واتای ڕێگا دێت ، پردی سیرات واتە (پردی ڕێگا ) كە شتێكی نەشیاوە، كەواتە پردی قیامەت شیاوترە لە پردی ڕێگا .

زوبێر و عایشە و یەزیدا دراوە و لەو باوەڕەن کە ئەوانە لە کارەکەیان پاشگەز بوونەتەوە و خراپەیان دەربارە نالێن[٤٧].

مەولانا خالید پێی وایە ئال و ئەسحابەی پێغەمبەر (ص) لە هەموویان چاکترن و یەکە یەکە بە چاکە ناوی خەلیفەکان (ابوبکر، عمر، عثمان، علی) دێنێ و بە خەلیفەی پێغەمبەریان حسێب دەکات . بەڵام مەولانا خەلیفەکانی راشیدین دەکاتە پێنج و حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلیش بە خەلیفە حسێب دەکات ((لەنێوان هەمواند حەزرەتی ئەبوو بەکر لە پاش پێغەمبەران چاترینی ئەووەلین و ئاخیرینی ئەولادی ئادەمە، خەلیفەیی ئەووەلی رەسولوڵلایە.... لە پاش عومەری کوڕی خەتاب خەلیفەی دووەمینە، لە پاش ئەوی ئیمام عوسمانی کوڕی عەففانە، لە پاش ئەوی ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالیب خەلیفەی چوارەمینە، لە پاش ئەوی ئیمام حەسەنی کوڕی ئیمام عەلی خەلیفەی پێنجەمینە))[٤٨]، هەروەها لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە مەولانا خالید بە خراپە باسی کەسیان ناکا و لەم ڕووەوە دەڵێت : هەرکەسێ موسڵمان بێ دەبێ جەمیعی ئال و ئەسحابی خۆشبوێ لەبەر خۆشەویستیی خودا و ڕەسوولی لەورا ئەو سەروەرە فەرموویەتی: هەرکەسێ دۆستی ئەوان بێ دۆستی منیشە، هەرکەسێ دوشمنی ئەوان بێ دوشمنی منیشە....هەم لەم حەدیسەدا هەیە خەدیجە و عایشە حەرەمی رەسولوڵلا و فاطمەی کچی لەگەڵ مەریەمەی دایکی عیسا پێغەمبەر و عاسیەی کچی موزاحیم چاترینی هەموو ژنی ئەولادی ئادەمن[٤٩].

١١- <u>دادپەروەری و دەسەڵاتی ڕەهای خودا</u> : هەموو لایەنە ئیسلامییەکان کۆکن لەسەر دەسەڵاتی مەزنی خودا، ئەوەی ناکۆکی دەخاتە نێوانیانەوە بنەمای ئەنجامدانی کارەکانە لە لایەن خوداوە.

موعتەزیلەکان بیردۆزیی دادپەروەریی خوایی دەخەنە ڕوو و دەڵێن : خودا دادپەروەرە و کارەکانی لەسەر بنەماکانی دادپەروەری جێبەجێ دەکا، بۆیە ناکرێ لە ڕۆژی دوایی چاکەکاران پاداشت نەکا و خراپەکارانیش سزا نەدات. ئەگەر وا نەکات دادپەروەرییەکەی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە[٥٠]. ئەشعەرییەکان بە پێچەوانەی موعتەزیلەکانن و لەو باوەڕەدان کە ((واتای دادپەروەریی خودا ئەوە

نييه كـه پـەيڕەويى ياساكانى دادپـەروەرى بكـا، بـەڵكو مەبەست ئەوەيـه خـودا سەرچاوەى دادپەروەرييه و ئەوەى دەيكات خودى دادپەروەرييه نـەك ئـەوەى كـه ئـەو كـارەى بـه پێـى دادپـەروەرى ئـەنجامى داوە)) [٥١]. هـەروەها باوەڕيـان بـه دەسـەڵاتى ڕەهـاى خـودا هەيـه و پێيـان وايـه هـەموو كارەكـانى دادپەروەرانەيـە، چونكه خودا دەفەرموێ ((وما ربك بظلام للعبيد)) [٥٢].

غەزالى دەڵێت : لەبەرئەوەى خودا قەت خراپەى بەنـدەكانى نـاوێ، بۆيـه مـرۆڤ هەر شتێكى بێته ڕێ باشه [٥٣].

مەولانا خاليد لەبارەى پاداشت و سزاوە بە جوانى ڕوونى كردۆتەوە، كه خـودا چـاكه و خراپـەى لا بـزر نابـێ و پاداشـتى چـاكان دەداتـەوە و سـزاى خراپـان بـه دادپەروەرى دەدا ((جەزاى چاكيان دەداتەوە به چاكى هى به خراپيان به خراپى، هەم هێندێكيان دەگرێت سەبەب گوناهێكى صەغيرە به عەدل، له گوناهى هێنـدێك گوناهكاران خۆش دەبێت بـه غـەيرى كـوفر، قـەت لـه كـافران خـۆش نابێـت)) [٥٤]، كەواته گوناهى گەورەش جگه له كوفر ڕێى تێدەچێ كه خودا بيبوورێت له ڕێگـەى شەفاعەتى پێغەمبەر و ئەوليا و پياو چاكانەوە، ((هەم ئەنبيا و ئـەوليا و مەلايكـە و صالحان شەفاعەت دەكەن بۆ گوناهى گەورە و بچووكى موسـڵمانان چـەندان كـو بێ تـەوبه مردبن)) [٥٥].

**١٢- <u>كێشەى باوەڕ</u> :** كێشەى باوەڕ لەو پرسيارەوە دێ : كێ خاوەن باوەڕە تا چ كاتێ به باوەڕدارى دەمێنێتەوە؟ ئەشعەرى لەم ڕووەوە پێيـان وايـه كـه بنـەڕەتى بـاوەڕ پـشتڕاستكردن و بـاوەڕ پێهێنانـه بـه دڵ، بـەڵام بەسـەر زار داهێنـانى و كاركردن به بنەماكانى ئاين لەڕيزى بەشەكانى باوەڕن . مەبەست لـه بـاوەڕ پێنـان به دڵ ئەوەيه كه دەبێ تاكى موسڵمان به دڵ دانـى بـه يـەكتايى خـودا هێنابێـت و بـاوەڕى بـه پێغەمبـەران و (س.خ) پەيامـەكانيان هـەبێت . ئەگـەر موسـڵمان لـەو كاتەدا گيانى له دەست بدات ئەوا به موسـڵمانى و بـاوەڕدارى كۆچـى كـردووە [٥٦]. هەروەها ئەشعەرى ڕاى وايه كـه كـوفر و بـاوەڕ لـه لايـەن خواوەيـە، بۆيـه بـاوەڕ سەركەوتنێكه كه خودا به بەندەكانى دەبەخشێت و سەركەوتنەكەش يەكسانه بـه ئەفراندنى تواناى ملكەچى لاى مرۆڤ [٥٧].

لەسەرەتای ئیسلامدا باوەڕ تەنیا بە زار کۆتایی پێ دەهات و زۆر مەرجی دیکەی لەگەڵ نەبوو، بەڵام پاشان جیاوازی کەوتە نێوان زانا کەلامییەکانەوە لەبارەی باوەڕ هێنانەوە، خودی ئەشعەری دوو پێناسەی جیاوازی بۆ چەمکی باوەڕ کردووە، لەوانەش باوەڕی وایە کە باوەڕ زیاد و کەم دەکات ((الأیمان قول و عمل یزید و ینقص))(٥٨).

مەولانا خالید پێی وایە باوەڕ تەنیا بە زار پێك نایەت و بەڵکو دەبێ لەناخی دڵەوە هەڵقوڵابێت و دڵنیایی پێوەبێت، بۆیە لە بارەی یەکەم بنەماکانی ئیسلام کە شایەتمانە دەڵێت: (ئەووەڵ ئەوەتە (اشهد) بە دڵ دەزانم بە یەقین، بە زوبان دەڵێم بە ئیختیار (ان لا اله) هیچ مەعبوودێ بە حەق نییە لایق بە پەرستن بێ (الا الله) ئیلا ئەو زاتە نەبێ واجبە بوونی))(٥٩) کەواتە سەر زارییەکەش دەبێ ویست و ئارەزووی لەگەڵ دابێ و بە زۆر نەبێ.

## پەراوێزەکان

١- تاريخ أديان ومذاهب، عبدالله آبادانى www Oiman Jawad Onet

٢- آشنايي با علوم اسلامي، رضا برنجكار، مؤسسة فرهنگى طه و سمت- تهران، ص٢٢.

٣- تاريخ مذاهب اسلامي، محمد ابو زهرة، ترجمة : علي رضا ايماني، ص٢٢٧ .

٤- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٨ .

٥- عامل فرهنگى بوجود آورندة اشاعره، جواد حسنى، WWW.Farageslam.net.

٦- تاريخ فلسفه اسلامي، هانرى كوربن، ترجمة : جواد طباطباهي، ص١٥٨ .

٧- خداشناسى از ابراهيم تاكنون، كرن آرمسترنگ، ترجمه : محسن سپهرى، ص١٩٥

٨- تاريخ مذاهب اسلامي، محمد ابو زهرة، ص٢٧٩ /الملل و النحل، ج١، ص٩٢.

٩- ايمان و آزادي، محمد مجتهدي شبسترى، ص١٣ .

١٠- خدا از ديدگاه قرآن، د.بهشتى. www.hawza.net

١١- المدخل الى دراسة الاديان والمذاهب، ج٢، العميد عبدالرزاق محمد اسود،ص٢١٨

١٢- حقيقت طمشدة، شيخ معتصم سيد احمد، WWW.alshia.com .

١٣- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد- عیراق- دەستەی کورد، ب٨ - ١٩٨١، ل٢٠٩.

١٤- سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦ .

١٥- الملل و النحل، ط٣، ج١، الشهرستانى، ص٨٦ .

١٦- تأريخ فلسفه اسلامي، هانرى كوربن، ص١٦٣/ دراسات في الفرق والعقائد الاسلامية،ص٢٣٢ .

١٧- فرق و مذاهب كلامي، علي زباني، ص١٨٧ .

١٨- فرهنگ فرق اسلامي، د.محمد جواد مشكور، ص٥٦ .

١٩- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ل٢٠٩ .

٢٠- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٩

٢١- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٩

٢٢- آشنايي با علوم اسلامي، ص٣٤
٢٣- الملل و النحل، ج١، ص٤٩
٢٤- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٨٧
٢٥- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ل٢١٢
٢٦- المدخل الى دراسة الاديان والمداهب، ص٢١٩- ٢٢٠
٢٧- گۆڤاری کوڕی زانیاری عیراق، ل٢١٣.
٢٨- الملل و النحل، ج١،ص٩٢.
٢٩- اصول عقايد معتزلة، WWW.balagh.net .
٣٠- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ل٢١٣
٣١- تاريخ مذاهب اسلامى، محمد ابو زهرة، ص٢٦٩
٣٢- تاريخ فلسفة در جهان اسلامى، ج١،حنا الفاخورى، ص١٥٤
٣٣- الملل و النحل، ج١،ص٩٢.
٣٤- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ل٢١٤
٣٥- ماجراى فكر فلسفى در جهان اسلام، ج١،ص٢٤٥
٣٦- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق، ل٢١١.
٣٧- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٠
٣٨- قواعد العقائد،محمد غزالى، ترجمة: د.على اصغر حلبى، ص١٧٤.
٣٩- ماجراى فكر فلسفى در جهان اسلام ، ج١ ،ص٢٤٥.
٤٠- قواعد العقائد ، محمد غزالى ،ص ١٧٦.
٤١- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق،ل٢١٩- ٢٢٠.
٤٢- قواعد العقائد،محمد غزالى،ص١٧٦.
٤٣- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق،ل٢١١.
٤٤- الملل والنحل ،ج١،ص٥٠.
٤٥- سەرچاوەی پێشوو،ل٩٤.
٤٦- قواعد العقائد،ص١٧٦.
٤٧- الملل والنحل ،ج١،ص٩٤.
٤٨- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق،ل٢١٧.

٤٩- سەرچاوەی پێشوو،ل٢١٧- ٢١٨.

٥٠- تاريخ فلسفه در جهان اسلامى،ج١،حنا الفاخورى ،ص١٢١.

٥١- معارف اسلامى ،جمعى از نويسندگان،ص٩٠.

٥٢- فصلت/٤٦.

٥٣- خير و شر ،سيد محمود موسوى،ص٥٦.

٥٤- گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق،ل٢١١.

٥٥- سەرچاوەی پێشوو،ل٢٢٢.

٥٦- الملل والنحل ،ج١،ص٩٢.

٥٧- سەرچاوەی پێشوو،ص٩٢.

٥٨- ايمان از ديدگاه معتزله و اشاعره وشيعه،عابدين درويش پور ،ص١٠٦.

٥٩- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق،ل٢٠٦ .

## ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەدا نووسەر گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- مەولانا خالید کە ڕابەر و دامەزرێنەری ڕێبازی نەقشبەندی بووە لە سلێمانی سۆفیگەرییەکەی سەر بە شەریعەت بووە و وەکو ئەهلی سوننەت و جەماعەت بیری کردۆتەوە و عەقیدەکەی بە پێی بۆچوونەکانی ئەشعەری نووسیوە.

٢- لە مەسەلەی بینینی خودادا سۆفییانە بیری کردۆتەوە و پێی وابووە کە پێغەمبەر (ص) لەمیعراجدا بە چاوی سەر خودای بینیوە، دوور نییە هەر ئەم بۆچوونە کاری لە (مەحوی) کردبێ و هەمان بۆچوونی دووبارە کردبێتەوە.

٣- لەبەر ئەوەی عەقیدەکەی بۆ خوێندەوار و نەخوێندەوار نووسیوە، بۆیە بە سادەیی بۆ کێشەکان چووەو هێندێکیشیانی فەرامۆش کردووە کە زۆر جێگای مشتومڕ بوونە.

٤- ناوی لە (پردی سیرات) ناوە (پردی قیامەت) کە پڕ بە پێستێتی.

٥- مەولانا کەلامی خودای بە قەدیم زانیوە و وەکو ئەشعەرییەکان نەیکردۆتە کەلامی نەفسی و لەفزی.

## سەرچاوەکان

**فارسييەکان**

١- آشنايي با علوم اسلامی، رضا برنجکار، مؤسسة فرهنگی طه و سمت،چاپ٣، تهران ١٣٨٤ .

٢- اصول عقايد معتزله، WWW.balagh.net .

٣- ايمان از ديدگاه معتزله و شاعره و شيعه، عابدين جرويش پور، دانشگاه قم، مرکز اربيت مدرس- ١٣٨٤ .

٤- ايمان و آزادي، محمد مجتهدی شبستری، انتشارات طرح نو، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، چاپ پنجم، تهران- ١٣٨٤ .

٥- تأريخ فلسفه اسلامی، هانری موربن، ترجمة : جواد طباطبايي،انتشارات کوير،چاپ٤،تهران- ١٣٨٤ .

٦- تاريخ فلسفه در جهان اسلام، م.م.شريف، مرکز نشر دانشگاهی، تهران- ١٣٨٤ .

٧- تاريخ مذاهب اسلامي، محمد ابو زهرة، ترجمة : علي رضا ايمانی، مرکز مطالعات و تحقيقات اديان و مذاهب، چاپ اول، پايز- ١٣٨٤

٨- حقيقت گمشده، شيخ معتصم سيد احمد، ترجمه:محمد رضا مهری، WWW.alshia.com .

٩- خدا از ديدگاه قرآن، د.بهشتی، WWW.hawaz.net .

١٠- خداشناسی از ابراهيم تاکنون، کرن آرمسترنگ، ترجمه، محسن سپهری، نشر مرکز، چاپ اول،تهران- ١٣٨٣ .

١١- خير و شر، سيد محمود موسوی، بجنوردی مجله متين، شماره:٢٢- ٢٤، ١٣٨٢ .

١٢- عامل فرهنگی بوجود آورنده اشاعره، جواد حسنی، WWW.ferag eslam.net

١٣- فرق و مذاهب کلامی، علی ربانی گلپايگانی، WWW.hawaz.net .

١٤- فرهنگ فرق اسلامی، د.محمد جواد مشکور، WWW.hawaz.net .

١٥- قواعد العقائد، محمد غزالی، ترجمه: د.علی اصغر حلبی، انتشارات جامی، چاپخانه ديبا، چاپ اول، تهران- ١٣٨٤ .

١٦- ماجرای فکر فلسفی در جهان اسلام، ج١، غلام حسین ابراهیمی دینانی،انتشارات طرح نو، چاپ سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، چاپ اول، تهران- ١٣٧٩ .

١٧- معارف اسلامی، (٢- ١)، جمعی از نویسندگان، سازمان مطالعه و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها (سمت)، چاپ سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، چاپ: ٢٨، تهران- ١٣٨٥ .

عەرەبییەکان

١٨- دراسات في الفرق والعقائد الاسلامية، د.عرفان عبدالحميد، دار التربية، مطبعة اسعد- بغداد- ١٩٧٧.

١٩ - الشيخ خالد النقشبندي ومنهجه في التصوف، جواد فقي علي، رسالة الدكتوراه، جامعة بغداد، كلية العلوم الاسلامية، ١٩٩٧.

٢٠- المدخل الى دراسة الاديان والمذاهب، ج٣، العميد عبدالرزاق محمد اسود، دار العربية للموسوعات،ط:١، بيروت- لبنان،١٩٨١.

٢١- الملل و النحل ، للامام الشهرستانى، ج١، تخريج محمد بن فتح الله بدران، مطبعة امير، ط:٣، قم- ١٣٦٨.

کوردییەکان

٢٢- گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی کورد،ب:٨،بەغدا- ١٩٨١.

## ملخص البحث

**د.ابراهيم احمد شوان**

هـذا البحـث الموسـوم ب(العقيـدة الاشـعرية في العقيـدة الكرديـة لمولانـا خالـد النقشبندي)، يتكون من المقدمة وفصلين.
حاول الباحث في المحور الاول ان يبين بأن علمـاء الكـرد الـذين كتبـوا حـول العقيـدة عبروا عنها بالنظم، الا ان خالد النقـشبندي كتـب هـذه الرسـالة بـالنثر لكـى يفهمهـا الجميع. و بيّن الباحث بأنّ المؤلف لم يتطرق في رسالته الى كـل المـسائل في العقيـدة الأشعرية وبالأخص موضوع كسب العبد وكلام اللّه.
وفي المحور الثاني حاول الباحث ان يعرف القراء بمختصر تأريخ ظهور الأشـعرية مـع بيان الأسس الفكرية التي انطلقت منها الأشعرية، ومنهـا: ذات اللّـه وصـفاتـه، كـلام اللّه، الصلاح والاصلح للّه، رؤية اللّه، الخير والشر، الشفاعة، نظرية المعرفـة، مفهـوم النبوة، الثواب والعقاب،الكبائر.......
وخلال شرح هذه الأسس قام الباحـث بأخـذ نـصوص مـن الرسـالة والتعليـق عليهـا وابراز علاقتها بالعقيدة الأشعرية. وبيّن الباحث بـأن المؤلـف اعتقـد في رسـالتـه بـأن الامام حسن بن علي هو خامس خلفاء الراشـدين، وانّ الـنبي (ص) في معـراجـه رأى اللّه بالعين المجردة.

## Synopsis

This study is entitled (The Ashhari Faith in the Kurdish Doctrian of Mawlana Khalid Naqshbandi) It presents a historical overview of the intellectual foundation of this doctrine and the influence it exercised on Muslim scholars. After that, the researcler examines the Kurdish doctrine of Mawlana Khalid to demonstrate the basis of Ashhari Faith to explain: the vision of God; the self and the characteristics of God; the miracles of the prophet ; the intercession of the prophet , the justice of God, the increase and decrease of faith.

Mawlana Khalid did tackle some intricate issues like (the speech of God, and the self-realization), He believed that Imam Hassan was the fifth Rashidi caliph and the prophet himself (PEUH) in his journey to the sky saw God with the naked eye.

# شێخ مارف بەرزنجی
# ژیانی و ناوەرۆکی هونەرە ئەدەبییەکانی
## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری وەسفییە

**پ.ی.د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید**

### پێشەکی

گەرمیانی کوردستان گەلێك بەهرەمەندی گەورەی تیا هەڵکەوتووە، کە بارودۆخی سەختی ژیانی سیاسی ناوچەکە و نالینەکانی کۆمەڵگا بەگشت شێوەکانییەوە پتر قالی کردوون و کردوونی بە خاوەن تاقیکردنەوەیەکی گەورەو دیاردەکانی جوامێری، وەك ڕاستگۆییو بوێری و خۆنەپەرستی لە دڵ و دەروونیدا چەسپاندوون.

شێخ مارفیش نموونەیەکی ئەو گۆڕەپانەیەو هەر لە منداڵییەوە کەوتۆتە بەر کارتێکەریی دیمەنە جوان و ڕەنگینەکانی سروشتی کوردستان و داب و نەریتی کوردەواری، لە بنەماڵەیەکی ئاینپەروەرو لە سایەی باوکێکی دڵسۆزدا، کە شێخێکی گەورەی خاوەن تەریقەت و نیشتمانپەروەر و بەهرەدار بووە، بەبێ نازی دایکی لە سەردەمی بلاوبوونەوەی هەستی نەتەوایەتیدا لەمیانەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمرەوە کە باوکیشی لایەنگرێکی بەهێزی بووە گەورە بووە، لە هەمان کاتیشدا ژیانی پڕ کوێرەوەری ڕەشوڕووتی وڵاتەکەی و جیاوازی چینایەتی سەرنجی ڕاکێشاوە.

قۆناغەکانی خوێندن لە قادرکەرەم و کەرکووك و بەغدا تەواو دەکات و کەشوهەوای ڕۆشنبیری هەر یەك لەم شارانەش کارتێکەریی گەورەی لە سەر بیرو بۆچوونەکانی دەبێ.

لە بەندیخانەدا بەهرەی ئەدەبی گەشە دەکات و توانستەکانی خۆی بەکاردێنی، کۆمەڵێك بەرهەمی ئەدەبی لە سەرجەم بوارەکانی داهێناندا لە دوای

خۆی بەجێ دێڵێ، کە شایانی ئەوەن ببن بە کەرەستەی گەلێك لێکۆڵینەوەی زانستییانە.

گەورەترین گرفت کە لەکاتی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا (شێخ مارف بەرزنجی – ژیانی و ناوەرۆکی هونەرە ئەدەبییەکانی) مەسەلەی کەمی سەرچاوە بوو، چونکە بەرهەمەکانی شێخ مارف وەك نووسەرانی دیکەی ناوچەی گەرمیان هێنەد نەبووەتە جێی بایەخی لێکۆڵەرانی کورد، بەلاّم خۆشبەختانە لە دیدارەکەیدا کەوا لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٩ لقی کەرکووکی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بەهاوکاری بنەماڵەکەی لە کەرکووك سازی کرد کۆمەلێك وتار و باس و تۆژینەوەی زانستی پێشکەش کرا بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم لێکۆڵینەوەیە وەك سەرچاوە سوودیان لێ بینرا.

لە بەرهەمە جۆری بابەتەکانیش زیاد لە رێبازێکی زانستی پێڕەو کرا، بەزۆریش لە سایەی هەردوو رێبازی شیکاری و وەسفیدا برگەکانی لێکۆڵینەوەکە بەئەنجام گەیەنران. مەوداکەشی سەردەمی ساڵانی تەمەنی شێخ مارفە (١٩٢١ – ١٩٦٣). ئامانجیشی لە دووپاتکردنەوەی ئەوەدا بەرجەستە دەبێ کە ناوەرۆکی بەرهەمەکانی شێخ مارف خزمەتی مەسەلەی رەوای نەتەوەکەی و مرۆڤایەتی دەکات.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکییەکەی سەرەوەو دوو بەش و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و کورتەیەك بەزمانی عەرەبی و کورتەیەك بە زمانی ئینگلیزی پێکدێت، بەشی یەکەم ناونیشانی (سەرگوزەشتەی شێخ مارف بەرزنجی) هەڵدەگرێ و لە دوو تەوەرە پێکهاتووە:

١– ژیانی و بەسەرهاتی.

٢– کارتێکەریی ژینگە لەسەر کەسێتی شێخ مارف.

بەشی دووەمیش تایبەتە بە ئەدەبیاتی شێخ مارف و دیسان لە دوو تەوەرە پێکهاتووە:

١– ئەدەب و ئەرکەکانی و، بیرو بۆچوونەکانی دەربارەی نوێگەری.

٢– ناوەرۆکی هونەرە ئەدەبییەکانی.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەشدا، بەپێی رێبازی زانستی پوختەی ئەو بۆچوونانە خراونەتە روو کە لێکۆڵەر بەپێی توانا بۆیان چووە. هیوادارم ئەم لێکۆڵینەوەیە خزمەتێك بە کەلتووری نەتەوەکەمان بگەیەنێ.

# بەشی یەکەم
# سەرگوزەشتەی مارف بەرزنجیی شەهید

## تەوەرەی یەکەم

**ژیانی و بەسەرهاتی:**

شێخ مارف بەر لەدایکبوونی، کوێرەوەرییەکان باوەشیان بۆ کردۆتەوە، چونکە وەك منداڵێکی ئاسایی لە منداڵدانی دایکیدا نۆ مانگ تەواو ناکات و بە حەوت مانگ لەدایك دەبێ، بێ گومان ئەمەش تەندروستی خستۆتە بارێکی ترسناکەوە و پێویستی بە چاودێری و خزمەتکردنێکی زیاد بووەو ئەو ئەرکەش کەوتۆتە سەر ئەستۆی دایکی کە خۆیشی نەخۆش بووەو دوای دوو ساڵ کۆچی دوایی کردووە. ساڵ و ڕۆژی لەدایکبوونیشی لە قادرکەرەم وەك لە دەستخەتەکەیدا [(1)] تۆماری کردووە دەکەوێتە پێنج شەممەی (٦) ی (جمادی دووەم) ی ساڵی (١٣٣٩) ی کۆچی کە بەرانبەرە لەگەڵ مانگی شوباتی ساڵی (١٩٢١) ی زاینی [(2)].

نووسەر دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی (شێخ حەسەن) ی قەرەچێوار کە جێنشینی کاك ئەحمەدی شێخ بووە، بۆیە زۆر بەناوبانگ بووە، باوکیشی (شێخ عەبدولکەریم) خاوەن تەکیە و تەریقەت و بە تواناو سوار چاك و قسە خۆش و دەنگ خۆش و شاعیر بووە. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەشت جار بەدوای یەکدا ژنی خواستووە، بێجگە لە زمانی نەتەوەکەی خۆی ، هەر سێ زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی زانیوە و لە میانەی شیعری شاعیرەکانیانەوە ئاگاداری ئەدەبیاتی ئەو سێ نەتەوەیە بووە، زۆر نزیکی شێخ مەحموودی نەمر بووەو تەنانەت لە بزووتنەوەکانیدا بەشداری کردووە، هەر بۆیەش لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا ماوەیەك لە بەسرە دەستبەسەر کراوە. دایکیشی ژنێکی شۆخ و خوێندەوارو لە پشتیشەوە سەر بەهەمان بنەماڵە بووە، خزم و دەستەخوشکی حەپسەخانی نەقیبیش بووە.

لـە قادرکـەرەم گـوێی پـڕ بـووە لـەدەنگی تـۆپ و فڕۆکـەو بۆمبابـارانی ناوچەکە لەلایەن هێزەکانی سوپای ئینگلیزو حکوومەتی بەغداوە.

هەر لەوێش ئـاگری نهێنـی ئـەوین لـە دڵـی بـەربووە و ماوەیـەك دووچـاری دڵدارییـەکی بێگـەرد دەبـێ، کـاتێکیش لەگـەڵ دڵدارەکەیـدا لەیـەك دادەبـڕێن، بەرچـاوی تاریـك دەبـێ و ماوەیـەك لـە مەرقەدەکـەدا گۆشـەگیر دەبـێ و خـەریکی خواپەرستی دەبێ. لە سـایەی باوکیـشیدا کـە بەرانبـەر بـە دەسـەلات هەڵوێـستی جوامێرانـەی هـەبووەو گـوێی نەداوەتـە مـاڵی دونیـاو دەسـتکورتی و نـەبوونی بەرانبەر بە ملکەچ نەکردن بۆ دەسەلاتی هەڵبژاردووە، نەشونمای کردووە.

باری ئابووری دەبێتـە هـۆی ئـەوەی دوو سـاڵ لـە خوێنـدن دابـڕێ، چـونکە پێویـستی بـەوە کـردووە بـچێ بـۆ شـاری کـەرکووك بـۆ تـەواوکردنی قۆنـاغی دواناوەندی، ئـەو شـارەی کـە تیایـدا ژیـانێکی پڕنـەبوونی و کـوێرەوەری لەگـەڵ حـسێنی برایـدا بەسـەردەبات، زمـانیش بووەتـە گرفـت بۆیـان، چـونکە خوێنـدن بەهەردوو زمانی تورکمانی و عەرەبی بووە. لە پۆلی یەکەمی ناوەندیشەوە دەچێتە ڕیزی پارتی " هیوا " وەو لەگەڵ مامۆستا ڕەفیـق حلمـی و کۆمـەڵێك ڕووناکبیری دیکـەدا کـاری ڕامیـاری دەسـت پێـدەکات. سـاڵی ١٩٤٠ لەگـەڵ کۆمـەڵێك لـە ئەنـدامانی دیکـەدا هەوڵـەکانی دەخاتــە گـەڕ بـۆ ئەنجامـدانی گۆڕانێـك لـەو ڕێکخراوەیەدا، بەلام سەر ناگرێ و دەبێتە مایەی دەرکردنی لەو پارتەدا. هـەر لـەو سەردەمەشـدا کـە خوێنـدکاری قۆنـاغی دواناوەنـدی دەبـێ و مامۆسـتای شـەهید شاکیر فەتاح بەڕێوەبەری ناحیەی قادرکەرەم دەبـێ و دیواربەنـدی" باسـەڕە "[٣] دەردەکات ئەمیش بابەتی تیا بڵاو دەکاتەوە و بەمەش کاروانی ڕۆژنامەنووسی لە ژیانی مارف بەرزنجیدا دەستی پێکردووە، وەك خۆیندکاریش هەمیـشە لـە ڕیـزی پێشەوەی زیرەکەکان بووە، بەلام لە وانەی وەرزشـدا بـەهۆی ئـازاری قاچـییەوە پلەی بەرزی وەدەس نەهێناوە .

سـاڵی (١٩٤٣) یـش کـە دواناوەنـدی تـەواو دەکـات و لەسـەر ئاسـتی لیـوای کەرکووك سییەم دەردەچێت، باوکی ژنی بۆ دێنێ (بـەبێ ئـەوەی ئـەم لـەوەوپێش دەزگیرانی خۆی بینیبێ) پاشان سەرکارێك دەگرێ و زۆری پـێ ناچـی بـە ناحـەق دەری دەکەن.

ساڵی ١٩٤٤ لەژێر کارتێکەریی بارێکی ئابووری سستدا ڕوو لە بەغدا دەکات، لــە کــۆلێجی (حقــوق) وەرئــەگیرێ و دەســتی دەگاتــە ئــازادیخوازان، لــە خۆپیشاندانەکانی ساڵانی ١٩٤٥، ١٩٤٦،١٩٤٧ لە ڕیزی پێشەوە دەبێ. مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ (پێش ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨) فرمانی گرتنی بۆ دەردەچێ ، ئەمیش خۆی دەشارێتەوە، سەردەمێك لە گەڕەکی (عقد النصاری) لە سەر شەقامی ڕەشید لە بەغدا (لەم ماوەیەدا جارێکی دی ئەوینێکی کتوپڕ سەردڵی دەگرێ – لەگەڵ کچە تلکێفییەك)، پاشان بەقاچاخ خۆی دەگەیەنێتە شاخەکانی دەوروبەری قادر کەرەم و خۆی دەشارێتەوە، دوایش کە بارەکە هێور دەبێتەوە بەیارمەتی باوکی دەتوانێ لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵدا بەشدار بێت و ساڵی ١٩٤٨–١٩٤٩ کە خوێندن تەواو دەکات دەبێتە پارێزەر، بەڵام هێند لە قورسی باری ژیانی کەم ناکاتەوە، ماوەیەك لە کۆمپانیای نەوت کاردەکات و ئەنجا جارێکی دی (دووچاری ڕاوەدوونان و خۆشاردنەوە دەبێت)، پاش هەڵگرتنی حوکمی عورفی دەست دەکاتەوە بە کاری پارێزەری لە ساڵانی ١٩٥١– ١٩٥٢ گۆڕانێك لە ڕەوتی ژیانیدا ڕوودەدات و بەرژەوەندیی کەسیی خۆی دەخاتە پێش هەموو شتێ، پاشان هەر زوو دەگەڕێتەوە سەر ڕێڕەوی خۆی و باوەڕ بەوە دێنێت کە مرۆڤ ئەگەر خاوەنی باوەڕێکی پیرۆز نەبێ بێ کەڵکە. ساڵی ١٩٥٢ شێخ لەتیف داوای لێدەکات لە هەڵبژاردنەکاندا خۆی بپاڵێوێ بۆ جێگرێتی پەرلەمان بۆ ئەو کورسییەی بۆ شێخ مەحموود تەرخان کرابوو، بەڵام قبووڵی ناکات و لە جووڵانەوەی ئاشتیخوازانەی لاواندا بەشداری دەکات. ساڵی ١٩٥٤ لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەددا لە نوێنەرایەتی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو لە ناوچەی سلێمانی بەرانبەر نوێنەرەکانی حکوومەت (عەلی کەمال و ماجید مستەفا) خۆیان ئەپاڵێون، ئەنجام حکوومەت لەڕێگای کاری تەزویرو ساختەکارییەوە نوێنەرەکانی خۆی سەردەخات ئەمەش هەرایەکی لێدەکەوێتەوە، ئەنجا باوکی کۆچی دوایی دەکات و حەوت مانگ شپرزەی ڕێوڕەسمی پرسە دەبێ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك و دیسان دەست دەکاتەوە بەکاری پارێزەری، لایەنگری جووتیاران و دژی دەرەبەگەکان دەبێ. ساڵی ١٩٥٦ لە کاتی دوژمنکاری سێقۆڵیدا بۆ سەر نۆکەندی سوێس توندی

بەندیخانە دەکرێت و دوایش بە کەفالەت ئازاد دەکرێت. دوای شۆڕشی ١٩٥٨ بە نوێنەری ئاشتیخوازانی کەرکووك هەڵدەبژێررێ و دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی نیشتمانی و لە سەر داخوازی جەماوەریش دەبێتە سەرۆکی شارەوانی، پاش مانگ و نیوێك و لە ئاهەنگی یەکەمین ساڵوەگەڕی شۆڕشدا بەهۆی فیتنەگەری کەرکووکەوە (گاور باخی) لەگەڵ هەژدە کەسی دیدا توندی بەندیخانە دەکرێن و چوار ساڵ لە بەندیخانەکانی کەرکووك و بەغدا بەسەردەبەن. شەوی ١٩٦٣/٦/٢٢ شەهید مارف و کۆمەڵێك ئازادیخوازانی دی بە فرۆکە لە بەندیخانەی بەغداوە دەگەڕێننەوە بۆ بەندیخانەی کەرکووك و پاش ئازارو ئەشکەنجەدانێکی زۆر بەرە بەیانی ١٩٦٣/٦/٢٣ لە سێدارە دەدرێن.

## تەوەرەی دووەم

**کارتێکەریی ژینگە لەسەر کەسێتی شێخ مارف بەرزنجی:**

بە وردبوونەوە لەو زانیارییە گرنگانەی کە لە میانەی لاپەڕەکانی ژیانی نووسەرەوە هەڵهێنجراون کەرەستەیەکی دەوڵەمەندمان دەکەوێتە بەردەست بۆ دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی بوونەتە مایەی دروستبوونی کەسێتی شێخ مارف بەرزنجی وەك مرۆڤێکی دڵ پڕ سۆز و بەزەیی و خۆنەویست و بەهرەمەندو بوێرو شۆڕشگێرو ڕاستگۆو نەتەوە پەروەرو ئازادیخوازو مرۆڤ پەروەرو گەشبین، هەریەك لەم سیفاتانە کە وێڕای ئەوەی بناغەی خۆڕسکیان لە ناخی ئەم نووسەرەدا هەبووە، بەڵام ژینگە کەش و هەوای لەباری بۆیان بەرپاکردووە هەتا نەشونما بکەن. گومان لەوەدا نییە زۆربەی هەرە زۆری بلیمەتەکانی جیهان لە ئەنجامی بەرپابوونی ژینگەی گونجاودا بەهرە و توانستەکانیان گەشەیان کردووە و دوایش پێگەیشتوون و ناوبانگییان بڵاو بووەتەوە، نموونەی ئەمانەش زۆرن، بەڵام با لەنێو ئەدیبانی نەتەوەکەی خۆمانەوە مامۆستا عەلائەددین سەجادی (١٩٠٧–١٩٨٤) وەك نموونە ئاماژەی بۆ بکەین و بپرسین: ئایا ئەگەر (سەجادی) تەنها لە نێو مزگەوتەکانی کوردستاندا گۆشەگیر بوایە و نەگەیشتبایەتە بەغدا کە ئەو سەردەمە سەرچاوەی زانست و زانیاری بووەو لەگەڵ ڕووناکبیراندا پێوەندی نەبوایە، دەیتوانی بگاتە ئەو ئاستە

بەرزەیی ڕۆشنبیری و کۆمەڵێك بەرهەم و چالاکی ئـەدەبی ئـەوتۆ پێـشکەش بکـات کە هەتا هەتایە مایەی شانازی ڕۆڵەکانی گەلەکەی بـن. هـەر بۆیـەش دەتـوانین لـە گۆشەنیگای کارتێکەریی ژینگەوە ئەو هۆکارانە دەسنیـشان بکـەین کـەوا بوونەتـە مایەی بەرجەستەبوونی کەسێتی شێخ مارف بەرزنجی کە لەم بـەهرە و توانـست و سیفاتانەیدا ڕەنگ دەدەنەوە:

### ١-سۆز و بەزەیی:

دیـارە نووسـەر بـەهۆی کۆچـی دوایـی دایکییـەوە لـە تەمـەنی دوو سـاڵاندا بارێکی دەروونی ئەوتۆی لا دروست بووە کە هەرگیز نەیتوانیوە خـۆی لێـی ڕزگـار بکـات، تەنانـەت وەك گرێیـەکی دەروونـی کارتێکـەریی ڕاسـتەوخۆی هـەبووە لـە ژیانیـاو گەیـشتۆتە ئـەوەی لـە سـەردەمی هـەردوو قۆنـاغی منـداڵی و مێردمنـداڵی ژیانیدا بگاتە ئاستێك بە هیچ جۆرێك نەتوانێ لەبیری خۆی بباتەوە، هەر بۆیـەش لـە نووسـینەکانیدا ڕەنگـی داوەتـەوە، لەبـەر ئەمـە دەبیـنین لـە دوورو نزیکـەوە هەسـتی بـەئێش و ئـازاری جگەرگۆشـەو دایکـان کـردووە، وەك ئـەوەی باسـی جەرجیس و دایکی دەکات کاتێك دراوسێیان بووە لە گـەڕەکی (عقد النـصاری)ی سەر شـەقامی ڕەشـید لـە شـاری بەغدا، چـونکە ئـەم وەك خـۆی ئامـاژەی بـۆ کـردووە هەرچـەندە بـاوکی زۆری خـۆش ویـستووە تەنانـەت لـە باوەشـی خۆیـدا خەواندوویەتی، بەڵام گشت ئـەو سـۆزو بەزەییـەی بـاوکی شـوێنی سـۆزو بـەزەیی دایکی بۆ پڕ نەکردۆتەوە، چونکە منداڵ ئەگەر لە سایەی سۆزو خۆشەویستی دایك و باوکـدا هـەردووك پێکـەوە گـەورە نـەبێ لـە ڕووی پەروەردەییـەوە دەروونـی ئاسوودە نابێ.

لەلایـەکی دیکەشـەوە دیمـەنی مریـدانی خۆیـان کـە خـەڵکانێکی هـەژارو دەسـتکورت بوونـە سـەرنجی ڕاکێـشاوە، بـە تایبـەت ئەوانـەی لـە ڕێـی دوورەوە هـاتوون بـۆ تەکیـەو بـەوە ڕازی بوونـە خۆراکیـان شـۆربای مـاڵی شـێخ بـێ و بـە جلوبەرگی شـیتاڵەوە لەبـەر دەرگـای مەرقـەدو تەکیـەدا ملکەچـی بنـوێنن و لـەو بـاوەڕەدابن کـە ئـەوە باشـترین ڕێگـای خواپەرسـتییە و لـەو دونیـادا بەهەشـتی بـەرینیان بـۆ دابـین دەکـات. سـەرباری ئەمـەش دیمـەنی ژیـانی جووتیـاری کـورد

سەرنجی ڕاکێشاوە، کاتێك ئاغا چەوساندوویەتییەوە و هەر چوار وەرزی ساڵ جووتیاری و وەرزێری و سەپانی و شوانی پێکردووە، ئەنجامیش هەر قەرزارو منداڵی برسی و ژیانی تاڵی بۆ دەستەبەر بووە.

ئەمە لەسەر ئاستی دیمەنەکانی ژیان لە قادرکەرەم، کاتێکیش چووەتە کەرکووك و ژیانی نەبوونی و دەستکورتی بینیوە پتر لە هەژاران نزیك بووەتەوە، وەك خوێندکارێکی دەست نەڕۆ نەیتوانیوە پێداویستییەکانی دابین بکات ، بەزەیی بە خۆی و هەژارەکانی هاوڕێیدا هاتۆتەوە، هەروەها ستەمی کۆمپانیاکانی نەوت و ژیانی پڕ کوێرەوەری نێو بەندیخانە، گشت ئەمانە هۆکار بوونە بۆ ئەوەی شێخ مارف سۆزو بەزەیی لە دڵ و دەروونیدا بچەسپێ.

## ٢–بەهرەی هونەری:

شێخ مارف خاوەنی کۆمەڵێك بەهرەی جیاجیا بووە، کە لە سایەی ژینگەو کەش و هەوای شیاوەوە نەشونمایان کردووە.

سەرەتا پێویستە ئەوە بدرکێنین کە ئەو ژینگەیەی ئەو چاوی تیا کردۆتەوە بریتی بووە لە تەکیە کە کۆمەڵێك چالاکیی هونەرئامێزی لەخۆ گرتووە وەك زیکرو قورئان خوێندن و سەلاواتدان و دوعاو مەولوودنامە خوێندنەوە بە دەنگ و ئاوازی خۆش و بەکارهێنانی دەف و تەپڵ و...تاد. گشت ئەمانەش بوونەتە هۆی جۆش و خرۆش و هەست بزواندن، هەر بۆیەش زۆربەی شێخەکان خۆیشیان ئەم بەهرانەیان لەخۆ گرتووە، بۆ وێنە شێخ عەبدولکەریمی باوکی شێخ مارف ئەدەب دۆست و دەنگ خۆش بووە. بۆیە زۆر ئاسایی بووە ئەمیش شوێن پێی باوکی هەڵگرێ و خوو بداتە شیعرو ئاواز، تەنانەت وەك خۆی ئاماژەی بۆ کردووە لەو سەردەمەدا کەوتۆتە سەر ئەو باوەڕەی کە " ئەگەر کەسێك شاعیر نەبێ پیاوێکی تەواو نییە" (٤)

ئەوەش زیاتر هانی داوە خولیای شیعر بێ و نزیك بێتەوە لە مامۆستا شاکر فەتاحەوە کە لە دیواربەندی "باسەڕە " دا شیعرەکانی بۆ بلاو کردووەتەوە.

هەروەها دیارە دانیشتنی نێو تەکیە و دیوەخانیش کە جێی وەعزو ڕێنومایی و ئیرشاد و گێڕانەوەی باس و بەسەرهات و چیرۆکی کۆن بووە، دیسان بوونەتە

مایەی ئەوەی بکەوێتە بەر کارتێکەریی گێڕانەوەی ئەو شێخ و خەلیفانەی لەو بوارەدا سەرنجی خەڵکیان ڕاکێشاوە، بۆیە ویستوویەتی وەك خوێندەوارێك شێوازێکی تازەتر بەکاربێنێ بۆ ڕێنماییکردنی خەڵك بۆ ئەمەش داڕشتنی چیرۆکی هەڵبژاردووە. هەروەها ئەو کۆڕو دانیشتنانە کە گفتوگۆو پرس و ڕایان تیا ئاڵوگۆڕ کراون دیارە ڕێگا خۆشکەر بووە بۆ ئەوەی لەو تەمەنەدا لێکۆڵینەوەش سەرنجی ڕابکێشێ و پاشەڕۆژ هەوڵی ئەوە بدات لەو بوارەشدا توانستەکانی خۆی تاقی بکاتەوە. لە ڕاستیشدا شێخ مارف چ بە شیعرو چ بە چیرۆك گوزارشتی کردووەو سەرەتای نووسینەکانیشی شێوازی ڕێنماییان بە ڕوونی پێوە دیارە وەك ڕەوشت بەرزی و هاندانی خوێندەواری[٥]، بە هیوای ئەنجامدانی گۆڕانێك لە واقیعی ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا ژیاوە. شایانی باسیشە ڕێنمایی لەشیعری ڕەسافی شاعیردا کە شێخ مارف خۆی دووپاتی کردۆتەوە کەوتۆتە بەر کارتێکەریی مەبەستێکی ڕوونە چونکە ڕەسافی هیچ کەس و لایەنێکی نەهێشتۆتەوە ئامۆژگاری نەکات، تەنانەت بەشێکی زۆری چامەنییەکانی بە ڕێنمایی کۆتایی پێ هێناون. [٦] دیارە شێخ مارف لەو بۆچوونەوە ڕوانیویەتییە هونەری بەرز کە (تەنها ئەوە نییە خۆشی و خۆشەویستی گەرم و گوڕ لە دەروونیدا دروست بکات، بەڵکو دەبێ بەخشندەترین هەست و میهرەبانیشی لەگەڵ بن)[٧]

### ٣- دیاردەی جوامێری:

شێخ مارف هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هەندێ سیفاتی بەرزی مرۆڤایەتی لا چەسپیوە کەپەیوەست بوونە بە کارتێکەریی داب و نەریتی ڕەسەنی کۆمەڵی کوردەواری و سروشتی کوردستانەوە، چونکە سەرەتا کە چاوی هەڵهێناوە هەورازو نشێوو چەم و دەشت و تۆکردن و باران و دروێنەو خەرمان و گێرە و شەن و بەرهەم هەڵگرتنی بینیوە، گشت ئەم دیمەن و چالاکییانە جۆرێکن لە ڕاهێنان و پەروەردەکردن و تایبەتمەندێتی دەبەخشن بە مرۆڤ، ئەو منداڵەش بەختەوەرە کە لە سایەی کەش و هەوای کوردستاندا گەورە بێت، چونکە دەزانێ هەوراز چییە و چ جۆرە ماندووبوونێکی دەوێت تا مرۆڤ سەری کەوێ و دوایش مرۆڤ پێویستی بە حیکمەت و وردبینی هەیە کاتێك بیەوێ لێی بێتە خوارەوە.

نزیکبوونی مرۆڤیش لە ئاو کە سەرچاوەی ژیانە هاندەر دەبێ بۆئەوەی مرۆڤ گەشبین بێت، چونکە گەشەی درەخت و گیانلەبەرەکانی تر هێندەی دی مرۆڤ پابەندی ژیان دەکات ئەمەش هەڵسوکەوتی مرۆڤی جێنشینی سروشتی ناسك لەگەڵ مرۆڤی جێنشینی بیابان جیا دەکاتەوە، تەنانەت کەلتووری کۆمەڵایەتی هەر نەتەوەیەك وەك کەسایەتییە بۆ تاك، وە وەك چۆن هەر تاکێك کەسایەتی تایبەتی خۆی هەیە و لە هەر تاکێکی دی جیای دەکاتەوە، بۆیە هەر نەتەوەیەکیش کەلتووری تایبەتی خۆی هەیەو لە نەتەوەکانی دی جیای دەکاتەوە. هەروەها کاری جووتیار و سەپانیش کە بە کێڵان و تۆکردن دەست پێدەکات و دواییش بە دروێنە و خەرمان هەڵگرتن کۆتایی دێت وەك چالاکییەکی مرۆڤایەتی تاقیکردنەوەیەکە بۆ مرۆڤ، چونکە بەرجەستەکردنی ڕەنج و کۆشش و دواییش بەر هەڵگرتن و گەیشتن بە ئەنجامە. هەروەها ڕاووشکاریش کە جۆرە وەرزشێکی سروشتییە و لە دێرین زەمانەوە بۆ مرۆڤ ماوەتەوە دیسان دەبێتە مایەی بەهێزکردنی ئەندامەکانی لەش و ڕاهاتن لەسەر چاوەڕوانی و دان بەخۆداگرتن و پەلاماردان و گورج و گۆڵی و خۆڕاگری، لە هەمان کاتیشدا دانیشتنی نێو کۆڕی پیاوماقووڵان دەبێتە مایەی ڕێز لێنان لە بەرانبەرو فێربوونی گفتوگۆ و هەڵسوکەوتی شیاو. گشت ئەم دیاردە جوانانەی سروشت و کۆمەڵگای کوردەواری کارتێکەریی ڕاستەوخۆیان هەبووە لەسەر بناغەبەستنی کەسێتی شێخ مارف لەسەر بنەماکانی ڕەوشت بەرزی و خۆنەپەرستی و خۆش ویستنی خەڵك و بوێری و ڕاستگۆیی و حەق پەرستی، ئەم دیاردە جوامێرییانە لە سەردەمی منداڵیدا لای چەسپیون، کارتێکەریی ئەو ڕۆژگارە و دوایش باوەڕهێنانی بە ڕاستییەکانی ژیان لە دوای ئەو قۆناغە وای لێ کردووە قبووڵ نەکات بە تەنها لە بەندیخانە ڕزگار بکرێت ئەگەر هاوڕێکانی لەگەڵ نەبن [٨].

کارتێکەریی ڕاستەوخۆی قادرکەرەم. لەسەر ڕەوتی ژیانی شێخ مارف لەم دێرە شیعرەیدا دووپات دەبێتەوە کە دەڵێت:

**ئەی قادر کەرەم لانەی منالیم**

**تۆماری ژینی گشت خۆشی و تالیم [٩]**

بۆیـە کـە گەیـشتۆتە کـەرکوك و دەسـتی بـە قۆنـاغێکی تـری خوێنـدن کـردووە توانستەکانی لەبار بوونە بەرەو خواستی زیاتر.

### ٤- بیری نەتەوایەتی و ئازادیخوازی:

شێخ مارف هەر لە تەمەنی هەرزەکاریدا لە قـادر کـەرەم بـیری نەتـەوەخوازی لای گۆپکـەی کـردووە، دیـارە ئـەویش بـە هـۆی کـەش و هـەوای سیاسـیی ئـەو سەردەمەوە بووە کـە شـێخ مـەحموودی نـەمر ڕابەرایـەتی خـەباتی ڕزگـاریخوازی کردووە، بنەماڵەی شێخەکانیش پشتگیرییان لێکردووە، بەتایبەت باوکی شـێخ مارف واتە شێخ عەبدولکەریم لایەنگرێکی بەرچاوی بووەو دەسـەڵاتی ئـەو کاتـەش لەوە بێ ئاگا نەبووە، بەڵکو لە ساڵی (١٩٢٥) دا لە ناوەخت هێزی ناردۆتە سـەری و لەگـەڵ ئیـسماعیلی کـوڕە گەورەیـدا قۆڵبەسـتی کـردووەو دوایـیش لـە بەسـرە دەستبەسەر کراون، ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژگارێکدا بووە شێخ مارف کۆرپە بـووە، بۆیە هـەرگیز گومـان لـەوەدا نییـە ئـەم کارەسـاتە کارتێکـەریی لەسـەر نـەبووبێ، هەروەها کاتێکیش مامۆستای شەهید شاکر فەتاح بەڕێوەبەری ناحیەکە بووە، لـە میانـەی دیواربەنـدی "باسـەڕە"وە وەك چـالاکییەکی ئـەدەبی لـە دوورو نزیکـەوە سـۆزو خۆشەویـستی بـۆ نەتـەوەو وڵاتەکـەی دەربڕیـوە، ئـەمیش نزیکـی بـووە و تەنانـەت بـە کۆمـەڵێك بابـەت بەشـداری تیـا کـردووەو ئیـدی بـەرە بـەرە هەسـتی نەتەوایەتی لە دەروونـدا چەسـپیوە، لەبـەر ئەمـە کاتێـك سـاڵی ١٩٣٦ گەیـشتۆتە کەرکوك لە پارتی "هیوا " دا وەك ڕێکخراوێکی نەتەوایەتی ئەو بوارە گونجـاوەی بۆ بەرپا بووە کە بتوانێ ئەو بیرەی هەڵیگرتووە گەشەی پێبـدات، بۆیـە تێکـەڵی سیاسەت بووەو، بووەتە ئەندامی ئەو پارتەو نوێنەری قوتابیانی.

شێخ مارف لە یادداشت نامەکەیدا ئەوەی درکاندووە کە ئەوکاتەی مامۆسـتا رەفیـق حلمـی سـەرۆکی پـارتی "هیـوا " بـووە هەسـتی بـەوە کـردووە کـە ئـەو ڕێکخراوە بەر سستی کەوتووە، پێویـستی بـەوە بـووە خـوێنی تـازەی بێتـە نـاو، بۆیە لە ساڵی (١٩٤٠) دا ئەوەی بـە باشـتر زانیـوە وەك جـاران لیژنەیـەك لـە لاوان سەرۆکایەتی بکەن، سەرەتا ئەم بیرۆکەیە پەسەندی هەندێ لە ئەندامانی "هیوا" بووە، بەڵام ئەنجام سەری نەگرتووە، چونکە هاوڕێکانی لێی پەشیمان بوونەتـەوە

((تەنها ئەم دان دەنێت بەڕاستدا)) [10] لەبەر ئەمە لە "هیوا " دەرکراوە. شایانی باسە ئەندامانی پارتی "هیوا" بریتی بوونە لە ئەفسەرو ئاغاو خوێندکاران، دووربوونە لە جەماوەری جووتیاران و زەحمەتکێشان[11] ساڵی ١٩٤٤ کاتێك دێتە بەغدا پێوەندی بە ئازادیخوازانەوە دەکات و لە زۆربەی خۆپیشاندانەکانی ساڵانی ١٩٤٥ – ١٩٤٧ بەشداری دەکات و خولیای بیری نێونەتەوەیی دەبێت. بەم شێوەیە دەبینین ژیانی سیاسی شێخ مارف لە دوو قۆناغدا بەرجەستە بووە:

قۆناغی یەکەم نەتەوەخوازی کە لە ئەدەبیاتی سەرەتای تەمەنیدا ڕەنگی داوەتەوە و لە سەردەمی پێوەندی بەستنییەوە لەگەڵ پارتی " هیوا " دا وەك ڕێکخراوێکی نەتەوەخواز گەیشتۆتە لووتکە، ڕەنگە بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم مەبەستە ئەو هەستە بەرزەی بێ کە لە پارچە شیعرێکیدا دەری بڕیوەو دەڵێت:

**"ئەی گەلی جێماو پەرت و لەت و پەت**

**هەی بەش بەش کراو لە چوار پێنج دەوڵەت"** [12]

دیارە شێخ مارف لە دووەمین قۆناغی ژیانی سیاسیدا ئەو سنوورەی بەزاندووە کە مرۆڤ تەنها لە فەخرو شانازی و پیاهەڵدانی نەتەوەکەی خۆی گوزارشت بکات، بەڵکو ئەو ڕێڕەوەی پەسەند کردووە کە مرۆڤ تا چەند دەتوانێ خزمەت بە سەرجەم خەڵکی وڵاتەکەی بکات، واتە بیرو بۆچوونەکانی لە گۆشەنیگای مرۆڤایەتییەوە ئاراستە کردووە، پێشکەوتنخوازانە ڕوانیویەتی، بەپێشکەوتن و سەرکەوتنی ئادەمیزاد لە هەر شوێنێکی دنیا شاد بووە و بە هی خۆی زانیوە، هەر بۆیەش بە سەرکەوتنی" گاگارین" کە لە نەژاددا کوڕە جووتیارێکی سۆڤێتی بووە لە پرۆسەی سووڕانەوەیدا بەدەوری زەویدا شاد بووە[13]. یان بۆ ئازادی "کۆنگو"[14] سروودی وتووە، لە چلەی " فەهد "ی پێشەوای حیزبی شیوعی عیراقیدا کە ساڵی ١٩٤٩ لە سێدارە دراوە بەپارچە شیعرێك گوزارشتی کردووە و بە سەروەرو ڕەهبەری داوەتە قەڵەم[15]. لە ئەنجامیشدا ئەوە دروستە بڵێین: "شاعیر هەستی بەو ستەمە کردووە کە دژی مرۆڤ کراوە " بۆیە عەقڵ و بیری تیژی خۆی لەو بوارەو لە پێناو ئازادکردنی کۆیلایەتی مرۆڤدا تەرخان کردووە ئیدی بە هۆی چینایەتی‌یەوە بووبێت یان ڕەگەزپەرستی[16].

# بەشی دووەم
# ئەدەبیاتی شێخ مارف بەرزنجی

## تەوەرەی یەکەم

**١- ئەدەب و ئەرکەکانی:**

ئـەدەب زادەی هەسـت و بـیری مرۆڤـە کـە لـە سـەرەتای ژیانییـەوە وەبـەری هێناوەو دواییش ئاوێنە ئاسا خۆشیو ناخۆشییەکانی ژیانی تیا ڕەنگی داوەتـەوە. ئەدەب ڕوونکردنەوەی ژیان و دەرکردنـی واتاکـانی دەنـوێنی کـە ئـەویش لەسـەر سۆزبەندە، چونکە ژیان بەواتا فراوانەکەیەوە زیاتر لە ژێر دەسەلاَتی مرۆڤدایە نەك هۆکارەکانی دەرەوە. [١٧]

ئـەدەب ئەرکیـشی لەسەرشـانە ئـەو ئەرکـەش لـە خزمـەتکردنی کۆمـەلگادا بەرجەستە دەبێ. لەم بارەیەوە شێخ مارف دەڵێت:

ئەدەب ئەرکێکی کۆمەلاَیەتی بەرزی لە سەر شانەو چەکێکی تیژو بە کـارە بـۆ گـوزەرانی ژیـانی کۆمـەڵ و چـاککردنی و پێشخـستنی بەتایبـەت لـەو کاتـەوە کـە ئـادەمیزاد بـە وریـایی و تێگەیـشتنەوە جلـەوی چارەنووسـی پاشـە ڕۆژی خـۆی گرتۆتـە دەسـت.... نەتـەوە ژێـر دەسـتەکان کـە یەکـەم ئامانجیـان ڕزگـاربوون و سەربەخۆییە لەبەر ئەوە ئەدەبەکەشیان لە هەموو شتێ بەرزترو ڕوونترو ئامـانجی ئازادی و سەربەخۆیی ئەگرێتە دەست، پاش بەدەستهێنانی ئەم ئامانجـە ئەکەونـە چاری دەردەکانی تری کۆمەڵ. [١٨]

**٢- بیرو بۆچوونەکانی دەربارەی نوێگەری:**

بۆ ئاشنابوون لە دیدو بۆچوونی شـێخ مـارف لەسـەر نوێگـەری، بـاش وایـە بگەڕێینـەوە بـۆ لێکۆڵینەوەیـەکی کـە لـە ژمـارە (١٠) ی سـاڵی ١٩٥٨ گۆڤـاری "شەفەق " بلاَوی کردۆتەوە و ئاماژەی بەوە داوە کە مەبەسـتی لـە شـیعری نـوێ (شـیعری – حـوڕ– ئـازاد)ە، لـە گۆشـەنیگای ڕەسـافی شاعیریـشەوە دەڕوانێتـە شیعرو دەڵێت: شیعر گۆرانییە، گۆرانی بێ شیعر نـابێ، شـیعریش ئەگـەر لەگـەڵ نەغمەی گۆرانیدا ڕێك نەکەوێ بە شیعر ناژمێررێ [١٩]، دوایش درێژە بـە باسـەکەی

دەدات و لە ئاسۆی بیرو بۆچوونەکانی (عەقادو پۆل ڤالێری)یەوە مەبەستەکانی دەخاتە ڕوو لە ئەنجامیشدا دەڵێت:

ئەمڕۆ شیعر لە مەیدانێکی زۆر پان و بەریندا خەبات ئەکات ئامانجەکانی هەموو ئامانج و خواست و گیرو گرفتی ژیانی و گیانیمان ئەگرێتەوە کە یەك پارچەیە و لەیەك جیا نابێتەوە، هونەری (گۆران)ی شاعیریش کە ڕابەری تازەکردنەوەیە لە شیعری کوردیدا بەرز هەڵئەسەنگێنێ..لە ڕۆژی کۆچی دواییدا کە لە گرتووخانەی بەغدا دەبێ دڵی بۆ هاتۆتە کوڵ و زمانیشی بۆ هاتۆتە گۆ کۆمەڵێك بەهرەو توانستی تایبەت دەخاتە پاڵی بە وێڵی گەوهەری شارراوەی ژیان وەسفی دەکات کە بۆ گیانی دیمەن نەئەگەڕا شارراوەی ناو دەروون و بۆی پەڕەی هەورو باران، ناو دۆڵ و سەر لووتکە بەفرینەکان، بەڵام تێکۆشەرو ئاشتی پەروەرو دۆستی گەلان، گۆران زوو ڕۆیشت وایش بزانم درەنگ جێگای پڕ ئەبێتەوە لەبەر ئەوە گریانی هەوری پایز لە جێی خۆیەتی دەبا بگری بە کوڵ بگری بەسەر ئاخر گەڵاو ئاخر گوڵ و ئاخر ڕۆژی خۆی و گۆرانا بگری بۆ گۆران.[٢٠]

لە بەر ڕۆشنایی بیرو بۆچوونەکانی شێخ مارفدا ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی لە سەر ئاستی هونەرەکانی ئەدەب تاووتوێ دەکەین، بزانین تا چەند لەو ئەرکانەی بەجێ هێناوە کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردن:

## تەوەرەی دووەم
## ناوەرۆکی هونەرە ئەدەبییەکانی:

**١– شیعر:**

پێش هەموو شتێك دەبێ ئەوە بدرکێنین کە شێخ مارف زیاتر بایەخی بە ناوەرۆك داوە نەك ڕوخسار، لەو باوەڕەشدا بووە ((کە کۆمەڵگای کوردی نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی تاکەکانی وەکو ڕەگەزێکی کاریگەر لە کۆمەڵدا دەوری خۆیان ببینن، بەڵام شێخ مارف بڕوای بەوە هەبوو کە دەبێت شیعر بۆ ئامانجی وشیار کردنەوەی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی مافەکانی بێت)) [٢١] سەرەتا، با هەندێ پارچە شیعری شێخ مارف بەسەرکەینەوە و سەرنجیان دەربارە تۆمار بکەین. یەکەم هەنگاو بۆ ساڵی ١٩٣٦ – ١٩٣٧ دەگەڕێتەوە کاتێك خوێندکاری پۆلی

شەشــەمی ســەرەتایی دەبێــت یەكــەم پارچــە شــیعر دەنووســێ كــە ئەمــە سەردێڕەكەیەتی:

"تیری شیری خۆم ئەبەستم پاسی كوردستان ئەكەم

دوژمنـــی خاكـــی ولاٌتم پەرتی ســـەر كێوان ئەكەم" (٢٢)

لەمەشەوە ئەوەمان بۆ دووپات دەبێتەوە كەوا هەر زوو هەستی خۆشەویستی ولاٌت و هەڵوێــست وەرگــرتن دژی داگیركــەرو گیــانی مقاوەمــەت لــە دلٌ و دەروونیــدا چەسپیوە، خۆیشی لەم بارەیەوە دەڵێت:

لە منداڵییەوە هەستی شیعرم بزاوە، هەڵبەستەكانم تـا سـاڵی ١٩٤٩ لـە ڕاونـان و دەربەدەریدا لەنێوچوون، ئەوەی ماوە هی دوای ئەمساڵەیە.(٢٣)

شیعریش لای شێخ مارف خورپەو ئیلهامە، چونكە دەڵێت: شەوێك بەم چەشنە هەڵبەستێكم بۆ هات، بیست... سی بەیتێكم لێ نووسی و سۆزەكەم بـە سەرچـوو ساڵێكی تر لە هەمان مانگدا تەواوم كرد.(٢٤)

خێرخـوازی مەبەسـتێكە لـە شـیعرەكانیدا ڕوونـەو ئاواتـەخوازە خۆشـی بـەر هەمووان بكەوێ بۆ نموونە:

لە كرسمسدا ئاواتەخوازە هەمووان خۆشی بگێڕن نەك كـزو مـەلوول لـە گۆشـەی كووچەدا ئەم ئاسا داماو. تەنانەت خەیاڵی دڵدارییش وچانێكی پێ ئەگرێ و زمانی شیعری دێتە گۆ:

"كریسمســەو زەماوەنە تۆ وای لە كۆڕی خۆشـییا

هەڵسام بەدەنگی ئێوەوە لە ژێر سزای ناخۆشییا "(٢٥)

لە پارچە شیعری ئاگری نـەورۆزی عەشـقدا ئـەوە ئەسـەلمێنێ كـە ئـەوینی نـەورۆز هەرگیز ناكوژێتەوە، بە هیوای شۆڕشێكە ڕەگی ستەم بنبڕ بكات مرۆڤ یەكجارەكی لـە دیلـی ڕزگـار بكـات ئەمــەی لــە ئاسـۆی سـۆزێكی ئەویـنداریو بـە خـەیاڵی خۆشەویستییەوە گوزارشت كردووە، ئەمەش سەردێڕەكەیەتی:

" ئاگری نەورۆزی عەشقی تۆم ئیتر ناكوژێتەوە

نەك دڵ و بیرم هەموو تاری لەشـــم ئەگرێتەوە "(٢٦)

زاراوەی دڵداریش لای شـێخ مـارف ڕوویـەکی دیکـەی هەیـە، سـنووری دڵداری ئاسایی دەبەزێنیٚ و دەگاتە خۆشەویستی خـاك و مرۆڤایـەتی، لـە دێڕێکـی ئـەو پارچە شیعرەیدا دەڵێت:

**"دەبا عەشـقیش بڕەنگێنین بە خـوێنی دوو دڵـی ئازاد**

**ڕووی خۆو خاکمان سوورکەین لە ڕۆژی جەنگ و مەیدانا "[٢٧]**

بەرخوردان و ڕاپەڕینیش بۆ ئەوەیە یەکسان بـژین، لـە کۆتـایی پارچـە شـیعری "ئاخێز " دا ئەم مەبەستە پیرۆزەی دووپات کردۆتەوە کە دەڵێت:

**" لە کوردستانی مەزنا سایەداری و پایەداری کەین**

**بەفـەن و عیلـم و دانایـی لەگەڵ عالەم برایی کەین**

**ببینە میللەتێکـی تێگەیشـتوو پێگەیشـتووی وا**

**نەکەس زۆرمان بەسەردا کا و نە زۆرمان بیٚ بەسەر کەسدا " [٢٨]**

کـاتێکیش لەگـەڵ گـوڵی کوردسـتاندا دەکەوێتـە گفتوگـۆ کـە جـوانی و ناسـکی و بێگەردی و ئازادی دەخاتـە پـاڵ ڕۆمانتیکییانـە دەڕوانـیٚ زیـاتر لـە بۆچـوونەکانی ڕۆسۆوە نزیك دەبێتەوە و لە سروشتەوە ئیلهام وەرئەگری و دەڵێت:

**" دڵم وەك پەڕەی تۆ بێگەردو پاك**

**عاشقی ئازادیم نەترس و بـیٚ باك**

**منیش وێنەی تۆ ئەکۆشم چـالاك**

**لە زستانی جەور نابم ترســناك " [٢٩]**

شێخ مارف لە زیـاد لـە پارچـە شـیعرێکیدا وێنـەی ژیـانی هـەژارانی کێشاوەو ئامـاژەی بـەوەداوە لـەپاڵ چاڵە نەوتـەکانی بابـەگوڕگوڕدا ڕۆڵـەکانی میللـەت برسین.

لە هێزی ڕەنجدەرانیـشدا ڕووخـانی تـەخت و تـاراجی زۆرداری ئـەبینیٚ بـەرەو یەکسانی ژیان، لەم بارەیەوە لە پارچە شیعری " هێزی ڕەنجدەران " دا دەڵێت:

**" لیٚ گـەڕیٚ بابینـە ڕۆڵەی گـەل لەتەك گەلدا بڕۆین**

**بۆ شـەڕی گورگی ژیانی گـەل بە مەردانە بڕۆیـن**

**تەخت و تاراجی زوڵم تێك دەین بەهێزی ڕەنجدەران**

**بێنە مەیدان چسـت و چالاك، با نەمێنیٚ بیٚ فـەڕان "[٣٠]**

شێخ مارف هەمیشە خۆی بەنزیكی ئازادیخوازانی جیهان زانیوە، هاوڕازو هاونیاز بووە لەگەڵ كەسانی وەك نازم حیكمەت و حسێن مەردان و هاوبیرەكانیاندا شیعریان بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی داناوە ئامانجیان ئازادی مرۆڤ بووە لە هەر كوێ بێت، هەر بۆیەش پارچە شیعری ئەوانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی، بەوەرگێڕاندنی پارچە شیعری (كچەكەی هێرۆشیما)ی نازم حیكمەت خزمەتێكی گەورەی ئەدەبیاتی كوردی و جیهانی كردووە:

" لە دەرگای هەمووتان ئەدەم
بەرۆكی هەمووتان ئەگرم
ناونیشانی خۆشم ئەدەم
من كچێكی حەوت ساڵان بووم
لە شاری هیرۆشیمادا
ڕوو خۆش و شیرین و جوان بووم
دە ساڵ لەمەوبەر زیندوو بووم "[٣١]

٢- چیرۆك

ئەم هونەرە بەشێكی گرنگی ئەدەبیاتی شێخ مارفە، بابەتەكانیشی بەگشتی دەربڕینێكی ڕاستگۆیانەن لە ئێش و ئازاری كەسیی خۆی كە ڕەنگدانەوەی ناڵینەكانی گەلەكەیەتی، هەندێكیشیان بڵاو كراونەتەوە بەشێكیشیان بەهۆی خۆشاردنەوەو ڕاوەدوونان و گرتنەوە فەوتاون.

لە ڕاستیشدا خوێندنەوەی چیرۆكەكانی وەك لە خوارەوە ڕوونی دەكەینەوە ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنێ كەوا نووسەر ئاگاداری باری چیرۆكی ئەو سەردەمە بووە بە تایبەت چیرۆك نووسانی عەرەب لە بەغدا، بەغداش ئەو سەردەمە ئەدەبی بەرزی لە ئامێز گرتووە و جێی بایەخی سەرجەم ڕووناكبیرانی عەرەب و كورد بووە:

لێكۆڵەرانی چیرۆك ئەوە دووپات دەكەنەوە كەوا لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا چیرۆك لە عیراقدا هەنگاوێكی تازەی ناوەو بووە بە شێوازێكی گرنگ بۆ

گوزارشتکردن  لە هەست و سۆزی مرۆڤایەتی، ڕێگایەکی نوێش بۆ ڕوونکردنـەوەی بیری چاکسازی  لە کۆمەڵگادا  ئەویش بە خستنەڕووی  کەموکورتییەکانی کۆمەڵ بە ئامانجی بەرەوپێش بردنی . ئەم ڕەوتەش پێچەوانەی قۆناغی یەکەمی مێـژووی چیرۆك بووە لە بیستەکانی سـەدەی  بیسـتەمدا، چـونکە ئـەو کاتـە تێگەیـشتنی چیرۆك بەند بووە لەسەر ئەندێشە و خەوبینین،  بەکارهێنانی هونەری چیرۆکیش بۆ مەبەستی کات بەسـەربردن و  هـەڵاتن بـەرەو کـەش و هەوایـەکی دوور لـە واقیعـی ژیانی خەڵك بووە، یان هەوڵ نەدان بۆ گۆڕینی ئەگەر نەڵێین تەگەرەی نەخستبێتە ڕێگای گەشەکردنی[٣٢].

به وردبوونەوە لە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی شێخ مارفیش دەبینین خەمی کۆمـەڵی هـەڵگرتووەو پەنجـە دەخاتـە سـەر  کـەم و کورتییـەکانی و دڵـسۆزانە هـەوڵی چارەسەرکردنیان دەدات، چونکە "مەسەلەی سەرەکی لای ئەو بیری کوردایـەتی و ڕزگاری مرۆڤە لە چەوساندنەوە" [٣٣]

لە چیرۆکی (ئاوازو کەباب)دا.  کێشەی  نێـوان دوو گـەنج (فـەلامۆرز و مـیرزا) باس دەکات کە دەربڕینە لە کێشەی نێوان هەردوو هێزی خێـرو شـەڕ، ئـەنجامیش هێـزی خێـر سـەرکەوتووەو ئاشـتی زاڵ بـووە بەسـەر شـەڕدا. لـە چـیرۆکی (گـای پیرۆز)دا سەرنجی گەلێك وردەکاری دەدەین:
وەك ئاوڕدانـەوە لـە سـیمای کۆمـەڵی ئـەو سـەردەمەی ناوچـەکە. پایەبڵنـدی بـە ڕواڵەت، دەس ماچ کردن، نۆکەری کردن  بە نانەزگ، کردنەوەی قوتابخانەیەك لـە سـایەی بـارودۆخێکی نائاسـاییدا، ژیـانی تـاڵی مامۆسـتا لـە سـایەی دەسـەڵاتی شێخدا.. ئەو شـێخەی کـە بـە ڕواڵـەت خواناسـەو لـە ڕاستیـشدا خۆپەرسـتە.. لـە ئەنجامدا هەردوو هێزی خێرو شـەڕ ڕووبـەڕوو دەبنـەوەو مامۆسـتا کـە هێـزی خێـر دەنـوێنێ دەبێتـە هـۆی بەرچـاو ڕوونـاککردنی جووتیـارە نەخوێنـدەوارەکان....
شێخیش ئەمە بە کۆسپ دەزانێ لەبەردەم مەرامەکانیا، خەلیفەی شێخیش خەو بە (بابە  گـەورە)یـەوە دەبینـێ کـە ئیـشارەتی بـۆ دەکـا ئـەم شـەیتانە (معلـم) لـەم بارەگایە دوور خرێتەوە، چونکە لای خوا و پێغەمبەر بەرپرسن لە  پاراسـتنی ئـەم ڕێگەیەدا. شێخ ترسی ئەوەی لێ نیشتووە مندالأن چاوکراوە بـن و ئیـدی بـەگوێی کەس نەکەن، تەنانەت لە خزمەتکردنی  دیوەخانیش واز بێنن، هەوڵـەکانی کۆڵکـە

مەلاش سەر ناگرێ.. ئەنجام شێخ دەڵێت: تۆ خەڵکمان لێ هەڵئەگێڕیتەوە.. مامۆستاش دەڵێت: ئەگەر جووتیار زەوی خۆی بکێڵێ و ولاخی خەڵك ڕانەكێشی كفرە؟ پێویستە خەڵك بەری ڕەنجی خۆیان بخۆن.

لەم چیرۆكەدا نووسەر بە بوێرییەكی زۆرەوە لە ئەوپەڕی خۆنەویستی (نكران الذات) دەردەبڕێ كە بە هەموو كەسێك ناكرێ... خۆی ئەیەوێ ئەوپەڕی ناڕەزایی لە دارودەستەی شێخ كە لە بنەماڵەكەی خۆیدا بەرجەستە دەبێ دەربڕێ.

لە چیرۆكی (شەتڵ) دا كە لە ژمارە (٣٢) ی ساڵی پێنجەمی مانگی تەمووزی ساڵی (١٩٦١) دا لە گۆڤاری ((شەفەق)) دا بڵاوی كردۆتەوە هێند فەلسەفییانە بۆ دونیاو دەوروبەر دەڕوانێ، ڕەنگە كەم بن ئەو چیرۆكنووسانەی ئەمڕۆ بتوانن وەك شێخ مارف ئینسانییانەو فەلسەفییانە بۆ واقیع بڕوانن "[٣٤] ئاماژە بۆ كەم و كورتی بەرنامەكانی خوێندن دەكات، ئەو كارەساتە دەخاتە ڕوو كە قوتابی كورد لە یەكەمین قۆناغی خوێندنیدا بە زمانی خۆی فێر ناكرێ و بە عەرەبی فێری خوێندن و نووسین دەكرێت... نووسەر باوەڕی وایە منداڵ بەزمانی دایك و باوكی نەخوێنی زۆر ستەمە، بەڵكو گوناهێكی گەورەشە. لە زمانی مامۆستایەكی كوردەوە دەگێڕێتەوە كە لە خوێندكارێكی پرسیوە ٤ و٤ دەكاتە چەند نەیزانیوە وەڵام بداتەوە، واقی وڕماوە، كەچی، كاتێك پێی وتووە ٤ زاید ٤ ئەكاتە چەند وتوویەتی (ثمانیة) .

هەر لەم چیرۆكەدا ئاماژەی بەوە داوە كە زیاتر منداڵانی ئاغاكان هان دەدران بچن بۆ قوتابخانە.. خەڵكی سادەو كەم دەرامەت و هەژارو كاسبكار بەوە نەدەپەرژان منداڵەكانیان ئاڕاستەی قوتابخانە بكەن.. داخ بۆ ئەوە هەڵئەكێشی كە چەند كەسێك لە بەهاری ئەو ساڵەدا منداڵەكانیان لە قوتابخانە دەركردووە كە زیرەكترین قوتابی بوونە ئەویش لەبەرئەوەی بیانكەن بە ساوەلەوان.

نووسەر لە چیرۆكی (نامەی سەر سنوور)دا ئاماژە بەوە دەدات كە ڕووناكبیرانی ئەو سەردەمە دڵیان بە شۆڕش و كۆمارەكەی ساڵی ١٩٥٨ شاد بووە، گوایە خێروبێری بۆ كوردو عەرەب یەكسان دەبێ، تەنانەت هێند دڵی بەو گۆڕانكارییە خۆش بووە عورفییەكەشی گرتۆتەوە، باوەڕی وابووە دادگا سەربەخۆ دەبێ، بەڵام واقیع پێچەوانە بووە ئاماژەشی بەوە داوە كەوا خەڵك بە گەڕانەوەی

بارزانییەکان شادبوونە، کاتێکیش بە شـەمەندەفەر لـە بەغـداوە گەڕاونەتـەوە بـۆ کوردستان لە وێستگەکاندا پێشوازییان لیّ کردوون، کەچی ئەو ئـاوات خواسـتنە سەری نەگرتووەو کۆمەلأنی خەلکی کوردستان لە شۆڕش بیّ ئومێد بوونە... ئەوە بوو زۆری پیّ نەچوو کەسانی وەك شێخ مارفیان لە سێدارە دا و دەستیان کرد بـە کاولکردنی کوردستان.

لـە چـیرۆکی (سـەرلەبەیانی نـەورۆزێك)دا کـە دوای شـەهیدکردنی نووسـەر، مامۆسـتا جـەمال خەزنـەدار سـالّی ١٩٧٢ لـە گۆڤـاری" ڕۆژی کوردسـتان " دا لـە ژمارە (٢) ی مانگی کانوونی دووەمدا بلأوی کردۆتەوە.. نووسەر بۆ داب و نەریتی کوردەواری، بۆ جوانی ڕەزو باخی کوردستان داخ هەلّئەکێشیّ، کـە جووتیارەکـان لەبـەر دەسـت کـورتی و قـەرزی بازرگانـەکانی شـار ڕەنگـە زۆریـان دەمیـان لـە میوەکەی نەچووبێت..هەندێکیـشیان، باخـەکانیان لـە ڕیـشە دەرهێنـا بـۆ ئـەوەی تـووتنی لـەجیاتی بـچێنن بـۆ وەدەسـهێنانی پـارەی زیـاتر ئەمـەش لـە بـیرو بۆچوونەکانی فەیلەسـووف گـەورەی فەرەنـساوە ڕۆسـۆ نزیکـی دەکاتـەوە چـونکە سروشت لای ئەو چـەند مانـاو مەغزایـەکی هەیـە، جارێـك بریتییـە لـە دابونـەریت، جارێك غەریزەیە، جارێکیش ئەو لانکەیەیە کە منداڵ و سەرجەم مرۆڤـەکان تیایـدا گەورە دەبێت [٣٥]... دەلّێت: ئێمە شاخ و کێومان هەر بۆ سەیران ناوێت ، چونکە پڕن لە کانی بەنرخ و بێگانە لێی داگیر کردووین.

٣- شـــانـــۆ:

بابەتی ناوەرۆکی شانۆگەرییەکانی دیسان لـە نـاخی کۆمەلـەوە هـەلّقولأون و خزمەتی جووتیارو زەحمەتکێشانی کوردیان کردووە:

لـە شـانۆگەری (زەوی زەوی خۆمانـە)دا کـەوا ڕووداوەکـانی پەیوەسـتن بـە شۆڕشی سالّی (١٩٥٨)وە نووسەر لـە وەسـفی کوێخـادا دەلّێـت: هەمیـشە لەگـەلّ ئاغادا هەلّساوەو دانیشتووە، دووڕوو، هەلپەست و پیلانگێڕە. لـە وەسـفی بەگـدا دەلّێـت: ورگنێکـی سـوورو سـپییە. لـە پـەردەی سـێیەمدا..نۆکـەرێك هـەواڵی یـاخیبوونی جووتیارەکـان ئەگەیـەنیّ..بـەگ دەلّێـت: چـۆن ئـەبیّ ئـەو سـەگبابانە ناماقوولّی بکەن، بـە خۆلّـەمێش ئەیانـسووتێنم.. دەبـیّ مالّێکیـان لـەم ئاواییـەدا

نەمێنێ..... بەلاّم حەمەی نۆکەر بۆ ئاغای دووپات دەکاتەوە.. یاخیبوونی ئەمجارە بە ڕا و تەکبیرەو هەموو چەك و تفاقیان هەیە.. بەگ لە داخا دەس ئەکا بە هاوارو ئەقیـژێنێ، ئەنجام ژان ئەیگرێ و داوای دەرمان دەکات. لە کۆتایی شانۆگەرییەکەشدا لە پاش ئەوەی بانگی ئازادی لە بەغداوە بەرز ئەبێتەوە..بەر شالاّوی جووتیاران ناگرێ و لەپڕ تێکەڵی خەڵکەکە دەبێ و دەس ئەکا بە هەڵپەڕکێ و دەڵێت: (زەوی زەوی خۆمانە بۆ دەرەوە بێگانە).

٤- لێکۆڵینەوەی ئەدەبی:

شاکارەکانی ئەدەبی کوردی بوونەتە جێی سەرنجی شێخ مارف.. سەبارەت بە داستانی مەم و زین دەڵێت: یادگارێکی بەرزو بەنرخی خانی نەمرە.. ئەگەر (شەرەفنامە) بەڵگەیەکی خۆماڵی مێژووی نەتەوەکەمان بێ (مەم و زین)ی خانیش شاکارێکی خۆماڵی کوردە و.... وەرگێڕانەکەی هەژاریش لە ساڵی (١٩٦٠) دا کە لە چاپخانەی (النجاح) لە بەغدا چاپ کراوە بووەتە جێی بایەخ پێدانی..دوایش هەزار سلاّو ئاڕاستەی هەژارو قزڵجی دەکات ڕێز لە هونەرەکانیان دەنێ.

شانۆگەرییەکەی مامۆستا (عبدالرزاق بیمار - بووکی پەردە) کە بابەتێکی کۆمیدی بووە، بووەتە مایەی گرنگی پێدانی و بەپێی دیدو بۆچوونی خۆی هەڵی سەنگاندووە، شتی بۆ ڕاست کردۆتەوە.

وتارێکی مامۆستا هەژار لە ژمارە (١)ی ساڵی یەکەمی (١٩٦٠) ی گۆڤاری "ڕووناهی" دا بە ناونیشانی (ئەدەبی کوردی سەر بەرەو ژێر دەڕوا) سەرنجی ڕاکێشاوە، بە ناونیشانی (سەرنجێك لە وتارەکەی مامۆستا هەژار) لە ژمارە (٣٢) ی مانگی نیسانی (١٩٦١)دا لە گۆڤاری "هیوا " دا وەلاّمی داوەتەوەو دەڵێت: گلەیی لە دوژمن ناکرێت هەروەها نەفام و کرێگرتەش، بوێژو هەڵکەوتووی گەل لە ڕیزی گەلدا دەژین. باوەڕیشی وا بووە.. هۆی زۆری شیعر وتن لە نێو کوردانـدا ئەوەیە کە شیعر وتن بلاّوبوونەوەی ئاسانترە لە پەخشان.. میللەتێکی ژێردەست و ڕێ لێگیراوی وەك کورد هەر شیعری بەدەستەوە ماوە بۆ دەربڕینی هەستی خۆی، هەرچی بابەتی پەخشانە وا ئاسان نییە، چونکە پێویستی بە گەلێك شت هەیە وەك توانای نووسین و خوێندنەوەو لەچاپدان و بلاّوکردنەوەیان[٣٦].

**٥- ڕۆژنامەنووسی:**

شێخ مارف لەم بوارەدا هەوڵەکانی بۆ سەرەتای هەڵچوونی دەگەڕێنەوە، کەوا لە بلاوکراوەی ((باسەرە))وە دەست پێدەکات لەگەڵ مامۆستای شەهید شاکر فەتاح کە تیایدا ١٤ وتاری ڕۆژنامەنووسی بلاو کردۆتەوە، (١٢) یان بابەتی کۆمەلایەتین و (٢) یان پەروەردەیین.[٣٧]، بەلام لە گۆڤاری ((شەفەق))دا نووسینەکانی پێشکەوتنێکی بەرچاو بەخۆیانەوە دەبینن.. لە گۆشەیەکی تایبەتیشەوە بە ناونیشانی (ئەلفویێ و گۆڤاری شەفەق) مەبەستەکانی نمایش دەکات و دەڵێت:

لە ئەلفەوە تا یێ هەموو شتێکی لێ پێکدێ نامانەوێ هەر بەوتن بێ، بەڵکو بەکردارمان ئەوێ، لەم دەرگایەوە لە گێروگرفتی ژیانمان ئەدوێین . نووسەر دەرفەتی ئەوەی دەبێ لە حەوت ژمارەی "شەفەق " دا بەم گۆشەیە بەشداری بکات..کە دێتە سەر پیتی چ. دەڵێت:

چەرمگە یاخود چالگەی ڕۆمی، ئەو شوێنەیە بۆ مێژوونووسانی دەرخست کە دانیشتوانی کوردستان لەپێش هەموو شوێنێکی تری سەرزەویدا ژیانی ئەشکەوتیان بەجێهێشتووە ، خانوویان دروست کردووە، ئاژەڵیان ماڵی کردووە، کشتوکاڵیان دەستپێکردووە. جا ڕۆژنامەی ((شعب)) سەری سوڕ ئەمێنێ لەوەی کە کورد ماستی دۆزیوەتەوە بۆ ئادەمزاد. چونکە ئاشکرایە کە کورد لەپێش گەلانی کەوە بزن و مەڕی ماڵی کردووەو ئەبێ ماستیشی لەپێش هەموو کەسێکا دۆزیبێتەوە. نووسەر سوور بووە لەسەر ئەوەی لەژێر ناونیشانی (شارو دێهاتەکانمان)دا لە میانەی کاری ڕۆژنامەنووسییەوە بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە بە ڕاستەوخۆیی و بێ لایەنانە کەم و کورتییەکانیان بخاتە ڕووی بەرپرسیاران وەك دەڵێت:

**"بە کاڵ ئەڵێین کاڵ و بە کولاو ئەڵێین کولاو "**

سەبارەت بە کەرکوك دەڵێت: گرنگترین و گەورەترین شاری کوردستانە، بە زەریای نەوتی و زۆری دانیشتوانی و گرنگی شوێنەکەی وەك دەربەندێکی چەشنی (مینایەکی بەڕی) شارەکانی کەمانە لە عێراقدا، بۆ کاروباری ئابووری و

هاتوچۆ، هەروەها ئەتوانین بڵێین شارێكی پیشەسازییە بەهۆی پیشەسازی نەوت دەرهێنانەوە...

له ئەنجامیشدا ئاماژە بۆ ناتەواوییەكانی دەكات لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە.

٦- نامە:

نامە گۆڕینەوە وەك بابەتێكی گرنگی ئەدەبیاتی نوێ بووەتە جێی بایەخی شێخ مارف، بەندیخانەی كردۆتە مەڵبەندنێكی ڕۆشنبیری و بارەگای نووسین، نامە نووسین بەشێكی ئەو چالاكییانەی بووە... لەو پێنج نامەیەیدا كەوا بۆ مامۆستای دوكتۆر مارف خەزنەداری ناردووە بۆ لینینگراد لە یەكێتی سۆڤێت پارچەگەلێكی ئەدەبی و نووسینی جوان و سۆزئامێز بەدی دەكرێت، تێكڕای چالاكی ئەدەبیی خۆی لەو ڕۆژگارە سەختەدا باس دەكات، بە شانازییەوە ناوی هاوڕێكانی دێنێت وەك مامۆستایان (مستەفا عەسكەری، مەلا نووری، ساجد) لە نامەی چوارەمیدا هەندێ شت زۆر سەرنجڕاكیشن وەك ئەوەی دەڵێت: عالەمی دەرەوەمان لە بیر كردووە، ڕاهاتووین، ئێستا بیری منداڵەكانم ناكەم، زۆر سەیرە ئەم دڵە ناسك و پڕ هەست و دڵسۆزەم بۆ كۆرپەكانم ئێستە لە خورپە كەوتووە. یان دەڵێت: كاكە كەمێكت هەڵنابووم، درۆیە بڵێم زۆرم پێ خۆش نەبوو، چونكە من كە دەستم داوەتە قەڵەم هێزێكی دەروونی پاڵی پێوە ناوم، بۆ ڕابواردن نانووسم هەست دەكەم ئەركم لەسەر شانە، كورد نووسیارێكی گەرەكە هەستی بەوە كردبێ كە زمانی كوردی توانایەكی مەزنی تیایە و كانێكی پڕ گەوهەرە و كرێكاری فرمان گوزارو ژیرو چالاكی ئەوێ تا گەوهەرەكانی دەربێنێ و بیخاتە بازاڕەوە، بازاڕی خۆماڵی و دەرەوە. كەمتەرخەمی دەورێكی زۆر گرانی خوێندەوارەكانمانە... من هەست دەكەم كورد نامەخانەكەی چۆڵە.(٣٨)

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

شێخ مارف ساڵی ١٩٢١ لە قادرکەرەم لە دایك بووە و کەوتۆتە بەر کارتێکەریی کۆمەڵێك هۆکاری سروشتی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و ئەدەبی، کە بوونەتە مایەی چەسپاندنی بڕێك دیاردەی جوامێری لە دڵ و دەروونیدا، وەك ڕاستگۆیی، بوێری و خۆنەویستی و نەتەوەخوازی و ئەدەب دۆستی کە لە نووسینەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکووك تەواو کردووە لەو ماوەیەدا هەستی نەتەوایەتی ورووژاوە و ماوەیەك چووەتە ڕیزی پارتی ((هیوا))وە، ساڵی ١٩٤٤ لە کۆلێجی حقوق لە زانکۆی بەغدا وەرگیراوەو چووەتە ڕیزی ئازادیخوازانەوە، لە ڕاپەڕینی چلەکاندا بەشداری کردووە، ساڵی ١٩٥٨ بەئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی هەڵبژێراوە و لە سەر داخوازی خەڵك بووەتە سەرۆکی شارەوانی کەرکووك، ساڵی ١٩٥٩ توندی بەندیخانە کراوە و بەناحەق تاوانی هەڵگیرساندنی (هەرای گاورباخی) خراوەتە ئەستۆو ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٢٣ لە سێدارە دراوە.

کونجی بەندیخانەی کردۆتە نووسینگەو ژیانی خۆی بۆ نووسین تەرخان کردووە و بووەتە هۆگرێکی تەواوی هونەرەکانی ئەدەب. لە هونەری شیعردا ناوەڕۆك بووەتە جێی بایەخی و باوەڕی وابووە دەبێ شیعر بۆ وشیارکردنەوەی مرۆڤ بەکاربهێنرێ، سەرەتاش بابەتی نەتەوایەتی لا گرنگ بووە و گیانی مقاوەمەتی لە دڵ و دەروندا چەسپیوە، پاشان خەمی مرۆڤایەتی هەڵگرتووە، تەنانەت ئاگری نەورۆزی بە ئەوینەوە گرێ داوە و بەهیوای شۆڕشێك بووە مرۆڤ لە دیلی ڕزگار بکات، بەوە ڕازی نەبوو، هەژارانی وڵاتەکەی لە پاڵ چاڵە نەوتەکاندا برسی بن، لە هێزی ڕەنجدەراندا ڕووخانی قەڵای زۆردارانی بینیوە، دوایش دەنگی خستۆتە پاڵ دەنگی ئازادیخوازیی جیهان و سروودی بۆ مرۆڤایەتی وتووە.

لە چیرۆکەکانیدا خەمی کۆمەڵی هەڵگرتووە، پەنجەی خستۆتە سەر کەم و کورتییەکانی و هەوڵی چارەسەرکردنیانی داوە، چونکە پرسی سەرەکی لای ئەو بیری کوردایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ بووە لە چەوساندنەوە، خۆنەویستانە سەودای کردووە، ناڕەزایی لە داروەستەی شێخ دەربڕیوە کە خۆی لەو بنەماڵەیە بووە،

بەتاوانی زانیوە ئەگەر منداڵ بە زمانی خۆی نەخوێنێ، داوای کردووە کانزاکانی کوردستان بهێنرێننە بەرهەم و خەڵك سوودیان لێ ببینن.

هونەری شانۆ بووەتە جێی بایەخی و لە ناوەڕۆکی دەقە شانۆگەرییەکانیدا چینی زەحمەتکێشی مەبەست بووە، وشیارکردنەوەی ڕەشوڕووتی وڵاتەکەی لا گرنگ بووە، خەڵکی دوو ڕوو هەلپەرستی ڕیسوا کردووە، پاشەڕۆژی جووتیاری کوردیشی بە گەشی بینیوە.

لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا بەچاوێکی وردبینانە ڕوانیویەتییە کەلتووری نەتەوەکەی، مەم و زینی خانی بە شاکارێکی ئەدەبی کوردی داناوە، شەرەف نامەشی بە بەڵگەیەکی خۆماڵیی مێژووی نەتەوەکەی زانیوە لە هەمان کاتیشدا ڕەخنەی لە هەندێ بەرهەمی ئەدەبیی دیکە گرتووە و زانستییانە هەڵی سەنگاندوون.

کاری ڕۆژنامە نووسینی بەرز هەڵسەنگاندووە، بەپێویستی زانیوە ڕۆژنامە نووسان ڕاستی پرسەکان بەبێ پێچ و پەنا بخەنە ڕوو، لە وتارەکانیدا پەردەی لە سەر ئەو ڕاستییە هەڵداوەتەوە کە کوردستان سەرەتاکانی ژیانی شارستانێتی لە خۆ گرتووە، کەچی نەیارانی باسی ناکەن، لە مێژووی نوێش غافڵ نەبووە، هەستی بە مەترسییەکان کردووە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە کەرکووك گرنگترین و گەورەترین شاری کوردستانە.

لە نامە ئەدەبییەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە زمانی کوردی توانایەکی مەزنی تیایە، کانێکی پڕ گەوهەرە، کرێکاری ژیرو چالاك و لێهاتووی ئەوێ تا گەوهەرەکانی دەربێنێ و بیانخاتە بازاڕی خۆماڵی و دەرەوە، بەرانبەر کەمتەرخەمی خوێندەوارەکان ناڕەزایە، چونکە ئەرکی زۆریان لە ئەستۆیە لەبەر ئەوەی کتێبخانەی کوردی چۆڵەو چاوەڕوانی بەرهەمی ڕەنجی ئەوانە.

# سەرچاوەکان

١– دکتۆر ئازاد عبدالواحد کریم، تراژیدیای پشکۆیەك ئایدیۆلۆژیا و پێکهاتەی دەق لە شیعرەکانی (شێخ مارفی بەرزنجی) دا، چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

٢– دکتۆر ئیسماعیل ئیبراهیم، بوێری و ڕاستگۆیی و ڕاستەوخۆیی لە نووسینەکانی مارف بەرزنجی شەهیددا، چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

٣– دانا عەسکەر. چیرۆکی "شەتڵ " ی شێخ مارف بەرزنجی لەنێوان ستاتیکای دەنگ و دەرکەوتە فیکرییەکاندا، دیداری نووسەری شەهید شێخ (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

٤– سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید "پشکۆ"، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٣.

٥– سەردار جاف، دوالیزمی لە ئاوەزێکی کراوەدا، چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

٧– سەمەد ئەحمەد، لە دۆخی سیاسی (هۆبز)ەوە بۆ دۆخی سروشتی ڕۆسۆ، خوێندنەوەیەك بۆ چیرۆکی (سەرلەبەیانی نەورۆزێك)ی مارف بەرزنجی ، چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی). کەرکووك، ٢٠٠٩.

٨– شاکر فەتاح ڕۆژنامەی "باسەرە"، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٥.

٩– شێخ صدیق، شێخ مارف بەرزنجی و کاری ڕۆژنامەنووسی لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ناوەرۆکی وتارە ڕۆژنامە نووسییەکانی. چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

١٠– لەتیف فاتیح فەرەج، مارف بەرزنجی و ڕۆژنامەنووسی پەنجەرەیەك بۆئەوەی لێوەی بڕوانینە ئازادی، چرایەك لە تاریکیدا، دیداری نووسەری شەهید (مارف بەرزنجی)، کەرکووك، ٢٠٠٩.

١١-دوکتۆر، مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.
١٢- گۆڤاری " ڕووناهی "، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم ١٩٦٠.
١٣- گۆڤاری " هیوا "ژمارە (٣٢)، مانگی نیسانی ١٩٦١.
١٤- گۆڤاری "شەفەق " ژمارە (٣٢) ی ساڵی پێنجەم. مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٦١.
١٥- گۆڤاری "دەفتەری کوردەواری "، هەردوو بەرگی دووەم و سێیەم، ١٩٧٠.
١٦- گۆڤاری " ڕۆژی کوردستان "، ژمارە (٢) ی ک٢، ١٩٧٢، ژمارە (٤١) ی ئابی ١٩٧٦.
١٧- احمد امين، النقد الادبي، الطبعة الثانية، مطبعة لجنة التاليف والترجمة والنشر القاهرة، ١٩٥٧.
١٨- توفيق الحكيم، فن الادب، الشركة العالمية للكتاب، بيروت، بلا.
١٩- د. عبدالاله احمد، نشأة القصة وتطورها في العراق، ١٩٠٨- ١٩٣٩، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٢.
٢٠- الدكتور عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، شركة المعرفة للنشر، ط١، بغداد، ١٩٨٩.
٢١- الدكتور علي الوردي، دراسة في طبيعة المجتمع العراقي، منشورات سعد بن جبر، ط١، ٢٠٠٥.
٢٢- د. علي عباس علوان، تطور الشعر العراقي في جمهورية العراق، وزارة الاعلام، بغداد.

# پەراوێزەکان:

١) تەواوی دەستخەتەکە لە نێوان ساڵانی ١٩٦٠–١٩٦١ لە بەندیخانەی بەغدا نووسیویەتی و بەنامەیەك بۆ مامۆستای دکتۆر مارف خەزنەدار ناردوویەتی ، کە ئەوکاتە لە وڵاتی سۆڤێت خەریکی تەواوکردنی خوێندن بووە ، ئەویش پاش گەڕانەوەی بۆ وڵات بەم شێوەیە بەسێ بەش لەم بڵاوکراوانەدا بڵاوی کردۆتەوە: دەفتەری کوردەواری بەرگی دووەم، **دەفتەری** کوردەواری بەرگی سێیەم، گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان ". ژمارە (٤١) ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٦.

٢) بڕوانە: "دەفتەری کوردەواری". بەرگی دووەم، بەغدا، مارت – نیسان، ١٩٧٠، ل: ١٤٦.

٣ ) باسەرە... دیواربەندێکی هەفتانەی دەسنووس بووە یەکەم ژمارەی لە ڕۆژی ١٩٤٢/٦/٢٥ دەرچووە و دوایین ژمارەشی (٢٤) ڕۆژی ١٩٤٢/١١/٢٣ دەرچووە. مامۆستا شاکر فەتاح ساڵی ١٩٨٥ هەموو ژمارەکانی بە کۆمەڵ چاپ کردووە.

(٤) سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل:٤.

(٥) لەتیف فاتیح فەرەج، مارف بەرزنجی و ڕۆژنامەنووسی پەنجەرەیەك بۆئەوەی لێوەی بڕوانینە ئازادی، ل٦.

(٦) الدکتور علي عباس علوان، تطور الشعر العراقي في جمهورية العراق، ص: ١٤٥.

(٧) توفيق الحكيم ، فن الادب، ص: ٧٥.

(٨) سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل: ٣٣.

(٩) سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٥.

١٠ سەرچاوەی پێشوو، ل: ٤٨.

١١ الدکتور عبد الستار طاهر شريف ، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، ص: ٩٤.

١٢ سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل: ٧٨.

١٣سەرچاوەی پێشوو، ل: ١١٤.

١٤ سەرچاوەی پێشوو، ل: ٨٩.

١٥ سەرچاوەی پێشوو، ل: ٩٥.

١٦) سەردار جاف ، دوالیزمی لە ئاوەزێکی کراوەدا، چرایەك لە تاریکیدا، ل: ١٦٠

(١٧) احمد امين، النقد الادبي، ص: ٢٤.

(١٨) سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل: ٢٨٠.

(١٩) سەرچاوەی پێشوو، ل: ٢٦٨.
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو، ل:٢٧٩.
(٢١) د. ئازاد عبدالواحد کریم ، تراژیدیای پشکۆیەك ئایدۆلۆژیا و پێکهاتەی دەق لە شیعرەکانی ( شێخ مارف بەرزنجی)دا ، ل: ١٨٠.
()٢٢ سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل: ٤٦.
(٢٣) سەرچاوەی پێشوو، ل:٥٥.
(٢٤) سەرچاوەی پێشوو، ل:٥٦.
(٢٥) سەرچاوەی پێشوو، ل:٧٠.
(٢٦) سەرچاوەی پێشوو، ل:٦٩
(٢٧) سەرچاوەی پێشوو، ل: ٧١.
٢٨ سەرچاوەی پێشوو، ل:٧٣.
٢٩ سەرچاوەی پێشوو، ل: ٧٣.
٣٠ سەرچاوەی پێشوو، ل: ٧٨.
(٣١) سەرچاوەی پێشوو، ل:٨٥.
(٣٢)– د. عبد الاله احمد ، نشاة القصة وتطورها في العراق ١٩٠٨–١٩٣٩ ، ص:١٠٣.
(٣٣) دکتۆر مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، ل: ٤٠٩.
(٣٤) دانا عەسکەر. چیرۆکی "شەتڵ"ی شێخ مارف بەرزنجی لەنێوان ستاتیکای دەنگ و دەرکەوتە فیکرییەکاندا، ل:١٠٩.
(٣٥) سەمەد ئەحمەد ، لە دۆخی سیاسی ( هۆبز)ەوە بۆ دۆخی سروشتی رۆسۆ ، خوێندنەوەیەك بۆ چیرۆکی ( سەرلەبەیانی نەورۆزێك ) ی مارف بەرزنجی، ل: ٧٧
٣٦ دکتۆر ئیسماعیل ئیبراهیم ، بوێری و ڕاستگۆیی و ڕاستەوخۆیی لە نووسینەکانی مارف بەرزنجی شەهیدا، ل: ١١٧ – ١٤٢.
٣٧ شێخ صدیق ، شێخ مارف بەرزنجی و کاری رۆژنامەنووسی لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ناوەرۆکی وتارە رۆژنامە نووسییەکانی، ل: ٢٧.
(٣٨) سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، مارف بەرزنجی شەهید، ل: ٣٢٠.

## ملخص البحث باللغة العربية

في ظل الظروف السياسية القاسية التي مرت بها كردستان في سنوات القرن العشرين ظهر في منطقة ( گرميان) العديد من المفكرين والمبدعين الذين صقلت مواهبهم نتيجة تأثرهم بمعاناة شعبهم ومجتمعهم مما ادى ذلك الى اغناء تجاربهم الشخصية مجسدة فيهم العديد من ظواهر الخلق القويم كالصدق والجرأة ونكران الذات .

الشيخ معروف البرزنجي ( ١٩٢١–١٩٦٣) نموذج من هؤلاء ، فهو منذ طفولته وقع تحت تأثير طبيعة كردستان والتقاليد الكردية الاصيلة . نشأ في عائلة متدينة وفي ظل رعاية أب وطني عطوف ذو شخصية مرموقة وصاحب مواهب أدبية يحمل شعورا قوميا نزيها كونه كان احد المؤيدين البارزين لقائد الثورة الكردية آنذاك (الشيخ محمود) .

وفي طفولته تأثر ايضا بفقدانه لحنان امه التي توفيت في السنة الثانية من عمره . بالاضافة الى تأثره بمعاناة الفلاحين ومظالم الاقطاعيين .

بدأ دراسته في (قادر كرم) وعندما وصل الى مدينة كركوك لمواصلة دراسته الثانوية وجد البيئة المناسبة لاظهار شعوره القومي حيث انتمى لفترة الى حزب " هيوا " الذي كان يضم كبار الشخصيات الكردية والضباط والطلاب . وحينها بدأ بنشر نتاجاته مبتدأً بنشرة " باسەرە " الذي كان يقوم باصدارها الاستاذ الاديب الشهيد شاكر فتاح ، وكذلك في مجلة " شەفەق " . و في سنة ١٩٤٤ قبل في كلية الحقوق في بغداد ، وفيها بدأ مرحلة جديدة من حياته السياسية ، حيث انضم الى الاحرار وشارك في الانتفاضات الشعبية .

وفي سنة ١٩٥٤ كان مع ممثلي الجبهة الوطنية الموحدة في منطقة السليمانية وبعد ثورة ١٩٥٨ اصبح عضوا في الجمعية الوطنية ومن ثم رئيسا لبلدية كركوك .

وفي سنة ١٩٥٩ اتهم ظلما باشعال الفتنة في كركوك وادخل السجن واعدم في ١٩٦٣/٦/٢٣ بدون وجه حق .

وهو في السجن بدأ بانماء مواهبه وقدراته الادبية، وكتب في مختلف مجالات الابداع من فنون الشعر والقصة والنقد والمسرح والصحافة والرسائل ... مما يهئ مادة رصينة للعديد من البحوث العلمية تعالج مختلف المواضيع . ومن هنا جاء اختيارنا " الشيخ معروف البرزنجي حياته ومضامين فنونه الادبية " عنوانا لهذا البحث الذي يتألف من هذه المقدمة وفصلين ، وكما تقتضي ضوابط منهج البحث العلمي كرست المقدمة لتبيان اهمية الوضوع

وضرورته ومدى دراسته عموما والصعوبات التي جابهت الباحث ومـن ثـم مكونـات البحـث واهم مصادره ومراجعه عرضا وتحليلا .

يحمل الفصل الاول عنوان " سيرة حياة الـشيخ معـروف البرزنجـي " ويتـصدى باختـصار لمعالجة موضوع سيرة حياة الكاتـب والظـروف الـتي احاطـت بـه ومـدى تـأثره بـالبيئتين الطبيعية والاجتماعية لكردسـتان في الريـف والمدينـة . فوقـف شـامخا بوجـه الاقطـاعيين لنصرة الفلاحين وكذلك بوجه مظالم شركة النفط ومعاناة العمال البسطاء .

يحمل الفصل الثاني عنوان " أدبيات الشيخ معروف البرزنجـي " ويتنـاول الباحـث في هـذا الفصل مضامين الفنون الابداعية للكاتـب مـن الـشعر والقـصة والمـسرحية والنقـد الادبـي والادب الصحفي والرسائل .

فمن خلال هذه الفنون نرى بان الكاتـب يحـدد واجبـات الادب ويبـدي ملاحظاتـه متبنيـة رؤى روسو ، ويتخذ من رؤى الشاعر العراقـي الكـبير الرصـافي وسـيلة للارشـاد والتوعيـة . فكان يحمل هموم ابناء جلدته ويشعر بمعاناتهم كونهم ينتمون لامة مظلومة وكـذلك يحمـل في ثنايا نصوصه هموم الانـسانية متبنيـا رؤى الادبـاء التقـدميين ( أمثـال نـاظم حكمـت وغيره) وتتـضمن خاتمـة البحـث أهـم الاسـتنتاجات الـتي توصـل اليهـا الباحـث في سـياق تحليلي قدر الامكان .

## ABSTRACT

Under the severe political conditions which Kurdistan has been subjected to during the twentieth century , many intellectuals and creative wirters who cultivate their talents as a result of effectiveness of the suffering of their people and society which led to the enrichment of the personal experiences embodied with many of true virtues such as truth, boldness and self-denial. One such people is Sheikh Marouf Albarazanji (1921 – 1963) who, from his childhood came under the influence of Kurdistan original nature and customs. He was raised in a religious family under the patriots , compassionate and father caring shadow with a prestigious personality and literature talented and has nationalistic feelings as he was one of the notable supporters for the Kurdish revolutionary leader Sheikh Mahmoud.

As for his childhood ,he had been inflicted with his mother's disease who died in the second year of his age. In addition to his sympathy with the suffering of the peasants and feudalists oppression, he started his studies in ( Qadir karam town) and when reached Karkuk city to pursue his secondary school found appropriate environment to reveal his national feeling. Then he joined for a period of time the (Hewa) Party which included some of the prominent Kurdish personalities, officers and students. Thereof he started publishing his leaflet (Basarra) which was issued by the writer and professor the martyr Shakir Fattah, and also – Shafaq – magazine. At 1944 he joined College of Law and started new era of his political life, then joined liberal party and participate in the Shabania uprising.

In 1954 he was one of the representatives of the united national front in Suleimania area. After 1958 he became a member in the National Assembly ,later chief of Karkuk municipality . In 1959 was accused of igniting sedition in Karkuk; therefore he was imprisoned and unjustly executed in 23 / 6 / 1963. During his existence in the

prison , he developed his literary abilities and talents ; therefore he wrote in different creative fields such as poetry, criticism, theater, media and letters which became later sedate materials for many scientific researches dealing with different subjects. From this point , we selected Alskaikh Marouf Albarazanji – his life and the contents of his literary arts – as a title for this research which consists of this introduction and two chapters. According to the rules of the scientific research method , introduction is dedicated to show the importance of the subject and its necessity and the extent of studying the difficulties which faced the researcher. Then the body of the research, its important references, its resources. The first chapter contains {biography of the life of Alskaikh Marouf Albarazanji}, which gives a summary of the writer's life and the circumstances that encompassed him and the influence of both environments of Kurdistan – natural & social - both the city and rural areas. He stands against the feudalists to support the peasants and against unjust oil companies and with the suffering of the simple workers. Second chapter is under the title “Literature of Alskaikh Marouf Albarazanji “ which is dealing with the contents of creative arts of the writer from poetry , stories , theatre , literature critic, journalistic and letters.

Through these arts , the writer identified the duties of the literature and gave his notes by adopting Rousenu’s thoughts and taking the great Iraqi poet Alrasafi as a means of instruction and enlightenment. He put on his burden the problems of the people and their worries because they belong to an oppressed nation which contains by its implications the human kind worries reflecting the view of the senior writers like ( Nadhim Hikmat and other). The end of the research contains the most important conclusions reached by the researcher analytically as much as possible.

# هەڵوێستی شاری هەولێر لە کودەتای بەکر سدقی ١٩٣٦

مەهدی محەمەد قادر
مامۆستای کۆلێژی ئاداب / زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

## پێشەکی

کودەتای سەربازی ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦ کە بە کودەتای بەکر سدقی ناسراوە دەرەنجامی ئەو پەرەسەندنە سیاسییە ئاڵۆزانە بوو، کە شانشینی عێراق لە دوای بە ئەندامبوونی لە کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٣٢ بەخۆیەوە بینی، و قۆناغێکی نوێی لە مێژووی سیاسی عێراقدا داهێنا و کاریگەری لە سەر هەردوو ئاستی سیاسی ناوەخۆیی و دەرەکی لێکەوتەوە.

سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەربارەی هەڵوێستی شاری هەولێر لە کودەتای بەکر سدقی دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەی گرنگیی ئەم رووداوە لە مێژووی سیاسیی عێراق و کاریگەری لەسەر رەوشی سیاسیی کوردستان، شاری هەولێریش وەك یەکێك لە شارە کوردییەکانی کوردستانی عێراق کەوتە ژێر کاریگەری ئەم بارودۆخە تازەیە، هەر بۆیە دیارخستنی هەڵوێستی مێژوویی ئەم شارە لەم رووداوەدا گرنگیی خۆی هەیە، هەروەها دەکرێت بڵێین نەبوونی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانە کە پشتی بە سەرچاوە و بەڵگەنامە هەمەجۆرەکان بەستبێت دەربارەی هەڵوێستی هەولێر فاکتەرێکی تر بووە لە هەڵبژاردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

جێگای ئاماژەیە لێکۆڵینەوەیەکی لەم جۆرە هەڵبەت توێژەر رووبەڕووی چەندین کۆسپ و تەگەرەی زانستی دەکات بە تایبەتی نەبوونی سەرچاوەی تایبەت بە شاری هەولێر لەم ماوە مێژووییە و کەمی بەڵگەنامەکان کە تایبەت بن بە پەرەسەندنە سیاسییەکانی ئەم شارە و هەروەها لە ژیان نەمانی بەشێکی زۆری

ئەو کەسانەی لەم ماوەیەدا لە هەولێر ژیاون و لە نزیکەوە ئاگاداری رووداوەکان بوونە ئەمە سەرەڕای نەنووسینەوەی یاداشت لە لایەن رۆشنبیران و کەسایەتییە سیاسییەکانی ئەم شارە کە دەکرێت ئەمە بە هۆکارێکی راستەوخۆی کەمی زانیارییەکان دابنێین.

توێژینەوەکە لە پێشەکی و دوو تەوەر و دەرەنجام پێك هاتووە و بە لیستی سەرچاوەکان کۆتایی دێت، تەوەری یەکەم بریتییە لە رەوشی سیاسیی هەولێر لە نێوان سالانی ( ١٩٣٣ ـــ ١٩٣٦ ) و تیشك خستنە سەر ئەو سیاسەتەی حکومەتەکانی ئەم ماوەیە بەرامبەر ئەم شارە پەیڕەوییان کردووە، تەوەری دووەم باس لە هەڵوێستی پێکهاتەکانی ئەم شارە دەکات بەرامبەر کودەتاکە.

ئەو سەرچاوانەی لەم توێژینەوەیەدا سوودی لێ وەرگیراوە، کتێبی (تاريخ الوزارات العراقية)ی عبدالرزاق الحسني و (انقلاب سنة ١٩٣٦ في العراق) ی صفاء عبدالوهاب المبارك و (بكر صدقي وانقلابه العاصف) ی محمود شبيب و(صفحات في تاريخ العراق المعاصر)ی كمال مظهر احمد و ئەو بەڵگەنامە بەریتانییانەی کە لە ئەرشیفی بەڵگەنامەکان لە بەغدا بە دەست هێنراون و بەشێك لەم بەڵگەنامە بەریتانییانەی کە بەشێوەی کتێب لە چەند بەرگێکدا بلاوکراونەتەوە، جێگای ئاماژەیە توێژەر لە رێگای چاوپێکەوتنەکانیدا بە تایبەتی لەگەڵ هەر یەك لە (فوئاد عارف و کەریم ئەحمەد و سەید نژاد بەرزنجی و ئەحمەد خدری پاشا و ئەحمەد دڵزار ) زانیاری گرنگی دەست کەوتووە.

هەر چەندە کارێکی لەم جۆرە بێ کەموکوڕی نابێت بەلام دەکرێت بە یەکەمین کاری زانستی دەربارەی هەڵوێستی شاری هەولێر لە یەکەمین کودەتای سەربازی لەسەر ئاستی عێراق و ولاتانی عەرەبی دابندرێت، لە کۆتاییدا هیوادارم بە چاوێکی زانستییانە وەربگیرێت.

## تەوەری یەکەم :

## ڕەوشی سیاسیی هەولێر ( ١٩٣٣ ـ ١٩٣٦ ).

ڕەوشی سیاسیی عێراق دوای مردنی (مەلیك فەیسەڵی یەکەم ١٨٨٣ ـ ١٩٣٣ ) لە ٨ی ئەیلولی ١٩٣٣[١]، بە قۆناغێکی ناسەقامگیردا تێپەڕی بە تایبەتی دوای ئەوەی دەسەڵاتدارانی عێراق بە سەر دوو ئاڕاستەی سیاسی پێچەوانەی یەکتر دابەش بوون[٢]، یەکەمیان ئەوانەی کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری و گوێڕایەڵی سیاسەت و ویستەکانی بەریتانیا کە چەند سیاسەتمەدار و ئەفسەرانی سوپای دەگرتەوە دیارترینیان (نوری سەعید ١٨٨٨ ــ ١٩٥٨) و (جەعفەر عەسکەری ١٨٨٥ ــ ١٩٣٦) بوون[٣]، دووەمیان ئەوانەی دژ بە سیاسەتی بەریتانیا بوون و ئاڕاستەیەکی نەتەوەییان گرتبووە بەر کە لە رووی ژمارەشەوە لە ئاڕاستەی یەکەم زیاتر بوون دیارترینیان (تەها هاشمی ١٨٨٨ ــ ١٩٦١) و(حکمت سلێمان ١٨٨٩ ــ ١٩٦٤) و(ڕەشید عالی گەیلانی ١٨٩٣ ــ ١٩٦٥) بوون کە هەیمەنەیان بە سەر ڕەوشی سیاسی لە عێراقدا گرتبوو [٤].

ئەم ناسەقامگیرییە سیاسییە بووە هۆی ئەوەی لە دوو ساڵدا ( ١٩٣٣ــ١٩٣٥) چەند حکومەتێك دابمەزرێت کە لە دوای ماوەیەکی کەم هەڵدەوەشایەوە، بۆ نموونە حکومەتی سێیەمینی ( جمیل المدفعي ١٨٩٠ ــ ١٩٥٨) لە ٤ی ئاداری ١٩٣٥ دامەزرا و دوای یانزە ڕۆژ سەرۆك وەزیران دەستی لە کار کێشایەوە[٥]، تا لە ١٧ی ئاداری ١٩٣٥ حکومەتێکی تازە بە سەرۆکایەتی یاسین هاشمی ( ١٨٨٤ ــ ١٩٣٧) پێك هێندرا [٦].

سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر دوای ڕاگەیاندنی حکومەتێکی تازە بە سەرۆکایەتی یاسین هاشمی ژمارەیەك لە پیاو ماقووڵان و سەرۆك هۆزەکانی لیوای هەولێر لەوانەش ( خدری ئەحمەد پاشا، حوسێنی مەلا، ڕەسول حەمە صادق، ڕەحمان حاجی بایز ئاغا، قادر ئەحمەد پاشا ) لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسایەتییە ناودار و سەرۆك هۆزەکانی (داودە و جاف و تاڵەبانی ) سەر بە لیواکانی کەرکوك و سلێمانی و موسڵ و دیالی بە مەبەستی پیرۆزباییکردن و وەفا نواندنیان سەردانی شاری بەغدایان کرد، لە کاتی دیدەنی سەرۆك وەزیران بە ناوی ئامادەبووان (شێخ

فائق تاڵەبانی) وتارێکی پێشکەش کرد کە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئامادەن شان بە شانی حکومەت بوەستن بۆ سەرکوتکردنی هەر هەوڵێك کە ئامانجی پارچەکردنی عێراق بێت، هەر وەك لە بەشێکی وتارەکەیدا هاتووە :

**".... ئەوانەی لە بەردەم بەڕێزتان کۆبوونەتەوە نوێنەرایەتی راستەقینەی هۆزەکانی لیواکانی کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و موصل و دیالە دەکەن، ئەم هاتنەیان بە هاندانی دەسەڵاتە ناوەخۆییەکان نییە بەڵکو لە دڵسۆزییانەوەیە بۆ متمانە پێکردنی وەزارەت بە رۆڵەکانی باکور.... راگەیاندنیانە بۆ پشتگیری و سەلامەتی ئەم شانشینە و جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان...."** [(٧)].

جێگای ئاماژەیە چەند کەسێك لە پێکهاتەی ئەم شاندە پێش چوونیان بۆ بەغدا کۆبوونەوەیەك ئەنجام دەدەن بە مەبەستی رێکخستنی نووسراوێك و ئیمزاکردنی بۆ ئەوەی لە پاڵ نواندنی وەفا و دڵسۆزییان چەند داواکارییەکیش پێشکەش بە سەرۆك وەزیران بکەن کە لەم خاڵانە پێك هاتبوو :

١ / چاکسازی کردن لە کارگێڕیی ناوچەکانی باکور و رەتکردنەوەی رێنمایی و رێکخستنە تایبەتەکانی فەرمانبەرانی تایبەت بە موتەسەرفیەکانی لیواکانی باکور.

٢ / کاریگەر کردنی یاسای زمانە ناوەخۆییەکان و راستکردنەوەی بە پێی راسپاردەکانی ئەمین زەکی بەگ [(٨)].

٣ / یەکخستنی خوێندن لە ناوچە کوردییەکان و بەڕێوەبەری پەروەردە لە باکور دەسەڵاتی زیاتر بکرێت و بەشێك لە بودجە بۆ خوێندن تەرخان بکرێت کە بگونجێت لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە.

٤ / کردنەوەی قوتابخانەیەکی سانەوی و کۆلێژێکی مامۆستایان و قوتابخانەیەکی (تقنية) لە ناوچەکانی باکور.

٥ / دانانی رێژەیەك بۆ قوتابیانی کورد لەوانەی بۆ خوێندن رەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرێن.

٦ / کردنەوەی قوتابخانەی شەوان بۆ کورد وەك چۆن لە شاری بەغدا هەیە.

٧ / دامەزراندنی یاریدەرێکی کورد بۆ بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی ناوەخۆ و پێدانی دەسەڵات بە پێی یاسایەکی تایبەتی [(٩)].

هەر چەندە ئەم داواکارییانە شێوەیەکی گشتگیری جەماوەریی لەخۆ دەگرێت، بەلاّم ئەگەر بەراورد بکەین بە رادەی سوود وەرگرتنی خەڵکی هەولێر لەم داواکارییانە ئەوا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زیاتر ئەم سەرۆك هۆزانە سوودیان لێ وەرگرتووە، بۆ نموونە لەو کاتەی کوڕەکانی حوسێنی مەلا قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی قازیخانە تەواو دەکەن دواتر قوتابخانەکە دادەخرێت و خاوەن بڕوانامەکانی دەرەوەی وڵات هیچ کەسێکی تێدا نییە جگە لە کوڕە دەرەبەگ و ئاغاکان نەبێت و سەبارەت بە چاکسازییە کارگێڕییەکانیش وەك دەردەکەوێت بۆ ئەوە بووە کە ئەو دەسەلاّتەیان بمێنێتەوە کە هەیانبوو[١٠].

جێگای ئاماژەیە داواکارییەکانی ئەم شاندە کوردییە هەر وەك لە بەڵگەنامە بەریتانییەکان هاتووە داواکاری ئاسایین هیچ جۆرە داواکارییەکی نەشیاو لە خۆ ناگرێت، کە عبدالرزاق الحسني بە برووسکەیەکی مەترسیداری وەسف دەکات [١١]، بەلاّم حکومەت ئامادە نەبوو کە ئەم داواکارییانە جێبەجێ بکات هەر بۆیە وەزیری ناوەخۆ (رەشید عالی گەیلانی) داوا لە شاندەکە دەکات کە ئەم داواکارییانە بە شێوەیەکی فەرمی پێشکەش بە حکومەت نەکرێت و بۆ رازیکردنیشیان چەند بەڵێنێکی زارەکییان پێ دەدات، ئەوەی جێگای ئاماژەیە شاندی ناوبراو کاتێك هەست دەکەن کە رێگایان پێ نادرێت ئەم داواکارییە گشتییانەی کورد بەرز بکەنەوە بۆ دەسەلاّتداران دەکەونە هەوڵی بەدیهێنانی دەسکەوتە تایبەتییەکانیان و لیستێك بە ناوی هەندێك لە کەسایەتی و سەرۆك هۆزەکانی ناوچە کوردییەکان ئامادە دەکەن و داوا لە وەزیری ناوەخۆ دەکەن کە لە خولی داهاتووی ئەنجومەنی نوێنەراندا نوێنەرەکانی لیوای (هەولێر و کەرکوك و سلێمانی ) لەم لیستەدا هەڵبژێرێت و وەزیری ناوەخۆش بەڵێنی پێدان کە ئەم داوایەیان لەبەر چاو بگیرێت[١٢].

کار و چالاکییەکانی حکومەتی (یاسین هاشمی) نەك تەنها لە ناوچە کوردییەکان بەڵکو لە سەر ئاستی عێراقیش لە ئاستێکی پێویستدا نەبوو، هەر بۆیە رووداوەکانی سەردەمی ئەم حکومەتە بوو بە فاکتەرێکی کاریگەر بۆ بەهێزبوونی بەرەی بەرهەڵستی بە تایبەتی دوای رووداوەکانی کازمیە و شۆڕشی رمێسەی یەکەم و دووەم و شۆڕشی ئەگرع لە دیوانیە و شۆڕشی سوق الشیوخ و

شۆڕشی مەدینە [١٣]، سەبارەت بە کوردستانیش بزووتنەوەی (خەلیل خۆشەوی ) و (جوولانەوەی کوردە ئێزیدییەکان لە سنجار)[١٤] لەناو بردران[١٥].

یەکێك لە کارەکانی حکومەت بۆ بێ دەنگکردنی نەیارانی هەوڵدان بوو بۆ راگرتن و قەدەغەکردنی دەرچوونی هەندێك لەم رۆژنامە و گۆڤارانەی کە رووی راستی کارەکانی حکومەتیان دەخستە روو، هەر لەم چوارچێوەیەشدا گۆڤاری (رۆناکی) کە لە شاری هەولێر دەردەچوو، دوای دەرکردنی ژمارە (١١) لە ١٦ی ئایاری ١٩٣٦ بە بیانووی ئەوەی گۆڤارەکە رەخنەی لە کارو چالاکییە خزمەتگوزارییەکانی حکومەت گرتووە دەربارەی پرۆژەی دابینکردنی ئاوی پاك بۆ شاری هەولێر وەستێندرا [١٦].

لە سەر ئاستی سەربازیش (بەکر سدقی) توانی گرووپێکی سەربازی لە ئەفسەرانی کورد و عەرەب پێك بهێنێت کە چەند ئامانجی لەخۆ گرتبوو گرنگترینیان لەکار لابردنی حکومەتی (یاسین هاشمی) و رەتکردنەوەی بنەماکانی عێراقی عەرەبی و پشتگیریکردن لە داواکارییە نەتەوەیی و کەمینە ئاینییەکان[١٧]، بەم جۆرە لە ئەنجامی هەموو ئەو دەرهاوێشتە سیاسی و سەربازییانەی ساڵانی (١٩٣٣ ــ ١٩٣٥ ) رەوشێکی لەبار رەخسا بۆ هێنانەکایەوەی سەرەتایەکی تازە لە ژیانی سیاسی لە عێراقدا.

## تەوەری دووەم :

## هەڵوێستی هەولێر لە کودەتای بەکر سدقی

حکومــەتی (یاســین هــاشمی) لــە ٢٩ی تــشرینی یەکــەمی ١٩٣٦ لــە رێگــای کودەتایــەکی ســەربازی بــە ســەرکردایەتی ( فــەریق بــەکر ســدقی ) رووخــا [١٨]، حکومەتێکی تازە بە سەرۆکایەتی ( حکمت سلێمان) پێك هێنرا [١٩].

کودەتــای ٢٩ی تــشرینی یەکــەم کــە بــە چــەند ناوێــك ناســراوە دیارترینیــان (کودەتــای بــەکر ســدقی ) یــە، بــە یەکــەمین کودەتــای ســەربازی لــە مێــژووی هاوچەرخی سیاسی وڵاتانی عــەرەبی و دەوڵــەتی تــازەی عێــراق دادەنــدرێت، هــەر بۆیە لە سەر ئاستی ناوەخۆ و دەرەوەش کاردانەوەی گرنگی بەخۆوە بینیوە.

سەبارەت بە هەڵوێستی دەرەکی، بەریتانیا هەر لە سەرەتای رووداوەکەدا لــە رێگــای بــاڵیۆز (ارشــیبالد کــلارك کــیر) وەك رووداوێکــی مەترســیدار و ترســناك ناســاندرا، بــە پێــی بەڵگەنامەیــەکی وەزارەتــی دەرەوەی بــەریتانی کــە ئاراســتەی باڵیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا بــە ژمــارە (٢٣٦) لــە ٣٠ی تــشرینی یەکــەم ١٩٣٦ کراوە، رووخانی حکومەتی (یاسین هاشمی) لە رێگای کودەتایەکی سەربازی بە لە کارخستنی دەســتوور نــاو دەبــات و ئــەم قۆناغــەش بــە قۆنــاغێکی پــڕ مەترســی و هەستیار لە عێراقدا وەسف دەکات[٢٠]، هەروەها هەندێك لە وڵاتانی پێشکەوتنخواز هــەر لــە ســەرەتادا وەك بزووتنەوەیــەکی نیــشتمانییان ناســاند[٢١]، بــەڵام وڵاتــانی عەرەبی بیروڕای جیاوازیان هەبوو[٢٢].

لــە ســەر ئاســتی نــاوەخۆش هــەر لــە ســەرەتای روودانــی کودەتایەکــە پێشوازییەکی گەورەی جەماوەری لێکرا و لە ٣ی تــشرینی دووەم (حزبــی شــیوعی عێراق) بە هاوکاری لەگەڵ (کۆمەڵەی ئەلئەهالی ـ جماعة الاهالي ) کەوتنە هانــدانی جــەماوەری شــاری بەغــدا و ســەرکردایەتی خۆپیــشاندانێکی جــەماوەری فراوانیــان کــرد، لــەم خۆپیــشاندانەدا ژمارەیــەکی زۆر لــە قوتابیــان و نیــشتمان پــەروەران و کاســبکاران بــە مەبەســتی پــشتگیریکردن لــە حکومــەتی تــازە بــە دروشمــی نیشتمانییەوە بەشدارییان تێدا کرد [٢٣].

جێگای ئاماژەیە کوردەکانی شارەکانی باشووری کوردستان بە تایبەتی کوردەکانی هەولێر کە لە بەغدا بوون بە هۆی هەستی نەتەوایەتییەوە پاڵپشتییان لەم کودەتایە کردووە و شان بە شانی خەڵکی شاری بەغدا بەشدارییان لە خۆپیشاندانەکەدا کرد [٢٤].

سەبارەت بە هەڵوێستی شاری هەولێر، بە پێی راپۆرتی (ایج.بی.هیربرت) ئەوە دەردەخات کە دەسەڵاتی کارگێڕی ( السلطة الادارية ) لە سەرووی هەمووشیانەوە موتەسەریفی هەولێر ( ئەحمەد تۆفیق ) یەکێك بووە لەم کەسایەتییانەی کە پەیوەندی بەم رووداوەوە هەبووە و پشتگیری کردووە تەنانەت لە دەقی ئەم راپۆرتەدا دەڵێت :

**".... بەڵگە هەبوو بە بوونی نەخشەیەکی کارامە بۆ ئەنجامدانی کودەتایەك کە لە لایان نەتەوە خوازانی کورد یارمەتی دەدرێت، ئەو کەسانەی پلانی کودەتایەکەیان داناوە و جێبەجێیان کردووە بریتین لە (بکر صدقي) و موتەسەریفی هەولێر ( ئەحمەد توفیق بەگ ) و موتەسەریفی موسل (عمر نظمي)... "** [٢٥].

دەکرێت بڵێین هەولێر یەکێك بووە لەم شارانەی کە پاڵپشتی ئەم کودەتایەی کردووە شان بە شانی شارەکانی تر هەر بۆیە دوای روودانی کودەتاکە و دەرکەوتنی هەڵوێستی بەریتانییەکان لە دژی ئەم کردەوەیەدا هیچ کاردانەوەیەکی نائاسایی لە هەولێر لە دژی کودەتاکە ئەنجام نەدراوە کە ببێتە هۆی ئەوەی هەڵوێستێکی نارەزایی تێدا دەربکەوێت، تەنانەت بە پێی بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦ دەربارەی کاردانەوەی ناوەخۆیی لە کودەتاکە دەڵێت : **" کودەتای سەربازی لە عێراق پشتگیری تەواوی لە هەموو لایەکەوە لێدەکرێت "**[٢٦]، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەوانەی دژ بە بەریتانییەکان بوونە لە سەنگەری بەرگری و هاوسۆزی ئەم حکومەتەدا بوون، هەروەها دوای یەکەمین بەیاننامەی سەرکردەی هێزە چاکسازییە نیشتمانییەکان کە بانگەشەیەکی ئاراستەی هەموو فەرمانبەران کرد تا دامەزراندنی حکومەتی تازە فەرمانگەکانیان جێبهێڵن بۆ خۆپاراستنیان لە هەر کاردانەوەیەکی لە ناکاو لە دژی ئەم کودەتایە[٢٧]، فەرمانگەکانی هەولێریش لە

لایەن هێزە ئەمنییەکانەوە پارێزران تا ئەو کاتەی حکومەتی تازە راگەیاندرا و دواتر بانگەشەیەکی ئاراستەی هەموو موتەسەریفەکانی عێراق کرد بۆ ئەوەی ژیانی ئاسایی لە شارەکاندا وەك پێشوو دەست پێبکاتەوە، بەم جۆرە دەزگاکان دەستیان بە کارەکانیان کردوە[٢٨].

سەبارەت بە بەشداری هەولێر لە رووی سەربازییەوە هیچ بەشدارییەکی نەبووە چونکە تا ئەو کاتەش لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە شارێکی بچووك بووە بە بەراورد لەگەڵ شارە گەورەکانی عێراق وەك شاری بەغدا و موسڵ، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین ئەمە هۆکارێکی سەرەکی بوو کە سەربازگەی گەورە و فێرگەی سەربازی بنکە فراوانی تێدا دانەمەزرێت، ئەوەی لە هەولێردا هەبوو تەنها یەك حامیەی سەربازی بووە کە ئامرەکەی ( نوری محمد ) بووە، ئەفسەری خانەنشین (فؤاد عارف ١٩١٣ ــ ٢٠١٠) کە لەم ماوەیەدا وەك ئەفسەرێکی بە پلەی مولازم لە حامیەی هەولێر لە خزمەتدا بووە سەبارەت بە رۆڵی سەربازی هەولێر لە کودەتای ٢٩ی تشرینی یەکەم دەڵێت :

**"شاری هەولێر لە رووی سەربازییەوە هیچ رۆڵێکی نەبوو لە کودەتای بەکر صدقی تەنها ئەوەی پەیوەندی بەم شارەوە هەبێت ئەوەیە کە لە سەر داوای (فەریق بکر صدقی ) ئامر حامیەی هەولێر (نوری محمد) چووە قرەغان لەو کاتەی کە تیپی دووی سوپای عێراق کە بکر صدقی سەرکردایەتی دەکرد لە قرەغان لە خولێکی مەشق بوو کە پلانی کودەتایەکەش لەم شوێنەدا نەخشەی بۆ کێشرا"** [٢٩].

وەك دەردەکەوێت ئەگەر (نوری محمد) یەکێك لەو ئەفسەرانەش بووبێت کە ئاگاداری رووданی کودەتایەکی لەم جۆرە بووە ئەوا لە رێگای پەیوەندی بە بکر صدقی یەوە بووە بۆیە ئەم جۆرە پەیوەندییە لە سەر ئاستی تاکە کەسی دادەندرێت نەك بەشداری ئەم هێزە سەربازییەی کە لە شارەکەدا هەبوو.

سەبارەت بە هەڵوێستی جەماوەریش هەر لە رۆژانی یەکەمی کودەتایەکەدا شان بە شانی خۆپیشاندانەکانی شارەکانی تر لە هەولێریش خۆپیشاندانێکی جەماوەری بەرێوە دەچێت بۆ پشتگیریکردن لە حکومەتی تازە و دەربرینی هەستی خۆشی بەم کودەتایە[٣٠]، جێگای ئاماژەیە جگە لە کورد و تورکمان و

کەمینــە ئاینییــەکانیش بــە دروشمــی نیــشتمانی بەشــدارییان لــەم خۆپیــشاندانە کردووە، یەکێك لە بەشداربووانی خۆپیشاندانی هەولێر بە ناوی (وەلی چایچی) بە زمانی تورکی بە شێوەی قۆریات کە جۆرێکە لە مەقاماتی تورکی و لە هەولێر باوە بە سەر سەرکردەی کودەتاکە ( بكر سدقی ) هەڵدەدا [٣١].

دەکرێت بڵێین ئەم هەڵوێستەی پێکهاتــەکانی هــەولێر لــە پــشتگیریکردنی ئــەم کودەتایە لەمەوە سەرچاوەی گرتــووە کــە (بکــر ســدقی) وەك کوردێــك کاریگــەری تەواوی بە سەر هەست و سۆزی خــەڵکی ئــەم شــارە کردبێــت بــە تایبــەتیش دوای ئەوەی بەسەر بزووتنەوەی ئاســوورییەکان ســەرکەوت ئــەم ناوبانگــەی لــە زۆربــەی شارەکانی عێراقدا بەدەست هێنا [٣٢]، لە لایەکی تر ئەم کودەتایە وا لێك درایــەوە کە دژی دەسەڵاتی بەریتانییەکانە لە عێراقدا ئەمەش تا رادەیەك کاریگەری هــەبوو لە پشتگیریکردنی ئەم کودەتایە لە لایەن ئەوانەی دژ بە دەسەڵاتی بەریتانییــەکان بوون هەروەها هەنــدێك لــەم تورکمانانــەش کــە پێــشتر کەوتبوونــە ژێــر کاریگــەری دەوڵــەتی عوسمــانی و ئەوانــەش کــە لەگــەڵ رێبــازی کەمالییــەکان هاوســۆز بــوون هەمان هەڵوێستیان نواندووە، هەر بۆیە دەکرێت بڵــێین ســەرۆك وەزیرانــی تــازەش (حکمت سليمان ) کە بە رەگەز تورك بوو لەوە دەچێت کاریگەری لە ســەر هەســت و سۆزی دووەم پێکهاتەی ئەم شارە هەبووبێت [٣٣].

هەروەها کاردانەوەی ئــەو سیاســەتەی کــە بــە درێــژایی ســاڵانی ســییەکان بــە تایبــەتی لــە ســەردەمی حــوکمڕانی (یاســین هــاشمی ) پــەیڕەو دەکــرا حکومــەتی پاشایەتی کەوتبووە هەوڵێکی بەرفراوان بــۆ دەســتگیرکردنی لاوانــی خــاوەن بــیری نەتەوەیی لە هەولێر، راستی ئەمەش لە یادکردنەوەی ساڵانەی جــەژنی نــەورۆز لــە شاری هەولێر بە ئاشکرا دەردەکەوت کە تا چ ئاستێك هەوڵ دراوە بــە شــێوەیەکی نهێنی یادی ئەم جەژنە نەتەوەییە بکەنەوە، یەکێك لە دیارترین ئەو کەســایەتییانە ( سەلیم سەیدۆك )* بووە کــە ســاڵانە لــە ماڵەکــەی خۆیــدا لــە گــەڕەکی تەکیــە بــە شێوەیەکی نهێنی یادی ئەم جەژنەیان کردۆتەوە [٣٤].

دەتوانین بڵێین ئەم رەوشە سیاسییەی باشووری کوردستان لە نێــوان ســاڵانی ١٩٣٢ ــــ ١٩٣٦ دوای لــەناوبردنی بزووتنــەوەی (شــێخ مــەحمودی حەفیــد و شــێخ ئەحمەدی بارزانی) کە شاری هەولێر لە هەردوو ئەم بزووتنەوەیەدا رۆڵێکی گرنگــی

هەبووە، ببووە هۆی دەرکەوتنی جۆرێك لە بۆشایی سیاسی و شۆڕشگێڕی لە باشووری کورستان تەنانەت گەورە بەرپرسانی حکومەت لەوانەش (مەلیك فەیسەڵی یەکەم) و (ئەمیر غازی) و سەرۆك وەزیرەکان لە کاتی سەردانەکانیان بۆ شارەکانی کوردستان زۆر بە دڵنیاییەوە باسیان لە سەرکوتکردنی هەموو ئەو جووڵانەوانە دەکرد کە دژ بە بەرژەوەندی و یەکپارچەیی عێراق بوون، بەم جۆرە هەولێریش بەدەر نەبوو لەم بێ ئومێدیەی کە کوردستان بە شێوەیەکی گشتی پێیدا تێدەپەڕی، کە بە یەکێك لە هۆکارەکانی پشتگیری ئەم شارە بۆ ئەم کودەتایە دابندرێت.

جێگای ئاماژەیە لقێکی پارتی برایی نیشتمانیی (حزب الاخاء الوطني ) کە لە ساڵی ١٩٣٠ لە شاری بەغدا دامەزرابوو لە هەولێر لە ساڵی ١٩٣٣ کرایەوە و سەرۆکی ئەم لقە ( شێخ محمدی کوڕی شێخ ئەسعەد ) و یەکێك لە دیارترین ئەندامانی ( شێخ عبدالقادری نەوەی شێخ ابو بکر ) بوو ئەرکی سەرەکی ئەم لقەی هەولێر بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ راکێشانی کەسانی رۆشنبیر و رووناکبیر بۆ پەیوەندیکردن بەم پارتەوە، بەڵام بە پێچەوانە لە کاتی رەتکردنەوەیان کێشە بۆ ئەم کەسانە دروست دەبوو هەر وەکو لە نێوان ( سەرۆکی لقی هەولێر و حسین حوزنی موکریانی ) روویدا، دوای رەتکردنەوەی لە هاتنە رێزی بۆ ناو ئەم پارتە کێشەی زۆری بۆ دروست دەبێت بە تایبەتی دەربارەی هێنانی چاپخانەکەی لە رەواندز بۆ شاری هەولێر و دواتریش داخستنی گۆڤاری رۆناکی[٣٥]. هەروەها لەوکاتەی (شێخ جەمیل) ئەندامی پارتی برایی نیشتمانی بە مەبەستی کردنەوەی لقێکی ئەم پارتە سەردانی کۆیە دەکات، بەڵام دوای ئاشکرابوونی مەبەستی سەردانەکەی لە لایەن یەکێك لە قوتابیانی کۆیە کە لە ناوەندی هەولێر دەیخوێند لە نووسراوێکدا هەڕەشەی لێدەکات لە ئەنجامدانی کارێکی لەم جۆرە، دوای گەڕانەوەی (شێخ جەمیل) بۆ هەولێر دەکەوێتە سۆراخکردنی ئەم قوتابیە و دوای ناسینی لە لایەن دەزگا ئەمنییەکان لە هەنگاوی یەکەم نەفەقەی قوتابخانەی لێ دەبڕن و دواتریش لە قوتابخانە دەردەکرێت [٣٦].

دەتوانین بڵێین بەشێکیش لە خەڵکی هەولێر ئەوانەی کە بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەم بارودۆخە تازەیە نەدەگونجا ئەنجا چ بە هۆی جیاوازی فکری یان

بەرژەوەندی و دەسەلآت بووبێت، دژی ئەم کودەتایە بوونە ئەگەرچی بە کردەوە هیچ جموجۆلێکیان نەنواندووە، بەلآم کاتێك هەر رەخنەیەك لە کارو چالاکییەکانی ئەم حکومەتە دەگیرا لە سەر رووی لاپەڕەکانی رۆژنامەکانەوە ئەوا لە لایەن ئەم گرووپانەوە دەستخۆشییان لێدەکرا، (مەسعود محەمەد) دەربارەی ئەم رۆژانە لە هەولێر لە یاداشتەکانیدا دەڵێت :

**"... لە بیرمە رۆژنامەی عبدالغفور البدري [ مەبەست رۆژنامەی الاستقلال ] چەند گوتارێکی زێدەوێرای دژی ئەو ئینقلابە نووسی کە لە مەکتەب دەگەڕامەوە بۆ مزگەوتی قەلآت جەریدەکەیمان دەخوێندەوە و تێکڕا ئافەرینمان لەو نەترساوییە و مەنتیقە بەهێزەی دەکرد کە گوتارەکانی تێیانڕا دیار بوو... "[٣٧].**

پەیوەندی نێوان (بەکر سدقی ) و خەڵکی هەولێر دەگەڕایەوە بۆ سەرەتای سالآنی سییەکان بە تایبەتی لەگەڵ (خدری ئەحمەد پاشای دزەیی) کە پەیوەندییەکی بەهێزیان هەبووە، دوای کودەتاکەش ئەم پەیوەندییە هەر بە دۆستایەتی دەمێنێتەوەو ( بەکر سدقی ) چەند جارێك سەردانی گوندی (سۆربەش)ی سەر بە دەشتی هەولێر دەکات[٣٨]، کانەبی عەزیز ئاغای دزەیی دەربارەی پەیوەندی نێوان بەکر سدقی و خدری پاشا دەڵێت :

**"... من و برایمی برام لە ماڵی خدری مامم (خدری پاشای) بووین ( بەکر سدقی) میوان بوو، کە ئێمەی دیت رووی لە مامم کرد و پێی وت کە شەشیان [مەبەست قۆناغی شەشەمی سەرەتاییە] تەواو کرد با بێنە کۆلێژی سەربازی، مامیشم وتی تەمەنیان بچووکە ئەویش وتی تۆ حەقت بەسەر ئەوە نەبێت " [٣٩].**

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە (بەکر سدقی) یەکێك لەم ئامانجانەی کە لە ماوەی سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپادا هەوڵی بۆ داوە زیادبوونی رێژەی ئەفسەرانی کورد بووە لە سوپای عێراقدا، ئەم هەڵوێستەی (بەکر سدقی) بۆ زیادکردنی ژمارەی ئەفسەرانی کورد دەبێتە هۆی رەخنە لێگرتنی لەلایەن هەندێك لە ئەفسەرە نەتەوەپەرستە عەرەبەکان [٤٠]، بەلآم سەبارەت بە بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کە هەموو کوردەکانی (عێراق و تورکیا و ئێران) لەخۆ بگرێت،

وەك (غروبا) ی باڵیۆزی ئەڵمانیا لە عێراق باسی لێوە دەکات [٤١]، چەند بیروڕای جیاواز هەن، هەندێکیان ئەم بیرۆکەیە بە راست دادەنێن و هەندێك رەتی دەکەنەوە [٤٢]، بەڵام دەکرێت ئەوە بەڕاست وەربگرین کە (بەکر سدقی) لەم ماوە مێژووییەدا زیاتر کەوتبووە ژێر کاریگەری هزری نەتەوەیی کە ئەو کاتە لە عێراقدا لە پەرەسەندندا بوو لەلایەن نەتەوەپەرستانی عەرەبەوە، هەروەها لە ئەورووپاش بە هەمان شێوە بیرۆکەی نازی لە ئەلمانیا و فاشی لە ئیتالیا لە قۆناغی گەشەکردندا بوون، ئەمەش ناچێتە چوارچێوەی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی.

سەبارەت بەم کارانەی کە حکومەتی (حکمت سلێمان) لە (٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦ ـ ١٧ی ئابی ١٩٣٧) ئەنجامی دا بە بەراورد لەگەڵ هەڵوێستی کورد لە باشووری کوردستان بەرامبەر ئەم کودەتایە لە ئاستێکی هاوسەنگدا نەبوو، هەر چەندە ماوەی لە سەر کاری حکومەتەکەش کەم بوو بەڵام هەندێ بەڵێن دەتواندرا جێبەجێ بکرێت بە تایبەتی ئەوانەی لە بەیاننامەی یەکەمینی حکومەت بۆ سەرجەم گەلانی عێراق راگەیاندرا [٤٣]، کە لە بەر گرنگیی ئەم بەرنامەیە رۆژنامەی (ژیان) بلاّوی دەکاتەوە و بە هیوایەکی زۆرەوە ستایشی دەکات [٤٤]، بۆ نموونە ئازادکردنی بەندکراوەکان کە تا ئەو کاتەش هەردوو سەرکردەی کورد (شێخ مەحمودی حەفید) لە شاری بەغدا و (شێخ ئەحمەدی بارزانی) لەژێر چاودێری حکومەتدا مابوونەوە [٤٥].

یەکێك لە دیارترین ئەو رێکەوتننامەیەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حکومەتی (حکمت سلێمان) کە لە بەرژەوەندی کورد نەبوو، رێکەوتننامەی سەعد ــ ئابادە کە لە ٨ی تەمموزی ١٩٣٧ لە نێوان عێراق و ئێران و تورکیا و ئەفغانستان مۆر کرا [٤٦]، کە خەڵکی هەولێر ئەم رێکەوتننامەیەی بە دژایەتیکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی لێکدەدایەوە چونکە هەر وەك لە بەندی دووەم و حەوتەمی رێکەوتننامەکەدا دەردەکەوێت [٤٧]، لە چوارچێوەی رەتکردنەوە و ناساندنی ئەم رێکەوتننامەیە لە دژی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد (کۆمەڵەی ئازادی کورد) لە شاری هەولێر بەیاننامەیەکی بلاّوکردەوە کە تیایدا ئەم رێکەوتننامەیە رەت دەکاتەوە و بە پیلانێکی دژ بە کوردی دادەنێت [٤٨]، هەر لە چوارچێوەی چالاکییەکانی دژ بەم رێکەوتننامەیە چەند کۆبوونەوە لە شارە

کوردییەکانی تر ئەنجام درا[٤٩]. یەکێك لە توێژەرەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم کودەتایە مۆرکردنی ئەم پەیماننامەیەی خێراتر کردووە سەرەڕای ئەم تەنگوچەڵەمانەی کە لە نێوان عێراق و ئێران هەبوو کە وەزیری دەرەوەی تورکیا (تۆفیق روشدی ئاراس ١٨٨٣ ـ ١٩٧٣) رۆڵی گرنگی تێدا بینیوە، لە یەکێك لە دانیشتنە نهێنییەکانی نێوان تورکیا و عێراق لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٧ کە رۆژنامەی (النهار)ی بەیروتی لە ژمارەی ١١٤٤ چەند خاڵێکی ئەم دانوستانە دەخاتە روو کە لە خاڵی سێیەمدا هاتووە:

**" رێگرتن لە ناردنی چەك و تەقەمەنی و یارمەتی جەنگ لە عێراق و ولاَتانی دەوروبەری بۆ ناوچە کوردنشینەکان "**[٥٠].

بە پێی راپۆرتی ئەفسەری هێزی ئاسمانی بەریتانی دەربارەی هەڵوێستی کورد و کەمینە ئاینییەکان لە کودەتای ٢٩ی تشرینی یەکەم کە دوای سەردانی بۆ لیوای موسل لە رۆژانی ٧ ـ ٩ تشرینی دووەمی ١٩٣٦ ئەوە دەردەخات کە زۆربەی دانیشتوان لە چینە جیاوازەکان خۆشحاڵن بەم حکومەتە تازەیە چونکە حکومەتێکی عەرەبی نییە و بوار دەرەخسێنێت بۆ دادوەری و یەکسانی لە ناو هەموو پێکهاتەکانی عێراق، هەر لە درێژەی راپۆرتەکەدا هاتووە کە کەمینە ئاینەکانیش هەمان هەڵوێستیان هەیە و کوردیش بە هۆی سەرسامییان بە بەکر سدقی هاوسۆزن بۆ ئەم حکومەتە، بەگشتی بۆچوونی کورد لەوەدایە کە رەوشەکەی لە کەمینەیەك دەگۆڕێت بۆ بەشداربوویێکی راستەقینە لە حکومەتی عێراقدا و چونکە پێدانی مافە کەمینەکان لە پرۆگرامە سەرەکییەکانی ئەم حکومەتەدا هاتووە[٥١]. هەروەها هەر وەك یەکێك لە توێژەرەکان ئاماژەی پێدەکات کە حکومەتی ئینقلاب دروشمی ( عێراق یەکەم جار ) ی بەرز کردەوە کە ئەمەش هەندێك بە ئاراستەی دژایەتی نەتەوەی عەرەبیان لێك دەدایەوە[٥٢].

سەبارەت بە کوشتنی بەکر سدقی چەند هەوڵێك درابوو بەلاَم سەرکەوتوو نەبوون بە تایبەتی یەکێك لەم هەوڵانە کە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٣٧ پیلانی بۆ کێشرا لەو کاتەی لە کۆبوونەوەیەکدا بوو لەگەڵ مەلیك غازی لە قەسری (الملح) لەسەر رێگای نێوان (بەغدا ـ ابي غريب)، کە چەند ئەفسەرێك لەم پیلانەدا بەشدار بوون دیارترینیان (نەقیب نجيب الربيعي، لیوا عبدالله المضايفي، الملازم محمود الدرة ) و چەندانی تر بەلاَم هۆکاری سەرنەکەوتنی ئەم پیلانە دەگەڕایەوە بۆ

مەترسی لە سەر ژیانی مەلیك غازی [٥٣]، بەلاّم زۆی نەخایاند دوای ئەم پیلانە کۆمەڵە ئەفسەرێك کە پێك هاتبوون لە (عقید سعید فهمی، عقید عزیز یاملکی، مقدم محمد خورشید و ملازمی فرۆکەوان قاسم مقصود) کۆمەڵەیەکیان بە ناوی (نجوم النارية) بۆ لەناوبردنی بەکر سدقی دامەزراند[٥٤]، دوای ئەوەی بە مەبەستی بەشداربوون لە مانۆرێکی سەربازی لە تورکیا (بەکر سدقی) لە ئێوارەی ١٠ی ئابی ١٩٣٧ بە رێگای شەمەندەفەر گەیشتە کەرکووك و لە وێستگەی شەمەندەفەر لە لایەن ژمارەیەك لە گەورە ئەفسەرانی سوپا و (خدری ئەحمەد پاشا) ی ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران پێشوازی لێدەکرێت، کە لە کاتی بەڕێخستنی بەرەو شاری موسل هاوەڵی دەبێت لە هەمان ئەو ئوتومبێلەی کە (بەکر سدقی) تێیدا بوو، دوای تێپەڕبوونیان بە شاری هەولێر لە رێگای هەولێر ـ موسل خدری پاشا پێی دەڵێت :

**"... جەنابت سەرۆك ئەرکانی سوپای عێراقی و حوکمڕانی ولاّت دەکەی، کەچی دەبینم هیچ چەکێکت پێ نییە و تەنانەت دەمانچەیەکیشت بە قەدەوە نییە، تا خۆتی پێ بپارێزی لە شەڕی ناحەزانت... " [٥٥].**

وەك دەردەکەوێت (خدری پاشا) لە رێگای چوونیان بۆ موسل داوای لێدەکات کە دەمانچەکەی ئەو بە دیاری قەبوڵ بکات، لەوە دەچێت بەکر سدقی داواکارییەکەی رەت نەکردبێتەوە [٥٦]، لە رۆژی ١١ی ئابی ١٩٣٧ دوای گەیشتنیان بە بارەگای هێزی ئاسمانی سوپا لە شاری موسل بە پیلانێکی نەخشە بۆکێشراو لە لایەن (عەریف محمد عبدالله تەلەعفەری ) دەکوژرێت[٥٧]. ئەحمەد خدر پاشا دەربارەی هەڵوێستی باوکی لەم رووداوە دەڵێت :

**"... دوای ئەوەی بە کوژراوی دەچێتە سەر لاشەی بەکر سدقی دەحەپەسێت و لەو پیلانە تێدەگات کە دژی ئەنجامدراوە، راستەوخۆ دەگەڕێتەوە شاری هەولێر و لەوێش دەچێتەوە گوندی سۆربەش، رووداوەکە زۆر کاریگەری بەسەریەوە دەبێت بۆ ماوەی هەفتەیەك لە ژوورێك دەبێت و کەس ناچێتە لای و لە چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکانی رەوشی سیاسی عێراق دەبێت " [٥٨].**

سەبارەت بە هەڵوێستی بەریتانیا لە رووداوی کوشتنی بەکر سدقی بە خۆشحاڵییەوە لە لایەن باڵیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا پێشوازی لێکرا چونکە هەوڵەکانی بەکر سدقی دوای کودەتای ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦ بە هەنگاوی

سەرەکی دەرهێنانی عێراق لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا لێك دەدایەوە، لە لایەکی تریش پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئەلمانیا لە سەردەمی حکومەتی (حکمت سلێمان ) ببووە هۆی نیگەرانی بەریتانییەکان لەم سیاسەتەی عێراق لە سەر ئاستی دەرەوە پیادەی دەکرد چونکە راستەوخۆ کاریگەری لەسەر پێگەی بەریتانییەکان لە رووی سیاسی و سەربازی و ئابووری هەبوو، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین بەریتانییەکان لە رێگای ئەفسەرە بەکرێگیراوەکانیان لە کورد و عەرەب لە پشتەوەی جێبەجێکردنی ئەم پیلانە بوون[٥٩].

بەڵام سەبارەت بە هەڵوێستی شاری هەولێر لە کوشتنی بەکر سدقی، هیچ خۆپیشاندان و نارەزاییەکی ئاشکرا بەرامبەر بەم رووداوە دەرنەکەوت بە پێچەوانەی شاری سلێمانی کە دواتر دەستەیەك بە ناوی ( لێژنەی تۆڵە ) دادەمەزرێنن [٦٠]، بەڵام بە شێوەیەکی نهێنی خەڵکی هەولێر بە هۆی هاوسۆزییان لەگەڵ بەکر سدقیدا هاوخەمییان دەربڕیوە، لە لایەکی تر بەشێك لەم کەسانەی کە بە هۆی بیروباوەڕی ئاینی و نەبوونی بەرژەوەندیی تایبەتییان لە سەردەمی دەسەڵاتداریتی (بەکر سدقی)دا هیچ هەڵوێستێکی نارەزاییان بەرامبەر کوشتنەکەی لێ بەدی نەکرا، دەکرێت بڵێین دوو هەڵوێستی پێچەوانەی یەکتر لە هەولێر بەرامبەر کوشتنی بەکر سدقی هەبوو[٦١].

جێگای ئاماژەیە هەندێك لە رۆشنبیران و رووناکبیرانی کورد کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم پیلانە و بە هەموو جۆرێك نارەزاییان دەربڕیوە، بۆ نموونە لە یادی چوار ساڵەی کوشتنی بەکر سدقی لە ١١ی ئابی ١٩٤١ (دڵزار)ی شاعیر هۆنراوەیەکی بە ناونیشانی (شیوەنێك بۆ بەکر صدقی) دەهۆنێتەوە کە تیایدا رۆژی کوشتنەکەی بە ساوابوونی باغی ژینی کورد و نەمانی باوکی هەژارانی ئەم میللەتە وەسف دەکات، تەنانەت بەکر سدقی بە ناپلیۆنی کورد ناودەبات [٦٢]. بەم جۆرە دوای کوشتنی بکر صدقی حکومەتی (حکمت سليمان) لە ١٧ی ئابی ١٩٣٧ دەستی لە کار کێشایەوە و (جميل المدفعي) لە ١٧ی ئابدا حکومەتێکی تازەی پێك هێنا و قۆناغێکی تازە لە مێژووی سیاسی ئەم وڵاتە دەست پێدەکات [٦٣].

## دەرەنجام

توێژەر لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەگاتە ئەم چەند خاڵەی خوارەوە.

١ / پێکهاتە سەرەکییەکانی شاری هەولێر هەر لە سەرەتای روودانی کودەتایەکەدا لە رێگای خۆپیشاندانێکی جەماوەری پشتگیرییان لە حکومەتی ئینقلاب کرد بە پێچەوانەی ئەوانەی بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەم گۆرانکارییە نەبوو هەر بۆیە پاڵپشتییان لە هەموو ئەو رەخنانە دەکرد کە ئاراستەی کارەکانی حکومەتی (حکمت سلێمان) دەکرا.

٢ / چینی باڵا دەست و هەندێك لە سەرۆك هۆزەکان و ئاغاکانی ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر بە تایبەتی ئاغاکانی دەشتی هەولێر هەوڵیانداوە لەگەڵ رەوشەکەدا خۆ بگونجێنن چونکە پێش روودانی ئەم کودەتایە ئەمانە دڵسۆزییان بۆ حکومەتی (یاسین هاشمی) دەربڕی و دوای کوشتنی (بەکر سدقی) پەیوەندی هەندێك لەمانە وەك خۆی لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق مایەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە پەیوەندی سەرۆك هۆزەکانی هەولێر و بەکر سدقی پاراستنی پێگەی سیاسی و کۆمەلآیەتی و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان بووە.

٣ / شاری هەولێر لە روودانی کودەتایەکە هەڵوێستێکی پشتگیری هەبوو بەلآم بە بەراورد لەگەڵ هەڵوێستی ئەم شارە لە کوشتنی بەکر سدقی لە ئاست یەکتردا نەبوو، دەکرێت هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ هەندێ لە هەڵوێستەکانی حکومەتی (حکمت سلێمان) بە تایبەتی پابەند نەبوون بە بەڵێننامەکانی بەیاننامەی یەکەمی کودەتا و بەستنی پەیماننامەی سەعد ـ ئاباد لە ٨ی تەمموزی ١٩٣٧ کە خەڵکی هەولێر بە پیلانێکی دژ بە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیان ناساندبوو.

٤ / بەکر سدقی دەربارەی پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی هیچ هەنگاوێکی کرداری نەناوە بەلآم دەشێت مەسەلەی نەتەوەیی لە ناخی ئەودا وەك کوردێك سیمای هەندێ هەڵوێست و بیرکردنەوە بووبێت وەك هەر کەسێکی نەتەوەیی.

٥ / گرنگیدانی بەکر سدقی بە سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەری هەولێر و سەردان کردنیان، بە پێچەوانەی زۆرینەی دانیشتوانەکەی کە تەنانەت لە ماوەی حوکمڕانیدا بۆ تەنها یەك جاریش سەردانی شاری هەولێری نەکردووە.

## سەرچاوەكان

**بەڵگەنامەكان :**

**یەكەم / بڵاونەكراوەكان.**

**. بەریتانییەكان.**

- FO,371/3817,secret report by squadron F.L.B. Hubbert after his visit to Mosul from 7th to 9 November,1936.

**. عێراقییەكان**

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الوثيقة : ٢٣٤، برقية من وزارة الخارجية الى سر.ای.كلارك كير، الموضوع: انقلاب عسكري في العراق / سري، في ٣١ / تشرين الاول / ١٩٣٦.

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الوثيقة : (٦)، بيان من بكر صدقي قائد قوات الاصلاح الوطني الى الشعب العراقي، في ٣٠ / تشرين الاول / ١٩٣٦.

**دووەم / بڵاوكراوەكان.**

**. بە زمانی ئینگلیزی.**

- FO,371/3817,secret report by squadron F.L.B.Hubbert after his visi to Mosul from 7th to 9th November,1936.

- Sir A.clark kerr to sir John simon , Baghdad , March 28,1935, Doc.273 , in. B.D.F.A , part (2) , vol (10).

**. بە زمانی عەرەبی.**

ـ الحكومة العراقية، وزارة العدلية، مجموعة القوانين والانظمة لسنة ١٩٣٨، مطبعة الحكومة، بغداد،١٩٣٩.

**چوارەم / نامە زانکۆییەکان.**

**. دکتۆرا.**

ــ عدنان زيان فرحان، السياسة البريطانية تجاه الاقليات الدينية في العراق ١٩١٤ــ١٩٤١، كلية الاداب، جامعة دهوك، ٢٠٠٩.

**. ماستەر.**

ــ صفاء عبدالوهاب المبارك، انقلاب سنة ١٩٣٦ في العراق (ممهداته واحداثه ونتائجه)، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٣.

**چوارەم / کتێبەکان.**

**. عەرەبییەکان**

ــ اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تأريخية في دورها السياسي والفكري ١٩٣٩ــ١٩٥٨، ط(٢)، مطبعة بينايي، السليمانية، ٢٠٠٥.

ـ احمد فوزي، أشهر الاغتيالات السياسية في العهد الملكي، ط(١)، مطبعة الديوانى، بغداد، ١٩٨٧.

ـ جورج لنشوفسكى، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ت: جعفر الخياط، مراجعة: د. محمود الامين، مؤسسة ـ فرانكلين للطباعة والنشر، بغدا د ــ نيويورك، ١٩٦٥، ج (١).

ـ عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط(٧)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، الاجزاء (٤، ٥).

ـ ـــــــــــــ، تاريخ العراق السياسي الحديث، ط(٧)، دار الرافدين للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠٠٨، الجزء(٣).

ــ عزيز حسن البارزاني، الحركة القومية الكردية التحررية في كردستان العراق ١٩٣٩ــ١٩٤٥، ط (١)، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٦.

ــ رجاء حسين الخطاب، تاسيس الجيش العراقي وتطور دوره السياسي من ١٩٢١ــ١٩٤١، بغداد، ١٩٧٩.

ــ سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦ ــ ١٩٣٩ ( دراسة تاريخية سياسية)، ط(١)، من منشورات دار سردهم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٦.

- سعاد خيرى، من تاريخ الحركة الثورية المعاصرة في العراق ١٩٢٠ـــ١٩٥٨، ط(٢)، مطبعة الاديب، بغداد، ١٩٧٤، الجزء(١).
- صلاح الدين الصباغ، المذكرات ـ من رواد العروبة في العراق، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣.
- فريتز غروبا، رجال ومراكز قوى في بلاد الشرق، ت : فاروق الحريري، ط(١)، مطبعة عصام، بغداد، ١٩٧٩.
- فؤاد حسين الوكيل، جماعة الاهالي في العراق ١٩٣٢ ــ ١٩٣٧، ط(١)، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩.
- كمال مظهر احمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر (دراسات تحليلية)، ط(١)، دارالشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٧.
- نصير سعيد الكاظمي، مساهمة في كتابة تاريخ الحركة العمالية في العراق حتى عام ١٩٥٨، ط(١)، منشورات مركز الابحاث والدراسات الاشتراكية، دمشق، ١٩٩١.
ــ محمود شبيب، بكر صدقى وانقلابه العاصف، ط(١)، مطبعة دار الجماهير للصحافة، بغداد، ١٩٩٢.
- محسن محمد المتولي، كرد العراق ــ منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨، ط(١)، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠١.

**- کوردییەکان**

- ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢ ــ ١٩٤٥، چ(١)، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨.
ــ اسماعيل شكر رسول، نەورۆزی هەولێر ١٩٣٢ـــ١٩٥٨ چەند لاپەڕەیەکی شاراوەی مێژووی گەلی کوردە، چ(١)، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٧.
- رووناکی ١٩٣٥/١٠/٢٤ ــ ١٩٣٦/٥/١٦ یەکەمین گۆڤاری کوردیی شاری هەولێر، ئا : کوردستان موکریانی، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
ــ کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، چ(١)، لە بلاوکراوکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٥.

- کوردستان موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی، چ(١)، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.
- گۆران سۆران فەیزی، باری ئەدەبی کوردی لە شاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥ــ١٩٥٨، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- طاهر احمد حەوێزی، مێژووی کۆیە، چ(١)، چاپخانەی نمیر، بغداد، ٩٨٤، بەرگی (٢)، بەشی (١).
- مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی ( ١٩٤٥ ــ ١٩٧٠ )، چ (١)، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ب(٧ ــ B).
- ئەمین زەکی بەگ، سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، ئا:سدیق ساڵح، چ(١)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.
ــ محمد اسماعیل محمد، ئینقلابی بەکر سدقی لە ٢٩ /١٩٣٦/١٠ هۆیەکان و ئەنجامەکان، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٧.
ــ محمد عبدالله کاکەسور، رۆڵی سیاسی و کولتووری ئەفسەرانی کورد لە کوردستانی خوارووودا، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٠.
- مەولود قادر بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە و بیستووە، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، بەرگی (٢).

**. ئینگلیزییەکان.**

-S. H. Longrrigg ,Iraq 1900-1950(Apolitical social and Economic History ), –second Edition,Oxford, University press , Londod , 1953.
-A.I.Dawisha,Iraq a political History from independence to occupation, Princeton university press,2009

**چوارەم / یاداشتەکان**

**. بە زمانی عەرەبی.**


ـ مذكرات جعفر العسكري، تحقيق وتقديم : نجدة فتحي صفوة، دار الام، لندن، ١٩٨٨.

ـ نوری شاويس، من مذكراتي، ط(١)، من منشورات حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني، د.م، ١٩٨٥.


**. بە زمانی کوردی.**


ـ مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ(٣)، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشی کۆیە، کۆیە، ٢٠٠٩.


**چوارەم / چاوپێکەوتنەکان**

| ناو | مێژووی چاوپێکەوتن | شوێن |
|---|---|---|
| ئەحمەد خدر پاشا دزەیی | ٦ ی کانونی دووەمی ٢٠١٠ | هەولێر |
| ئەحمەد دڵزار | ٨ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ | هەولێر |
| حەسەن تەها | ٢٢ی تەمموزی ٢٠٠٩ | هەولێر |
| حەمەدەمین ئەحمەد صۆفیان | ١٤ی ئابی ٢٠١٠ | هەولێر |
| سەید نژاد بەرزنجی | ٢٩ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ | هەولێر |
| فوئاد عارف | ١٩ی ئابی ٢٠٠٩ | سلێمانی |
| کەریم ئەحمەد | ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ | هەولێر |
| نورالدین دەباغ | ٢٨ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠ | هەولێر |

**. گۆڤار و ڕۆژنامەکان.**

**. عەرەبییەکان.**


ـ البلاد"جريدة"، ع (٥٠٧)، ٢٧ / آذار / ١٩٣٥.

**ـ کوردییەکان.**
ـ ئازاد عوبێد ساڵح، کێ بەکر سدقی کوشت، K21 "گۆڤار"، ژ(٩)، ٢٠١٠.
ـ تاریق جامباز، نەورۆز سالانی ١٩٣٣ ــ١٩٤٠ لە قەڵاتی هەولێر لاپەڕەیەکی شاراوەی شکۆمەندی کوردایەتییە، ئازادی "رۆژنامە"، ژ(٦٦)، ١٩٩٣/٣/٢١.
ـ کەریم شارەزا، پیاوی ئازا و بە جەرگی دزەییان خدری ئەحمەد پاشا ١٨٨٠ ــ ١٩٨٦، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٤)، ١٩٩٩.
ـ ژیان، ژ(٥٠٨)، ١٤ / تشرینی یەکەمی / ١٩٣٦.

## پەراوێزەکان:

(١) مەلیك فەیسەڵ پێش مردنی لە ساڵی ١٩٣٢ چەند چاکسازییەکی ڕاگەیاند، کە ئامانج تێیدا ڕێکخستنەوەی کارگێڕیی لیواکان و زیادکردنی دەسەڵاتی شارەوانییەکان و کردنەوەی قوتابخانەی تازە و گرنگیدان بە پیشەسازییە ناوەخۆییەکان و چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و زیادکردنی هێزە چەکدارەکان و یەکسانی لە نێوان مەزهەبەکان و ڕێزگرتنی مافە ئاینییەکان بوو . بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە :

S. H. Longrrigg ,Iraq 1900-1950 (Apolitical social and Economic History),second Edition,Oxford, University press , Londod , 1953 , p 229-230.

(٢) جورج لنشوفسكى، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ت: جعفر الخياط، مراجعة : د.محمود الامين، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، بغداد_ نيويورك، ١٩٦٥، ج (١)، ص١٥.

(٣) بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ڕۆڵی سیاسی و سەربازی بڕوانە : مذكرات جعفر العسكري، تحقيق وتقديم : نجدة فتحي صفوة، دار الام، لندن، ١٩٨٨، ص٤٣ ــ ١٩٠ .

(٤) جورج لنشوفسكى، المصدر السابق، ص ١٥ .

(٥) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط(٧)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ج(٤)، ص ٦٠.

(٦) دەربارەی پێکهاتەی وەزارەتەکەی بڕوانە : المصدر نفسه، ج(٤)، ص٨٢ .

(٧) البلاد"جريدة"، ع (٥٠٧)، ٢٧ / اذار / ١٩٣٥ .

(٨) بڕوانە راسپاردەکان لە : ئەمین زەکی بەگ، دوو تەقەلای بێ سوود، لە سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ، ئا: سدیق ساڵح، چ(١)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٥٥ ـ ٦٥ .

(٩) Sir A.Clark Kerr to sir John Simon, Baghdad ,March 28,1935 ,Doc.273,in.B.D.F.A,Part (2),vol .10,p430 .

(١٠) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەسەن تەها " لە ٢٢ی تەمموزی ٢٠٠٩، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەمەدەمین ئەحمەد صۆفیان ، لە ١٤ی ئابی ٢٠١٠ .

(١١) تاريخ الوزارات ...، ج(٤)، ص ٨٨ .

(١٢) Sir A.Clark Kerr to sir John Simon, Baghdad, May 22, 1935, Doc.291, in.B.D.F.A, Part (2), vol .10, P442.

[١٣] دەربارەی ئەم شۆڕشانە بڕوانە : صفاء عبدالوهاب المبارك، انقلاب سنة ١٩٣٦ في العراق (ممهداته واحداثه ونتائجه)، رسالة ماجستير (غير منشورة )، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٣، ص٦٦ ــ ٧٨ .

[١٤] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦ ــ ١٩٣٩ ( دراسة تاريخية سياسية )، ط(١)، من منشورات دار سردەم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٦، ص ٢٥٥ ــ ٢٦٠ ؛ عدنان زيان فرحان، السياسة البريطانية تجاه الاقليات الدينية في العراق ١٩١٤ ــ ١٩٤١، اطروحة دكتوراه (غير منشور)، كلية الاداب، جامعة دهوك، ٢٠٠٩، ص ١٦٢ ــ١٦٧.

[١٥] عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ط(٧)، دار الرافدين للطباعة والنشر، بيروت، ٢٠٠٨، ج(٣)، ص ١٤٤ ؛ سروه اسعد، المصدر السابق، ص ٢٦٦ .

[١٦] گۆڤاری ( ڕۆناکی ) یەکەمین ژمارەی لە شاری هەولێر لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥ دەرچوو کە گۆڤارێکی هەفتانەی زانستی و وێژەیی و کۆمەڵایەتی کوردی بوو، دەرکردنی ئەم گۆڤارە بوارێکی رەخساند کە ڕۆشنبیرانی کورد بتوانن لە ڕێگای ئەم گۆڤارەوە بیرو سەرنجەکانیان بە نووسین بڵاوبکەنەوە، چەند لە ڕۆشنبیرانی کوردستان وەك (دلدار، محمد علی کوردی، هیجری، یونس مستەفا، هەوری، بێخود، سعید ناکام، کانی، گیوی موکریانی، جەمیل ڕۆژبەیانی، حوسێن حوزنی، اسماعیل علی، جمال ئەحمەد) نووسینەکانیان لەم گۆڤارەدا بڵاودەکردەوە. جێگای ئاماژەیە بابەتەکانی ئەم گۆڤارە کاریگەری هەبوو لە سەر سەرنجراکێشانی لێپرسراوانی حکومەت بۆ گرنگیدانیان بە پرۆژە خزمەتگوزارییەکان لە باشووری کوردستان، هەروەها گرنگی دەدا بە بڵاو بوونەوەی هەستی نەتەوایەتی و مێژوو و ئەدەبی کوردی، هەروەها برایەتی نێوان کورد و عەرەب و یەکپارچەیی عێراق لە بابەتەکانی رەنگی دەدایەوە، تەنانەت لە رووی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان بابەتی بیری سۆسیالیستی بڵاودەکردەوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی= لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، چ(١)، لە بڵاوکراوکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٥، ل٢٣٥ــ٢٣٦؛رووناکی ٢٤/١٠/١٩٣٥ــ ١٦/٥/١٩٣٦ یەکەمین گۆڤاری کوردیی شاری هەولێر، ئا: کوردستان موکریانی، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤ــ٩ ؛ اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تأريخية في دورها السياسي والفكري ١٩٣٩ــ١٩٥٨، ط(٢)، مطبعة بينايي، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ٥٢ .

[١٧] رجاء حسين الخطاب، تاسيس الجيش العراقي وتطور دوره السياسي من ١٩٢١ــ١٩٤١، بغداد، ١٩٧٩، ص ١٤٥ ؛ صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ٩٩ ــ ١٠٠ .

[١٨] دەربارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی کودەتایەکە بڕوانە : محمود شبيب، بكر صدقي وانقلابه العاصف، ط(١)، مطبعة دار الجماهير للصحافة، بغداد، ١٩٩٢، ص ١١٦ ــ ١١٧ ؛ صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ١٠٣ ــ ١١٣ .

[19] عبدالرزاق الحسنى، تاريخ الوزارات ....، ج(٤)، ص٢٣٠ .

[20] د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الوثيقة : ٢٣٤، برقية من وزارة الخارجية الى سر .اى .كلارك كير، الموضوع: انقلاب عسكري في العراق / سري، في ٣٠ / تشرين الاول / ١٩٣٦ . (نسخة مصورة ومترجمة عن الارشيف الوطني البريطاني ) .

[21] نصير سعيد الكاظمي، مساهمة في كتابة تاريخ الحركة العمالية في العراق حتى عام ١٩٥٨، ط(١)، منشورات مركز الابحاث والدراسات الاشتراكية، دمشق، ١٩٩١، ص ١٠٢

[22] بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ١٤٣ ـ ١٥٤ .

[23] فؤاد حسين الوكيل، جماعة الاهالي في العراق ١٩٣٢ ــ ١٩٣٧، ط(١)، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩، ص ٣٨٥ ؛ نصير سعيد الكاظمي، المصدر السابق، ص ١٠٢ ؛ سعاد خيري، من تاريخ الحركة الثورية المعاصرة في العراق ١٩٢٠ــ١٩٥٨، ط(٢)، مطبعة الاديب، بغداد، ١٩٧٤، ج(١)، ص ٦٩ .

[24] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ فؤاد عارف، لە ١٩ی ئابی ٢٠٠٩ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کریم ئەحمەد، لە ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ .

[25] FO,371/3817,secret report by squadron F.L.B. Hubbert after his visit to Mosul from 7th to 9 November,1936.

[26] د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الوثيقة : ٢٣٤، برقية من وزارة الخارجية الى سر .اى .كلارك كير، الموضوع: انقلاب عسكري في العراق / سري، في ٣١ / تشرين الاول / ١٩٣٦ . (نسخة مصورة ومترجمة عن الارشيف الوطني البريطاني ) .

[27] د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الوثيقة : (٦)، بيان من بكر صدقي قائد قوات الاصلاح الوطني الى الشعب العراقي، في ٣٠ / تشرين الاول / ١٩٣٦ . (نسخة مصورة و مترجمة عن الارشيف الوطني البريطاني ) .

[28] صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ١٤١ ؛ محسن محمد المتولي، كرد العراق ــ منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨، ط(١)، الدار العربية للموسوعات، بيروت،٢٠٠١، ص ٢٨٣ .

[29] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ فؤاد عارف، لە ١٩ی ئابی ٢٠٠٩ .

[30] عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات ....، ج(٤)، ص ٢٣٩ ؛ محمد اسماعيل محمد، ئینقلابی بەکر سدقی لە ٢٩ /١٩٣٦/١٠ هۆیەکان و ئەنجامەکان، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٤٣ ؛ صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ١٤٠ .

[31] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کریم ئەحمەد، لە ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەید نژاد بەرزنجی، لە ٢٩ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ .

[32] S. H. Longrrigg ,op.cit , p 236 .

[33] صفاء عبدالوهاب المبارك، المصدر السابق، ص ١٤٠ .

[*] کوڕی عبدالله حسن جۆلەمێرگییە، لە ساڵی ١٩١٠ لە قەلاتی هەولێر لـە دایـك بـووە، لەسـاڵی ١٩٢٧ ئیجازەی مەلایەتی لە سەر دەسـتی (مـەلا ئەفەنـدی) وەرگرتـووە، زمـانی کـوردی و عـەرەبی و تـورکی و ئینگلیـزی زانیـوە، لـە بـواری نووسـیندا لـە رۆژنامـەکانی (خـەبات و الاستقلال و المبدأ و صوت الاکراد) وتاری بلأوکردۆتەوە . لە ساڵی ١٩٤١ بە چەند رۆژێك لە هاتنی جەژنی نەورۆز لە لایەن دەزگای پۆلیسی هەولێر دەستگیر دەکرێت بەم بیانووەی کە ساڵانە لە ماڵی ئەودا یادی ئـەم جەژنـە دەکرێتـەوە، لـە ٢٤ی ئـەیلولی ١٩٧٠ مـردووە لـە گۆڕسـتانی گـەورەی هـەولێر نێـژراوە . تـاریق جامبـاز، نـەورۆز سـاڵانی ١٩٣٣ ـــ ١٩٤٠ لەقـەلاتی هـەولێر لاپەڕەیـەکی شـاراوەی شـکۆمەندی کوردایەتییـە، ئـازادی "رۆژنامـە"، ژ(٦٦)، ١٩٩٣/٣/٢١ .

[٣٤] بەمەبەستی دوورخـستنەوەی گومـانی دەزگاکـانی پـۆلیس لـە کۆبوونـەوەکان لـە شـێوەی یادکردنەوەی جەژنی لەدایکبوونی پێغەمبـەر (د.خ) ئاهـەنگیان سـاز دەکـرد، هـەروەها بـۆ پاسەوانی ئامادەبووان یەکێك لە نێو کەسانی بەشـداربوو چاودێری ماڵەکـەی دەکـرد و لـە دیـارترین ئـەو کەسـانەی بەشـدارییان دەکـرد ( مـەلا عبـدالرحمن هـەولێری و دەروێـش اسماعیل) کە دەفژەنی بە توانا بوون، بۆ نموونە لـە یـادی نـەورۆزی سـاڵی ١٩٣٣ نزیکـەی (٢٥) کەس بەشدارییان تێدا کردووە لەوانە ( سـەلیم سـەیدۆك، حـسین حـوزنی موکریـانی، عیزەدین فەیزی، عومەر ساقی، عونی یوسف، گیوی موکریانی، ئەسعەد ئاغا شـێخ حـسین ئاغای زراری، مەلا عبـدالرحمن هـەولێری، دەروێـش اسماعیـل، ئەحمـەد حەمـەدەمین ئاغـا دزەیی، عبدالوهاب ئاغـای هـەولێری، عاصـم حەیـدەری ) بڕوانـە : اسماعیـل شـکر رسـول، نەورۆزی هەولێر ١٩٣٢ــ١٩٥٨ چەند لاپەڕەیـەکی شـاراوەی مێـژووی گـەلی کـوردە، چ(١)، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٣ــ١٤ ؛ تاریق جامباز، سەرچاوەی پێشوو ؛ مەولود قـادر بێخـاڵی، هـەولێرم وا دیـوە و بیـستووە، چ (١)، چـاپخانەی وەزارەتـی رۆشـنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، بەرگی (٢)، ل١٣٣؛ گۆران سۆران فەیزی، باری ئەدەبی کـوردی لـە شـاری هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٣٥ــ١٩٥٨، چ(١)، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هـەولێر، ٢٠٠٦، ل٤١.

[٣٥] بۆ زیاتر زانیـاری دەربـارەی پەیوەنـدی ئەنـدامانی لقـی پـارتی برایـەتی و خـەڵکی هـەولێر بڕوانە: کوردستان موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی، چ(١)، دەزگـای چـاپ و بلأوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٦١٣، ٦١٧ ــ ٦١٨ .

[٣٦] طاهر احمد حویزی، مێژووی کۆیـە، چ(١)، چـاپخانەی نمـیر، بغـداد، ٩٨٤، بـەرگی (٢)، ب (١)، ل ١٦٤ .

[٣٧] گەشتی ژیانم، چ (٣)، لـە بلأوکراوەکـانی سـەنتەری لێکۆڵینـەوە و پەخـشی کۆیـە، کۆیـە، ٢٠٠٩، ل ١٧٥ .

(٣٨) کەریم شارەزا، پیاوی ئازا و بە جەرگی دزەییان خدری ئەحمەد پاشا ١٨٨٠ ـــ ١٩٨٦، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٤)، ١٩٩٩، ل ٩٦ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەحمەدی خدری پاشا دزەیی، لە ٦ ی کانونی دووەمی ٢٠١٠ .

(٣٩) محمد اسماعیل محمد، ئینقلابی بەکر سدقی لە ١٩٣٦/١٠/٢٩هۆیەکان و ئەنجامەکان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٩٦.

(٤٠) محەمەد عبدالله کاکەسوور، رۆڵی سیاسی و کولتووری ئەفسەرانی کورد لە کوردستانی خواروودا، چ(١)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٠، ل ٩٠ ـ ٩١ .

(٤١) فریتز غروبا، رجال ومراکز قوی في بلاد الشرق، ت : فاروق الحریري، ط(١)، مطبعة عصام، بغداد، ١٩٧٩، ص ٢٧٣ .

(٤٢) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە : کمال مظهر احمد، صفحات من تاریخ العراق المعاصر (دراسات تحلیلیة )، ط(١)، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، ١٩٨٧، ص ١١٩ ـــ ١٣٠ ؛ صلاح الدین الصباغ، المذکرات ـ من رواد العروبة في العراق، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٨٣، ص ١٥٢ ـ ١٥٤، محەمەد عبدالله کاکەسوور، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧ ـــ ٩٣، محمد اسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٩ــ ٢٢٠ .

(٤٣) بڕوانە دەقی بەیاننامەکە لە : عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات .....، ج(٤)، ص٢٣١ .

(٤٤) ژ (٥٠٨)، ١٤ / تشرینی یەکەمی / ١٩٣٦ .

(٤٥) ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩٣٢ ـــ ١٩٤٥، چ(١)، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٧٠ ـ ٧١ .

(٤٦) بڕوانە بەندەکانی ئەم رێکەوتننامەیە لە : الحکومة العراقیة، وزارة العدلیة، مجموعة القوانین والانظمة لسنة ١٩٣٨، مطبعة الحکومة، بغداد، ١٩٣٩، ص ١٣٦ ـ ١٤١ .

(٤٧) بڕوانە : المصدر نفسه، ص ١٣٨، ١٤٠ .

(٤٨) نوری شاویس، من مذکراتي، ط(١)، من منشورات حزب الشعب الدیمقراطي الکردستاني، د.م، ١٩٨٥، ص ١٢٧ .

(٤٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سروه اسعد، کوردستان الجنوبیة ...، ص ٣١١ ـــ ٣١٦؛ عزیز حسن البارزاني، الحرکة القومیة الکردیة التحرریة في کردستان العراق ١٩٣٩ـــ١٩٤٥، ط (١)، الدار العربیة للموسوعات، بیروت، ٢٠٠٦، ص ٥٠ ـ ٥٧.

(٥٠) ئەحمەد محەمەد ناسر باوەڕ، دۆزی کورد لە پەیوەندییەکانی عێراق و ئێراندا ١٩٣٧ ـــ ١٩٤٧، چ (١)، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٠، ل٧٩ ـ ٩٥ .

(٥١) FO,371/3817,secret report by squadron F.L.B. Hubbert after his visit to Mosul from 7th to 9th November,1936.

(٥٢) A.I.Dawisha,Iraq a political History from independence to occupation, Princeton university press, 2009, p136-137

(٥٣) صفاء عبدالوهاب المبارك، المصدر السابق، ص ٢٩٠

(٥٤) محمد اسماعیل محمد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٩ .

(٥٥) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەحمەد خدر پاشا، لە ٦ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ .

(٥٦) کەریم شارەزا، پیاوی ئازا و ....، ل ٩٦ ـ ٩٧ .

(٥٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە :احمد فوزی، أشهر الاغتیالات السیاسیة في العهد الملكي، ط(١)، مطبعة الدیوانی، بغداد، ١٩٨٧، ص٩٤ ـ ١٢٨ ؛صفاء عبدالوهاب المبارك، المصدر السابق، ص ٣٠٣ ـ ٣٠٦ ؛ ئازاد عوبێد ساڵح، کێ بەکر سدقی کوشت، K21 "گۆڤار"، ژ(٩)، ٢٠١٠، ل٨٤ ـ ٩٠.

(٥٨) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەحمەد خدر پاشا، لە ٦ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠ .

(٥٩) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : صفاء عبدالوهاب، المصدر السابق، ص ٣٠٣ ـ ٣٠٤ ؛ سروه اسعد صابر، المصدر السابق، ٣٠٨ ـ ٣٠٩ .

(٦٠) کمال مظهر احمد، صفحات من تاریخ العراق ...، ص ١٢٩ ؛ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢ .

(٦١) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ نژاد بەرزنجی، لە ٢٩ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دڵزار، لە ٨ی کانوونی دووەمی ٢٠١٠؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ نورالدین دەباغ، لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠ .

(٦٢) لە بەشێکی هۆنراوەکەدا هاتووە :

دیسان دووکەڵ و بوخاری ستەم — کوردستانی گرت چەشنی تۆزوتەم
باغی ژینی کورد دیسان ساوا بوو — ئەستێرەی بەختی لە کەل ئاوا بوو
بە گوللەی دەستی دوژمن چوو — لە ناوی ژیندا ناوبانگی ون بوو
ئەسەف بۆ گەورەی شەهیدانی کورد — حەیف بۆ باوکی هەژارانی کورد
درێغ بۆ شێری نێری مەیدانم — بۆ بەکر سدقی رەئیس ئەرکانم
بۆ جەنگاوەری بەهێز و گوردم — بۆ ناپولیۆنی میللەتی کوردم
بڵێ ئەی (دڵزار) هەژاری غەمبار — بە رۆڵەی وردی کوردی سیاچار
گەر پرسیار ئەکەن لە مێژووی مەرگی — لە ڕۆژی ڕەشی پچڕانی جەرگی
لە چەرخی بیستەمساڵی سی و حەوت — یازدەی ئاغستۆس لەژێر خاکا خەوت.

بڕوانە : مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی ( ١٩٤٥ ـــ ١٩٧٠ )، چ (١)، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ب(٧ ـ B)، ل٣٩٥ ـ ٣٩٦ .

(٦٣) عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات ....، ج(٥)، ص ٧ .

# ملخص البحث باللغة العربية

ان الانقلاب العسكري الذي حدث في ٢٩ تشرين الاول ١٩٣٦، هـو اول الانقلابـات العسكرية في تاريخ العراق المعاصر. وكان حصيلة اتفاق بين مجموعتين اولا : مدنيـة الـتي تمثلـت في جماعـة الاهـالى والاخـرى عـسكرية التـى تمثلـت بالجماعـة العـسكرية بزعامة بكر صدقى.

لقد جاء الانقلاب نتيجة عوامل داخلية منها المشاكل التي ورثهـا العـراق في عهـد الانتـداب، وتمثلـت في الثـورات الكرديـة والاثـوريين بـصورة خاصـة الـتي كانـت مـن حصيلة السياسة البريطانية الانتدابية. ثم تلتها مشاكل اخـرى منهـا عـدم الاسـتقرار الوزاري والثورات الـتي قامـت بهـا العـشائر العراقيـة في الجنـوب والوسـط والـشمال، اضافة الى تدهور الاحوال الاقتصادية، ثم مناورات الـسياسيين واسـتخدامهم الجـيش بكثرة لمواجهة الاخطار الداخلية.

شمل هـذا البحـث (موقـف اربيـل مـن انقـلاب بكـر صـدقى ١٩٣٦ ) مـن مقدمـة ومحورين، الاول : عرض سياسة الحكومة العراقية قبل حدوث انقلاب وخاصة الوضع السياسي ابان حكم رئـيس الـوزراء (ياسـين الهـاشمي) وصـورة عـن موقـف رؤسـاء العشائر الكردية مـن هـذه الحكومـة والاجـراءات الـتي قامـت بهـا الحكومـة في مدينـة اربيل. المحور الثاني : صورة واضحة عن موقف هذه المدينة من الانقلاب من خـلال شرائعها المختلفة، ومن ضمنها الموقف الرسمي والشعبي في اربيل.

واحتوت خاتمة البحث على الاستنتاجات التى توصلت اليـه مـن خـلال دراسـتي عن (موقف اربيل من انقلاب بكر صدقي ١٩٣٦ ) . وختاما ارجو ان اكون قد وفقـت في اعطاء صورة واضحة عن موقف مدينة اربيل من انقلاب بكر صدقي.

والله ولي التوفيق...

## Abstract

**(Arbil's attitude towords the military coup of Baker Sidqi 1936)**

General Baker Sidqi led the first military coup in the history of contemporary Iraq in October 1936.The coup evoked different reactions throughout Iraq, this article tackles the attitude of Arbil towards that event. The article begins with an introduction about the political situation in Arbil between 1933-1936, including the attitude of the Arabilis towards the policies and administrative policies of successive Iraqi governments. the second topic of the article follows up the response of Arbils, population, administrative officials and military units in the city to the coup. This topic dealt also with some Arbil notables relations with General Baker Sidqi. The last topic of the article is about the echo of Baker Sidqi's assassination in Mosul among Arbil people.

The most important conclusions of the article are:

1 – The Aghas of Arbil and its neighbourhood were motivated by their personal interests, this was evident from their contradicting attitudes. They supported the government of Yasin al-Hashimi before the coup, then they supported the coup, and finaly changed their attitude after the fall of the coup government.

2 – The majority of the supporters of the coup in Arbil were the middle class and the poor, while some Aghas were against the coup but they were not able to do any thing.

3 - General Baker Sidqi with his Kurdish origin had an effect on the attitude of the Arbilis towards the coup.

4 - In contrast to their support to the coup at the beginning, the attitude of the Arbilis was different towards the assassination of Baker Sidqi. This is attitude attributed to three reasons;The first was that the government of the coup did not implement its pledges, the second was the signing of the Saad Abad pact in 1937, which was directed mainly against the Kurds. the third was that the government of the coup didn't realese the Kurdish leaders Sheikh Mahmoud Barzanji and Ahmad Barzani from their house arrest in Baghdad and Sulaimaniya.

# کوردستانی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم تا ساڵی ١٩١٨

**( لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە )**

**کامەران محەمەد حاجی**
**بەشی مێژوو- کۆلێژی ئەدەبیات- زانکۆی سەلاحەددین**

**پێشەکی :**

مێژووی کوردستانی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم تاکو ساڵی ١٩١٨ لایەنێکی گرنگی مێژووی کورد بەگشتی پێك دەهێنێت، چونکە لەو ماوە زەمەنییەدا چەندین پەرەسەندنی گرنگ لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هاتنە پێشەوە، کەوا بەشێوەیەکی ئەرێیی یان نەرێیی کاریگەرییان بۆ سەر کورد و کۆمەڵی کوردەوارییەوە هەبوو. ئامانجیش لەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە دەرخستنی گرنگترین ئەو پەرەسەندن و پێشهاتانە.

باسی ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان ، زاڵبوونی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی بەسەر کوردستان و سیاسەت و مامەڵەی خراپی کاربەدەستانی عوسمانی لە ماوەی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩) و ماوەی فەرمانڕەوایی تورکە ئیتیحادییەکان (١٩٠٨-١٩١٨)، کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی چەند بزاڤ و ڕاپەڕینێکی چەکداریی، لایەنێکی گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەخۆ دەگرێت. هەروەها لەم لێکۆڵینەوەیە سیاسەتی هەردوو دەوڵەت (عوسمانی و ڕووسیا) لە بەرانبەر کورد و هەوڵەکانیان لەپێناو دەستەبەرکردنی سۆز و هاریکاریی کوردان بۆلای خۆیان لەماوەی لە ئارادابوونی شەڕ و پێداهەڵپژانەکانیان کراوە. هەر لێرەدا ئاماژە بەگرنگترین ئەو پەرەسەندنە سیاسی و ڕۆشنبیرییانەش کراوە کەوا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم هاتوونەتە ئاراوە، بەتایبەت لەبواری ڕۆژنامەگەری و دەرکەوتنی کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان. لە کۆتاییشدا هەلومەرجی سیاسی ،

ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردستان لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانییدا خراوەتە ڕوو.

شایانی باسە کەوا لەم لێکۆڵینەوەیە پشت بە ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوەی جۆراو جۆر بەستراوە، گرنگترینیان بریتین لەو بەڵگەنامانەی کەوا لە دووتوێی کتێبەکاندا بلاّو کراونەتەوە. لەنێو ئەمانەشدا بەڵگەنامە بەریتانییەکان بەپلەی یەکەم دێن ، ئینجا بەڵگەنامە قاجاری و ڕووسییەکان. هەروەها پشت بەچەند سەرچاوەیەکی تریش بەستراوە کەوا لە بنەڕەتدا بریتین لە یادداشت و تێبینییەکانی ئەو دیپلۆماتکار و گەڕیدە بیانییانەی سەریان لە ناوچەکە داوە و ...هتد.

**أ. کوردستان لەژێر دەسەلاّتی ڕاستەوخۆی عوسمانیدا:**

هاوکات لەگەڵ کۆتایی هاتنی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، ڕۆڵی مێژوویی میرنشینە کوردییەکانی ژێر دەسەلاّتی عوسمانی کۆتایی پێ هات.

ئەم ڕووداوەش لە لایەکەوە بریتی بوو لە پاشگەزبوونەوەی ڕاستەوخۆی دەسەلاّتدارانی عوسمانی، لەو بەڵێن و گفتانەی کەوا هەر لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢–١٥٢٠)ەوە بەمیرو سەرۆکە کوردییەکانیان دابوو[1]، لە لایەکی تریشەوە ئاماژە بوو بۆ هاتنی سەردەمێکی نوێ، کە تیایدا کوردستان بەشێوەیەکی ڕەها و لە ژێر سایەی ڕاستەوخۆی دەسەلاّتدارانی عوسمانی بەڕێوە دەبرا.

سەپاندنی دەسەلاّتی ڕەهای عوسمانییەکان تەنها گوزارشتکردن نەبوو لەوەی کەوا فەرمانبەرانی بێگانە بەسەر ناوچە کوردییەکاندا حوکم دەکەن، بەڵکو مانای لە ڕیشە دەرهێنانی بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کورد بوو، چونکە زۆر لە میر و سەرۆکە کوردییەکان لە کوردستان دوور خرانەوە، یان بۆ تاراوگە نێردران. ئەمەش مانای بێ بەشکردنی کورد و کۆمەڵی کوردەواریی لە هەڵبژاردەی سیاسی دەگەیاند[2]. هەر ئەوەش وای کردووە ژمارەیەك لە لێکۆڵەران ئەو ماوەیە بە ماوەی بۆشایی لە دەسەلاّتی سیاسیی کوردی لە قەڵەم بدەن [3] .

لەگـەڵ دوورخـستنەوەو لـەناوبردنی مـیرو سـەرۆکە کوردییـەکان و دانـانی فەرمانبـەرانی تـورك لـە شـوێنیاندا[٤]، دەسـت کـرا بـە بەجێگەیانـدنی پرۆسـەی کۆچـپێکردنی بـە زۆری کـوردان لـە نیـشتمانی خۆیـان و[٥]، دیـاردەی زیـادکردنی جۆرو رێـژەی باجـەکان و سـەرباز گرتنـی بـە زۆر و ... هتـد لـە زیـادبوون دابـوو. ئەمەش کوردەکانی دووچاری بارودۆخێکی دژوار کردبوو، چونکە ئەم دیاردانـە زۆر جار دەبوونە هـۆی ئـەوەی کوردەکـان شـوێنی خۆیـان بـەجێ بهـێڵن و لـە خـاك و زەویوزاری خۆیان دوور بکەونەوە. زۆر جـاریش دووچـاری توندوتیـژی و کوشـتن و برین دەبوونەوە[٦]، بە تایبەتی لەلایەن ئەو سەربازانەی کەوا ئۆردوگایان لە ناوچە کوردییەکاندا بۆ دامەزرابوو، لە کاتی سەندنی باج و خەراج و سەرکوتکردنی بزاڤ و راپەرینە کوردییەکان[٧]سـوودیان لێ دەبینـرا. هـەروەها زۆری شـەڕ و شـۆڕەکان و خەرجییە سەربازییەکان ، دیسان بەشێکی، وەکو بارێکی گران ، دەکەوتەوە سـەر شانی خەڵکی رەشۆك و جووتیارەکان[٨] .

**ب . سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم**

**(١٨٧٦-١٩٠٩) بەرانبەر بە کورد:**

بە تێڕوانینێکی بەراوردکارییانە لە سیاسەتی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم لەگەڵ سیاسەتی سوڵتانەکانی تری عوسمـانی پـێش خـۆی لـە سـەدەی نـۆزدەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هەوڵی داوە خۆی لە کوردان نزیك بکاتەوە.

پێکهێنـانی یەکـە سـوارەکانی حەمیـدی (حەمیـدی ئـالایلری) [٩]، کـەوا لـە ساڵی١٨٩٠ بە پێی بڕیارێکی فەرمی بڕیاری دامەزرانـدنی درا [١٠]، رووبـەکی گرنگـی سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی لە بەرانبەر کورد پێك دەهێنا، چونکە ژمارەیەك لە سـەرۆك عەشـیرەت و سـەرکردەکانی کـورد ، لـە پـاڵ ئەوانـەی تـری ئـەلبانی و چەرکەسی و عەرەب[١١]، چوونە ریزی سوارەی حەمیدییەوە. دەکرێ هۆکارەکـانی دامەزراندنی یەکە سوارەکانی حەمیدی لە چەند خاڵێکدا کۆ بکرێنەوە:

١ـ چالاکی هێزە ئەورووپاییـەکان لـە دەوڵـەتی عوسمـانی و فـشاری زیاتریـان لەسەری لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا.

٢ـ گەشەکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی ئەرمەن .

٣ـ کاریگەری ڕاپەڕینەکانی کورد لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا.

٤ـ مەترسی دەوڵەت لە لێکنزیکبوونەوەی هەردوو نەتەوە (کوردو ئەرمەن).

٥ـ چالاکی بەرهەڵستکارانی ناوەخۆ بە تایبەتی تورکە لاوەکان و کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن [١٢].

کوشتاریی بە کۆمەڵی ئەرمەنەکان کەوا سوارەکانی حەمیدی ڕۆڵیان تیادا بینی، گەلێك جار لە لایەن مێژوونووسانەوە بە هۆکارێکی گرژبوونی پەیوەندی نێوان کوردو ئەرمەن دادەنرێ و، لەم ڕووەشەوە کوردی پێ تاوانبار دەکرێ.

کەچی دەکرێ بگوترێ کورد وەکو نەتەوەیەك بەشداری لەو پرۆسانەی لەناوبردن نەکردبوو کەوا لە دژی ئەرمەن ئەنجام درا، چونکە وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کەسانی تریش لە نەتەوەکانی تر تێیدا بەشداربوون. ئەرمەنەکان خۆیان تەنها ئەو چەکدارە کوردانە تۆمەتبار دەکەن کەوا لە ڕیزەکانی سوارەی حەمیدی دابوون [١٣]. خۆ زۆرجاریش کوردەکان لە کاتی تەنگانەدا دالدەی ئەرمەنەکانیان دابوو و گیانیان پاراستبوون [١٤].

ڕوویەکی تری سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە بەرانبەر کورد، بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ خۆ نزیککردنەوە لە کەسایەتییە ئایینییەکانی کوردستان.

پەرەسەندنی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلانی بەلکان ، سەرکەوتنەکانی ڕووسیا لە شەڕی ساڵانی ١٨٧٧– ١٨٧٨ و سەپاندنی پەیمانە مەرجدارەکانی سان ستیڤانۆ و بەرلین[١٥] بەسەر دەوڵەتی عوسمانی، چالاکی بەرهەڵستکارانی ناوەخۆ و[١٦] دەست تێخستن و فشاری زۆری زلهێزە ئەورووپاییەکان لە کاروباری دەوڵەت کە بوونە هۆی لە دەستدانی چەند ناوچەیەکی سەر بە دەوڵەت[١٧] و هەوڵدان بۆ لاوازکردنی ڕەوتە جوداخوازییەکانی کورد و عەرەب [١٨]و.. هتد، ئەمانە پاڵنەری بەهێز بوون بۆ ئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید لە پێناو پارێزگاری لە قەوارەی دەوڵەت و بەهێزکردنی سیاسەتی خۆی، هەوڵی بەدەستهێنانی لایەنگیری موسڵمانانی جیهانی ئیسلامی بدات.[١٩] بانگەشەکردن بۆ (جامیعەی ئیسلامی) کەوا

کەوا لەو کاتانەدا دەوڵەت هەوڵی بۆ دەدا هەر لە سۆنگەی ئەو پاڵنەرو هۆکارانەی سەرەوە دەهات.

سوڵتان دەیویست لە ڕێگای دامەزراندنی پەیوەندی لە نێوان ئەستانەو تەکیە و خانەقاکاندا خۆی لە زانایانی ئایینی و شێخانی تەریقەت نزیك بکاتەوە [٢٠]. بۆ ئەو مەبەستەش نوێنەر و بانگەشەچییەکانی خۆی بۆ کوردستان و ناوچەکە ناردووە و بە ناوی خەلیفەی موسڵمانانەوە هەوڵی خۆ نزیککردنەوەیان لە کوردان داوە [٢١]. دیارە لە ژێر کاریگەری ئەو بانگەشانە و تایبەتمەندی کەسایەتی کوردیی کە وەکو نەتەوەیەکی ئیماندار خۆی پاراستووە، بۆتە هۆی ئەوەی چەند زاناو شێخ و سەید و مەلاکانی کوردستان سەردانی ئەستانە بکەن و بگەنە خزمەت سوڵتان و لە ڕووی ماددی و مەعنەویشەوە خەلات و پاداشت بکرێن.

پەیوەندی توندو تۆڵی نێوان شێخ سەعیدی حەفید و ئەستانە نموونەیەکی بەرچاوی ئەو جۆرە پەیوەندییانەن کەوا لە نێوان کەسایەتییە ئایینییەکانی کوردستان و سوڵتان عەبدولحەمیددا هەبووە [٢٢]. ئەمە جگە لە چەندین نموونەی تر کەوا لە سەرچاوەکاندا ئاماژەیان بۆ کراوە [٢٣].

**ج . هەڵوێستی کوردو ڕاپەڕینی چەکداری:**

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا، چەند ڕاپەڕین و شۆڕشێکی چەکداری لە لایەن کوردانەوە لە دژی عوسمانییەکان بەرپا بوو، دەکرێ لەم ڕووەوە ئاماژە بۆ دیارترینیان بکەین:

**- ڕاپەڕینی یەزدان شێر:**

لە ئەنجامی سیاسەتی چەوتی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە بەرانبەر کورد و لە ناوبردنی میرنشینە کوردییەکان و دوورخستنەوە و لەناوبردنی میر و سەرۆکەکانی کورد و دانانی کەسانی بەرەگەز تورك لە شوێنیاندا، جگە لە پیادەکردنی پرۆسەی بە زۆر کۆچپێکردنی کوردو خراپبوونی باری ئابووری گشتی خەڵك بە هۆی زیادبوونی ڕێژەی باج و دیاردەی سەرباز گرتنی بە زۆرو...هتد [٢٤]، ئەمانە بوونە هۆی ڕق ئەستووری و بێزاری خەڵك لەبەرانبەر دەوڵەت و بوونە

هاندەرێك بۆ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینێك بە سەرۆكایەتی ( یەزدان شێر ) كەوا شاری جەزیرە و هەموو ئەو ناوچانەشی گرتەوە كەوا كەوتوونەتە نێوان دەریاچەی وان تاكو شاری موسڵ خۆیشی [٢٥]. ڕاپەڕینەكە سیمایەكی جەماوەری پێوە دیار بوو، چونكە ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكی سەر بە نەتەوە و تایەفە ئایینییە جۆر بە جۆرەكانی وەك: كورد ، عەرەب، یۆنانی ، ئەرمەن ، نەستووری و ئێزیدی و ... هتد بەشدارییان تێدا كردبوو [٢٦].

یەزدان شێر هەوڵی دا سوود لە هاوكاری زلهێزەكان ببینێت، بە تایبەتی لە ڕووسەكان كەوا ئەو كاتە لە شەڕێكدا بوون لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا كە لە مێژوودا بە شەڕی ( قرم )[٢٧] ناسراوە، چەند جارێك پەیوەندی بەو سەركردە ڕووسییانەوە كرد ئەوانەی لە ماوەی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەكاندا لە ناوچەكە نزیك ببوونەوە [٢٨]. كەچی دەبینین ڕووسەكان دوودڵ بوون لە بەرانبەر ئامانجەكانی ڕاپەڕینەكە و ئەگەری ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر بەرژەوەندییەكانیان لە ناوچەكەدا [٢٩]. بۆیەشە هاوكاری ڕاپەڕیوەكانیان نەكرد.

هەرچی بەریتانییەكانیشە ئەوا تا ئەوكاتە هەوڵی پارێزگارییان لە یەكپارچەیی و (ڕەوشی ئێستا)ی دەوڵەتی عوسمانی دەدا. هەروەها لە ترسی ئەوەی نەوەك ڕاپەڕینەكە ببێتە بەهێزبوونی هەڵوێستی ڕووسەكان و بەرژەوەندییەكانیان لە ناوچەكە، بەتایبەت كە ئەوكاتە لەگەڵیاندا لە شەڕدا بوون [٣٠]، دەستیان كرد بە داڕشتنی پیلانێك بۆ لێدان و لەناوبردنی ڕاپەڕینەكە. ئەم كارەشیان بە(كریستیان ڕەسام)ی جێگری كونسوڵی موسڵ سپارد. ئەوە بوو فشاریان خستە سەر یەزدان شێر و لە ڕێگای گفت و بەڵێن پێدان بە ئاشتكردنەوەی ناوبراو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی [٣١]، یەزدان شێر پەیوەندی پێیانەوە كرد و گرتیان و ڕەوانەی ئەستانە كرا[٣٢]. گوایە دواتریش خراوەتە زیندان و پاشان لە سێدارە دراوە [٣٣].

بەم جۆرە دەبینین كەوا بە دەستگیركردنی سەركردەی ڕاپەڕینەكە، وەكو زۆربەی ڕاپەڕینەكانی تر، ڕاپەڕینەكە دادەمركێتەوە. ئەم فاكتەرەش بە درێژایی مێژووی كورد ڕۆڵی خۆی گێڕاوەو وەكو فاكتەرێكی سەلبیی كاریگەر خۆی سەپاندووە. دیارە بەرژەوەندی زلهێزەكانیش لەڕووی هەوڵدانیان بۆ بنكۆڵكردنی

پێگە و دەسەلاتی یەکتری لە ناوچەکە، بەشێوەیەکی نەرێیی و ڕاستەوخۆ، لەسەر ئەنجامەکانی ڕاپەڕینەکە ڕەنگی دایەوە.

- **ڕاپەڕینی کوڕانی بەدرخان**
**(حوسێن کەنعان پاشا و عوسمان پاشا):**

پاش دوورخستنەوەی میربەدرخان و کۆچی دوایی کردنی، ئەندامانی تری ماڵباتەکەی لەوانەش کوڕ و نەوەکانی درێژەیان بە خەبات و چالاکی سیاسی و چەکدارییانەی خۆیان دا..

شکستییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرانبەر ڕووسەکان لە شەڕی ساڵانی ١٨٧٧ –١٨٧٨ و سەپاندنی پەیمانەکانی سان ستیڤانۆ و بەرلین بەسەر دەوڵەتدا، کەوا هەڵوێستی دەوڵەتی لە بەرانبەر ڕووسیادا لاواز کردبوو، بێزاری و ڕق ئەستووری کوردەکان لە کاربەدەستان و سەربازانی لەشکری عوسمانی لەبەرانبەر ئەو خراپەکاری و زیانانەی بەسەر ناوچە کوردییەکانیاندا هێنا[٣٤]، بوونە هۆی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینێك کەوا هەردوو کوڕەکەی میر بەدرخان(حوسێن کەنعان پاشا و عوسمان پاشا) سەرکردایەتییان کرد.

هەر دوو برا بەر لە دەستکردن بە ڕاپەڕین ئەفسەر بوون لە سوپای عوسمانیدا، بارو هەلومەرجی ناوچەکەیان بە هەل زانی و گەڕانەوە کوردستان و پەیوەندییان بە سەرۆك عەشیرەت و ئەفسەرانی کوردەوە کرد، تاکو بێنەوە کوردستان و دەست بە ڕاپەڕین بکەن. ئەوە بوو دوای گەڕانەوەیان بۆ کوردستان لە ماوەیەکی کورتدا  دەستیان بەسەر شاری جەزیرەدا گرت .توانیشیان دەست بەسەر چەك و تەقەمەنییەکانی ئەوێدا بگرن و سەربەخۆییان ڕاگەیاند. عوسمان پاشا نازناوی ( میر )ی بەرز کردەوە و ناوی لە خوتبە خوێندرایەوە [٣٥]. ئەمەش خۆی لە خۆیدا  ئاماژەیە بە ڕاگەیاندنی جۆرێك لە سەربەخۆیی یا هیچ نەبێ بریتی بووە لە نواندنی جۆرێك لە هەڵوێستی تەحەداکردن لە بەرانبەر دەوڵەتدا.

بنکەی سەربازی و جەماوەریی ڕاپەڕینەکە فراوان بوو، بە تایبەتی پاش ئەوەی ئێزیدییەکانیش هاتنە ڕیزی ڕاپەڕیوەکان و هێزەکانی ناوچەی هەکاریش ئامادەیی خۆیان بۆ یارمەتیدانیان دەربڕی [٣٦]. ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کەوا

کاربەدەستانی عوسمانی مەترسی زۆریان لا دروست بێ. هەر بۆیە دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی لەشکرێکی گەورە لە ناوچەکانی سێرت ، ئامەد ، ئەرزنجان و ئەرزەڕۆم و ناردنیانە سەر ڕاپەڕیوەکان [٣٧]. ئەمەش لە کاتێکدا بوو کەوا ڕاپەڕینەکە ناوچەکانی جۆڵەمێرگ ، زاخۆ، ئامێدی ، ماردین و نسێبین و هی تری گرتبۆوە [٣٨]. کاربەدەستانی عوسمانی زانییان ناتوانن بەئاسانی ڕاپەڕینەکە دابمرکێننەوە، بۆیە داوای دانوستانیان لەگەڵ هەردوو برادا کرد. دوای چەند گفت و بەڵێنێك سەبارەت بە ئازادکردنی ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان و پێدانی جۆرێك لەسەربەخۆیی ناوەخۆ، هەر دوو برا خۆیان بەدەستەوە دا . کەچی گیران و ڕەوانەی ئەستانە کران و خرانە زیندانەوە. دواتریش ئازاد کران و بە زۆر لە ئەستانە نیشەجێ کران [٣٩].

- **شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا [٤٠] و**
**سەرەتای سەرکردایەتی ئایینی لە بزاڤی کوردییدا :**

دوای ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان و ڕاپەڕینەکەی یەزدان شێر، بۆشاییەك لە هەیکەلی سەرکردایەتی سیاسی کوردی دروست بوو، ئەوەی توانی ئەم بۆشاییە پڕبکاتەوە، پیاوانی ئایینی یان شێخانی تەریقەت بوون. کە توانییان چ لە ڕووی سیاسی و چ لە ڕووی ڕێکخستنی کۆمەڵی کوردەواری ڕۆڵی خۆیان ببینن [٤١]. شێخ عوبەیدوڵلا کەسایەتییەك بوو کەوا توانی لە ڕێگەی تێکەڵاوکردنی گیانی ئایینی لەگەڵ هەستی نەتەوەییدا، مۆرکێکی نوێ بە سەرکردایەتی بزاڤی کوردی ببەخشێ [٤٢].

لەگەڵ دەسپێکی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم، کوردستان دووچاری هەلومەرجێکی زۆر نالەبار ببۆوە. بە تایبەت کە لەو ماوەیەدا دوو شەڕی گەورە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیادا هەڵگیرسا. بە هۆی بوونی کوردستان بە گۆڕەپانی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو. دیاردەی سەرباز گرتنی بە زۆر و سەپاندنی باجی تازە و بەرزبوونەوەی ڕێژەی باجەکانی تر ڕووی لە زیادی بوو. سیاسەت و مامەڵەی خراپ و توندو تیژی کاربەدەستان و سەربازان لەبەرانبەر کورد و دانیشتوانی کوردستان ، بوونە هۆی ڕق ئەستووری خەڵك لە بەرانبەر دەوڵەت [٤٣]. هەروەها هیوا و ئامانجی نیشتمانیی شێخ عوبەیدوڵلا لە

ڕزگارکردنی کوردستان و یەکخستنی کوردان[٤٤] بۆ ڕزگاربوون لە جەور و ستەمی بێگانە و.... هتد پاڵنەری بەرپابوونی شۆڕشەکە بوون.

بە پێی ئاماژەی بەڵگەنامەیەکی فەرەنسی، شۆڕشەکە لە قۆناغی یەکەمیدا، لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٧٩ وە دەستی پێی کردووە. پاشان ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستانی گرتۆتەوە، بە تایبەتی لە ناوچەکانی باشووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا[٤٥]. ئامانجیش بریتی بووە لە بەدەستهێنانی جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی[٤٦] بۆ کوردستانی عوسمانی، بەڵام بە هۆی هاتنی وەرزی زستان و سەرماو سۆڵە و زانیاری شۆڕشگێڕان لە بارەی سوور بوونی دەوڵەت لەسەر سەرکوتکردنی شۆڕشەکە، چالاکیی شۆڕشگێڕان وەستاوە. شێخ عوبەیدوڵڵا نوێنەری خۆی بۆ لای (سامیح پاشا)ی سەرکردەی سوپای چوارەمی عوسمانی لە (وان) ناردووەو دڵسۆزی خۆی بۆ سوڵتان دەربڕیوە[٤٧]. کاربەدەستانی عوسمانی، تەنانەت بە سەدری ئەعزەمیشەوە هەڵوێستێکی نەرمیان لە بەرانبەر شێخدا نواندبوو[٤٨]. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەوا عوسمانییەکان خۆیان پاراستووە لە هەر کردەوەیەکی توندو تیژیی لە بەرانبەر شێخدا، چونکە لەوانە بوو بە هۆی بەهێزی دەسەڵات و پێگەی ئەم کەسایەتییە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر ببووایە.

بیرۆکەی خەبات و ڕزگارکردنی کوردستان لە هزری شێخدا نەڕەوییەوە. ئەمجارەیان ویستی لە ڕێگای ئاڕاستەکردنی چالاکی شۆڕش بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئازادکردنی ئەوێ ، دەست بە قۆناغێکی تری شۆڕش بکاتەوە. تاکو ئەم هەنگاوە ببێتە سەرەتایەك بۆ هێنانەدی تەواوکردنی پرۆژە گەورەکەی، کە ڕزگارکردنی هەموو کوردستان بوو. ئەم ئامانجانەشی لە کۆبوونەوەکەی نەهری و لە تەمووزی ١٨٨٠دا، لە میانەی وتارێکیدا کە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزو تیرە و موریدەکانی، کە لە کۆبوونەوەکە ئامادەبوون، خستبووە ڕوو[٤٩].

لاوازی دەسەڵاتی قاجارەکان لە ئێران، بوونی ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانی شێخ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەروەکو پێشیان وابوو بەم کارەیان زلهێزە ئەوروپاییەکان کەمتر هەراسان دەبن[٥٠]، لەگەڵ دەوڵەمەندی ئەو بەشەی کوردستان لە چاو کوردستانی عوسمانی[٥١] و سەرقاڵی قاجارەکان بە شەڕی

تورکمانەکان و[٥٢]... هتد، هۆکار بوون لە پشت ئەم هەنگاوەی ئاراستەکردنی چالاکییەکانی شۆڕش بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

پاش چەند شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ هێزەکانی قاجار، کوردەکان توانییان ناوچەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئازاد بکەن.[٥٣] کەچی بە هۆی هاتنی هێزی زۆر و پڕ چەکی قاجاری[٥٤]، هەڵگەڕانەوەی ژمارەیەك لە سەرۆك خێڵەکان و هاوکارییان لەگەڵ لەشکری قاجاری، لاوازیی ڕێکخستن و ناتۆکمەیی ڕیزەکانی شۆڕشگێڕان[٥٥]، کاریگەری خراپی ململانێ و ڕکابەرێتی زلهێزەکان لە ناوچەکە و ڕۆڵی دوژمنکارانەیان بەرانبەر شۆڕش، وەکو دواتر باسی لێوە دەکەین، بوونە هۆی شکستهێنانی شۆڕش و پاشەکشێی شۆڕشگێڕان بۆ کوردستانی عوسمانی.

کە دەگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی، شێخ عوبەیدوڵڵا جارێکی تر دەست دەکاتەوە بە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی شۆڕشگێڕان و بەدەستهێنانی چەك و تەقەمەنی و پەیوەندی و نامە ناردن بۆ سەرۆکەکانی کورد، ئەمەش بۆ ئەوەی جارێکی تر دەست بە چالاکییەکانی بکاتەوە[٥٦]. کەچی لە ژێر فشاری زۆر بۆهێنانی بەریتانییەکان بۆ کاربەدەستانی عوسمانی، تاکو ڕێگا لە جموجۆڵەکانی شێخ بگیرێت و[٥٧]، هەوڵە بەردەوامەکانی ئێران بۆ فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانی بۆ هەمان مەبەست[٥٨]، ئەمانە لە لایەك و، بە هۆی هەوڵ و تەقەلای عوسمانییەکان لەلایەکی ترەوە لە حوزەیرانی ١٨٨١دا شێخ ڕازی بوو سەردانی ئەستانە بکات و لەوێ زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کرا، بەڵام کە دەزانێ دەستبەسەر کراوە و گوێ بۆ داخوازییەکانی ناگیرێت، دەست دەکات بە پلاندانان بۆ خۆ دەربازکردن. بۆ ئەو مەبەستەش هاتنی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٨٨٢ ی بەهەل زانی و ئەوەی بڵاو کردەوە کەوا ئەو مانگە خەریکی خەڵوەت و خواپەرستی دەبێ و کەس سەردانی نەکات. ئەوە بوو توانی لە ڕێگای خاکی ڕووسیاوە، قۆناغ بە قۆناغ ڕێگا ببڕێ تاکو لە ئابی ١٨٨٢ گەیشتەوە نەهری[٥٩].

دوای گەڕانەوەی بۆ نەهری، شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ دواجار هەوڵی دا تا پەیوەندی بەلایەنگرانی بکاتەوە و، خۆی لە قەڵای (ئۆرامار) یان (هۆرەمار) قایم کرد، بەڵام هەر زوو عوسمانییەکان ئابڵۆقەی قەڵاکەیان دا. بۆ ئەوەی خوێن ڕشتن

ڕوو نەدات، شێخ خۆی بە دەستەوە دا. ئەوە بوو سەرەتا لەسەر داواکاری خۆی، شێخ بۆ موسڵ ڕەوانە کرا (٦٠)، دوای ئەوەش لە کانوونی یەکەمی ١٨٨٢ بۆ دوا قۆناغی کە حیجاز بوو گواسترایەوە (٦١). لە ساڵی ١٨٨٣ دا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد (٦٢).

سەبارەت بە هەڵوێستی نێو دەوڵەتیشەوە، شێخ عوبەیدوڵلا هەر لە سەرەتاوە دەرکی بە گرنگیی بەدەستهێنانی پشتگیریی نێو دەوڵەتی کردبوو. بۆیە هەر بۆ ئەو مەبەستە چەند جارێك نوێنەری خۆی ناردە لای دیپلۆماتکارانی ڕووس لە ئەرزەڕۆم و وان (٦٣)، کەچی ئەوان ئامادە نەبوون هیچ یارمەتییەکی شۆڕش بدەن و، داوایان لێ دەکردن لەگەڵ حوکمەت ڕێك بکەون (٦٤). تەنانەت لە ڕێگای ڕۆژنامەکانیانەوە، بۆ مەبەستی لەکەدارکردنی ئامانجەکانی شۆڕش، پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاو دەکردەوە، کەوا گوایە شۆڕشەکە بە فیتی بەریتانییەکان هەڵگیرساوە (٦٥). تەنانەت باڵیۆزی ڕووسیا لە ئەستانە داوای لە کونسوڵخانەکانیان و مەسیحییەکان کردبوو، پەیوەندی بە شێخ و نوێنەرەکانی نەکەن، ئەمەش تاکو هیچ بیانوویەك نەداتە دەست دەوڵەتەکانی تر کە پشتیوانی لە ڕاپەڕین دەکەن (٦٦).

لە ڕاستیدا ڕووسەکان بە دروستبوونی پەشێوی لەسەر سنوورەکانیاندا بە تایبەتی لەگەڵ ئێران، کە بەرژەوەندی ئابووری و سەربازی و هی تریان لە ناوچەکە هەبوو، زۆر نیگەران بوون (٦٧). دەترسان لەوەی کەوا شۆڕشەکە بۆ ناوچە کوردییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان تەشەنە بکات و ببێتە هۆی هێنانە کایەی جۆرێك لە هەماهەنگی لە نێوان شۆڕشگێڕانی کورد و بزاڤی شۆڕشگێڕی لە داغستان، بە تایبەتی کە هەر دوولا بنەمای ئایینییان سۆفیگەریی نەقشبەندی بوو (٦٨). هەر ئەمانەش بوونە هۆی ئەوەی ڕووسیا دوا جار ئامادەیی خۆی پیشان بدات بۆ ئەوەی لەگەڵ بەریتانییەکان بەیەکەوە ڕێگا بگرن لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی شۆڕش (٦٩). تەنانەت هێزەکانی خۆیان لەسەر سنوور کۆکردنەوە (٧٠) و بەڵێنی پشتگیریشیان بە ئێران دابوو (٧١).

هەرچی بەریتانییەکان بوو، ئەوکاتە خۆیان بەهاوپەیمانی دەوڵەتی عوسمانی دەزانی لە دژی ڕووسیادا، بۆیە پێیان وابوو سەرکەوتنی شۆڕشەکە و دروستبوونی

قەوارەیـەکی کـوردیی، مەترسـی لەسـەر بەرژەوەندییـەکانیان دروسـت دەکـات و دەرفەتی زیاتر دەداتە ڕووسیا بۆ دەست خستنە نێو کاروباری دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری [٧٢]. هەروەها پێیان وا بوو مەسەلەی یەکێتی کوردان مەترسی بۆ سەر ناوچە ئەرمەن نشینەکان دەبێت [٧٣]، بە تایبەتی چونکە بەریتانییەکان چ لە ڕێگـەی دیـداری تایبـەتی و ڕاسـتەوخۆی خۆیـان لەگـەڵ شـێخ عوبەیـدوڵڵا دا [٧٤]، یـانیش لـە ڕێگـەی ئاگادارییـان لـە بـارەی نـاوەڕۆکی ئـەو نامانـەی کـەوا شـێخ عوبەیـدوڵڵا بـۆ دکتـۆر کۆچـران و [٧٥]، ئیقبـال ئەلدەولـەی فـەرمانڕەوای ورمـێی ناردبوو [٧٦]، زانیاری وردیان لە بارەی ئامانجەکانی شۆڕش هەبوو. تەنانـەت هـانی مەسیحییەکانیان دەدا تاکو لە شۆڕش دوور بکەونەوە و [٧٧]، زانیارییان لە بـارەی جموجۆڵی شێخ دەدایە قاجارەکـان [٧٨]. هـەروەها لـە مـاوەی گـەمارۆدانی ورمـێ لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە، ڕۆڵیان لەدواخستنی هێرشـی کـوردان بـۆ سـەر شـارەکە بینیبوو، کە دواتر بە هۆی بەفیڕۆچوونی کات و هاتنی هێـزی زیـاتری قاجـاری بـۆ شارەکە، شارەکە لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە نەگیرا [٧٩].

هەرچی فەڕەنسایە، ئـەم وڵاتـەش کـە خـاوەنی بەرژەوەنـدی خـۆی بـوو لـە ناوچەکەدا، پێی وابوو سەرکەوتنی شۆڕشەکە دەبێتە هۆی ئەوەی دەرفـەت بداتـە هـەر دوو دەوڵـەتی ڕووسـیا و بـەریتانیا بـۆ ئـەوەی زیـاتر دەسـت لـە کاروبـاری ناوەخۆی عوسمانی و ئێران وەربدەن [٨٠]. تەنانەت لە ماوەی گەمارۆی کوردان بـۆ سەر ورمێ، لە ڕێگای مسیۆنێرەکانیانەوە یارمەتی داراییان پێشکەش بـە ئیقبـال ئەلدەولە کردبوو تاکو لە ڕێکخستنی بەرگری لە شارەکە سوودی لێ ببینێ [٨١].

بەم شێوەیە دەبینین کەوا کێشەی کورد و شۆڕشەکەی شێخ عوبەیـدوڵڵا، بـە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کەوتە ژێـر کاریگـەری دەرهاوێـشتەی ململانێـی زلهێزەکـان لەسـەر ناوچـەکە. ئـەو ململانێیـەی زیـاتر پەیوەسـت بـوو بـە (مەسـەلەی ڕۆژهەڵاتی The Eastern Question) [٨٢] یەوە، کەوا بـە شـێوەیەکی نـەرێیی بەسـەر شۆڕشـەکەدا شـکایەوە. بـە واتایـەکی تـر ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـەوا بزاڤـی ڕزگـاریخوازی کـوردی بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و ئاشـکراتر پەیوەسـت بـوو بـە پەرەسـەندن و پێـشهاتە نێـو دەوڵـەتیی و هەرێمییـەکان لەلایـەك و، ململانـێ و ڕکابەرێتی زلهێزە ئەوروپاییەکان لە ناوچەکە لەلایەکی ترەوە.

**د ـ کورد لە شەڕەکانی ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانیدا:**

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم، دوو شەڕی گەورە لە نێوان ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانی ڕوویدا. یەکەمیان شەڕی (قرم) ی ساڵانی ١٨٥٣ – ١٨٥٦ و، ئەوەی تریشیان شەڕی ساڵانی ١٨٧٧ – ١٨٧٨ بوو. هەردوو دەوڵەت، بە شێوەیەکی ئاسایی و، هەموو جارێك، هەوڵیان دەدا تاکو پشتگیری و لایەنگیری و خزمەتی کوردەکان بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕدا، نزیکەی ٤–٥ هەزار سوارەی کوردی پەیوەندی بە لەشکری عوسمانییەوە کرد. لە یەکێك لەو شەڕانەی بەرەی قەوقاز کە شەڕی (باشکادیکلار) بوو، دیسان هەندێ لە سوارەی کوردان لایان دابووە پاڵ لەشکری عوسمانی. کەچی وەکو یەکێك لە ژەنەڕاڵە ڕووسەکانی ئەو بەرەیە بە ناوی (بێبتۆڤ)ەوە، باسی ئەوە دەکات چۆن کوردەکان بە ساردی و بێ باکییەوە دژی ڕووسەکان شەڕیان کردووە. تەنانەت کە تورکەکان شکاون، کوردەکان لێیان هەڵگەڕاونەتەوە و، بەرە بەرە ژمارەیان لە ناو ڕیزەکانی لەشکری عوسمانیدا کەم بۆتەوە. هەروەها هەوڵیان داوە سوود لە (ڕەسول پاشا) ی ڕەواندوز و(عەبدوڵڵا بەگ)ی بابان ببینن، بەڵام زانیاری لەم بارەوە نییە [٨٣].

ئەڤیریانۆڤ دەڵێ: **" لە کاتی شەڕەکەدا سوارەکانی کورد هەندێ قازانجیان بە تورکەکان گەیاند ... دیارە چاوەڕێی ئەوە بوون کە سەرکەوتن بۆ کام لایەن دەبێت..."**[٨٤]. واتە چاوەڕێی ڕەوتی ڕووداوەکانیان کردووە. (قەرە فاتیمە) یەکێکە لەو ژنە کوردانەی کەوا بە سەرۆکایەتی (٣٠٠) سوارەی کوردی لە پاڵ لەشکری عوسمانیدا بەشداری شەڕی کردبوو، ئەمەش شتێك بوو جێگای سەرنجی دەوڵەتی عوسمانی بوو[٨٥].

وا پێ دەچێ کەمی بەشداری کوردەکان لە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ ئەو هەلومەرجە خراپە بگەڕێتەوە کەوا لە پاش ڕووخانی میرنشینە کوردییەکان کوردستان دووچاری ببۆوە. هەر ئەوەش بوو وەکو پێشتر باسمان کرد بووە هۆی ڕوودانی ڕاپەڕینەکەی یەزدان شێر، لە ڕۆژانی شەڕی قرمدا.

سەبارەت بەڕووسەکان، دیارە ئەوانیش لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٨٥٣دا بۆ پەیوەندیکردن بە کوردەکان دەستیان بە چالاکی کردبوو. ئەو چالاکییانەشیان

له‌گه‌ڵ پێشڕه‌ویکردنی له‌شكری ڕووسی بۆ ناو قووڵایی خاكی كوردستان زیاتر ببوو [٨٦].

قاسم خان، كه یه‌كێك بوو له سه‌رۆكه كورده‌كانی ناوچه‌ی قارس، له‌و كه‌سانه بوو كه‌وا ڕووسه‌كان له ڕێگه‌ی ژه‌نه‌ڕاڵ (مێلیكۆڤ)ه‌وه په‌یوه‌ندییان پێوه كرد و، به‌ڵێن وا بوو كه‌وا له كاتی پێویستی ٨٠٠ – ١٠٠٠ نه‌فه‌ر سواره له كوردان ئاماده بكات [٨٧]. كه‌چی وه‌كو ده‌ركه‌وت ڕووسه‌كان سوودێكی ئه‌وتۆیان لێ نه‌بینی، چونكه تاكو كۆتایی شه‌ڕه‌كه په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی عوسمانی نه‌پچڕاندبوو و به ئاشكرا شه‌ڕی له دژی له‌شكری عوسمانی نه ده‌كرد [٨٨]. هه‌روه‌ها ڕووسه‌كان به تایبه‌تی به‌رپرسانی پیته‌ربورگ، له نێویشیاندا وه‌زیری جه‌نگ (دلجۆرۆكوڤ) جه‌ختی له‌سه‌ر گرنگیی په‌یوه‌ندیكردن به كوردان ده‌كرده‌وه. هه‌ر له‌م باره‌وه گوتبووی : **"ئامانج كاتێك دێته دی ئه‌و كاته‌ی كورده‌كان به شێوه‌یه‌كی یه‌كلاییكه‌ره‌وه له حوكمه‌تی توركی ده‌پچڕێن و له له‌شكركێشی داهاتوودا پشتگیری هێزه‌كانمان ده‌كه‌ن"** [٨٩]. ئه‌مه له كاتێكدا هه‌ندێك له به‌رپرسانی ڕووسی جه‌ختیان له‌سه‌ر پیاده‌كردنی سیاسه‌تی تۆقاندن له به‌رانبه‌ر كوردان ده‌كرده‌وه [٩٠].

له شه‌ڕی ساڵانی ١٨٧٧ – ١٨٧٨ یشدا، عوسمانییه‌كان توانییان له ڕێگای ڕاگه‌یاندنی بانگی جیهاده‌وه [٩١]، ژماره‌یه‌ك له كورده‌كان بۆ لای خۆیان ڕابكێشن. له دیارترین ئه‌و كه‌سایه‌تییانه، شێخ عوبه‌یدوڵڵای نه‌هری بوو، كه‌وا به ژماره‌یه‌ك چه‌كدار [٩٢] به‌شداری له شه‌ڕه‌كه كردبوو، به‌ڵام له ژێر فشاری هێزه‌كانی ڕووسی و سه‌ركه‌وتنه‌كانیان و كه‌می ئازووقه و چه‌كی پێویست به‌ره به‌ره پاشه‌كشێیان كردبوو [٩٣]. ته‌نانه‌ت (كاك ئه‌حمه‌دی شێخ [٩٤]، ئه‌ویش هێزێكی خۆبه‌خشی به سه‌ركردایه‌تی شێخ سه‌عید بۆ به‌ره‌ی كه‌فكاس ناردبوو. له‌به‌رانبه‌ر ئه‌م به‌شداربوونه‌یاندا، دواتر له لایه‌ن سوڵتان عه‌بدولحه‌میددا پاداشت كراوه [٩٥]. هه‌مه‌وه‌نده‌كانیش ژماره‌یه‌كیان به پیر بانگه‌وازی جیهاده‌وه چوون و به‌شدارییان له شه‌ڕه‌كه‌دا كردووه، به‌ڵام دواتر ئه‌وانیش هه‌ڵگه‌ڕاونه‌ته‌وه [٩٦].

ڕووسه‌كان به‌ر له ده‌ستپێكی شه‌ڕه‌كه، له ڕێگای باڵیۆزی خۆیان له ئه‌ستانه (ئاجودانت ئێگناتیڤ) برووسكه‌یان بۆ فه‌رمانده‌ی هێزه‌كانیان له‌به‌ره‌ی قارس

ناردبوو تاکو هەوڵ بدەن کوردەکان لەخۆیان نزیك بکەنەوە ، بەر لەوەی تورك و بەریتانییەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن [٩٧]. بۆ ئەو مەبەستە دەستیان کرد بە پێکەوەنانی هێزی پۆلیس و سوارەی ڕێکوپێك لە کوردەکان. توانییان تاکو کۆتایی شەڕەکە نزیکەی ١٣٠٠ سوارە پێك بهێنن و بەشداری شەڕەکانیان کرد، بەڵام وەکو ئەڤیریانۆڤ دەڵێ: **"... ڕێکخستنی ئەوانە [سوارە کوردەکان ] زیاتر بە مەبەستی سیاسی بوون"** [٩٨].

شایانی باسە کەوا ڕووسەکان لەبەر ئازایەتی نواندنی کوردەکان لە شەڕدا، مەدالیایان بە سەرکردەکانیان بەخشیوە [٩٩]. ئەمەش مانای ئەوە بوو کە ڕووسەکان بەلایانەوە گرنگ بوو هەست و سۆزو لایەنگیری کوردەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن تاکو لە دژی دەوڵەتی عوسمانی سوودیان لێ ببینن، بەڵام وەکو کوردناسی ڕووسیی مینۆرسکی لەم بارەیەوە دەڵێ: **"هەر کاتێك شەڕ لەو دیو قەفقاسەوە [یاخود قەوقاز ] هەڵبگیرسایەوە ئێمە زیاتر بایەخمان ئەدا بە کوردەکان"** [١٠٠]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا ڕووسەکان لە کات و ساتی دیاریکراو و بەپێی هەلومەرج و ئاراستەی بەرژەوەندییەکانیان مامەڵەیان لەگەڵ کوردان کردبوو.

**٥ ـ ململانێی وڵاتە زلهێزەکان لە کوردستاندا :**

کوردستان وەکو بەشێکی گرنگ و ستراتیژی، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك، لە نەخشەی زلهێزە ئەوروپاییەکاندا شوێنێکی تایبەتی هەبوو. بۆ ئەو مەبەستە زلهێزەکان هەوڵیان دەدا دەست بەسەر سامانە سروشتییەکەیدا بگرن و بە بازاڕەکانی خۆیانی ببەستنەوە [١٠١].

بەریتانییەکان لەوانەبوون کە بەردەوام لە هەوڵی بەهێزکردنی پەیوەندی ئابووری و دەسەڵاتی دارایی خۆیان دابوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا [١٠٢]. بۆ ئەو مەبەستەش لە ڕێگای کاری کۆمپانیاکانیان وەکو (کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بەریتانی British East India Company)[١٠٣]، ناردنی گەڕیدەکان و نێردە دیپلۆماسییەکانیانەوە، هەوڵی پتەوکردنی شوێن پێی خۆیان لە ناوچەکە داوە. ئێف. ئار. چێسنی کە سەرۆکی نێردەیەکی لێکۆڵینەوەی کەشیتوانی بوو، لەو

کەسانە بوو جەختی لەسەر گرنگیی بازرگانی موسڵ بۆ بەریتانیا دەکردەوە. بۆیەش داوای دەکرد گرنگی بدرێت بە بازرگانی لە ڕێگەی ئەسکەندەرۆنەوە بۆ دیاربەکر و لە وێشەوە بەڕێگەی ئاوی دیجلەدا بەرەو موسڵ. ئەم نەخشەیەشی بۆ مەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی تێچوونی گواستنەوە و خێراتر کردنی گوێزانەوەی ماددە دروست کراوەکانیان و توانای فراوانکردنی بازرگانی پێکردنیان بوو لە کوردستاندا[١٠٤].

لایارد Layard ی کەسایەتی سیاسی و زانای شوێنەوار ناسی بەریتانیی کە لە ماوەی ساڵانی (١٨٤٥ – ١٨٥١) دا بە بیانووی کاری پشکنین و توێژینەوە[١٠٥] لە ناوچەکە کاری کردبوو، باسی گرنگیی کردنەوەی ڕێگای بازرگانی لە کوردستان کردووە. هەروەکو ئاماژەی بە هەندێ بەرهەم و سەرچاوەی سروشتی کوردستان کردبوو کە بۆ بەریتانیا گرنگییان هەبوو[١٠٦]. خوری یەکێك بوو لەو بەرهەمانەی لەلایەن بەریتانییەکانەوە ڕەواجی باشی هەبوو[١٠٧]. ئەمەش لە سۆنگەی پێشکەوتنی ئەو وڵاتەوە دەهات کەوا لەڕووی پیشەسازییەوە پێی گەیشتبوو. ئەمانە و ململانێ لەنێوان کۆمپانیا و کەسایەتییە سەرمایەدارەکانی جیهان، بەتایبەت هی بەریتانی و ئەڵمانی، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمەوە تاکو هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی، لە سەر وەرگرتنی جیاوگی کنە و پشکنین و دەرهێنانی نەوتی کوردستان گەیشتە پۆپە[١٠٨]. ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی پیشەسازی و هۆکارەکانی گواستنەوە و دەرکەوتنی نەوت وەکو ماددەیەکی سەرەکی وزە و کەرستەیەکی بنەڕەتی لەم بوارانەدا، هاتە ئاراوە .

ڕووسەکان لە دوو ڕوانگەوە سەیری کوردستانیان دەکرد، لە ڕوانگەیەکەوە کوردستان بازاڕێك بوو بۆ ساغکردنەوەی شمەکەکانیان، لە ڕوانگەیەکی تریشەوە ڕێگەیەك بوو بۆ تێپەڕاندنی بازرگانیی قەوقاز بەرەو ئاسیای بچووك و ئێران [١٠٩]. هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان وەکو سەرەڕێگا و مەڵبەندێکی ترانزێتی لە نێوان دەریای ڕەش، دەریای قەزوین، دەریای ناوەڕاست و کەنداوی عەرەب[١١٠] ، گرنگیی زیاتری بەم وڵاتە بەخشیبوو. شاری ئەرزەڕۆم یەکێك بوو لەم مەڵبەندە گرنگانەی کەوا بەلای ڕووسەکانەوە بایەخی تایبەتی هەبوو[١١١].

ئەڵمانەکانیش لەو زلهێزانە بوون کەوا لە دوا چارەکی سەدەی نۆزدەمدا گرنگییان بە پەرەپێدانی دەسەلأت و شوێن پێی خۆیان لە دەوڵەتی عوسمانی دەدا و[112]، زانیارییان لە بارەی بوونی نەوت لە کوردستان هەبوو[113].

جەختیان لەسەر ئەگەری قازانجی نەوتی ناوچەکە کردبۆوە[114]. کەچی پرۆژەی هێڵی ئاسنینی (بەرلین – بەغدا) کە دەبوا هێڵەکانی بە کوردستانیشدا تێ بپەڕێت، ئەو پرۆژەیە بوو کەوا مەبەستێکی ئابوورییانەشی لە پشتەوە بوو. واتا بۆکردنەوەی بازاڕێك بۆ شمەکی ئەڵمانیی لە ناوچەکەو[115] ئاسانکردنی پرۆسەی هێنان و بردن، گرنگیی خۆی دەبوو[116].

لە نەخشەی سیاسی و سەربازییانەی زلهێزەکاندا، دیسان کوردستان گرنگیی خۆی هەبوو. بەریتانییەکان بە ئامانجی پارێزگاریکردن لە ڕێگاکانی گەیشتن بە هیندستان و دۆزینەوەی کورتترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە هیندستان، کە کوردستان یەکێك بوو لەو ڕێگایانە [117]، بەردەوام لە کۆششدا بوون، تاکو شوێن پێ و دەسەلأتی خۆیان لە ناوچەکە پتەو بکەن و بەرهەڵستی زۆری هێزەکانی تریان لە ناوچەکە دەکرد [118]. ئەو پرۆژانەی کەشتیوانی، کە بەریتانییەکان بە تەنگ پێکەوەنان و لێکۆڵینەوەیان بوون، بەشێك بوون لە پلانی ئەو وڵاتە، تاکو کوردستانی پێ بکەنە نێوەندێك بۆ بەستنەوەی دەریای ناوەڕاست بە کەنداوەوە و، هەر لەم ڕێگایەشەوە بەرهەڵستی ڕووسیاو[119] هێزەکانی تری پێ بکەن.

(لۆرد کێرزن) ی دیپلۆماتکاری بەریتانیی لە نەتەوەکانی سەدەی نۆزدە، بە ئاشکرا داوای دەکرد کەوا میسۆپۆتامیا بکرێتە ناوچەیەکی ڕووتی دەسەلأتی بەریتانی [120]. خۆ دژایەتیکردنی بەریتانییەکان بۆ پرۆژەی هێڵی ئاسنینی بەرلین–بەغدا[121]، هەر لە سۆنگەی پارێزگاریکردنیان لە بەرژەوەندییە سیاسی و سەربازی و ئابوورییەکانیانەوە لە ناوچەکە دەهات. بۆیە زۆر بە وردییەوە چاودێری هەنگاوەکانی ئەڵمانەکانیان لە ناوچەکە دەکرد[122].

ڕووسەکانیش لە سۆنگەی برەودان بە کاری فراوانخوازی و بەرژەوەندییە ستراتیژەکانیان لە ناوچەکانی قەوقاز و ئاوە گەرمەکان و ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست گرنگییان بە کوردستان دەدا [123]. هەر بۆیەشە، بە تایبەتی لە ماوەی شەڕەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، گرنگییان بە خۆنزیککردنەوە لە کوردان

دەدا و لەم ڕووەوە هەندێك جار سوودیان لە کورد بینیبوو[١٢٤]. لە پێناو ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆر لە گەڕیدەکانیان، کەسانی سەربازی و دپلۆماتکارو سیخوڕو...هتد، ڕوویان لە کوردستان و ناوچەکە کردبوو[١٢٥].

بۆ ئەڵمانەکانیش پڕۆژەی هێڵە ئاسنینەکان گەورەترین و کاریگەرترین پڕۆژەی فراوانخوازی ئیستعماری بوون، چونکە دەیانویست لەم ڕێگەیەوە دەست بەسەر ناوچەیەکی فراواندا بگرن. ئاسیای بچووك ، ئەستانەو میسۆپۆتامیا تاکو کەنداو بە ئەورووپا و وڵاتەکەیان ببەستنەوە[١٢٦].

شایانی باسە ململانێی زلهێزەکان لەسەر کوردستان هەندێك جار سیمایەکی ئایینی لە خۆ دەگرت. دیارە بوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی مەسیحی و ڕێباز و ئایینزای جیاواز لە کوردستان[١٢٧]، هانی زلهێزە ئەوروپاییەکانی داوە، تا لەم ڕووەشەوە کوردستان بکەنە مەڵبەندێکی چاوتێبڕین.

بەریتانییەکان لە پێناو بڵاوکردنەوەی بنەماکانی ئایینزای پرۆتستانتی لە نێو ئاسوورییەکان و[١٢٨]، ڕووسەکانیش بۆ پتەوکردنی شوێن پێی خۆیان لە ناو ئۆرسۆدۆکسەکان و کۆمەڵی ئەرمەنی و نەستوورییەکان[١٢٩] بەردەوام لە چالاکیدا بوون. فەرەنسییەکانیش لە ویلایەتی موسڵدا، بۆ برەودان بە ئایینزای کاسۆلیك دریغییان نەکردووە[١٣٠]. هەرچی ئەمەریکاییەکانە، ئەوا لەوانەی تر چالاکتر کاریان کردووەو لەنێو پرۆتستانتەکاندا ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە[١٣١].

### و ـ بووژانەوەی هۆشیاری نەتەوایەتی کورد و بزاڤی ڕۆشنبیری و ڕێکخراوەیی:

### ـ کوردو بزاڤی دەستووری لە دەوڵەتی عوسمانیدا:

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، بزاڤ و چالاکی بەرهەڵستکارانی ناوەخۆی دژ بە سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە پەرەسەندندا بوو. ئەنجامی ئەمەش کۆدێتاکەی ٢٣ی تەمووزی ١٩٠٨ بوو کە لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەی (ئیتیحادو تەرەقی ) ئەنجام درا. سوڵتان عەبدولحەمیدیان ناچار کرد ڕەزامەندی لەسەر گێڕانەوەی دەستوور دەرببڕێ. دواتریش لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٨ پەرلەمانێکی تر دامەزرایەوە، کە تیایدا ئیتیحادییەکان زۆرترین کورسییەکانی پەرلەمانیان بە دەست هێنابوو[١٣٢].

بانگەشـەو پڕوپاگەنـدەی ئیتیحادییـەکان بـۆ بڵاوکردنـەوەی دادپـەروەری و یەکسانی و برایەتی و... هتد، بوونە هۆی ئەوەی هـەر لـە سـەرەتاوە گـەلانی ژێـر دەستی عوسمانی لە نێویشیاندا بەشێك لە کوردان، بە تایبەتی ئەوانەی بـەرۆژئاوا کاریگەر بوون، پێشوازی لە ڕژێمە تازەکە بکەن و خۆیان ڕێك بخەنـەوە و شـانازی بـە نەتـەوەی خۆیـان بکـەن و خۆشـحاڵی خۆیـان لـەم بـارەوە دەربـبڕن (١٣٣). بـە تایبەتی کەوا ئیتیحادییەکان دەستیان کرد بەئازادکردنی ئەو کوردانەی لـە زینـدان بوون و گێڕانەوەی ئەوانـەش کـەوا دوور خرابوونـەوە. ئەوانـەی پێـشتریش لەگـەڵ ئیتیحادییـەکان بـوون، یـان سـەر بەئیتیحادییـەکان بـوون پێیـان وا بـوو کـەوا لـە **"سزادان"** ڕزگاریان بووە (١٣٤) .

ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری نەهری و شەریف پاشا و... هی تـر لـەو کەسـایەتییە نەتەوەییانـە بـوون پـشتگیری کۆدێتاکـەیان کـرد. بـە ئومێـدی ئەوەی تورکەکان بەرهەڵستی داخوازییەکانی کەمایەتییـە نەتەوەییـەکان نەکـەن. تەنانـەت شـێخ عەبـدولقادر ماوەیـەك وەکـو سـەرۆکی ئەنجومـەنی پیـاو مـاقووڵان (سـینات) لـە پەرلـەمانی عوسمـانی هەڵبـژێردرابوو (١٣٥). هـەروەها ژمارەیـەك لـە پەرلەمانتاری کوردی وەکو ئەندام لە پەرلـەمان بەشـدار بـوون، وەکـو: ئیـسماعیل حەقی بابان، سەعید پاشای خەندان، مەلا سەعید ئەفەنـدی کـەرکوکی، حیکمـەت پاشا، محمد عەلی قیردار، و جەمیل سدقی زەهاوی و...هی تر (١٣٦).

لەبەرانبەر ئەوانەدا، جەماوەری کوردی، لەوانەش زانایانی ئـایینی جۆرێـك لـە خۆپارێزی (تەحەفوز)یان لەبەرانبـەر ڕژێمـە تازەکـە هـەبوو، چـونکە پێیـان وابـوو دەستوور هۆکارێکە بـۆ سـنووردانان بـۆ دەسـەڵاتیان. هاونیـشتمانیانی ئاسـاییش مەترسییان لەوە هەبوو سەردەمی دەسـتووری ببێتـە هـۆی دەرچـوون لـە ئـادابی گشتی و داب و نەریتی کۆمەڵگای کوردی (١٣٧). تەنانەت زانای کورد، مەلا سەعیدی نەورەسی، کەوا سەرەتا بە هاتنی ڕژێمە تازەکە خۆشحاڵ بوو (١٣٨)، کەچـی دواتـر دژایەتی کردوون، چونکە ناوبراو هەوڵی دەدا مەسەلەکانی ئـازادی لەسـەر بنـەمای ئایینی ئیسلام و شەریعەت لێك بداتەوە (١٣٩). ئەمە جگە لەوەی پرسی دەستوور و بنەماکانی زۆر جار بـە پیلانـی ڕۆژئـاوا و نـەیارانی ئیـسلام لێـك دراوەتـەوە. بۆیـە

شتێکی ئاسایی بوو لەلایەن پیاوانی ئایینییەوە جۆرێك لە هەڵوێستی دژایەتیکردن ببینرێت.

**ـ سەرەتای بزاڤی ڕۆشنبیری:**

دەکرێ ئەو پەرەسەندنە ڕۆشنبیرییەی کەوا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا هاتە دی، بەسەرەتایەکی نوێی بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی دابنرێت. (قوتابخانە خێڵەکییەکان)[١٤٠] و خوێندنگە ئایینی و سەربازییەکان، مەڵبەندێکی سەرەکی بوون بۆ پێگەیشتنی کەسانێك کەوا وەکو پێشەنگ و ڕابەری بزاڤی ڕۆشنبیری کوردی ڕۆڵی خۆیان بینی[١٤١]. سەرەڕای بوونی چاودێری و سانسۆری زۆر لە ناوچەکانی سەر بە دەوڵەتدا، کەچی ئەمە نەبووە ڕێگر لە پێگەیشتنی کەسانێك، کەوا دوور لە دەسەڵاتی مەڵبەند دەژیان[١٤٢]، تاکو لەم ڕووەوە پەرە بە بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی بدەن.

٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ ڕۆژێکی پرشنگدار بوو لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا، چونکە لەم ڕۆژەدا یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی (کوردستان) لە قاهیرە، لە لایەن ئەندامانی ماڵباتی بەدرخان، کەوا ئەو کاتە بە پەنابەری لە میسر دەژیان، دەرچوو[١٤٣]. سەرەتا مقداد مەدحەت بەدرخان و دوای ئەویش عەبدولڕەحمانی برای ئەرکی دەرکردنی ڕۆژنامەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو[١٤٤].

ڕۆژنامەی (کوردستان) سی و یەك ژمارەی لێ دەرچوو، لەبەر هۆی ڕاوەدوونانی سەرپەرشتیکارەکانی لە چەند شوێنێکی جیاوازدا دەرچووە. لەوانە: قاهیرە، ژنێف، لەندەن و فۆلگستن بوو. بابەتەکانی ڕۆژنامەکە ڕۆشنبیری و سیاسی و مێژوویی بوون. لەساڵی ١٩٠٢، بە هۆی سانسۆرو ڕاوەدوونانی عوسمانییەکان بۆی و گرفتی داراییەوە، دەرچوونی ڕۆژنامەکە ڕاگیراوە[١٤٥].

ڕۆژنامەکە گرنگی زۆری بە مێژوو و کەلتووری کوردی دابوو. لەوانەش گرنگیدان بە بەرهەمی شاعیرانی وەکو (ئەحمەدی خانی) و بەرهەمی مێژوویی وەکو شەرەفنامە و مێژووی فەرمانڕەواکانی جەزیرەی بۆتان و سەرکردە کوردەکان وەکو سەلاحەددینی ئەیوبی و ...هتد[١٤٦]. گرنگیدان و جەختکردنەوە لەسەر لایەنی فێرکردن و خوێندەواری لایەنێکی بەرچاوی باسەکانی نێو

لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکە بوو[١٤٧]. هەروەها لەبەر ئـەوەی تـا ئـەو کاتـە کۆمەڵەیـەکی کـوردی نـەبوو، بۆیـە ڕۆژنامەکـە وەکـو جەمـسەرێك وابـوو بـۆ کۆکردنـەوەی نیشتمانپەروەرو ڕۆشـنبیرانی کـورد لـە دەوری خۆیـدا و[١٤٨]، **" هـەر لـە هـەوەڵ سـاتی لەدایکبوونییـەوە... بۆتـە هـۆی خەملاَنـدنی بـیری نەتـەوەیی لـە نـاو کوردا"**[١٤٩].

***ـ سەرەتـای خەبـاتی سیاسیی ڕێکخراوەیی:***

دەکرێ ئەو کۆنگرەیەی کـەوا لـە تـەمووزی سـاڵی ١٨٨٠ دا لـە( نـەهری ) لـە ناوچەی شەمدینان بەڕێوەچوو، کە تیایدا لەسەر داوای شێخ عوبێدوڵلا ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزو ناوداران و موریدانی شێخ ئامـادە بـوون[١٥٠]، بەیەکـەم کـاری خـەباتی سیاسـی ڕێکخراوەیـی کـوردی دوای ڕووخـانی میرنـشینە کوردەکـان[١٥١] دابنرێـت. لێـرەدا شـێخ عوبێـدوڵلا مەبەسـت و ئامانجـەکانی کۆبوونەوەکـەی لـە یەکخـستنی خـەبات و ڕزگـاریی کوردسـتان خـستبووە ڕوو[١٥٢]. لـە بەڵگەنامـەی بەریتانییەکانیـشدا شـێخ عوبێـدوڵلا بـە سـەرۆکی"موحتەمـەل"ی ئـەو کۆمەڵەیـە دانـراوە کـەوا لـە ئـەنجامی کـاری هاوبەشـی نـاو کۆنگرەکـە دامـەزراوە، [١٥٣] لـە سەرچاوەکانیشدا بە**"کۆمەڵەی کوردی"** و[١٥٤]، **"کۆمەڵـەی خێڵـە کوردییـەکان"**و[١٥٥]، **"کۆمەڵی میللەتی کورد"**و[١٥٦] **"یەکێتی کوردان"**و[١٥٧]**" یەکێتی عەشیرەتە کوردییەکان"**[١٥٨]، ناوی هاتووە.

**هاوکات** لەگەڵ دەسپێکی سەدەی بیستدا، کۆمەڵەیەکی تر بە ناوی کۆمەڵـەی عەزم قەوی کوردستان **"کردستان عزم قوی جمعیتـی"** دامـەزراوە لـە سـاڵی ١٩٠٠ دا. ئەمەش هەروەکو لە نووسینەکانی زنار سلوپی دا بە دیار دەکـەوێ گوایـە ئـەم کۆمەڵەیە بەدەستپێشخەری کەسایەتی ( فکری ئەفەندی دیار بەکری ) دامـەزراوە. ئەحمەد رامز کردی زادە وەکو نوێنەری کۆمەڵەکە چۆتە میسر و پەیوەندی لەگەڵ لایەنگرانی"تورکە لاوەکان" بەستووە[١٥٩].

***ز ـ کوردستان لە سەردەمی ئیتیحادییەکاندا:***

لە سەرەتاکانی سەدەی بیست، خەباتی سیاسی بەرهەڵستکارانی سیاسـەتی سوڵتان عبدولحەمیدی دووەم گەیشتە ئەوپەڕی." کۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی"

گرنگترین لایەنی بەرهەڵستکاری بوو. کە توانییان لە ٢٣ ی تەموزی ١٩٠٨ دا لە ڕێگای کودێتایەکەوە دەست بەسەر حوکمدا بگرن و دواتریش لە نیسانی ١٩٠٩ سولتان عەبدولحەمیدیان لێ خست [١٦٠]. بەمەش سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیتیحادییەکان دەست پێ دەکات ، واتە لە ١٩٠٨ تاکو ١٩١٨ ، جگە لە ماوەیەك نەبێ کەوا ئەندامانی پارتی **"حوریەت و ئیتیلاف"** [١٦١] دەسەلاتیان لە دەستدا بوو.

### ـ سیاسەتی ئیتیحادییەکان بەرانبەر بە کورد :

دوای ئەوەی ئیتیحادییەکان دەسەلاتیان گرتە دەست و، دەستوور بۆ ولات گێڕدرایەوە، هەڵوێستی کوردان بە گشتی لە دوو ڕەوتی جیاوازدا خۆی دەبینییەوە. یەکەمیان ئەو کەسانە بوون کەوا هاوسۆزی سوڵتانی عوسمانی بوون و کە سوڵتانیش لێ خرا پێی کاریگەر بوون. دووەمیشیان ئەو کەسایەتییانە بوون کەوا گێڕانەوەی دەستوور لەلایەك و، بەرزکردنەوەی دروشمەکانی **" ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی"** لەلایەن ئیتیحادییەکان لە لایەکی ترەوە کاری تێ کردبوون [١٦٢] و پشتگیری ڕژێمە تازەکەیان کرد.

ئیتیحادییەکان سەرەتا ویستیان پشتگیری ڕێکخراوە سیاسی و کەسایەتییە دیارەکانی کورد بۆ خۆیان دەستەبەربکەن [١٦٣]. ڕێگادان بە دامەزراندنی چەند کۆمەڵەیەکی کوردی، کە دواتر باسیان لێوە دەکەین، لەگەڵ بەشداری ژمارەیەك لە کورد لە پەرلەمانی تازە و بوونی چەند کەسایەتییەکی کوردی، وەکو عەبدوڵلا جەودەت و ئیسحاق سکوتی [١٦٤] لە ناو پارتەکەو ... هتد، هاندەر بوونە بۆ ئەوەی کەسانی تریش لە سەرکردە کوردەکان پشتگیری لە ڕژێمە تازەکە بکەن.

کەچی وەکو دەڵێن: ئەم بەهاری ئازادییە کورت بوو، چونکە بەرەبەرە دەستیان کرد بە پیادەکردنی سیاسەتێك کە لە سەر بنەمای ڕەگەزپەرستی و بە تورککردنی هەموو نەتەوە غەیرە تورکەکان [١٦٥] و بانگەشە بۆ "تۆرانیەت" [١٦٦] دامەزرابوو. لە دروشمەکانی پێشوویان هەڵگەڕانەوەو بە ئاشکرا دەیانگوت: "ئێمە تورکین و کەعبەمان تۆرانە" [١٦٧]. ئەوە بوو دەستیان کرد بەڕاوەدوونانی کەسایەتییە نەتەوەییەکانی کورد. لەوانەش (ئەمین عالی بەدرخان) و (شەریف پاشا)، کەوا بە تۆمەتی یاخیبوون حوکمی مەرگیان بەسەردا درا و ناچار بوون

ولات بەجێ بهێلن[168]. هەروەها ئیتیحادییەکان دەستیان کرد بە دژایەتیکردن و داخستنی کۆمەڵە کوردییەکان لەوانەش داخستنی کۆمەڵەی"تەعاون و تەرەقی" بوو . لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی جیهانی یەکەمیشدا هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی تریان داخست[169].

ئەو سیاسەتەی ئیتحادییەکان پیادەیان کرد، دواتر بووە هۆی ئەوەی سەرکردە و کەسایەتییە سیاسییە دیارەکانی کورد لە دژی ئیتیحادییەکان کار بکەن. تەنانەت **"بگرە هەندێکیان ، وەکو عەبدوڵلا جەودەت و هی تر، هەموو ژیانی خۆیان بۆ بەرهەڵستی ئەوان تەرخان کرد"**[170]. هەروەها خەباتی سیاسی و سەربازی عەبدولرەزاق بەدرخان بوو، کەوا دەیویست سوود لە ڕووسەکان ببینێ و لە دژی ئیتیحادییەکان کار بکات[171] ـ ئەمانەو ئیتیحادییەکان دژی کەسایەتییە ئایینییەکانیش بوون. نموونەشمان لەم بارەوە کوژرانی شێخ سەعیدی حەفید[172] و شێخ عەبدولسەلام بارزانی و مەلا سەلیمی بەدلیسی بوو[173].

دامەزراندنی فەرمانبەرانی **"ناپاك"** و **"نادڵسۆز"** لە ناوچە کوردییەکاندا، یەکێکی تر بوو لە سیاسەتی ئیتیحادییەکان[174]. یەکە کارگێڕییەکانی دەوڵەت لە ناوچەکانی کوردستاندا گیروگرفتیان بۆ ئەو نوێنەرە کوردانە دەنایەوە کەوا خۆیان بۆ پەرلەمان هەڵدەبژارد. زۆر جاریش دانیان پێیاندا نەدەنان و پەسەندیان نەدەکردن[175]. ئەمە جگە لە پیادەکردنی سیاسەتێکی ئابووری توندوتیژ، لە ڕێگەی سەپاندنی باج و خەراجی زۆر بە سەر خەڵکدا، کەوا گوزەرانی خەڵکی نالەبار کردبوو[176].

هەروەها ئیتیحادییەکان هەوڵیان دەدا وشەی**"کوردی"** نەهێڵن، تەنانەت زاراوەی**"ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات"**یان لەجیاتی وشەی**"کوردستان"** داهێنا. ئەو هۆکارانە و هی تریش بوونە پاڵنەر تاکو نەتەوەکانی تری سەربە دەوڵەت بیر لەحاڵی خۆیان بکەنەوە، لە نێویشیاندا نەتەوەی کورد بوو، کەوا پارتی سیاسیی خاوەن ئایدۆلۆژیای ڕابوونی نەتەوەیی دامەزراند[177]. کە لە تەوەرێکی تر باسی ئەم بابەتە دەکەین.

**ـ پەرەسەندنی ڕێکخراوە کوردییەکان :**

لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستدا، بووژانەوەیەکی شۆڕشگێڕی ئەو وڵاتانەی گرتەوە کەوا کوردستانیان بەسەردا دابەش ببوو. شۆڕشی مەشرووتە لە ئێران و[١٧٨]، شۆڕشی ١٩٠٥ لە ڕووسیا و[١٧٩]، ئینجا کۆدێتاکەی ئیتیحادییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا نموونەی بەرچاوی ئەو پەرەسەندنانە بوون. ئەمەش بەش بە حاڵی خۆی کاریگەری بۆ سەر کورد و بزاڤەکەی هەبوو.

دوای سەرکەوتنی ئیتیحادییەکان و گێڕانەوەی دەستوور و، ئەو جۆرە کرانەوەیەش کەوا لە گۆڕەپانی سیاسیدا هاتە پێشەوە، یەکەمین کۆمەڵەی سیاسیی کوردیی ئاشکرا بە ناوی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد **" کرد تعاون و ترقی جمعیتی "** لە ١٩ی ئەیلولی ١٩٠٨دا لە ئەستانە دامەزرا. هەریەك لە ئەمین عالی بەدرخان، سەید عەبدولقادری نەهری، داماد ئەحمەد زولکەفەل پاشا و خەلیل خەیالی و کەسانی تر لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە بوون. پاش دامەزرانی کۆمەڵە لقی خۆی لە چەند شارێکی کوردستان وەکو: بەتلیس، مووش، ئامەد، موسڵ، خنس، ئەرزەڕۆم و بەغدا کردەوە .

کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد قوتابخانەی تایبەتی بۆ منداڵانی کورد و دەزگای چاپی سەربەخۆی کردبۆوە، گرنگی بە ئەدەبیاتی کوردی و بڵاوکردنەوەی هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد دەدا. ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە بریتی بوو لە چەسپاندنی دەستوور لەسەر بنەمای ئیسلام و بەدیهێنانی خۆشی و بەختەوەری و ئاسایشی نیشتمان، بەهێز ڕاگرتنی پەیوەندی کورد لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی و گەلانی ژێر دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتەو، چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان خێڵەکان، پێشخستنی ئاستی ڕۆشنبیری و پەروەردەو پەرەپێدانی پیشەسازی و بازرگانی و... هتد. هەروەها کۆمەڵەکە ڕۆژنامەیەکی تایبەت بە خۆی دەرکردووە بە ناوی "کرد تعاون و ترقی غزتەسی" کەوا یەکەم ژمارەی لە بەرواری ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨ لێ دەرچووە. دوا جار کۆمەڵەکە لە نیسانی ساڵی ١٩٠٩دا لە لایەن ئیتیحادییەکانەوە داخراوە [١٨٠].

هەر لە ساڵی ١٩٠٨دا، کۆمەڵەیەکی ئەدەبیی کوردیی لە ئەستانە بە ناوی کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کوردی " کرد نشر معارف جمعیتی"[١٨١]

دامەزراوە [١٨٢]. خەلیل خەیالی لە دیارترین دامەزرێنەرانی بوو [١٨٣]. ئامانجی کۆمەڵەکە زیاتر بریتی بوو لە گرنگیدان بە زانست و زانیاری و پێشخستنی ئەدەب و کەلتووری کوردی. هەروەها ئەم کۆمەڵەیە قوتابخانەی بۆ منداڵانی کورد کردبۆوە و، لە دیارترین ئەوانەی لەم قوتابخانەیەدا وانەیان گوتبۆوە (شێخ سەعیدی نەورەسی) و (ئەحمەد رامز کوردی زادە) بوون [١٨٤]. وا پێی دەچێت ئەم کۆمەڵەیە سەربە کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی بووبێت [١٨٥]. بۆیە ڕەنگە هەر لە ساڵی ١٩٠٩ داخرابێ.

لە دیارترین کۆمەڵە کوردییەکانی پێش هەڵگیرسانی شەڕ، کۆمەڵەی **"هێڤی"** یاخود **"جڤاتا فقیە هی وی کوردان"** بوو، کە بە تورکی (کرد طلبە هی وی جمعیتی) پێ دەوترا[١٨٦]. کەوا لە ساڵی ١٩١٢و، لەلایەن ژمارەیەك لە قوتابیانی کورد لە ئەستانە دامەزراوە. سەرۆکی کۆمەڵە (عومەر جەمیل پاشا) بوو. قەدری جەمیل پاشا سکرتێری و، فوئاد تەمۆ ، جەراح زادە ، مەمدوح سەلیم و کەسانی تر لە ئەندامە چالاکەکانی بوون. کۆمەڵەی هێڤی گۆڤارێکی تایبەت بە خۆی بە ناوی **"ڕۆژی کورد"** لە ساڵی ١٩١٣ دا دەرکرد، کەوا بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی دەردەچوو. ڕۆژنامەکە حەفتانە بوو، کوردێکی سلێمانی بە ناوی عەبدولکەریم بەگ سەرنووسەری بوو.

هەر یەك لە ئیسماعیل حەقی بابان و عەبدوڵڵا جەودەت، مەمدوح سەلیم، یوسف زیا ، کەمال فەوزی بەگ ، نەجمەدین حوسێن کەرکووکی ، خەلیل خەیالی، عەبدولکەریم بەگ ، حەمزە بەگ ، دیار بەکری، فکری نەجدەت ، فوئاد تەمۆ و هی تر نووسینیان لە گۆڤارەکە بڵاوکردۆتەوە. ئامانجی سەرەکی گۆڤارەکە بریتی بوو لە پێشخستنی ڕۆشنبیری کوردی و بڵاو کردنەوەی خوێندن و نووسینی کوردی لە نێوان کورداندا. پاشان ڕۆژنامەکە بە ناوێکی تر کە **"هەتاوی کورد"** بوو دەرکرا ، لەگەڵ کۆمەڵەی هێڤیدا بە هەڵگیرسانی شەڕ چالاکییان نەما [١٨٧]. چونکە زۆربەی چالاکوانانی کورد کەوا هەندێکیان لە دەرچووانی قوتابخانە و کۆلێژە سەربازییەکان بوون ، بۆ بەرەکانی جەنگ ڕاپێچ کران[١٨٨].

بە گوێرەی گوتەکانی جەلیلی جەلیل، لە مانگی ئابی ساڵی ١٩١٢ کۆمەڵەیەك بە ناوی کۆمەڵەی **"ئیرشاد"** ەوە لە نێو کورداندا هەبووە. هەر یەك لە سیبکی

عەزیز بەگ، زیرکی عەگید ئەفەندی، ئەشکیرتی شێخ عوسمان، سەلیم ئەفەندی و بەکر ئەفەندی لە ئەندامانی کۆمیتەی ڕێکخراوەکە بوون. لقی لە وان و دیار بەکر و ئۆرفەو شوێنانی تر هەبووە. هەر ئەو کۆمەڵەیەش خەریکی کۆکردنەوەی دارایی و خۆ پڕچەککردن بووە، بۆ مەبەستی سازدانی ڕاپەڕینێك، ئەویش ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩١٣ ی بەتلیس بوو [(١٨٩)].

**ـ خەباتی چەکداری و ڕاپەڕین:**

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئیتیحادییەکاندا چەند ڕاپەڕینێکی چەکداریی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا سەریان هەڵدا. ئەمانەش زیاتر دەرەنجامی ئەو سیاسەتە چەوت و ڕەگەز پەرستانەیە بوون کە ئیتیحادییەکان لە بەرانبەر کورددا پیادەیان دەکرد.

ڕاپەڕینی شێخ عەبدولسەلام بارزانی[(١٩٠)] یەکێك بوو لەو ڕاپەڕینانەی، کەوا ڕەگ و ڕیشەی بۆ پێش سەردەمی ئیتیحادییەکان دەگەڕایەوە. ئەمەش ئەو کاتەی کەوا شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ ژمارەیەك لە ڕابەرانی تری کورد لە ماڵی (شێخ نور محەمەد بریفکانی) لە بادینان یادداشتێکیان نووسی، کەوا چەند داواکارییەکی ڕیفۆرمخوازانەی لە بوارەکانی بەڕێوەبردن و ئابووریو دادوەری و ڕۆشنبیریی لە ناوچەکەدا لە خۆ دەگرت و، لە ساڵی ١٩٠٧دا بۆ بەرپرسانی حوکمەتیان بەرز کردەوە[(١٩١)]. هەروەها وێنەیان بۆ هەریەك لە شێخ عەبدولقادری نەهری و ئەمین عالی بەدرخان و ژەنەڕاڵ شەریف پاشا ناردبوو[(١٩٢)].

هەر چەندە یادداشتەکە **"...تەنها بانگهێشتێکی ئاشتییانە بوو بۆ چاکسازی و گوزارشت بوو لە پێداویستی نەتەوایەتی بۆ پێشکەوتن و ڕۆشنبیری..."**، کەچی لە لایەن کاربەدەستانی حوکمەتی عوسمانی بە هەوڵی جیابوونەوە لە قەڵەم درا[(١٩٣)]. تەنانەت پێیان وا بوو کەوا شێخ عەبدولسەلام لە لایەن ئەو کۆمەڵە کوردانەوە هاندراوە کە بۆ هێنانەدی حوکمێکی نامەرکەزی بۆ کوردان تێدەکۆشان[(١٩٤)]. بە تایبەتی کەوا ئەوە زانراوە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد و کۆمەڵەی هێڤی گەیشتبوونە بارزان[(١٩٥)]. بۆیە دوورنییە کاربەدەستانی دەوڵەت ئاگاداری ئەمە بووبن. بۆیە بەرپرسانی ناوچەکە ویستیان لە ڕێگەی

بانگهێشتکردنی شێخ و کوشتنی لە بۆسەیەکدا مەرامەکانیان بهێننەدی. کەچی پاش ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵیاندا شێخ دەربازی بوو. بارودۆخەکەش هەر بە ئاڵۆزی مایەوە تاکو هاتنە سەر دەسەڵاتی ئیتیحادییەکان [196].

والی موسل (محمد فازل پاشای داغستانی) ئەرکی ڕووبەڕووبوونەوەی شێخ عەبدولسەلامی لە ئەستۆ گرتبوو. ئەوە بوو بە هێزێکی زۆرەوە ڕووی کردە بارزان و خراپەکاری زۆری لە ناوچەکە ئەنجام دا . تەنانەت تەکیەی بارزانیش ڕووخێنرا[197]. لەماوەی ئەو هێرشەی حوکمەتدا بۆ سەر ناوچەکە، هەندێ لە هۆزە کوردییەکانی ناوچەکە لە پاڵ حوکمەت و هەندێکی تریش بە بێلایەنی وەستابوون. شێخیش ناچار بوو ناوچەکە بەجێ بهێڵێ[198]. دوای ئەوەش ماوەیەك خۆی حەشارداو بەنهێنی سەردانی هەریەك لە (مارشەمعون بنیامین)ی پەتریارکی ئاسوورییەکان و شێخ نور محمد بریفکانی و هی تری کردو، ئەوانیش پەنایان دابوو و پارێزگارییان لێ کردبوو. بەڵام دواجار دەچێتەوە ناوچەکەی خۆی و ژمارەیەکی زۆر چەکداری لە دەور کۆدەبێتەوە و لە شەڕی"سەری باز" لە چیای شیرین سەرکەوتنی گەورە بەسەر هێزەکانی حوکمەتدا بە دەست دەهێنێ. بەڕادەیەك حوکمەت ناچار دەبێ داوای دانوستان بکات، بەڵام شێخ ئەمەی بە پیلانێك زانی کەوا بۆ لەناوبردنی نەخشەی بۆ کێشرابێ، بۆیە ڕازی نەبوو دانوستان بکات [199].
بە هاتنە سەر دەسەڵاتی ئەندامانی پارتی **"حوریەت و ئیئتیلاف"** بارودۆخەکە ماوەیەك ئارام بۆوە. بە تایبەتی کەوا هەر یەك لە (نازم پاشا) ی والی بەغداد (ئەسعەد پاشا) ی والی موسڵ بەوەکالەت ویستیان نەرمی لەگەڵ شێخدا بنوێنن و فەرمانی لێبووردنیان بۆ دەرکرد. تەنانەت (ئەسعەد پاشا) داوای لە"باب العالی" کرد کە مەدالیایەك بە شێخ ببەخشرێت. بەڵام دووبارە هاتنەوە سەر دەسەڵاتی ئیتیحادییەکان لە ساڵی ١٩١٣دا بارودۆخەکەی بە ئاڕاستەیەکی تر بردەوە. بە تایبەتی پاش ئەوەی (ئیسماعیل سەفوەت بەگ) کەوا پیاوێکی سەر بە ئیئتیلافییەکان بوو بە تیرۆرکردنی (مەحمود شەوکەت)ی سەرۆك وەزیر لە ئەستانە تۆمەتبار کرابوو، هانای بردە بەر شێخ عەبدولسەلام و ئەمیش ڕازی نەبوو بیداتەوە دەست حوکمەت. ئەمەش لەلایەکەوە بیانوویەکی دایەوە دەست حوکمەت تاکو شێخی پێ لەناو ببات و، لەلایەکی تریشدا بواری بۆ

سەرهەڵدانەوەی خولێکی تری شەڕو پێکدادان لەنێوان ڕاپەڕیوەکان و هێزەکانی حوکمەتدا ڕەخساندەوە. (سلێمان نەزیف)[٢٠٠] ی والی موسڵ ئەرکی یەکلاییکردنەوەی کێشەکەی گرتبووە ئەستۆ و لەشکرێکی بە هێزی ناردە سەر شێخ عەبدولسلام و، شەڕێکی توند لە نێوانیاندا ڕووی دا . ڕاپەڕیوەکان دواجار ناچار بوون لە ناوچەکەیان بکشێنەوە. شێخ عەبدولسەلامیش پەنای بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان برد و چووە ورمێ. بووە میوانی (سەید تەهای نەهری)و چەند مانگێك لەوێ مایەوە . ئینجا سەردانی (سمکۆی شکاك)یشی کرد لە گوندی"جاریا"و ڕێزی لێ گیرا[٢٠١]. ئەو ماوەیەی شێخ عەبدولسەلام لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان مابۆوە ، بۆی گونجابوو چاوی بە شێخ عەبدولقادری نەهریش بکەوێ. تەنانەت خۆی گەیاندبووە (تەفلیس)و چاوی بە"غراندۆق" ی سەرکردەی سوپای باشووری رووسیا کەوتبوو، بەڵام وا پێ دەچێ هیچ شتێکی لێیان دەست نەکەوتبێ[٢٠٢]. تەنانەت پەیوەندیشی بە کونسوڵخانەی ڕووسی لە ورمێ کردبوو، بەڵام وەکو عەبدولڕەزاق بەدرخان لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ: **"کونسوڵی ڕووسی لە ورمێ دەترسا ئاشکرا پشتیوانی لە شێخ بکا..."**[٢٠٣]. بۆیە لێرەش پشتیوانییەکی دەست نەکەوتبوو.

دوا جار، پاش سەردانەکەی بۆ لای سمکۆ ، لەڕێگای گەڕانەوەیدا شێخ عەبدولسەلام لەسەر بانگهێشتی خەڵکی گوندی"گەنگەجین" سەردانی گوندەکە دەکات، کەچی لە لایەن گەورەی گوندەکەوە دەستگیر دەکرێ. پاشان لەگەڵ پیاوەکانی تری دەدرێنە دەست بنکەی پۆلیس و لەوێش بۆ"وان" ئینجا "دیار بکر" و دواجاریش بۆ"موسل"ی ڕەوانە دەکەن. پاشان لە کانوونی یەکەمی ساڵی١٩١٤دا لەگەڵ سێ لە یاوەرانی لە سێدارە درا[٢٠٤].

ڕاپەڕینی بەتلیسی ساڵی١٩١٣ نموونەیەکی تری ئەو کاردانەوەی کوردان بوو کەوا ڕەنگدانەوەی هۆشیار بوونەوەی سەرکردەکانی کوردی لە هەمبەر سیاسەتی چەوت و مامەڵەی توندو تیژی ئیتیحادییەکانی لە دژی کورد و دانیشتوانی ناوچەکە دەگەیاند .

توندوتیژی سیاسەتی ئابووری تورکەکان لە ڕووی سەپاندنی باجی زۆرو زیادکردنی ڕێژەی باجەکان و، کاریگەری خەباتی ڕزگاریخوازی گەلانی تری وەکو

ئەلبان و عەرەب و [٢٠٥]، دامەزراندنی کاربەدەستانی گەندەڵ لە کوردستان و [٢٠٦]، بە زۆر بەسەربازگرتنی خەڵك کەوا کاری خراپی کردبووە سەر باری ئابووری جووتیاران و هێزی کاریان لە دەست دا و شیرازەی خێزانیشی بەرەو تێکچوون بردبوو. ئەمانە بەیەکەوە هۆکاری ڕاپەڕینەکەی بەتلیس بوون. هەروەها وەکو زانراویشە کەوا ڕێکخراوی **"ئیرشاد"**ی نهێنی لە پشتی ڕاپەڕینەکە بووە و خەریکی پڕچەککردنی خەڵك بووە.(خەیرەدین بەرازی)یش یەکێك بووە لەوانەی ئەرکی هاندانی کوردەکانی ئەرزەڕۆم و بەتلیس و بایەزید و مووشی بۆ ڕاپەڕین پێ سێپردرابوو. پارەیەکی زۆریشی بۆ هەمان مەبەست کۆکردبۆوە، بەڵام لەئەیلولی ١٩١٣ لەلایەن تورکەکانەوە دەستگیر دەکرێت و دەکوژرێت [٢٠٧].

شایانی باسە کەوا هەریەك لە (مەلا سەلیم) و(شێخ شەهابەددین) و ( سەید علی) لە دیارترین سەرکردەکانی ڕاپەڕینەکە بوون [٢٠٨]. دەستگیر کردنی چوار چەکداری مەلا سەلیم لە ئاداری ١٩١٤دا بووە هۆی تەقینەوەی ڕاپەڕینەکە. ئەمەش کاتێك کاربەدەستان ڕازی نەبوون ئازادیان بکەن. ئەوەبوو شەڕ لەنێوان ڕاپەڕیوان و هێزەکانی حوکمەت ڕووی داو کوردەکان چەند سەرکەوتنێکیان بەدەست هێناو هێرشیان کردە سەر بەتلیس [٢٠٩] و لە ٣ی نیساندا چوونە ناو شاری بەتلیس [٢١٠]، بەڵام بەهۆی بێسەروبەری چالاکی ڕاپەڕیوەکان و نەبوونی ڕێکخستن لە ڕیزەکانیان، خراپی جۆری چەك و تفاقی سەربازییان، لەگەڵ هێنانی هێزی زۆر لەلایەن حوکمەت بۆ ناو شارەکە کەوا لە شارەکانی وان و مووش و ئەرجیش و شوێنی تردا کۆکرابوونەوە و، هەڵوێستی خراپی هەندێ لە دەستڕۆیشتوانی کورد کاتێك چوونە پاڵ هێزەکانی حوکمەت، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی شکانی ڕاپەڕیوەکان و پاشەکشێیان لە بەتلیسدا.

دوای دامرکانەوەی ڕاپەڕینەکە هەریەك لە سەید عەلی و شێخ شەهابەددین و چەندانی تر دوای دەستگیرکردنیان لە سێدارە دران. ناوچەکەش دووچاری وێرانکاری و شاڵاوی توندوتیژی زۆری تاڵان و، خەڵکەکەش دووچاری پرۆسەی گرتن و کوشتنی زۆر بوونەوە [٢١١]. مەلا سەلیمیش سەرەتا پەنای بردبووە بەر کونسوڵخانەی بەریتانیا لە بەتلیس، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون پەنای بدەن و بیپارێزن. پاشان ڕووی کردە کونسوڵخانەی ڕووسی و لەگەڵ ژمارەیەك لە یاوەرانی

پەنا دران و[٢١٢] تاکو هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان ڕووسیاو دەوڵەتی عوسمانی لەوێ مانەوە. ئەوەبوو سەربازانی تورك هێرشیان کردە سەر کونسوڵخانەکەو گرتیان و مەلا سەلیم و یاوەرەکانیشی دەستگیر کران و لە سێدارە دران[٢١٣].

بەم شێوەیە و لە ئەنجامی نەبوونی هەماهەنگی و ڕێکخستن و، گرفتی ڕاپەڕیوەکان لە ڕووی کەمی و خراپی جۆری چەك و زەخیرەی پێویست و هاتنی هێزی زۆری حوکمەت بۆ سەر شارەکەو خراپی هەڵوێستی هەندێ لە سەرۆکەکانی کوردو، دەستپێکردنی ڕاپەڕینەکە بەر لە وادەی خۆی بەمانگێك[٢١٤]، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینەکەی بەتلیس.

**ح ـ کوردستانی عوسمانی لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا:**

لە ئابی ساڵی ١٩١٤ دا شەڕی یەکەمی جیهانی لە نێوان وڵاتانی بەرەی هاوپەیمانان و بەرەی ناوەڕاست هەڵگیرسا[٢١٥]. لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵیشدا دەوڵەتی عوسمانی لە پاڵ وڵاتانی ناوەڕاست چووە ناو شەڕەکەوە[٢١٦]. لەبەر ئەوەی بەشێکی گەورەی خاکی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دابوو، بۆیە خاکی کوردستان بووە گۆڕەپانێکی یەکلاییکردنەوەی ململانێی نێوان هێزە شەڕکەرەکانی (عوسمانی و ئەڵمانیا) لە لایەك و(بەریتانیا و روسیا) لەلایەکی ترەوە. بەمەش گەلی کورد بەبێ ئەوەی ئارەزوو بەرژەوەندی لە شەڕدا هەبێ، لە شەڕەکە تێوەگلا[٢١٧]. ڕاگەیاندنی بانگی جیهاد لە دژی کافران لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، ڕۆڵی خۆی هەبوو لە ڕاکێشانی سۆزی کوردان بۆ لای ئەم دەوڵەتە، هەر لەم ڕووەشەوە بانگەشەکانی عوسمانی– ئەڵمانی کاریگەری خۆی هەبوو[٢١٨]. ئەوە بوو کوردەکان لە پاڵ دەوڵەتی عوسمانیدا لە بەرەکانی موسڵ، مەعمورییەی عەزیز، سیواس و ئەرزەڕۆمدا شەڕیان کرد[٢١٩]. ئەمە سەرەڕای خراپیی جۆری چەك و کەمی زەخیرە و خۆراك، کەچی ڕۆڵی خۆیان بینیبوو[٢٢٠]. شێخ مەحمودی حەفید لەگەڵ چەند سەرۆکێکی تری کوردی ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر وەکو سەید محمد جەباری و سەید ئەحمەدی خانەقا و هی تر لە شەڕی"شوعەیبە" دا لەپاڵ لەشکری عوسمانی ڕووبەڕووی هێزەکانی بەریتانیا بۆوە[٢٢١]. هەروەکو لە ناوچەی بانەو مەریوانیشدا ڕووبەڕووی لەشکری ڕووس

وەستابوو و سەرکەوتنی بەسەریاندا بەدەست هێنابوو. بەڵام بە هۆی شکستی هێزەکانی لەلایەك و، ڕەفتاری خراپی تورکەکان لەبەرانبەر کورد، بە تایبەت کەوا لەو ماوەیەدا حەفت سەرۆك خێڵی کوردیان بە بیانووی کەمتەرخەمی لە شەڕ کوشتبوو، بڕیاری دا لە مەیدانی شەڕ بکشێتەوە [٢٢٢].

ڕووسەکانیش لە هەوڵی ئەوەدا بوون کوردەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. هەر لە ٣٠ی ئابی ١٩١٤دا (سازا نۆڤ) ی وەزیری دەرەوە نامەیەکی بۆ (گۆرمیکین)ی نوێنەری وەزارەتی کاروباری دەرەوە ناردووە کە تیایدا هاتووە: **"ئەبێ وەکو چۆن لەگەڵ ئەرمەنەکاندا وەهاش لەگەڵ کوردەکاندا پەیوەندییەکی قایم پەیدا بکرێت..."** هەروەها داوای پێکهێنانی سوپای میللی لە کورد و ئاسوورییەکان کردووە [٢٢٣]. ئەوە بوو دوای سەرکەوتنەکانی ڕووسی لەبەرەی قەوقاز لە هاوینی ساڵی١٩١٤دا چەند بەگێکی کورد چوونە پاڵیان [٢٢٤]. هەروەها دەرسیمییەکان و شێخ مەحمود و مەحمود پاشای جاف لەو کەسایەتییانە بوون کەوا ڕووسیا ئومێدی پێیان هەبوو[٢٢٥]. بۆ ئەو مەبەستەش سێ جار لە ڕێگەی ژەنەڕال (براتۆڤ) ی فەرماندەی سەربازییانەوە نامەیان بۆ شێخ مەحمود ناردبوو. داوایان لێ کردبوو هاوکارییان بکات، بەڵام وەکو لە وەڵامەکانی شێخدا دەردەکەوێ، خراپی مامەڵە و هەڵسوکەوتی ڕووسەکان لەبەرانبەر کورددا نەبووە هۆی دروستبوونی پەیوەندی و هاوکاری لە نێوانیاندا [٢٢٦].

شایانی باسیشە کەوا، سەرکردەکانی کورد، ئەوانەی ئەو کاتە دژی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بوون و بەرهەڵستیان دەکرد، پەیوەندییان بەڕووسەکانەوە کردووە. ئەمەش بەمەبەستی هاوکاری کردنی یەکتر لەبەرانبەر داننان بە مافە نەتەوەیییەکانی کورددا. عەبدولڕەزاق بەدرخان [٢٢٧]، سەید عەبدولقادر[٢٢٨] و کامیل بەدرخان [٢٢٩]، لەو کەسایەتییانە بوون کەوا پەیوەندییان بەڕووسەکانەوە کردبوو. بەڵام هیچیان دەردەست نەبوو.

سەبارەت بە بەریتانییەکانیش، دیارە ئەوانیش دوای گەیشتنیان بە بەغدا لە ئاداری ١٩١٧، هەوڵیان داوە لە ڕێگەی (مێجەر سۆن)[٢٣٠]ەوە خۆیان لە کوردەکان نزیك بکەنەوە و سوپای بەکرێگراویان لێ پێکەوەبنێن[٢٣١]. کاتێکیش گەیشتنە کەرکوك و دەوروبەری، شێخ لە ڕێگەی باوەڕپێکراوێکی خۆیەوە نامەیەکی بۆ

ناردن تاکو بیگەیەننە حاکمی گشتیی عێراق (وێلسن)، کە تیایدا داوای لێ کردبوون تـا لەسـەر بنـەمای بەیاننامـەکانی سـەرۆك کۆمـاری ئەمـەریکا (ویـدرۆ ویڵـسن)و (وینیستون چێرچل)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا دان بە مافەکانی کورد دابنـێن و لـە پێنـاو بـەدیهێنانی  سـەربەخۆیی کـوردا یارمـەتییان بـدەن [٢٣٢]. لەوانەیـە بەریتانییەکانیش هەر ئەمەیان مەبەست بووبێ، بە تایبەتی هەر وەکـو ئیدمۆنـدس باسی دەکات، کەوا سیاسەتی ئەوان بریتی بـوو لـەوەی چـەند پارێزگایـەکی نیـوە خودموختاریی کوردیی دابمەزرێ و بە سیاسەتی خۆیەوە بیانبەستێتەوە، بەمـەش خۆی لە شەڕ و پێکدادانەکانی ناوچە شاخاوییەکان دەپاراست [٢٣٣].

هاتنەوەی عوسمانییەکان بـۆ ناوچـەکەو کـشانەوەی هێزەکـانی بـەریتانیا لـە ناوچەکە بۆ ماوەیەکی کاتیی، پێوەندییەکانی کورد و بەریتانییەکانی بـۆ ماوەیـەك دواخست، چونکە شـێخ مـەحمود لـە لایـەن عوسمانییەکانـەوە دەسـتگیر کـرا. لـە کەرکوك حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، بەڵام بە هۆی ئەوەی شـێخ مـەحمود خـاوەنی پێگەیـەکی گـەورە و بـە هێـز بـوو لـە نـاو خەڵکـدا ، مەترسیـشیان لـە هاتنەوەی بەریتانییەکان بۆ ناوچەکە هەبوو ، هەروەها ویستیان دەسەڵاتی خۆیان لـە نـاو کـوردان پتـەو بکـەن، بۆیـە نـەك هـەر لـە سـێدارەیان نـەدا، بـەڵکو روتبەی **"مارشال"** یان پێ بەخشی و دانیـان نـا بەدەسـەڵاتی لەسـەر ناوچـەکەیدا. کەچی دووبارە هاتنەوەی هێزەکانی بەرتیانیا بۆ ناوچەکە، جـارێکی تـر دەرفـەتی لێکنزیکبوونـەوەی نێـوان کـورد و بەریتانییـەکانی هێنایـە پێـشەوە. ئـەوە بـوو ڕێککەوتنێك لە نێوان هەر دوولا بەئەنجام گەیشت. ئـەویش بریتـی بـوو لـەوەی لـە تشرینی دووەمی سـاڵی ١٩١٨ دا شـێخ مـەحمود وەکـو **"حوکمـدار"**ی کوردسـتان ناسرا [٢٣٤].

شایانی باسە کەوا لە مـاوەی شـەڕدا کوردسـتان دووچـاری زەرەر و زیـانێکی مـاددی و مرۆیـی زۆر بـۆوە. کـەوا هەنـدێك لـەو زیانانـە لەلایـەن ڕووسـی و ئەرمەنەکانـەوە بـەر کوردسـتان کـەوت و هەنـدێکی تریـشی لەلایـەن لەشـکری عوسمانی ئەنجام دەدرا [٢٣٥]. سەربازەکانی ڕووسی و ئەو ئەرمەنـە خۆبەخـشانەی لە پێشەوەی لەشکری ڕووسیدا بوون چەندین کاری کاولکاریی و کوشتاریی زۆریان دەرهەق بە ماڵ و گیانی خەڵکی کوردسـتان، بەتایبـەتی لـە ڕەوانـدز و خانـەقین ،

ئـەنجام دابـوو[٢٣٦]. تەنانـەت ئـەڵمان و بەریتانییـەکانیش لـەم ڕووەوە درێغییـان نـەکردبوو. بـە تایبـەتی لـە ڕووی بـەزۆر زەوتکردنـی زەخـیرە و ڕەشـەوڵاخ و... هتد[٢٣٧].

ژیانی ئابووری لـە کوردسـتاندا دووچـاری داتـەپین ببـۆوە. ئەمـەش بـە هـۆی کەمبوونەوەی هێزەکانی کار ، دەستگرتنی لەشکری عوسمانی بەسەر ئاژەڵەکان ، کۆچـکردنی جووتیـاران لـە گوندەکانـەوە بـۆ شـارەکان و دەسـتگرتنی سـەربازان بەسەر بەروبووم یان بەزۆر پێفرۆشتنیان و هی ترەوە بوو[٢٣٨].

سیاسەتی بـەزۆر کۆچـپێکردنی کـوردان لەسـەر خـاکی خۆیانـەوە بـۆ ناوچـە دوورەکانی ئەنەدۆڵ، لایـەنێکی تـری ئـەو نەهامەتییانـە بـوو کـەوا ئیتیحادییـەکان لەماوەی ساڵەکانی شەڕدا لەهەمبەر کورددا بە ئەنجامیان گەیاند. کەوا زۆریـان بـە دەم ڕێگاوە دەمردن، یانیش بە دەستی جەندرمەکانەوە دەکوژران. دیارە ئەمەش بە پێی چەند بڕیارێکی فـەرمی حوکمـەت بـووە کـەوا لـەنێوان سـاڵەکانی ١٩١٥ – ١٩١٦ دەرچـووبوو[٢٣٩]. ئــەوەبوو خــەڵکی بەرەگــەز تورکیــان لــە شــوێنیان دادەمەزراندن، ئەمەش بۆ لێدانی پرسی نەتەوەیی کورد بوو[٢٤٠].

ئـەوە مـاوە بڵـێین کـەوا لـە مـاوەی جەنگـدا گـەورەترین پـیلان لـە لایـەن زلهێزەکانـەوە بـۆ دابەشـکردنی خـاکی دەوڵـەتی عوسمـانی، بەکوردستانیـشەوە، نەخشەی بۆ کێشرا. ئەویش بریتی بوو لە واژۆکردنـی ڕێککەوتننامـەی سـایکس – بیکـۆ لــە نێــوان (بــەریتانیا – فەرەنــسا– ڕووســیا)دا. ئــەو ڕێککەوتننامەیــە نموونەیەکی ستەمکارانەی دیپلۆماسیەتی نهێنی نێوان ئەو وڵاتانـە بـوو[٢٤١]، کـەوا لەپێناو پەیداکردن و پتەوکردنی شوێن پێ و دەسـەڵاتی خۆیـان لـە ناوچـەکەدا و، پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانیان پیلانیان بۆ دارشتبوو . بەڵام بەهۆی چوونە دەرەوەی ڕووسـیا لـە شـەڕ و پێـشهاتە سیاسـی و سـەربازییەکانی دوای ئـەوە، ڕووداوەکان بەئاراستەیەکی تر، کەچی هەر لە دژی بەرژەوەندی کـورد دا، بـەڕێوە چوو.

# بەشی یەکەم
# لایەنی تیۆری

## بەندی یەکەم / دەستنیشانکردنی چەمکەکان:

لە چوارچێوەی توێژینەوەکەماندا هەندێ چەمك و زاراوەی پێویست و تایبەتمەند بەبابەتی توێژینەوەکەمان دەخەینە روو بۆ بەر چاو روونی و دیاریکردنی مەبەستی ورد لەم چەمکانە کە گرنگترینیان:

**توێژەر** / ئەو کەسەیە کە هەڵدەستێ بە چالاکی (میتۆدی و داهێنانی) ئەویش مەبەستی وەدەستهێنانی زانیاری تایبەت بە مرۆڤ و کەلتوورو کۆمەڵگا..... یاخود ئەم چالاکییە میتۆدی و داهێنانەیە بۆ جەختکردنەوە لەسەر دیاردەی سروشتی و بەشداریکردن لە جێبەجێکردنی زانستی بۆ ئەم زانیارییانە بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی کە رووبەڕووی کۆمەڵگا دەبێتەوە[٢].

کەواتە توێژەر / ئەو کەسانەن کە هەڵدەستن بە لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان لەسەر هەمان بابەت و لایەنە پەیوەندیدارەکانی بابەتی توێژینەوە.

**توێژینەوە**/ بریتییە لە دیراسەی زانستیی رێکوپێك بۆ دیاردەیەکی دیاریکراو بە بەکارهێنانی رێبازی زانستی، بۆ گەیشتن بە راستی و دەرخستنی زانیاری دروست و راستی [٣] .

هەروەها بریتییە لە بەدواداچوونی بابەتەکان و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەریان بۆ گەیشتن بە مەرام و ئامانجی دیاریکراو.[٤]

بەهەمان شێوەش لەرووی زمانەوانییەوە توێژینەوە بریتییە لە پشکنین و دەرخستن و بەدواداچوون.[٥] هەروەها پشت بەستنە بەڕای ژمارەیەك لە تاکەکان بۆ بەگشتی کردنی راکانیان [٦]، هەروەها توێژینەوە بریتییە لە دیارخستنی مەعریفەو بەهەمان شێوەش مەعریفەش لە رێگەیەوە دروست دەبێت [٧].

کەواتە توێژینــەوە / دیراســەکردنی بابەتــەکان و کۆکردنــەوە و شــیکردنەوەی زانیارییەکانە کە لەو توێژینەوەیە بەدەست دەهێندرێن.

**توێژەری کۆمەڵایەتی /**

توێژەری کۆمەڵایەتی هەڵدەستێ بە توێژینەوەی بونیادی کۆمــەڵگا و سـۆنگە کۆمەڵایەتییــەکان و توێژینـــەوەی هۆکارەکـــانی گرفــت و کێــشەی کۆمەڵایـــەتی لەمیانــەی ئامــادەکردنی توێژینــەوەو پلانــی سۆسیۆسیاســی لەتــەك شــیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی دیاردەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان.[8]

هەروەها توێژەرانی کۆمەڵایەتی ئەم توێژەرانەن کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی توێژینــەوەی کۆمەڵایــەتی لــە بــوارە دیاریکراوەکــان کــە کاریــان تیــادا دەکــەن بــە پشتبەستن بە رێبازەکانی زانستی کۆمەڵایەتی و گرنگیدان بــە بــواری مەیـدانی بــە رەچاوکردنی شوێن و کات. [9]

بەهەمان شێوەش کاردەکــەن بــۆ دیراســەکردنی بنــەما و سروشــت و پانتــایی هۆکارەکانی گرفت لــە رێگــەی چاوپێکەوتنی تــاك و خێزانــەکان و بەرەچــاوکردنی هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان. [10]

توێــژەری کۆمەڵایــەتی ئــەو کەســەیە کــە هەڵدەســتێ بــە ئاراســتەکردنی گرووپەکان بۆ وەدەستخستنی گەشەیەکی دروست، کە وایــان لــێ بکــات بگــونجێن لەگەڵ ژینگەو تواناکانیان لەمیانەی قۆناغەکانی گۆڕان کە رووبەڕووی دەبنەوە[11].

بەهــەمان شــێوەش توێــژەری کۆمەڵایــەتی ئــەم کەســەیە کــە پەیوەســتە بــە فەلسەفەی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و هەموو بنەماکانی کە بە سەرکردەی پیشەیی دادەنرێت لە پرۆسەی کۆمەڵایەتی کە پێی هەڵدەستێ [12].

توێژەری کۆمەڵایــەتی: دەرچــووی بەشــی کومەڵناســی کۆلیــژی ئــەدەبیاتن و بەشەکانی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتین و خاوەنی بەکەلۆریۆســن لــەم بــوارەدا، کــار دەکەن لــە دەزگــا حکــومی و ناحکومییــەکان و لــە دەزگــا خێرخــوازی و چــاودێری کۆمەڵایــەتی.....هتــد، ئــەرکیان دیارخــستنی پەیوەندییــە لــەنێوان تاکــەکان و دەزگاکـــان و روونکردنـــەوەی پەیوەندییـــەکان بـــۆ خزمـــەتکردن و دابینکردنـــی

پێداویستییەکان و دەستنیشانکردنی پلانێکی گونجاو بۆ ڕێکردنی کارەکان بەشێوەی دروست.

- **توێژەری دەروونی :**

توێژەری دەروونی ئەو کەسەیە کە کار دەکات لە بوارەکانی کاری فەرمی، لە فەرمانگەکان و قوتابخانەکان ونەخۆشخانە گشتی و دەروونییەکان کە کاری سەرەکییان بریتییە لە پسپۆری لە بواری پێوانەی دەروونی و دیاریکردنی زیرەکی و چارەسەری دەروونی و تەواوکەری کاری تیپە پزیشکییەکان [١٣].

هەروەها دەکرێت پێناسەی بکەین بەوەی کە ئەو کەسەیە هەڵدەستێ بە کاری تاقیکردنەوەی ئاستی زیرەکی و پێوانەی کەسایەتی، لەتەك ئەنجامدانی دانیشتنی چارەسەری وەك چارەسەری رەفتاری و مەعریفی و خێزانی، بەهەمان شێوەش کارکردن لەسەر چارەسەری سەریری کە لە نەخۆشخانەکان راهێنانی لەسەر دەکەن دوور لە پێدانی چارەسەری دەرمان، رۆڵی تیپی تەندروستی تەواو نابێت بەبێ ئەندامبوونی توێژەری دەروونی لەو تیپانە [١٤].

کەواتە ئەرکی سەرەکی توێژەری دەروونی بریتییە لە هەڵسەنگاندنی توانای ئەقڵی و ڕێکردنی کەسایەتی بەشێوازەکانی چارەسەری دەروونی، کە رۆڵی هەیە لە ڕێنمایی پیشەیی لە ڕێگاکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی بەمانا ئەم بوارانەی کە تاکەکان کاری تیادا دەکەن [١٥].

توێژەری دەروونی: دەرچووی بەشی دەروونناسی کۆلیژی پەروەردەن و خاوەن بەکەلۆریۆسن لە بواری دەروونناسی، لە دەزگا حکومییەکان و ناحوکومییەکان کار دەکەن لە بوارەکانی دەروونی و چارەسەری دەروونی لە تەك پێوانەی دەروونی و دیاریکردنی ئاستی زیرەکی و بابەتەکانی تری دەروونی.

- **چاودێری کۆمەڵایەتی /**

چەمکی چاودێری کۆمەڵایەتی ئەو چەمکە بەرفراوانەیە کە زۆرێك لە بوارەکانی خزمەتگوزاری دەگرێتە خۆ  کە ئەو خزمەتانەش لە کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی تر جیاوازن بەهەمان شێوەش لە ئاستەکاندا جیاوازن [١٦].

هەروەها چاودێری کۆمەڵایەتی بریتییە لە یارمەتی مرۆڤ بۆ هاوڕەگەزەکەی لە کاتی تەنگانەو پێویستی کە بەدەرن لە توانای ئەم کەسانە وەك چاودێری بەساڵاچووان و یەتیم و بێ سەرپەرشت و بێوەژن. [١٧]

بەهەمان شێوەش چاودێری کۆمەڵایەتی بریتییە لە رێکخستن بەمەبەستی هاوکاریکردنی مرۆڤەکان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی پێداویستییە قووتی و کۆمەڵایەتییەکان لە میانەی پێشکەشکردنی چاودێری لە رێگەی دەزگا حکومییەکان یا ناحکومییەکان، کە لە رێگەیانەوە هەوڵ دەدرێت بۆ کەمکردنەوەی رێژەی هەژاری و ئازاری خەڵکی خاوەن پێداویستی و بێ توانا بۆ تێرکردن و دابینکردنی پێداویستە سەرەکییەکانیان. [١٨]

چاودێری کۆمەڵایەتی کۆدەکرێتەوە لە مانای چاودێری بەچاکە و پارێزگاریکردن لە ماف و چاودێریکردنی مافەکان [١٩].

هەروەها چاودێری کۆمەڵایەتی بریتییە لە ئەرکی رێکخستنی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگا، کە مەبەست لە ئەرك دابینکردنی خزمەتگوزارییە بەشێوەی راستەوخۆ وەك خزمەتگوزاری فێرکردن و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و نیشتەجێکردن.. [٢٠].

دەکرێ چاودێری کۆمەڵایەتی بەوە دیاری بکەین کە هەموو ئەو چالاکییە حکومییانەن لە پێناو بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا یا ئەو چالاکییانەن کە حکومین یا دەزگاکانی حکومی ئەنجامی دەدەن بۆ گەشەکردنی توانای تاکەکان [٢١].

چاودێری کۆمەڵایەتی/ هەموو ئەو توانا تایبەتانەی حکومین کە دەخرێنە گەڕ بۆ خزمەتی کۆمەڵگا بۆ دابینکردنی پێداویستەکان، و فەراهەمکردنی خۆشگوزەرانی بۆ تاکەکان بەتایبەت خاوەن پێداویستە تایبەتەکان و منداڵانی بێ دایك و باوك و بێ سەرپەرشت و یارمەتی خێزانە هەژارەکان و بەساڵاچووان.

**توێژینەوەی کۆمەڵایەتی**/ بریتییە لە دیراسەی زانستیی رێکوپێك بۆ دیاردەو گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، توێژینەوەی کۆمەڵایەتیش پشت دەبەستێت بە کۆمەڵێ بنەمای زانستی وەك:

– دیاریکردنی ئامانجەکانی توێژینەوەو گرنگی توێژینەوەکە.

- دارشتنی گریمانە.
- ئامادەکردنی چوارچێوەی تیۆری توێژینەوە.
- رێکخستنی میتۆدەکانی توێژینەوە.
- دیاریکردنی  قەوارەو جۆری نموونەکان.
- دەستنیشانکردنی ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان.
- دیاریکردنی شێوازەکانی ئاماری بەکارهاتوو لە توێژینەوە.
- شیکردنەوەو روونکردنەوەی ئەنجامەکان.
- نووسینی راپۆرتی کۆتایی توێژینەوە[٢٢].

هەروەها توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بریتییە لە بەکارهێنانی شێوازی زانستی بۆ دیراسەکردنی کۆمەڵگا لە دیاردەو گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، کە پەیوەستە بە دەرخستنی راستییەکان لە کۆمەڵگا و چاککردنەوەی بۆچوونە هەڵەکان [٢٣].

کەواتە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی / ئەو توێژینەوەیە کە هەڵدەستێ بە دیراسەتکردنی بابەتە کۆمەلایەتیەکان وەك (دیاردەی کۆمەڵایەتی و گرفت و پەیوەندی و گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان) بە کۆکردنەوە وشیکردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە هەن یان وەدەست هاتوون لە میانی توێژینەوەکە.

**بەندی دووەم/ سروشتی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی**

ئەم بەندە دەکرێت بکەین بە سێ تەوەری سەرەکی کە ئەم تەوەرانەی خوارەوە دەگرێتە خۆ:

**تەوەری یەکەم/ سروشتی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی /**

هەرچەندە پانتایی فراوان بێت لە نێوان مرۆڤەکان و بەها کۆمەڵایەتییەکان کە پەیوەندی نێوان تاکەکان لە رێگەیەوە دیاری دەکرێت لە نێو کۆمەڵگادا، هێندە پانتایی گومان و لادان و دژییەکی بەرەو زێدەگی دەڕوات، ئەمەش وادەکات کە توێژەری کۆمەڵایەتی کاربکات بۆ کارابوونی رۆڵی لە نێو کۆمەڵگادا [٢٤].

بۆیە دەکرێت سروشتی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە فەرمانگەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی لەم چەند خاڵەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

ئەنجامدانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بەهەردوو لایەنی تیۆری و مەیدانی.
دیاریکردن و چاککردنی شێوازی کارکردن بەمەبەستی پەرەپێدانی شێوازی کارکردن لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان.
وەدەستخستنی زانیاری پوخت و دروست و شیکردنەوەی زانیارییەکان لە بواری کۆمەڵایەتی.
سازکردنی کۆڕو سیمیناری تایبەت بە لایەنی کۆمەڵایەتی و ڕێنمایی و هۆشیاری کۆمەڵایەتی. [٢٥]

**تەوەری دووەم / ئەرکەکانی توێژەری کۆمەڵایەتی :**

دەکرێت ئەرکەکانی توێژەری کۆمەڵایەتی لەم چەند خاڵەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

بەشداریکردن لە دانانی بەرنامەو پلانی کۆمەڵایەتی و سەرپەرشتیکردن لە جێبەجێکردنی بەرنامەو پلانەکان.

بەشداریکردن لە خولی راهێنان بەمەبەستی وەدەستخستنی زانیاری پترو نوێ.

ئەنجامدانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و هاوکاریکردنی ئەو جۆرە توێژینەوانەی کە لە بابەتی کۆمەڵایەتین.

سوودوەرگرتن و کۆکردنەوەی زانیاری لەمەڕ ئەو توێژینەوە کۆمەڵایەتییانەی کە ئەنجامدراون.

سەردانی کردنی مەیدانی بەمەبەستی وەدەستخستنی زانیاری بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە.

کۆکردنەوەی ئامارو خشتەی دیاریکراو بەبابەتی کۆمەڵایەتی بۆ سوودوەرگرتن لە بواری توێژینەوەکان.

سەرپەرشتیکردن و دابینکردنی پێداویستییەکان بۆ سوودمەندانی خانەو پەیمانگا.

سەرپەرشتیکردنی وانەکان لەم کاتەی کە مامۆستاکان ئامادە نابن بۆ وتنەوەی وانەکان و سەرپەرشتیکردنی خواردنەکانیان.

بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی دایکان و باوکانی قوتابیان.

دانانی فایلی تایبەت بە هەرمندالێك یا سوودمەندێك.

ئەنجامــدانی ســەردانی مەیــدانی بــۆ لای قوتابییــەکان و خێزانــەکانیان بــۆ وەدەستخستنی زانیاری نوێ و دروست دەربارەیان.

ڕێکخستن و سەرپەرشـتیکردنی بەرنامـە تـەرفیهی و خۆشـگوزەرانییەکان بـۆ سوودمەندانی خانەو پەیمانگاکان. [٢٦]

هــەروەها دەوڵــەت دەبێــت دەستپێــشخەر و پاڵپــشت بێــت لەســەر ئــەم توێژینەوانەی کە ئەنجام دەدرێت لەسـەر کـەم ئەنـدامان و کاریگـەرن لەسـەر کـەم ئەندامان و خێزانەکانیان [٢٧]، ئەو توێژینەوە کۆمەڵایەتییانەی کە سوود بە کۆمەڵگا دەگەیەنێ.

ڕەگەزی کـات لەبـەردەم توێـژەرو توێژینـەوە بـە ڕەگـەزی سـەرەکی ئـەژمار دەکرێـت بـۆ ناسـین و دیراسـەتکردنی دیـاردەو بابەتـەکان بۆئـەوەی توێـژەری کۆمەڵایەتی زیادە بپەرژێتە سەر بابەتەکان و شیکردنەوەکانیان [٢٨].

### تەوەری سێیەم / بواری کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی

توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە زۆرێـك لـە بوارەکـانی کـاری فـەرمی و نافـەرمی لـە دەزگا حکومی و ناحکومییەکان کاردەکەن بە گـوێرەی پـسپۆری و توانایـان، ئـەم دوو لایەنی خوارەوەش مەبەستمان لەم توێژینەوەیە ئاماژەی بۆ بکەین :

**دەزگـا حکومییـەکان** : توێـژەرانی کۆمەڵایـەتی کـار دەکـەن لـە زۆرێـك لـە وەزارەت و دام و دەزگا جۆراو جۆرو بەشە جیاجیاکان وەك:

وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن.

وەزارەتی مافی مرۆڤ.

وەزارەتی دادو دادگاکان.

وەزارەتی شەهید و ئەنفالەکان

وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی.

لەلایەك دەوڵەت و کۆمەڵگا (خانەکانی چاودێری) بەرپرسن لە فەراهـەمکردنی پێداویستییەکانی چاودێری کۆمەڵایەتی، لەلایەکی تر ئـەم کەسـانە کـە کاردەکـەن

لەپێکهاتە خێرخوازییەکان و دەزگاو دەستە ئەهلییەکان جێبەجێکردنی ئەم جۆرە بەرنامانەی چاودێری کە لەئەستۆیانە [٢٩].

**بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی:** لێرەدا لە دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی و بەڕێوەبەرایەتییە تایبەتییەکانی سەر بەم بەڕێوەبەرایەتییە گشتییە، لە هەریەك لە بوارە جۆراو جۆرەکانی وەك بەشی پلان و توێژینەوەو بەشی کارگێڕی و چاودێری خێزان و پاراستنی منداڵ و بنکەکان و پەیمانگای تایبەت بە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان و بەساڵاچووان و خانەکانی چاودێری کوڕان و کچانی بێ سەرپەرشت بەهەمان شێوەش لە بواری دایەنگاکان کاردەکەن.

ئەوەی کە ئاماژەی بۆ دەکرێت لە بواری چاودێری کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە چاودێری کۆمەڵایەتی بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی کەشی خێزانی بۆ ئەوکەسانەی کە لەنێو خێزان و کەشی خێزانی دوورن [٣٠].

## بەندی سێیەم/ بەشەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی

بۆ دیاریکردنی ئەو شوێنانەی کە توێژەرانی کۆمەڵایەتی کاری لێ دەکەن دیاری دەکرێت بە دیاریکردنی هەریەك لەم پێنج بەڕێوەبەرایەتییە سەرەکی و دەزگاو فەرمانگەکانیان بەم شێوەیەی خوارەوە:

دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی.

راستەوخۆ سەرپەرشتی سەنتەری (نەوا + لانەی منداڵان+ تیشك ) دەکات.

بەڕێوەبەرایەتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی.

**بەڕێوەبەرایەتی چاودێری تایبەت:**

خانەی چاودێری کوڕان.

ماڵی خەندە(خانەی چاودێری کچان)

خانەی بەساڵاچووان.

دایەنگەی ژین و دایەنگەی پەپوولە.

**بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کەم ئەندامان:**

پەیمانگای هیوای نابیستان.

پەیمانگای رووناکی نابینایان.

پەیمانگای هانا بۆ شیاندنی کەم ئەندامان.

پەیمانگای ئاوات بۆ بیرکۆڵان.

فەرمانگەی دابەشکردنی مووچەی کەم ئەندامان (نابینایان).

سەنتەری رۆشنا بۆ نابینایان.

سەنتەری هاوچەرخ بۆ نابیستان.

سەنتەری ئۆتیزم.

بەڕێوەبەرایەتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی کۆیە. (خانەی چاودێری کوڕان و کچان لەگەڵ بنکەی تەقتەق بۆ پاراستنی منداڵ).

بەڕێوەبەرایەتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی سۆران.

ا/ بنکەی چۆمان.

ب/ بنکەی مێرگەسوور.

بەشێوەیەکی گشتی چاودێری کۆمەڵایەتی راستەوخۆ گرنگی دەدات بە چاککردن و پاراستن و باشکردنی کەرەسە مرۆییەکان کە یارمەتی و بیمەی کۆمەڵایەتی و چاودێری منداڵ و دەزگاکانی چاکسازی ،...دەگرێتە خۆ [٣١].

چاودێری کۆمەڵایەتی لە هەرێمی کوردستان لە ئێستادا بریتییە لە هەموو ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتییانەی کە ئاڕاستەی بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵ و کۆمەڵگا دەکرێت کە مەرامی سەرەکیی تیایدا دابینکردنی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتییە [٣٢].

# بەشی دووەم
# لایەنی مەیدانی

## بەندی یەکەم/ ڕێگاکانی توێژینەوە

بۆ ڕێکردنی توێژینەوەکەمان بەشێوەیەکی زانستی پشتمان بەستووە بە چەندین میتۆدو ڕێگەی زانستی بۆ وەدەستخستنی زانیاری دروست لەسەر بابەتی توێژینەوەکەمان وەك:

**یەکەم/ میتۆدەکانی توێژینەوە:** لەم توێژینەوەیەدا میتۆدی (توێژنەوەی سوسەیی (دراسة استطلاعي)مان بەکار هێناوە، هەروەها سوودمان لە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی بار (دراسة الحالة) وەرگرتووە بەمەبەستی نزیکبوونەوە لە پرسپێکراوەکان و دڵنیابوون لەو زانیارییانەی کە پێمان دەبەخشن.

**دووەم / کۆمەڵگەی توێژینەوە** (بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەلأیەتی و بەڕێوەبەرایەتی و سەنتەرەکان)/ هەولێر سەر بەم بەڕێوەبەرایەتییەن.

**سێیەم / ئامرازەکانی توێژینەوە** : گرنگترین ئامرازی بەکارهاتوو لە توێژینەوەکەمان بریتین لە :

- **سەرنجدان** ( الملاحظة) : ئەم ئامرازەیان لە میانەی بینین و سەرنجدان لە رەوتی رۆژانەی کارو ئەرکی توێژەرانی کۆمەڵایەتییە لە فەرمانگەکان و چالاکییەکانیان.
- **چاوپێکەوتن:** لەمیانەی ئەم دانیشتن و دیدارانەی کە رۆژانە ئەنجامماندا وون لەگەڵ توێژەرانی کۆمەلأیەتی لە شێوەی باسکردن و گفتوگۆکردن لەسەر کارو گرفتی توێژەرانی کۆمەلأیەتی لە ئەرکی رۆژانەیاندا.

**فۆرمی راپرسی:** بریتییە لە کۆمەڵێ پرسیاری تایبەت بۆ توێژەرانی کۆمەلأیەتی لە بوارە جۆراوجۆرەکانی کاریان و ئیشکردن لەسەر ئەنجامی وەڵامەکانیان و شیکردنەوەی زانیارییەکان.

## بەندی دووەم/ بوارەكانی توێژینەوە

توێژنەوەكەمان گرنگترین ئەم بوارانەی لای خوارەوە دەگرێتەخۆ:

**یەكەم / بواری مرۆیی:**

لە بواری مرۆیی ئەم توێژەرانەی كە كاردەكەن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی كۆمەڵایەتی و فەرمانگەكانی بە نموونە وەرگیراون.

ژمارەی توێژەرانی كۆمەڵایەتی بریتین لە (٩٢) توێژەری كۆمەڵایەتی و دەروونی.

تەنها (٥٠) توێژەر وەلأمیان داینەوە بەواتا (٤٢) توێژەر وەڵامیان نەداینەوە.

رەگەز...نێر (٣٠) و مێ (٢٠).

ساڵانی خزمەت:

خزمەت زیاتر لە دوو ساڵ (٤٠)

ساڵێك خزمەتیان هەیە (٢)

دووساڵ خزمەتیان هەیە (١)

كەمتر لە ساڵێك خزمەتیان هەیە(٧)

باری كۆمەڵایەتی: خێزاندار (٣٠) و سەڵت (٢٠).

**دووەم/ بواری شوێن:**

لە بواری شوێن ئەم توێژینەوەیە لە (بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی كۆمەڵایەتی و فەرمانگەكانی / هەولێر) ئەنجامدراوە.

**سێیەم/ بواری كات :**

سەبارەت بە بابەتی كات ئەم توێژینەوە نزیكەی (١٢) مانگی خایاندووە تاوەكو تەواو بەهەردوو بەشی تیۆری و مەیدانی لە رێكەوتی ٢٠٠٩/٣/١ تاكو ٢٠١٠/٢/٢٠.

## بەندی سێیەم / خستنەڕووی زانیارییەکان

**یەکەم: زانیاری گشتی**

لەم بەشەدا هەوڵمانداوە لە ڕێگەی چەند زانیارییەك لە شێوازی ژمارە پێناسەیەکی ئەو نموونە بخەینە روو کە زانیارییان لێوەوە وەدەست هاتوون..

**١-ڕەگەز:**

**خشتەی ژمارە (١) ڕەگەزی نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیار دەکات**

| بابەت | نێر | مێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| ڕەگەز | ٣٠ | ٢٠ | ٥٠ |

لەبەر ئەوەی کە ژمارەی توێژەرانی کۆمەڵایەتی (نێرینە) زیاترن لە ژمارەی توێژەرانی کۆمەڵایەتی (مێینە) بۆیە لە توێژینەوەکەمان ژمارەی نێرینە (٣٠) و ژمارەی مێ (٢٠) توێژەری کۆمەڵایەتین.

**٢- ساڵی دەرچوون:**

**خشتەی ژمارە (٢) ساڵانی دەرچوونی نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیار دەکات**

| بابەت | پێش ٢٠٠٣ | ٢٠٠٣ | ٢٠٠٤ | ٢٠٠٥ | ٢٠٠٦ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ساڵانی دەرچوون | ٣٢ | ٦ | ٤ | ٢ | ٦ | ٥٠ |

بەگوێرەی ئەوەی کە لە خشتەکەدا دیار کەوتووە کە پەیوەندی هەیە بە ساڵانی دەرچوونی توێژەرانی کۆمەڵایەتی و دەروونی لە هەریەك لە کۆلیژەکانی ئەدەبیات بەشی کۆمەڵناسی و بەشی دەروونناسی لە کۆلیژی پەروەردە ڕێژەیەکی بەرچاو لە توێژەرانی کۆمەڵایەتی و دەروونی بەر لە ساڵی ٢٠٠٣ بڕوانامەی بەکەلۆریۆسیان بەدەست هێناوە لە زانکۆ.

**٣-ساڵی خزمەت:**

**خشتەی ژمارە (٣) ساڵانی خزمەتی نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیار دەکات**

| بابەت | کەمتر لە ساڵێك | یەك ساڵ | دوو ساڵ | زیاتر لە دوو ساڵ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ساڵانی خزمەت | ٧ | ٢ | ١ | ٤٠ | ٥٠ |

سەبارەت بەم بابەتەی کە پەیوەندی هەیە بە ساڵانی خزمەتەوە ئەوەمان بۆ روون بۆتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرانی کۆمەڵایەتی ساڵانی خزمەتیان لە دوو ساڵ زیاترە، کە ئەمەش مانای ئەوەیە کە شارەزایی باشیان هەیە لەم بوارانەی کە کاریات تیادا کردووە لەدوای دامەزراندنیان.

**٤-باری کۆمەڵایەتی:**

**خشتەی ژمارە (٤) باری کۆمەڵایەتی نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیاری دەکات**

| بابەت | سەڵت | خێزاندار | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| باری کۆمەڵایەتی | ٢٠ | ٣٠ | ٥٠ |

ئەوەی کە پەیوەست بێت بە بواری خێزانداربییەوە رێژەی (٣٠) لە نموونەکانی توێژینەوەکەمان خێزاندارن و ئەوانەی کە خێزانیان پێك نەهێناوە تەنها (٢٠) لەنموونەکانن لە کۆی تەنها (٥٠) نموونەی بەشداربوو.

**٥- زمانەوانی (یاخود شارەزایی لە زمان):**

**خشتەی ژمارە (٥) رێژەی زانینی زمانی نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیار دەکات**

| بابەت | کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی | تورکی | فارسی |
|---|---|---|---|---|---|
| زمان | ٥٠ | ٤٢ | ١٧ | ٣ | ٢ |

لەم خشتەیەدا ئەوە روون دەبێتەوە کە هەموو توێژەرانی بەشداربووی توێژینەوەکەمان زمانی کوردی دەزانن لەتەك زمانی کوردیش رێژەیەکی بەرچاو کە (٤٢) توێژەر لە کۆی (٥٠) لە توێژەران زمانی عەرەبی دەزانن ئەمەش رێژەیەکی باشە بۆ تێگەیشتن و لەیەك گەیشتن لە نێوان زمان و زانیارییەکان لەنێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبی، بەهەمان شێوەش رێژەی (١٧) لە زمانی ئینگلیزی شارەزان و هاندەری باشن بۆ سوودمەند لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان.

**دووەم: بابەتی لێکۆڵینەوە**

لەم بەشەدا ئەو زانیارییانە دەخەینە روو کە تایبەتن بە مەبەستەکانی ئەنجامـدانی ئەم توێژینەوەیە:

**٦- شوێنی کارکردن:**

**خشتەی ژمارە (٦) شوێنی کارکردنی ئێستای نموونەکانی لێکۆڵینەوە دیاری دەکات**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی | ٨ | ٨ |
| پەیمانگای هیوا | ٥ | ٥ |
| بەڕێوەبەرایەتی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی | ٥ | ٥ |
| بنکەی لانەی منداڵان | ٥ | ٥ |
| سەنتەری چارەسەری دەروونی و کۆمەڵایەتی | ٤ | ٤ |
| خانەی نەوجەوانان کچان | ٣ | ٣ |
| پەیمانگای هانا | ٣ | ٣ |
| پەیمانگای ئاوات | ٣ | ٣ |
| بنکەی نیرۆژ (تیشک) | ٣ | ٣ |
| خانەی نەوجەوانان کوڕان | ٢ | ٢ |
| سەنتەری نەوا | ٢ | ٢ |
| سەنتەری پاراستنی منداڵ | ٢ | ٢ |
| دایەنگەی ژین | ٢ | ٢ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری تایبەت | ١ | ١ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کەم ئەندامان | ١ | ١ |
| دایەنگەی پەپوولە | ١ | ١ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

لەبەرئەوەی ئەم توێژەرانەی کە کاردەکەن لە دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەڵدەستن بە ڕێکخستنی کارەکانی توێژەران و بەشی پـلان و بەشـی توێژینـەوەو رەوانەی لایەنی پەیوەندیدارو سەروو دەکرێت بۆیە ڕێژەیەکە زۆر لە نموونـەکانمان لە دیـوانی بەڕێوەبەرایـەتی گشتییە و هـەروەها لەبـەر ئـەوەی ڕێژەیـەکی زۆر لـە توێـژەران لــە دیــوانی بەڕێوەبەرایــەتی گــشتی وەڵامــی فــۆرمی تایبــەت بــە توێژینەوەکەمانیان داوەتەوە.

## ٧ –ئەم شوێنەی کە کاریان تیادا کردووە:

**خشتەی ژمارە (٧) شوێنی کارکردنی نموونەکان دیاری دەکات**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی | ١٥ | ١٥ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری تایبەت | ٨ | ٨ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کەم ئەندامان | ٢ | ٢ |
| خانەی نەوجەوانان کوڕان | ١٩ | ١٩ |
| خانەی نەوجەوانان کچان | ١٥ | ١٥ |
| بەڕێوەبەرایەتی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی | ١٣ | ١٣ |
| پەیمانگای هانا | ٨ | ٨ |
| سەنتەری نەوا | ٨ | ٨ |
| پەیمانگای هیوا | ١٥ | ١٥ |
| پەیمانگای ئاوات | ١٠ | ١٠ |
| بنکەی نیرۆژ (تیشك) | ٢ | ٢ |
| بنکەی منداڵان | ١٣ | ١٣ |
| دایەنگەی منداڵان | ١٣ | ١٣ |
| سەنتەری پاراستنی منداڵ | ١٥ | ١٥ |
| وەزارەتی کاری بەغدا | ٢ | ٢ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی بەغدا | ٢ | ٢ |
| دیوانی وەزارەتی کار | ٦ | ٦ |
| بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاکسازی | ٤ | ٤ |
| وەزارەتی رۆشنبیری | ٢ | ٢ |
| وەزارەتی ناوەخۆ | ٢ | ٢ |
| خانەی بەساڵاچووان | ٨ | ٨ |
| چاکسازی هەولێر | ٦ | ٦ |
| چاودێری خێزان | ١٥ | ١٥ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری کۆمەڵایەتی کۆیە | ٤ | ٤ |
| سەنتەری چارەسەری دەروونی | ١١ | ١١ |
| کۆی گشتی | ٢١٨ | ٢١٨ |

توێـژەرانی كۆمەڵایـەتی لـە سـەرەتاوە لـە دیـوانی بەڕێوەبەرایـەتی گـشتی دادەمـەزرێن لـەدوایی ڕەوانـەی بەڕێوەبەرایـەتی و سـەنتەرەكانی تـری سـەر بـەم بەڕێوەبەرایەتییە دەكـرێن بۆیـە زیاتریـان لـە دیـوانی بەڕێوەبەرایـەتی گـشتییەوە كاردەكەن، ئەگەر چی هەندێكیشیان ڕاستەوخۆ لە بەڕێوەبەرایەتی و سەنتەرەكان كاردەكەن و دەست بەكار دەبن، بۆیە بەگوێرەی ڕیزبەندی وەڵامەكانیان زۆرینـەی شوێنی كاركردنیان دیاری دەكەین :

١/ خانەی چاودێری كوڕان.

٢/ پاراستنی منداڵ و خانەی كچان و پڕۆژەی چاودێری خێزان.

٣/ دایەنگە و بنكەی منداڵان و بەڕێوەبەرایەتی گەشەپێدانی كۆمەڵایەتی.[٣٣]

### ٨- باشترین شوێنی كاركردن:

**خشتەی ژمارە (٨) باشترین شوێنی كاركردنی نموونەكانی لێكۆڵینەوە دیاری دەكات**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| پەیمانگای ئاوات | ٨ | ٨ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری كۆمەڵایەتی كۆیە | ٤ | ٤ |
| وەزارەتی ڕۆشنبیری | ٢ | ٢ |
| خانەی چاودێری كوڕان | ٤ | ٤ |
| خانەی چاودێری كچان | ١٠ | ١٠ |
| چاكسازی هەولێر | ٤ | ٤ |
| چاودێری خێزان | ١١ | ١١ |
| بنكەی منداڵان | ١٥ | ١٥ |
| خانەی بەساڵاچووان | ٢ | ٢ |
| دایەنگەی منداڵان | ٦ | ٦ |
| سەنتەری چارەسەری دەروونی | ١٠ | ١٠ |
| بەڕێوەبەرایەتی چاودێری تایبەت | ٢ | ٢ |
| پەیمانگای ڕووناكی | ٢ | ٢ |
| پەیمانگای هیوا | ٦ | ٦ |

| | | |
|---|---|---|
| پەیمانگای هانا | ٦ | ٦ |
| گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی | ١١ | ١١ |
| بنکەی نیرۆژ (تیشك) | ٢ | ٢ |
| هیچ کامیان باش نەبوون | ١١ | ١١ |
| کۆی گشتی | ١١٣ | ١١٣ |

بۆ روونکردنەوەی باشترین شوێنی کارکردنی توێژەران دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلینیان بکەین:

١/ پرۆژەی چاودێری خێزان لەبەرئەوی دەرماڵەی تایبەت هەبوو وەك پاداشت بەرامبەر بەکارکردنی توێژەران لە پرۆژەی چاودێری خێزان هەروەها بنکەی منداڵان چونکە لەم بنکانەدا خولی تایبەت هەبوون بۆ بەشداریکردن لەلایەن توێژەران و سوودمەندبوونیان لە رووی زانیاری و مادییەوە.

٢/ خانەی چاودێری کچان ئەمەش پەیوەستە بە کەمی دەوامکردن و کەمی ئەرکی توێژەران بە بەراورد لەگەڵ کارەکانی توێژەران وەك دیوانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی و بەڕێوەبەرایەتی و هەندێ شوێنی تر ئینجا بنکەی چارەسەری دەروونی و کۆمەڵایەتی.

٣/ پەیمانگای ئاوات بۆ پەروەردەی مێشك لەبەر ئەوەی توێژەران لە پەیمانگای ئاوات و هەموو پەیمانگاکانی تر ماوەی دەوامکردنیان دیاریکراوە ناگاتە کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ لەگەڵ هەبوونی پشووی نیوەی ساڵ و پشووی هاوین لەم پەیمانگایانەدا.

٩- بۆچی باشترین شوێن بوون؟

**خشتەی ژمارە (٩) باشترین شوێنی کارکردن دیاری دەکات**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| لەگەڵ حەزی خۆم دەگونجێ | ٢٩ | ٢٩ |
| لەگەڵ بڕوانامەم دەگونجێ | ٢١ | ٢١ |
| بێ هۆکار | ٨ | ٨ |
| وەرگرتنی زانیاری نوێ | ٦ | ٦ |
| هۆکاری مرۆیی | ٢١ | ٢١ |
| باشی ستاف | ٦ | ٦ |
| دابینکردنی پێداویستییەکانی کارکردن | ٦ | ٦ |
| بێ کێشە بۆ کارکردن | ٤ | ٤ |
| هیچ کامیان خزمەتی راستەقینە ناکەن | ٨ | ٨ |
| خزمەتکردنی سوودمەندان | ٢ | ٢ |
| کۆی گشتی | ١١١ | ١١١ |

بۆ زیاتر روونکردنەوە ئەوەی پەیوەندی هەیە بە باشی ئەم شوێنانەی کاریان تێدا کردووە، هۆکارەکانی بریتین لە:

١/ حەزی توێژەران بۆ کارکردن لەم شوێنانەو گونجانی لەگەڵ بڕوانامەکەیان.

٢/ هۆکاری مرۆیی بۆ خزمەت گەیاندن بە سوودمەندان.

٣/ وەرگرتنی زانیاری نوێ لەم شوێنانەی کاریان تێدا کردووە.

٤/ ئەگەر چی توێژەران ئاماژەیان نەکردووە بە هەندێ لایەنی پەیوەندیدار بە باشی ئەم شوێنانە لە کەمی ماوەی کارکردن و بوونی پشووەکانی نیوەی ساڵ و هاوینە، هەندێ سوودمەندبوونی تری ماددی و کەسی.

**١٠- ئەم خولانەی بینیوتە:**

**خشتەی ژمارە (١٠) ئەم خولانە دیار دەکات کە توێژەران تیایدا بەشدار بوون**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| خولی دەروونی | ٤٢ | ٤٢ |
| مافی منداڵان | ٢٧ | ٢٧ |
| مافی ئافرەتان | ٣٣ | ٣٣ |
| پلان | ٤ | ٤ |
| ڕۆشنبیری گشتی | ٦٧ | ٦٧ |
| فێربوونی زمان | ٢ | ٢ |
| هۆشیاری کۆمەڵایەتی | ٣٨ | ٣٨ |
| کۆمپیوتەر | ١٥ | ١٥ |
| هۆشیاری پەروەردەیی | ١٠ | ١٠ |
| کاری توێژەران | ١٩ | ١٩ |
| کارگێڕی | ١٠ | ١٠ |
| خولی زمانی ئاماژە | ٨ | ٨ |
| PRA ڕووپێوی خێرا | ٤ | ٤ |
| ئارت | ٦ | ٦ |
| کۆی گشتی | ٢٨٥ | ٢٨٥ |

بۆ دیاریکردنی ڕێژەی ئەم خولانەی کە توێژەران بینیویانە دەتوانین بەپێی ئاستەکانیان دەستنیشانیان بکەین بەم شێوازەی خوارەوە:

١/ خولەکانی ڕۆشنبیری (کۆمەڵایەتی).

٢/ خولەکانی دەروونی.

٣/ خولەکانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی.

هەروەها لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەمترین ڕێژەی ئەو خولانەی توێژەرەکان بینیویانە بریتین لە:

١/ خولەکانی پلان.

٢/ خولەکانی بەهێزکردنی توانای توێژەران.

٣/ خولەكانی رووپێوی خێرا (PRA).
بۆیە رەچاوكردنی ئەم ئاستە نزمە لە خولەكان كە راستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەكارو سیستەمی توێژەران گرنگە، بۆ روونكردنەوەو بەهێزكردنی توێژەران لە میانەی كارە راستەوخۆكەیان كە پەیوەستە بە تواناكانو پلان.

١١- **باشترین خولەكان:**

**خشتەی ژمارە (١١) باشترین خولەكان دیار دەكات**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژینەوەی مەیدانی | ٦ | ٦ |
| راگەیاندن | ٢ | ٢ |
| مافی منداڵان | ١١ | ١١ |
| مافی ئافرەتان | ٨ | ٨ |
| مافی بەندكراوان | ٢ | ٢ |
| پلان دانان | ٢ | ٢ |
| هۆشیاری رۆشنبیری | ١٥ | ١٥ |
| هۆشیاری كۆمەلأیەتی | ١٩ | ١٩ |
| چارەسەری دەروونی | ٢١ | ٢١ |
| كۆمپیوتەر | ٨ | ٨ |
| سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٦ | ٦ |
| بەهێزكردنی توانای توێژەران | ٢ | ٢ |
| زمانی ئاماژە | ٦ | ٦ |
| ئارت | ٦ | ٦ |
| رپێووی خێرا PRA | ٢ | ٢ |
| هیچ كامیان باش نەبوون | ٢٥ | ٢٥ |
| كۆی گشتی | ١٥٠ | ١٥٠ |

سەرەڕای ئەوەی كە ئاماژەمان كرد گرنگی خولی تایبەت بە بەهێزكردنی توانای توێژەران و بابەتەكانی پلان بۆ توێژەران بەڵام بە پلەی دیاریكراو بە خراپترین

خولەکان ئاماژەیان بۆ کراوە لەلایەن توێژەران سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەك لە نموونەکان ئاماژەیان کردووە بە خراپی ئەم خاڵانە بەبێ روونکردنەوەی هۆکاری خراپی ئەم خولانەی کە بینیویانن لە بواری تایبەت بە کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی.

١٢- **بۆچی خولەکان باش بوون:**

**خشتەی ژمارە (١٢) هۆکاری باشی خولەکان دیاری دەکات**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| وەدەستهێنانی زانیاری نوێ | ٣٥ | ٣٥ |
| بۆ بەهێزکردنی لایەنی کرداری (عملي) | ١٣ | ١٣ |
| بۆ سوودمەندبوون لە ژیانی کۆمەڵایەتی | ١٩ | ١٩ |
| کاری راستەقینەی توێژەرانی روون کردەوە | ٦ | ٦ |
| بێ هۆکار | ٢٩ | ٢٩ |
| کۆی گشتی | ١٠٢ | ١٠٢ |

سەرەڕایی ئەوەی ژمارەیەك لە توێژەران ئاماژەیان کردووە بەوەی کە خولەکان لەبەر ئەوە باش بوون زانیاری نوێیان خستە بەردەم توێژەران و کاری توێژەران، لە هەمان کاتیشدا ژمارەیەکی نزیك لە بۆچوونەکان لە توێژەران ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووەکە هۆکاری باشی خولەکان دیار نین.

١٣- **پرۆژەکان:**

**خشتەی ژمارە (١٣) بەشداربوون و بەشدارنەبوونی توێژەران دیاری دەکات لە پرۆژەکان.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نووسینی پرۆژە | ٧ | ٧ |
| بەشداربوون لە نووسینی پرۆژە | ١٧ | ١٧ |
| هیچ کامیان | ٢٦ | ٢٦ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

سەرەڕای ئەوەی ڕێژەی ٨٠٪ توێژەرانی کۆمەلأیەتی زیاتر لە دوو سالْ خزمـەتیان هەیە، کەچـی بەڕێـژەی ٥٢٪ ی توێـژەران هـیچ توێژینەوەیـەکیان ئـەنجام نـەداوە تەنانەت بەشداریش نەبوون لـە توێژینـەوە، دەکرێـت ئەمـەش ئاماژەیـەك بێـت بـۆ خراپی خولەکان کە تەنها (١٢٪) لە خولەکان تایبەت بـوون بـە کـاری توێژینـەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی توێـژەران لـە کـارکردن لەگـەلْ توێژینـەوەکانی تایبـەت بـە بواری کۆمەلأیـەتی و پەیوەندیـدار بـە کـارو ئامانجـەکانی بەڕێوەبەرایـەتی گـشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەلأیەتی.

١٤- جۆری پرۆژەکان:

**خشتەی ژمارە (١٤) جۆری پرۆژەکان دیار دەکات .**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| مافی مندالأن | ١٩ | ١٩ |
| مافی ئافرەتان | ١٠ | ١٠ |
| هۆشیاری کۆمەلأیەتی | ٢٥ | ٢٥ |
| هۆشیاری دەروونی | ٦ | ٦ |
| کردنەوەی بەشی خزمەتگوزاری لە کۆلیژی ئەدەبیات | ٢ | ٢ |
| ڕووپێو | ٦ | ٦ |
| کارگێڕی | ٢ | ٢ |
| کردنەوەی سەنتەر | ٦ | ٦ |
| هۆشیاری پەروەردەیی | ١٣ | ١٣ |
| قەرزی بچووك | ٢ | ٢ |
| زمانی ئاماژە | ٤ | ٤ |
| چاودێری خێزان | ٢ | ٢ |
| هیچ پرۆژەیەك | ٤٨ | ٤٨ |
| مافی مندالأن | ١٩ | ١٩ |
| کۆی گشتی | ١٦٤ | ١٦٤ |

بە پێی ئەم خشتەیە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە توێژەرانی کۆمەڵایەتی بەڕێژەی (٤٨) بەشدار نەبوون لە پرۆژەکان بەرامبەر بە (٩٨) بەشدار بوون لە پرۆژەکان کە دەکاتە ڕێژەی (٥٠٪) بەشدار نەبوون لەپرۆژەی کۆمەڵایەتی.

**١٥- باشترین پرۆژەکان :**

**خشتەی ژمارە (١٥) باشترین پرۆژەکان دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| مافی منداڵان | ٨ | ٨ |
| مافی ئافرەتان | ٢ | ٢ |
| هۆشیاری کۆمەڵایەتی | ١٣ | ١٣ |
| هۆشیاری دەروونی | ٢ | ٢ |
| کردنەوەی سەنتەری منداڵان | ٤ | ٤ |
| کردنەوەی سەنتەری ئافرەتان | ٢ | ٢ |
| کردنەوەی بەشی خزمەتگوزاری لە کۆلیژی ئەدەبیات | ٢ | ٢ |
| کارگێڕی | ٢ | ٢ |
| هۆشیاری پەروەردەیی | ٢ | ٢ |
| رووپێو | ٢ | ٢ |
| چاودێری خێزان | ٦ | ٦ |
| زمانی ئاماژە | ٢ | ٢ |
| هیچ کامیان باش نەبوون | ٤٢ | ٤٢ |
| کۆی گشتی | ٨٩ | ٨٩ |

بەپێی ئاماژەی توێژەرانی بەشداربوو لەم توێژینەوەیە بەڕێژەی (٤٢) لە توێژەران ئاماژەیان کردووە بە خراپی پرۆژەکان بەمەش تەنها (٨) لە بەشداربووان باس لە باشترین لە پرۆژەکان دەکەن ئەمەش لایەنی رەشبینی ئەم توێژەرانە بەرامبەر بە پرۆژەکان روون دەکاتەوە.

**١٦- باشترین پرۆژە ؟ بۆچی ؟**

**خشتەی ژمارە (١٦) هۆکاری باشی ئەم پرۆژانە دیاری دەکات .**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| جێبەجێ کران | ٤ | ٤ |
| سوودمەندبوونی منداڵان | ٦ | ٦ |
| سوودمەندبوونی کۆمەڵگا | ١٣ | ١٣ |
| سوودمەندبوونی شەخسی | ٢ | ٢ |
| بێ هۆکار | ٢١ | ٢١ |
| جێبەجێ کران | ٤ | ٤ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

لەم خشتەیەدا ئەوە بەرچاو دەکەوێت کە ناڕوونییەك هەیە لە بۆچوونی توێـژەران بەرامبەر بە باشترین پرۆژەکان بە بەراورد لەگەڵ بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی تر کـە پێیان وایە بەر لە هەموو کەسێك کۆمەڵگا لە پرۆژەکـان سـوودمەند دەبێـت ئینجـا منداڵان کـە دەکەونـە چوارچـێوەی پرۆژەکـان و سـوودمەندبوونی شەخـسیش دوا بەدوای شتەکانی ترەوە دێت.

**١٧- توێژینەوە**

**خشتەی ژمارە (١٧) ئەنجامدانی توێژینەوە دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژینەوەی کردووە | ١ | ١ |
| بەشدار بووە لە توێژینەوە | ١٩ | ١٩ |
| نە بەشداربووە و نە نووسیویەتی | ٣٠ | ٣٠ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

ئەگەر سەرنج بدەین ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرانی کۆمەڵایەتی بەشـدارنەبوون لە توێژینەوەکانی تایبـەت بـەبواری کۆمەڵایـەتی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە سـەر سـێ هۆکاری سەرەکی :

١/ هەست و توانای کەسـی توێـژەران بەرامبـەر بەئەنجامـدانی توێژینـەوە یـا بەشداریکردن لە توێژینەوە.

٢/ هاوکاری نەکردن لەلایەنی کەسانی پەیوەندیدار بە توێژینەوەو لایەنی بەرپرس لەم بوارانەدا لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە.

٣/ بەشداری نەکردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە خولی تایبەت بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی.

١٨- ئەو توێژینەوانەی کە ئەنجامدراون:

**خشتەی ژمارە (١٨) جۆری توێژینەوەکان دیاری دەکات .**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژینەوە لەسەر منداڵان | ٢٩ | ٢٩ |
| توێژینەوەی کۆمەڵایەتی | ٦ | ٦ |
| توێژینەوە لەسەر بەساڵاچووان | ٤ | ٤ |
| توێژینەوەی پەروەردەیی | ٨ | ٨ |
| توێژینەوە لەسەر مافی مرۆڤ | ٢ | ٢ |
| توێژینەوە لەسەر ئافرەتان | ٨ | ٨ |
| توێژینەوەی دەروونی | ٤ | ٤ |
| توێژینەوە لەسەر گرفتی نەوجەوانان | ٦ | ٦ |
| توێژینەوە لەسەر کەم ئەندامان | ٦ | ٦ |
| توێژینەوە لەسەر کاری توێژەران | ٢ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٧٥ | ٧٥ |

سەرەڕایی ئەوەی ژمارەی توێژەرانی بەشداربوو تەنها (٢٠) توێژەرن کەدەکاتە (٤٠٪) بەشداربوون بە توێژینەوەکان بەرامبەر بە زۆرترین بەشداری نەبوونی توێژەران لە توێژینەوەکاندا بەڵام، ئەم ژمارەیە بەشداربوو کە (٢٠) توێژەرن نزیکەی لە (٧٥) توێژینەوە بەشدار بوون کە هەر توێژەرێك نزیکەی (٤) توێژینەوەی بەر دەکەوێت.

**١٩- باشترین توێژینەوە :**

**خشتەی ژمارە (١٩) باشترین توێژینەوەکان دیار دەکات کە توێژەران ئەنجامیانداوە.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژینەوە لەسەر منداڵان | ١٩ | ١٩ |
| توێژینەوە لەسەر هۆشیاری کۆمەڵایەتی | ١٣ | ١٣ |
| توێژینەوە لەسەر هۆشیاری پەروەردەیی | ٦ | ٦ |
| توێژینەوە لەسەر رووپێو | ٢ | ٢ |
| بێ هۆکار | ١٠ | ١٠ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

وادیارە ئەو توێژینەوانەی کە ئەنجامدراون لەسەر منداڵان باشترین توێژینەوەکانن کە توێژەران تیایدا بەشدار بوون ئینجا ئەو توێژینەوانەی کە تایبەتن بە بواری هۆشیاری کۆمەڵایەتی، ئینجا بواری پەروەردەو توێژینەوە دەربارەی رووپێوی کۆمەڵایەتی.

**٢٠ – بۆچی باشترین توێژینەوە بوون ؟**

**خشتەی ژمارە (٢٠) هۆکارەکانی باشتری توێژینەوەکان دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سوودمەندبوونی منداڵان | ١٣ | ١٣ |
| وەرگرتنی زانیاری | ٨ | ٨ |
| سوودمەندبوون بەشێوەیەکی گشتی | ٦ | ٦ |
| سوودمەندبوونی ئافرەتان | ٢ | ٢ |
| دەگونجێ لەگەڵ کاری خۆم | ٢ | ٢ |
| سوودمەندبوونی شەخسی | ٢ | ٢ |
| هیچ کامیان باش نەبوون | ١٧ | ١٧ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

بەهەمان شێوەی پرۆژەکان پێویستە ئامانج روون بکرێتەوە لە توێژینەوەکان لەبەر ئەوەی ڕێژەی ٣٤٪ نازانن کە بۆچی توێژینەوەکان باشن و سوودمەند بوون

ئایا ئەم دەبێت پەیوەندی بە چ هۆکارێکەوە بێت کە ڕێژەکەی زۆر لە توێژەران ئاماژەیان کردووە کە هیچ کام لەو توێژینەوانە باش نەبوون کە ئەنجامدراون، ئایا دەبێت پەیوەندی هەبێت بە خودی توێژەران یا ئەنجامەکانی توێژینەوەکان یاخود جێبەجێ نەکردنی ئەنجامی توێژینەوەکان لەلایەن لایەنی بەرپرس بە بابەتی توێژینەوەکە.

**٢١ - سیستەمی کاری توێژەران**

**خشتەی ژمارە (٢١) سیستەمی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سیستەم هەیە | ١١ | ١١ |
| سیستەم نییە | ٣٧ | ٣٧ |
| بێ وەڵام | ٢ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە سیستەمی کاری توێژەارنی کۆمەڵایەتییەوە توێژەران بەڕێژەی (٧٤٪) ئاماژەیان کردووە بە نەبوونی سیستەمی کاری تایبەت بە کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی لەمیانەی کارەکانیاندا، بەرامبەر بە (٢٢٪) بەبوونی سیستەم و لەگەڵ وەڵام نەدانەوە بە ڕێژەی (٤٪).

**٢٢ - جۆری سیستەم (کام سیستەم)**

**خشتەی ژمارە (٢٢) جۆری سیستەمی کاری توێژەران دیاری دەکات .**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سیستەم و یاسای فەرمانگەکان | ١٠ | ١٠ |
| سیستەمی کاری بەغدا | ٢ | ٢ |
| سیستەمی چاودێری کۆمەڵایەتی عیراق | ٢ | ٢ |
| سیستەمی توێژینەوە | ٢ | ٢ |
| نازانم کام سیستەم | ٦ | ٦ |
| سیستەم و یاسای فەرمانگەکان | ١٠ | ١٠ |
| کۆی گشتی | ٣٢ | ٣٢ |

بە مەبەستی زیاتر روونکردنەوەی ئەو خاڵەی کە پەیوەندی هەیە بە سیستەمی کاری توێژەران بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە وەڵامیان بە بەڵێ بووە بە بوونی سیستەمی کاریان بریتییە لە، یاساو سیستەمی فەرمانگەکان کە بەشێوەیەکی رۆتینی رۆژانە کاری پێدەکەن، سەرەڕای ئەوە بەشێکیش لە توێژەران باس لە سیستەمەکە دەکەن نازانن چ جۆرە سیستەمێکە رۆژانە کاری پێدەکەن لە فەرمانگەکانیان.

**٢٣ - سیستەمەکە چۆنە ؟**

**خشتەی ژمارە (٢٣) هەڵسەنگاندنی سیستەمەکان دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سیستەمێکی باشە | ٦ | ٦ |
| سیستەمێکی خراپە | ١ | ١ |
| سیستەمی ناوەندە | ٤ | ٤ |
| کۆی گشتی | ١١ | ١١ |

بە گوێرەی بۆچوونی نموونەکانی توێژینەوە بەڕێژەی (١٢٪) پێیان وایە کە ئەم سیستەمەی هەیە سیستەمێکی باشە بۆ کارکردن بەرامبەر بە (٢٪) ی خراپی ئەم سیستەمەو ئاسایی بوونی بەڕێژەی (٨٪) ئەم سیستەمە.

**٢٤ - بۆچی سیستەمی کاری توێژەران نییە ؟**

**خشتەی ژمارە (٢٤) هۆکاری نەبوونی سیستەمی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژەر کاری خۆی ناکات | ٦ | ٦ |
| لە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی روون نەکراوەتەوە | ١٣ | ١٣ |
| توێژەر بە بیرو بۆچوونی خۆی کار دەکات | ٨ | ٨ |
| نەبوونی سیستەم ئاساییە | ٥٢ | ٥٢ |
| توێژەر کاری خۆی ناکات | ٦ | ٦ |
| کۆی گشتی | ٨٥ | ٨٥ |

ئەوەی پەیوەستە بەو توێژەرانەی کە وەڵامیان ئەوە بووە کە (سیستەمی کاری توێژەران نییە) بەپێی ڕێژەکانی وەڵامیان روون دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی کە شایەنی باسە ئەوەیە کە ڕێژەی ٧٤٪ لە توێژەران پێیان وایە کە سیستەمی کاری توێژەران نییە بۆ کارکردنیان کەچی لەلایەکی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە نەبوونی سیستەم بۆ کارکردنیان شتێکی ئاساییە بەڕێژەی بەرچاو لە هەمان کاتیش ئاماژە کراوە بەوەی کە لەلایەن وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی روون نەکراوەتەوە بۆ توێژەران ئەمەش ئەرکی سەرەکی وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتییە لە دیاریکردن و روونکردنەوەی سیستەمی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی.

**٢٥- چ بکرێت بۆ دانانی سیستەم :**

**خشتەی ژمارە (٢٥) هەنگاوەکانی دانانی سیستەمی کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سیستەمی پێشوو دیراسە بکرێت | ١٠ | ١٠ |
| پرس و را بە کەسی پسپۆرو شارەزا بکرێت | ٢١ | ٢١ |
| رای توێژەران وەربگیرێت | ١٩ | ١٩ |
| کۆڕو سیمینار ببەسترێت | ١٥ | ١٥ |
| ناردنی توێژەران بۆ دەرەوەی وڵات | ١١ | ١١ |
| توێژەر تەنها کاری توێژەری بکات | ١٠ | ١٠ |
| دابینکردنی پێداویستییەکانی توێژەر | ٨ | ٨ |
| دانانی لیژنەیەك بۆ دانانی سیستەم | ٢ | ٢ |
| بەستنی کۆنفرانس | ٦ | ٦ |
| کاراکردنی کۆمەڵەی کۆمەڵناسان | ٢ | ٢ |
| هیچ نەکرێت بۆ دانانی سیستەم | ٢٣ | ٢٣ |
| سیستەمی پێشوو دیراسە بکرێت | ١٠ | ١٠ |
| کۆی گشتی | ١٣٧ | ١٣٧ |

سەرەڕای ئەوەی ڕێژەی بەرچاو ئاماژەیان بەوە کردووە کە نەبوونی سیستەم ئاساییە و بەڕێژەیەکی پێیان ئاساییە کە هیچ نەکرێت بۆ دانانی سیستەمی کار بۆ

توێــژەران لــە فەرمانگــەكان و شــوێنی كاركردنیــان وەك لــە خــشتەكەدا روون كراوەتــەوە، رەنگــە لەمەشــدا بەرژەوەنــدی كەســی زیــاتر بڕیــار بــدات لەســەر دیاریكردنی سیستەم یاخود دیاری نـەكردنی سیـستەم بـۆ ئـەوەی لەهـەر بوارێـك بیانەوێت كاری خۆیان بكەن بە بێ رەچاوكردنی تواناو شـارەزاییان لـە بوارەكـانی كارو تێكەڵ نەبوون بە كارەكانی تری ئیداری.

**٢٦ – رەوتی ئیدارەو توێژەر :**

**خشتەی ژمارە (٢٦) رەوتی نێوان ئیدارەو توێژەرانی كۆمەڵایەتی لە فەرمانگەكان دیاری دەكات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| باشە | ١٩ | ١٩ |
| خراپە | ٩ | ٩ |
| ناوەندییە | ٢٢ | ٢٢ |
| كۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

ئەوەی مایەی ئاماژە پێكردنـە لـەم بارەیـەوە ئەوەیـە كـە رەوتـی نێـوان ئیـدارەو توێژەران باشەو ئاساییە و مایەی ئەوە نییە كە جێگەی سەرنج بێت.

**٢٧ – هەماهەنگی نێوان ئیدارەو توێژەران :**

**خشتەی ژمارە (٢٧) هەماهەنگی نێوان ئیدارەو توێژەرانی كۆمەڵایەتی دیاری دەكات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| باشە | ١٦ | ١٦ |
| خراپ | ٨ | ٨ |
| ناوەندییە | ٢٤ | ٢٤ |
| بێ وەڵام | ٢ | ٢ |
| كۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

بەهەمان شێوەی رەوتی نێوان ئیدارەو توێژەران هەماهەنگی تـەواو هەیـە لـەنێوان توێژەران و ئیدارەو بۆ رێککردنی کارەکان لە نێو فەرمانگەکانـدا، بۆیـە رێژەیـەکی بەرچاو ئاماژەیان کردووە بە باش و ئاسایی ئەم پەیوەندییە.

**٢٨ – بۆچی پەیوەندی و هەماهەنگی نێوان ئیدارەو توێژەران باشە ؟**

**خشتەی ژمارە (٢٨) هۆکاری باشی پەیوەندی نێوان ئیدارەو توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| هاوکارو هەماهەنگی هەیە لەنێوانیان | ٢٩ | ٢٩ |
| توێژەران بەڕێوەبەرن | ٢ | ٢ |
| بێ هۆکار | ٦ | ٦ |
| کۆی گشتی | ٣٧ | ٣٧ |

لەبەر ئەوەی پەیوەندی و هەماهەنگی پتـەو هەیـە لـە نێـوان توێـژەران و ئیـدارەو ئەمەش وای کردووە پەیوەندی نێوان پتەو بێت و کارەکانی یەکتری ئاسان بکەن.

**٢٩ – بۆچی پەیوەندی و هەماهەنگی نێوان ئیدارەو توێژەران خراپە ؟**

**خشتەی ژمارە (٢٩) هۆکاری خراپی پەیوەندی نێوان ئیدارەو توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیار دەکات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژەر حەز لە بەڕێوەبەرایەتی دەکات | ٢ | ٢ |
| توێژەر ئاژاوە دروست دەکات | ٤ | ٤ |
| جیاوازی هەیە لە نێوان توێژەران | ٤ | ٤ |
| توێژەر کەمتەرخەمە لە کارەکانی | ٢ | ٢ |
| ئیدارە بەتەواوی توێژەران ناناسێ | ٦ | ٦ |
| توێژەر بەڕێوەبەر نییە | ٤ | ٤ |
| نەبوونی سیستەمی کاری توێژەران | ٢ | ٢ |
| بێ وەڵام | ٤٠ | ٤٠ |
| کۆی گشتی | ٦٤ | ٦٤ |

سـەرەڕای ئـەوەی هۆكـاری خراپـی پەیوەنـدی نێـوان توێـژەران و ئیـدارە روون نەكراوەتـەوە بـەڵام زۆرتـرین ئامـاژە بـۆ ئەوەیـە كـە ئیـدارە بەتـەواوی توێـژەران ناناسـێ، بـەڵام ئـەوەی پەیوەنـدی راسـتەوخۆی هەیـە بـەم بابەتـەو دیـسانەوە پەیوەستە بە دیار نەبوونی سیستەمی كاری توێژەرانی كۆمەڵایەتی بۆ دیاریكردنی چوارچێوەی كاریان و تێكەڵ نەبوون بە پسپۆرییەتەكانی تر.

**٣٠ – كامە كار دەكەیت :**

**خشتەی ژمارە (٣٠) ئارەزووی كاركردنی توێژەران دیاری دەكات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| توێژەرایەتی | ٣٦ | ٣٦ |
| ئیدارە | ٤ | ٤ |
| توێژەرایەتی + ئیدارە | ١٠ | ١٠ |
| كۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

بە گوێرەی خشتەی سـەرەوە ئـەوەمان بـۆ روون دەبێتـەوە كـە توێـژەران حـەز دەكەن بە كاركردن لە بواری كاری توێژەرایەتی كۆمەڵایەتی.

**٣١– ئەگەر كاری توێژەری دەكەیت بۆچی ؟**

**خشتەی ژمارە (٣١) هۆكاری كاركردنی لە كاری توێژەرایەتی دیاری دەكات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| ئیدارە كاری توێژەری پێ ناكرێت | ٢ | ٢ |
| توێژەرایەتی كاری خۆمانە | ٣٥ | ٣٥ |
| پسپۆری و شارەزایی لە كاری توێژەران | ١٠ | ١٠ |
| كار دابەش كراوە | ٢ | ٢ |
| بێ وەڵام | ٢٥ | ٢٥ |
| كۆی گشتی | ٧٤ | ٧٤ |

ئەگەر چی زۆربەی توێژەران پێیان ئاساییە سیستەم نەبێت بۆ کاری توێژەران و بەڕێژەی (٧٢٪) حەز لە کاری توێژەرایەتی دەکەن کەواتە دەبێت چ جۆرە کارێك هەبێت بۆ توێژەران ئەگەر سیستەم نەبێت بۆ کارکردنیان و ڕێکخستنی کارەکانیان بۆ ئەوەی کە کارەکانیان تێکەڵی کاری پسپۆرییەتەکانی تر نەبێت و بەریەککەوتن لە نێوانیان دروست نەبێت چونکە ڕێژەی ٤/١ لە توێژەران بۆیان روون نییە بۆ کاری توێژەرایەتی دەکەن.

**٣٢ - ئەگەر کاری ئیدارە دەکەیت بۆ چی ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٢) هۆکاری کارکردنی لەبواری ئیدارە دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| پلەی وەزیفیم گەیشتە پلەی ئیداری | ٢ | ٢ |
| پسپۆری لەکاری ئیدارە | ٢ | ٢ |
| بێ وەڵام | ٤ | ٤ |
| کۆی گشتی | ٨ | ٨ |

لەم خشتەیەدا ئەوە روون دەبێتەوە بێ وەڵامی بەرامبەرە بەدیاریکردنی بۆچوونەکان دەربارەی گەیشتن بە پلەی وەزیفی و پسپۆڕی لەکاری ئیدارییەوە.

**٣٣ - ئەگەر کاری توێژەرایەتی و ئیدارە دەکەیت بۆ چی ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٣) هۆکاری کارکردنی لە کاری توێژەراتی و ئیدارە دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| کاری توێژەرایەتی لە روانگەی ئیدارە گرنگە | ٤ | ٤ |
| حەزم لە هەردوو کارە | ١٠ | ١٠ |
| لەبەر ئەوەی توێژەر نییە لە فەرمانگەکان | ٢ | ٢ |
| لەبەر پێداویستی ئیدارە | ٤ | ٤ |
| کۆی گشتی | ٢٠ | ٢٠ |

لەم خشتەیە ئەوە روون دەبێتەوە کە کارکردن لـە هـەردوو بـواری توێژەرایـەتی و ئیدارە، توێژەران وا لێ دەکات کە گرنگی نەدەن بـە دیـاریکردنی سیـستەم بۆیـان بەڵکو لە هەمان کاتدا توێژەران حەزی لە کامە کاریان هەبوو ئەنجامی بدەن.

**٣٤ – ئایا تەداخولات هەیە بۆ کاری توێژەران ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٤) تەداخولات بۆ کاری توێژەران دیاری دەکات .**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٢٤ | ٢٤ |
| نەخێر | ١٩ | ١٩ |
| بێ وەڵام | ٧ | ٧ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

سـەرەڕای ئـەوەی بەڕێـژەی (٨٠٪) پەیوەنـدی نێـوان توێـژەرانی کۆمەڵایـەتی و ئیدارە باش و ئاساییە کەچی بەڕێژەی (٤٨٪) لە توێژەران ئاماژەیان کـردووە کـە تەداخولات هەیە لە لایەن ئیدارەوە بۆ کاری توێژەران.

**٣٥ – کێ تەداخولی کاری توێژەران دەکات ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٥) لایەنی تەداخولکار دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بەڕێوەبەری گشتی | ٤ | ٤ |
| سەرووتر لەپلەی وەزیفی توێژەر | ٢ | ٢ |
| ئەوانەی توێژەر ناناسن | ٨ | ٨ |
| بەڕێوەبەر | ٢١ | ٢١ |
| توێژەران خۆیان | ٦ | ٦ |
| لاوازی توانای توێژەران | ٢ | ٢ |
| ئیدارییەکان لەلایەن حزبەوە دانراون | ٢ | ٢ |
| فەرمانبەران | ٢ | ٢ |
| بێ هۆکار | ٥٣ | ٥٣ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠ |

ســەرەڕای ئــەوەی کــە ڕێــژەی ٤٨٪ لــە توێــژەران ئاماژەیــان بــەوە کــردووە کــە تەداخولات هەیە بۆ کاری توێژەران، کەچی ڕێژەیەك لە وەڵامەکان ئاماژەیان بەوە کــردووە کــە توێــژەران توانــای ڕوونکردنــەوەی ئــەوەیان نییــە کــە کــێن ئەوانــەی تەداخول دەکەن بۆ کاری توێژەران ئەگەر چی ئامــاژەکردن بــە تــەداخول لەلایــەن بەڕێوەبەرەکانیان بەڕێژەیەکی زۆرە تەداخولییەکانی کاری توێژەران.

٣٦ – **پەیوەندی نێوان توێژەران چۆن دەبینی ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٦) پەیوەندی نێوان توێژەران دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| باشە | ١٦ | ١٦ |
| خراپە | ٩ | ٩ |
| ناوەندییە | ٢٥ | ٢٥ |
| کۆی گشتی | ٥٠ | ٥٠ |

ڕێژەی زۆرینە لەنموونەکان ئاماژەیان بەوە کردووە کە پەیوەندیی نێوان توێژەران باشە و ئاساییە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی خراپی پەیوەندی نێوان توێژەران.

٣٧ – **ئەگەر پەیوەندی نێوان توێژەران خراپە هۆکارەکەی چییە ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٧) هۆکاری خراپی پەیوەندی نێوان توێژەران دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| پەیوەندی نێوان توێژەران لاوازە | ٨ | ٨ |
| توێژەران لەیەك تێناگەن | ٢ | ٢ |
| هەڵوێستی جیاجیای توێژەران | ٨ | ٨ |
| نەبوونی کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ و بێ لایەن | ٦ | ٦ |
| نەبوونی هۆشیاری کۆمەڵایەتی لەنێوان توێژەران | ٢ | ٢ |
| بەرژەوەندی شەخسی | ٢ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٢٨ | ٢٨ |

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە خراپی پەیوەندی نێوان توێژەران پەیوەستە بـە لاوازی پەیوەندی نێوان توێژەران خۆیان ئەمەش لە چوارچێوەی هەڵوێستی جۆراوجـۆری

توێژەران و نەبوونی کۆمەڵەیەکی سەربەخۆو بێ لایەن بۆ کارکردن بۆ توێژەرانی کۆمەڵایەتی.

**٣٨ - چ بکرێت بۆ کۆککردنی توێژەران ؟**

**خشتەی ژمارە (٣٨) هەنگاوەکانی کۆککردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی دیاری دەکات.**

| بابەت | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سەندیکایەك هەبێت بۆ توێژەران | ١٠ | ١٠ |
| توێژەر ئازادبێت لە سەردانیکردنی فەرمانگەکان | ٢ | ٢ |
| حکومەت گرنگی بدات بە کاری توێژەران | ٢٣ | ٢٣ |
| کردنەوەی خول و وۆرك شۆپ بۆ توێژەران | ١٥ | ١٥ |
| ناردنی توێژەران بۆ دەرەوەی وڵات | ٤ | ٤ |
| گۆڕینی شوێنی کاری توێژەران بەشێوەی دەوری | ٤ | ٤ |
| تەداخولات نەکرێت لە کاری توێژەران | ٨ | ٨ |
| کردنەوەی یانەو سەنتەری تایبەت بەتوێژەران | ٢٣ | ٢٣ |
| چالاککردنی کۆمەڵەی کۆمەڵناسان | ٦ | ٦ |
| نامیلکەیەك هەبێت بۆ کاری توێژەران | ٤ | ٤ |
| بێ وەڵام | ٢٣ | ٢٣ |
| کۆی گشتی | ١٢٢ | ١٢٢ |

کەواتە باشترین کار بۆ کۆککردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە گرنگیدانی لایەنی بەرپرس (حکومی) بە توێژەرانی کۆمەڵایەتی و کردنەوەی یانەو سەنتەری تایبەت بەم توێژەوە لەتەك ئەمانەش دابینکردنی دەرماڵەی تایبەت و پاداشت لەبری ئەنجامدانی هەر توێژینەوەیەکی بەسوود لە بواری کۆمەڵایەتی یا لە بواری کاری کۆمەڵایەتی کە تایبەتن بە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی لەتەك هاندان و دەستخۆشی کردن لە توێژەران لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکانیان.

## بەندی چوارەم: بەرەنجام و پێشنیازەکان

**١/ دەرەنجامی گشتی توێژینەوە:**

لەم توێژینەوەیە دەگەینە چەند بەرەنجامێکی گشتی وەك لای خوارەوە:

١/ بۆ روونکردنەوەی باشترین شوێنی کارکردنی توێژەران دەتوانین بڵێین پرۆژەی چاودێری خێزان، لەبەرئەوەی دەرماڵەی تایبەت هەبوو وەك پاداشت بەرامبەر بەکارکردنی توێژەران لە پرۆژەی چاودێری خێزان هەروەها بنکەی منداڵان چونکە لەم بنکانەدا خولی تایبەت هەبوون بۆ بەشداریکردن لەلایەن توێژەران و سوودمەندبوونیان لە رووی زانیاری و مادییەوە.

٢/ سەرەڕای ئەوەی رێژەی ٨٠٪ توێژەرانی کۆمەڵایەتی زیاتر لە دوو ساڵ خزمەتیان هەیە، کەچی بەرێژەی ٥٢٪ ی توێژەران هیچ توێژینەوەیەکیان ئەنجام نەداوە تەنانەت بەشداریش نەبوون لە توێژینەوە، دەکرێت ئەمەش ئاماژەیەك بێت بۆ خراپی خولەکان کە تەنها (١٢٪) لە خولەکان تایبەت بوون بە کاری توێژینەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی توێژەران لە کارکردن لەگەڵ توێژینەوەکانی تایبەت بە بواری کۆمەڵایەتی و پەیوەندیدرا بە کارو ئامانجەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی.

٣/ ئەگەر سەرنج بدەین ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرانی کۆمەڵایەتی بەشدارنەبوون لە توێژینەوەکانی تایبەت بەبواری کۆمەڵایەتی ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر سێ هۆکاری سەرەکی :

١/ هەست و توانای کەسی توێژەران بەرامبەر بە ئەنجامدانی توێژینەوە یا بەشداریکردن لە توێژینەوە.

٢/ هاوکاری نەکردن لەلایەنی کەسانی پەیوەندیدار بە توێژینەوەو لایەنی بەرپرس لەم بوارانەدا لە رووی ماددی و مەعنەوییەوە.

٣/ بەشداری نەکردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی لەخولی تایبەت بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی. توێژەرانی کۆمەڵایەتی.

٤/ ئەوەی پەیوەندی هەیە بە سیستەمی کاری توێژەارنی کۆمەڵایەتییەوە توێژەران بەرێژەی (٧٤٪) ئاماژەیان کردووە بە نەبوونی سیستەمی کاری تایبەت

بە کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە میانەی کارەکانیاندا، بەرامبەر بە (٢٢٪) بەبوونی سیستەم و لەگەڵ وەڵام نەدانەوە بە ڕێژەی (٤٪).

٥/ سەرەڕای ئەوەی بەڕێژەی (٨٠٪) پەیوەندی نێوان توێژەرانی کۆمەڵایەتی و ئیدارە باش و ئاساییە کەچی بەڕێژەی (٤٨٪) لە توێژەران ئاماژەیان کردووە کە تەداخولات هەیە لە لایەن ئیدارەوە بۆ کاری توێژەران.

**ب/یەکەم/ پێشنیازەکان**

لە کۆتایی خستنەڕووی ئەم زانیارییانە کورتەی پێشنیازەکانی ئێمە بریتین لەمانەی خوارووە:

١/ پێویستە لە سەر لایەنی پەیوەندیدار لە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی سیستەمی کاری توێژەران روون بکاتەوە، بۆ توێژەران بەمەبەستی کارئاسانی و دروست ڕێکردنی کارەکانی توێژەران و فەرمانگەکان بۆ گەیاندنی خزمەتی دروست و راستەقینە بە کۆمەڵگا و سوودمەندان، کە سیستەمی کاریان لەم دوو خاڵەی خوارەوە کورت دەکرێتەوە:

ا/ توێژینەوە.

ب/ پلان.

٢/ بۆ روونکردنەوە یاخود دانانی سیستەمی تایبەت بەکاری توێژەران پێویستە:

ا/ پرس و را بە کەسانی پسپۆر بکرێت لەم بوارەدا.

ب/ رای توێژەران وەربگیرێت.

ج/ کۆڕو سیمینار ببەسترێت.

د/ ناردنی توێژەران بۆ دەرەوەی وڵات.

٣/ پێویستە لە دەستپێکی دامەزراندنی توێژەران لە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی رەچاوی حەزی کارکردنی توێژەران بکرێت، لەم شوێنانەی کاری تێدا دەکەن یاخود حەزی کارکردنیان هەیە.

٤/ پێویستە لە میانەی ئەنجامدانی خول بۆ توێژەران جەخت بکرێتەوە لەسەر:

ا/ خولی تایبەت بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی
ب/ خولەکانی پلان.
ج/ بەهێزکردنی توانای توێژەران.
٥/ پێویستە لە بابەتەکانی خول جەخت بکرێتەوە لەسەر بابەتەکانی:
ا/ دیاردەی کۆمەڵایەتی
ب/ هۆشیاری کۆمەڵایەتی.
ج/ هۆشیاری دەروونی.
د/ رووپێوی خێرا بۆ دیاردەکانی تایبەت بە بواری کۆمەڵایەتی PRA .

٦/ لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران پرۆژەیان ئەنجامداوە لە بوارەکانی تایبەت بە (هۆشیاری کۆمەڵایەتیو مافی منداڵانو هۆشیاری پەروەردەیی) دەکرێت سوود لە تواناکانیان وەربگیرێت لەم بوارانەدا، سوودوەرگرتن بەپێی توانا لەشارەزایان لە بواری کارەکانیان.

٧/ پێویستە هەماهەنگیو پەیوەندی پتەو هەبێت لە نێوان توێژەران و بەڕێوەبەری فەرمانگەکانیان بەمەبەستی زیاتر خزمەتگەیاندن بە سوودمەندانی کۆمەڵگا لە رێگەی توێژینەوەو پلانی دروست لە پێناوی کاری دروست لەتەك پتەوکردنی پەیوەندی نێوان توێژەران خۆیان.

٨/ لەسەر حکومەت و لایەنی پەیوەندیدار پێویستە کە گرنگی بدات بەتوێژەرانی کۆمەڵایەتی (دەروونی) لەمیانەی کردنەوەی کۆمەڵە سەنتەری تایبەت بەتوێژەرانی کۆمەڵایەتی (دەروونی).

**دووەم / راسپاردەکان**

١/ پتەوکردنی پەیوەندی لەنێوان توێژەران و لەیەك گەیشتن بەمەبەستی خزمەت گەیاندن بەخودی توێژەران و خزمەتکردنی ئەم توێژە لە رێگەی خۆیانەوە.

٢/ پێویستە لەسەر توێژەران لەکاتی ئەنجامدانی خول و توێژینەوە و پرۆژەکان ئامانجەکانیان لا روون بێت بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست ئامانجەکانیان بێتە دی، لەگەڵ ئەمەش راستگۆ بن لە پێدانی زانیاری دروست بەم

مەسەلانەی کە خزمەتی خودی توێژەران دەکات، خۆ دوورگرتن لە بابەتە کەسی و هەستیارەکان.

٣/ توێژەرانی کۆمەڵایەتی گرنگی بدەن بە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و بابەتە کۆمەڵایەتی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان.

٤ / کارکردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی کاری کۆمەڵایەتی و تەداخول نەکردنە سەر کاری بەدەر و کاری شارەزایانی تری بوارە جۆراوجۆرەکانی تر.

٥/ تەداخول نەکردنی توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە کارەکانی ئیدارە بەتایبەت ئەو کارانەی کە پەیوەندی نییە بە کارەکانی توێژەری کۆمەڵایەتی، کاروباری کارگێڕین.

٦/ هەوڵی توێژەرانی کۆمەڵایەتی بۆ دروستکردنی یانەو سەنتەری تایبەت بە توێژەرانی کۆمەڵایەتی، دوور لە هەڵوێستی بەرتەسکی و خۆ هەڵواسین بەهەڵوێستە جیاوازەکان کە هیچ پەیوەندییەکی نەبێت بە کاری توێژەرانی کۆمەڵایەتی و ماف و ئەرکەکانیان.

## لیستی سەرچاوەکان


١/ ابوبكر: د.سيد، دراسات في تنظيم المجتمع، المطبعة المصرية، ١٩٦٩.

٢/ احمد : د. احمد زكي، مقدمة الرعاية الاجتماعية، ط٢، مكتبة النهضة المصرية، قاهرة، ١٩٧٦.

٣/ العلوي: هادي، قاموس الانسان والمجتمع، ط١، دار الكنوز الادبية، ١٩٩٧.

٤/بدوي : د.احمد زكي، معجم المصطلحات الاجتماعية، دار الفكر العربي، قاهرة، ١٩٥٦.

٥/ب.ديكسون: د. جون، ت: شعبة الترجمة باليونسكو، العلم والمشتغلون بالبحث العلمي في المجتمع الحديث، سلسلة عالم المعرفة، مطبعة دار المعرفة، ١٩٨٧.

٦/حسن: د. محمود، مقدمة في الرعاية الاجتماعية، مطبعة الشاعر، ط٢، جزء الاول، ١٩٧٣.

٧/حسن: عبدالباسط محمد، اصول البحث الاجتماعي، ط١١، مكتبة وهبة، القاهرة، ١٩٩٠.

٨/حسن: د. محمود، مقدمة الخدمة الاجتماعية، مكتبة المعارف الحديثة، ١٩٧٩.

٩/ علي: د. محمد خيري محمد، توطين الصناعة والرفاهية الاقتصادية والاجتماعية، دار النهضة العربية، ١٩٦٥.

١٠/عبيد: ماجد السيد، مقدمة في تاهيل المعاقين، ط١، دار صفاء للنشر، ٢٠٠٠.

١١/ غيفون: رودولف، البحث الاجتماعي المعاصرالمناهج والتطبيقات، ت: علي سالم، دار الشؤون الثقافة ط٢، ١٩٨٨.

١٢/غباري : محمد سلامة محمد، الخدمة الاجتماعية ورعاية الاسرة والطفولة والشباب، مكتبة الجامعة الحديثة، مصر، ١٩٨٩.

١٣/ شهاب: بهيجة احمد، المدخل الى الخدمة الاجتماعية، دار الكتب، جامعة الموصل، ١٩٨٢.

١٤/ يونس: فاروق الزكي، الخدمة الاجتماعية والتغير الاجتماعي، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٠.

١٥/ قانون الرعاية الاجتماعية، رقم ٧٦، لسنة ١٩٨٣.

١٦/ دار كتابة البحوث والتقارير، مطبعة دار الحرية، بغداد، ١٩٨٨.

١٧/دليل وصف الوظائف، وزارة العمل والشؤن الاجتماعية، شباط، ١٩٨٢.

١٨/ ڕێسا بنچینەییەکانی ڕەخساندنی هەلی یەکسانی بۆ کەم ئەندامان، ڕێکخراوی کوردستان بۆ ڕاهێنانی کەم ئەندامان، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

**سەرچاوەکانی لە ئەنتەر نێت**


١/ عالم الحواء: مناهج البحث العلمي، تعريف البحث، ٢٠٠٩/٣/١٨ www.smsa.com

2/ د.محمد هشام النعسان، معهد الامام الشيرازي الدولي للدراسات، واشنطن، ٢٠٠٩/٣/١٩ www.sironline.org

٣/ صندوق تنمية الموارد البشرية، باحث الاجتماعي، ٢٠٠٩/٣/١٦ www.arabvol.org

٤/ عالم تطوع العربي، دوى الباحث الاجتماعي، ٢٠٠٩/٣/١٦ www.arabvol.org

٥/ مجلة العلوم الاجتماعية، باحث الاجتماعي، ٢٠٠٩/٣/١٧ www.swma.com

٦/**المنتدى العربي الموحد، منتدى الصحة العامة،** ٢٠٠٩/٤/٦ www.7urab.com

٧/ منتدى الاجازات التمريضية، ٢٠٠٩/٤/٦، www.jazamarses.com

٨/ ماهر ابو المعاطي علي، مقدمة في الرعاية الاجتماعية والخدمة الاجتماعية، ط٢، دار الزهرة، ٢٠٠٨/٣/١٧ www.arabvol.org

٩/ مختار ابراهيم اعجوبة، الرعاية الاجتماعية واثرها، ط٢، دار العلوم، ١٩٩٠، ٢٠٠٩/٣/١٦ www.arabvol.org

١٠/ المصطلحات الاجتماعية، البحث الاجتماعي، ٢٠٠٩/٣/١٩ www.ejtemay.com

١١/ جريدة صباح، شذى الجنابي، طبيعة العمل الاجتماعي، ٢٠٠٩/٣/٢٦ www.sabah.com

١٢/ الباحث العلمي، ٢٠٠٩/٣/١٩ alba7es@yahoo.com

## سێیەم / فۆرمی راپرسی

**فۆرمی راپرسی بۆ توێژەران**

**لە وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەڵایەتی**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی/ هەولێر**

- **زانیاری گشتی**

١/ شوێنی کارکردن............. ٢/ رەگەز نێر......... مێ............

٣/ ساڵی دەرچوون .................. ٤/ ساڵانی خزمەت .................

٥/ باری کۆمەڵایەتی................

٦/ ئەم زمانانەی کە دەیانزانی کوردی.......... عەرەبی...............

ئینگلیزی......... زمانی تر..............

****

- **شوێنی کارکردن**

**ئەم شوێنانەی کە کاری تیادا کردووە**

١/

٢/

٣/

٤/

باشترین شوێنی کارکردنت کوێ بوو؟

١/

٢/

بۆ چی

؟.................................................................................

..............................................................

****

- **خول و پرۆژەو توێژینەوە**

خولەکان

_ ئەم خولانەی کە تیایدا بەشدار boویت کامانەن؟

/١

/٢

/٣

/٤

/٥

ـ باشترین خول کامانە بوون؟

/١

/٢

/٣

بۆچی؟.................................................................................

..........................................................................................

پرۆژەکان

– ئەم پرۆژانەی کە نووسیوتن یا بەشدار بووی لە نووسینی کامانە بوون؟

/١

/٢

/٣

/٤

– باشترین ئەم پرۆژانە کامانە بوون ؟

/١

/٢

/٣

بۆ چی؟.................................................................................

توێژینەوە

– ئەم توێژینەوانەی کە کردووتە یا بەشدار بووی کامانەن ؟

/١

/٢

/٣

/٤

– باشترین ئەم توێژینەوانە کامانە بوون؟

/١

/٢

/٣

بۆچی؟.................................................................................

****

- ## سیستەمی کاری توێژەران

_ ئایا سیستەم بۆ کاری توێژەران هەیە؟

بەڵێ................

نەخێر.............................

ئەگەر وەڵام بە بەڵێ بوو کامە

سیستەم؟..................................................................................

سیستەمەکە چۆنە؟

باشە............... خراپە........................ ناوەندە..................

ئەگەر وەڵام بە نەخێر بوو

بۆچی؟.................................................................................

پێت باشە بۆ دانانی سیستەم چ بکرێت باشە ؟

/١

/٢

/٣

/٤

****

- ## ئیدارەو توێژەر

– ڕەوتی ئیدارە بەرامبەر توێژەران چۆنە؟

باشە............. خراپە......................

ناوەندە.................

–هەماهەنگی لە نێوان ئیدارەو توێژەران چۆن دەبینی ؟

باش................. خراپ.......................... ناوەند.....................

ئەگەر وەڵام بە بەڵێ بوو بۆچی؟

/١

/٢

/٣

ئەگەر وەڵام بە نەخێر بوو بۆ چی ؟

/١

/٢

/٣

ـ ئایا کاری توێژەرایەتی دەکەی یاخود ئیداری ؟

توێژەرایەتی.......... ئیداری...........................

بۆچی ؟..................................................................

ـ پێت وایە کە تەداخولات دەکرێت بۆ کاری توێژەران؟

بەڵێ.............. نەخێر........................

ـ لای کێ و بۆ

چی؟...........................................................................

پەیوەندی نێوان توێژەران

ـ پەیوەندی نێوان توێژەران چۆن دەبینی ؟

باش............ خراپ...................... ناوەند........................

ـ ئەگەر وەڵام بە خراپ بوو بۆ چی؟

/١

/٢

/٣

بەڕای جەنابتان چ بکرێت باشە بۆ کۆککردنی توێژەران لەسەر بەرژەوەندی گشتی؟

...........................................................................................

...........................................................................................

.........................................................................................

## پەراوێزەكان:

[1] / قانون رعاية الاحداث، رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣، ص٢٢.

* لەبەرئەوەی توێژەرانی دەروونی بەناوی توێژەری كۆمەڵایەتی لە وەزارەتی كارو كاروباری كۆمەڵایەتی دادەمەزرێن بۆیە تەنها لەتوێژینەوەكەمان ئاماژە بەناوی توێژەری كۆمەڵایەتی دەكەین.

[2] / د. جون ب. ديكنسون، العلم والمشتغلون بالبحث العلمي في المجتمع الحديث، ت. شعبة الترجمة باليونسكو، سلسلة عالم المعرفة، مطبعة دارالمعرفة، ١٩٨٧ ، ص ١٦١.

[3] /عالم الحواء– مناهج البحث العلمي– تعريف البحث–wwwsmsa.com .٢٠٠٩/٣/١٨

[4] /د. محمد هشام النعسان – معهد الامام الشيرازي الدولي للدراسات– واشنطن – www.sironline.org. ٢٠٠٩/٣/١٩

[5] / عبدالباسط محمد حسن–اصول البحث الاجتماعى– ط١– مكتبة وهبة القاهرة –١٩٩٠– ص ١٢٣

[6] / رودولف غيفيون، البحث الاجتماعي المعاصر مناهج وتطبيقات، ت: د. علي سالم، دار الشؤون الثقافة، طبعة الثانية، ١٩٨٦، ص٥

[7] / دليل كتابة البحوث والتقارير، مطبعة دار الحرية، بغداد: ١٩٨٨، ص١٦

[8] / الباحث الاجتماعي– صندوق تنمية الموارد البشرية–www.arabvol.org .٢٠٠٩/٣/١٦

[9] / دور الباحث الاجتماعي– عالم تطوع العربي–www.arabvol.org١٦ /٢٠٠٩/٣/

[10] / الباحث الاجتماعي– مجلة العلوم الاجتماعية–www.swma.com ٢٠٠٩/٣/١٧

[11] /بهيجة احمد شهاب، المدخل الى الخدمة الاجتماعية، دار الكتب، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ص٣٩

[12] /د. سيد ابوبكر، دراسات في تنظيم المجتمع، المطبعة المصرية، ١٩٦٩، ص٧٠

[13] / المنتدى العربي الموحد، منتدى الصحة العامة، www.7urab.com ٢٠٠٩/٤/٦

[14] / منتدى جازان التمريضية، www.jazannarses.com،٢٠٠٩/٤/٦

[15] / ماجد السيد عبيد، مقدمة في تاهيل المعاقين، الطبعة الاولى، دار صفاء للنشر،٢٠٠٠، ص ٥٧

[16]/ بهيجە احمد شهاب،سەرچاوەی پێشوو، ص٥٨

[17] / ماهر ابو المعاطي علي – مقدمة في الرعاية الاجتماعية والخدمة الاجتماعية– ط٢– دار الزهرا–٢٠٠٥ www.ararbvol.org ٢٠٠٩/٣/١٧

[18] / مختار ابراهيم اعجوبة– الرعاية الاجتماعية واثرها– ط١– دار العلوم–١٩٩٠– www.arbvol.org٢٠٠٩/٣/١٦

[19] / هادي العلوي، قاموس الانسان والمجتمع، طبعة الاولى، دار الكنوز الادبية، ١٩٩٧، ص ٢٤١

[20] / د.محمد خيري محمد علي، توطين الصناعة والرفاهية الاقتصادية والاجتماعية، دارالنهضة العربية، ١٩٦٥، ص٨٣

[21] / محمود حسن، مقدمة الخدمة الاجتماعية، مكتبة المعارف الحديثة، ١٩٧٩،ص٣

[22] /المصطلحات الاجتماعية، البحث الاجتماعي، www.ejtemay.com ٢٠٠٩/٣/١٩

[23] / د. احمد زكي بدوي، معجم المصطلحات الاجنماعية، دار الفكر العربي، قاهرة، ١٩٥٦، ص ٣٩٤

[24] / شذى الجنابي، طبيعة العمل الاجتماعي–جريدة الصباح، الصفحة الالكترونية–٢٦/٣/9 ٢٠٠ www.sabah.com

[25] / وزارة العمل والشؤون الاجتماعية، دليل وصف الوظائف، شباط ١٩٨٢.

[26] / وزارة العمل والشؤون الاجتماعية، هەمان سەرچاوە

[27] / ڕێسا بنچینەییەكانی ڕەخساندنی هەلی یەكسانی بۆ كەم ئەندامان، ڕێكخراوی كوردستان **بۆ** ڕاهێنانی كەم ئەندامان، چاپی یەكەم، ٢٠٠٨، ل ٢٥.

[28] / الباحث العلمي، alba7es@yahoo.com _١٩ /٢٠٠٩/٣

[29] / د: احمد كمال احمد وآخرون، مقدمة في الرعاية الاجتماعية، الطبعة الثانية، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٧٦، ص ٤٢٢.

[30] / محمد سلامة محمد غباري، الخدمة الاجتماعية ورعاية الاسرة والطفولة والشباب، المكتب الجامعى الحديث، مصر ـ ١٩٨٩، ص ١٠٠

[31] / د. محمود حسن، مقدمة الرعاية الاجتماعية، مطبعة الشاعر، الطبعة الثانية، جزء الاول،١٩٧٣، ص ٢٠

[32] / الفاروق الزكي يونس، الخدمة الاجتماعية والتغير الاجتماعي، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٧٠، ص ٤

[33] /لەبەر ئەوەی نموونەكانی لێكۆڵینەوە زیاتر لە وەڵامێك دیاری دەكەن بۆیە ژمارەی وەڵامەكەیان زیاترە لە (٥٠) و ژمارەی نموونەكان ئەمەش بەسەر هەموو ئەم پرسیارانە جێبەجێ دەبێت كە زیاتر لەوەڵامێك لەخۆ دەگرن .

## پوختەی توێژینەوە بەزمانی عەرەبی

الباحث الاجتماعي هو الذي يقوم بالمشاركة في تحديد وتشخيص المعالجات اللازمة لمشكلات الاشخاص الذين لهم احتياجات خاصة في الدوائر والمراكز الخدمية، وايضا يقوم بدراسة المواضيع الاجتماعية والظواهر والمشكلات الاجتماعية باستخدام الاساليب العلمية للدراسة.

الباحثون الاجتماعيون الذين يعملون في وزارة العمل والشؤون الاجتماعية فهم من خريجي قسم علم الاجتماع في كلية الاداب، والباحثون النفسيون هم من خريجي علم نفس في كلية التربية جامعة صلاح الدين.

هذا البحث له علاقة خاصة باخذ آراء الباحثين حول نظام العمل وواجبات الباحثين الاجتماعيين (النفسيين)، وبشكل خاص الباحثين الذى يعملون في المديرية العامة للرعاية والتنمية الاجتماعية وفروعها.

من أهم المصاعب التي واجهت البحث حول نظام عمل الباحث الاجتماعي تتوضح من خلال النقاط الآتية:

١/ محاولة معرفة كيفية عمل الباحثين الذين يؤدون واجباتهم في المديرية العامة للرعاية والتنمية الاجتماعية وفروعها.

٢/ عدم وضوح نظام عمل الباحث الاجتماعي والنفسي.

٣/ تداخلات في اداء الواجبات بين الباحثين والاداريين في مجال العمل.

اهمية البحث : تتضمن الجانبين الاساسيين وهما:

١/ الجانب النظري : من خلال اكتساب معلومات مهمة حول الباحثين ونظام العمل، مع توضيح بعض المفاهيم والمصطلحات ذات العلاقة المباشرة بموضوع البحث.

٢/ الجانب الميداني : ان اهمية هذا الجانب تتضح من خلال المقابلات المباشرة مع الباحثين الاجتماعي والنفسيين واخذ المعلومات المباشرة لخدمة موضوع البحث، وتجنب وقوع تداخلات بين الباحثين والاداريين في مجال العمل من جانب ومن الجانب الآخر الاستفادة من هذا المعلومات لمعرفة مشاكل ومصاعب المستفيدين من الدوائر الخدمية.

اهداف البحث : ان ما يتعلق بالاهداف الاساسية للبحث هو:

١/ توضيح نظام عمل الباحثين الاجتماعيين والنفسيين وتشخيص الجوانب المعنية بنظام العمل، من خلال اخذ المعلومات من الباحثين انفسهم.

٢/ اشارة وتحديد العوائق التي تؤدي الى صعوبات في اداء عمل الباحثين.

٣/ تحديد مشاكل ومطالب المستفيدين في الدوائر ذات العلاقة بالمديرية العامة للرعاية والتنمية الاجتماعية وفروعها.

ويعتبر الباحثون الاجتماعيون والنفسيون عناصر فعالة واساسية في وزارة العمل والشؤون الاجتماعية، لتمشية الاعمال اليومية في المراكز والدوائر الخدمية وبالخصوص في المديرية العامة للرعاية والتنمية الاجتماعية، بالخصوص الدوائر التي تقدم الخدمات المباشرة للمستفيدين في المجالات المتعددة مثل دار المسنين ودوائر رعاية الاحداث للبنين والبنات، وايضا في مجالات حماية الطفولة وحماية المرأة ومشروع رعاية العائلة والحضانات، كما يقومون بتأدية اعمالهم في مجال معاهد ذوي الاحتياجات الخاصة "معهد هانا (للمعوقين) + معهد ئاوات (للتخلف العقلي) + معهد روناكى (للمكفوفين) + معهد هيوا(للصم والبكم) ".

لقد توصل البحث الى مجموعة من النتائج التي نطرحها بشكل مختصر وكانت النتائج كالآتي :-

١- وضع نظام عمل للباحثين الاجتماعيين بشكل ينسجم مع اعمالهم من خلال الاستفادة من آراء الخبراء وتنظيم ورشات العمل والندوات.

٢- - شرح نظام العمل الجديد للباحثين الاجتماعيين من قبل الوزارة (وزارة العمل والشؤون الاجتماعية) عند اصدار نظام العمل الجديد في الوزارة.

٣- من اهم اسباب نجاح الباحث الاجتماعي في عمله ان يكون حسب رغبة الباحث حتى يمكن للباحث الاجتماعي ان يتقن عمله ويتفنن فيه.

٤- من الضروري فتح دورات للباحثين الاجتماعيين في كيفية اداء اعمالهم.

٥- الاهتمام الاكثر بقدرات وخبرات الباحثين الاجتماعيين واستغلال هذه الخبرات في خدمة المجتمع بشكل افضل.

٦- محاولة تفعيل جمعية علم الاجتماع لانها البيت الثاني للباحثين الاجتماعيين بعد وزارة العمل والشؤون الاجتماعية.

٧- ارسال الباحثين الاجتماعيين في دورات الى خارج الاقليم لاكتساب الخبرات والمهارات الجديدة في خدمة المجتمع.

٨- على الباحثين الاجتماعيين تنظيم ورشات عمل يشارك فيها المسؤولين عن اصدار القرارات في الوزارة يطرح بها الباحثين مشكلاتهم وحلول هذه المشكلات بحرية ودون خوف.

# پوختەی توێژینەوە بەزمانی ئینگلیزی

system work for social resercher

**The abstract of the research**

Social researchers participate in selecting and singling out of necessary treatments for problems special needs individuals at offices and services centers, they are also studying social topics and phenomenan, and social problems by using scientific techniques for studying.

Social Researchers who work in the Ministry of Labor and Social Affairs, are all graduated in the social science department in College of Arts, also Psychological researchers are graduated in the department of Psychology in the College of Education at the University of Salahaddin. This research has a special relationship for taking researchers' opinions about the system of work and duties of Social and Psychological researchers, especially researchers who work in the General Directorate of Social Development and Care and its sub-offices,

The significant obstacles that faced the research about social researcher's work system, are illustrated as follows:

First: Attempting to know how researchers do perform their responsibilities in the General directorate of Social Development and Care and its sub-offices.

Second: The system of work assignments for social and psychological researchers is not clear.

Third: Interferences in performing duties between researchers and administrators in the work place.

The importance of research: It includes two essential aspects whitch are:

First: Theoretical aspect: during getting important information about researchers and work system, with illustrating some concepts and terms related to research topic.

Second: Empirical aspect:

The importance of empirical aspect is illustrated during direct interview with social and psychological researchers , and taking direct information to serve research topic, and preventing from happening any interference between researchers an administrators in the work place in the one hand, and benefit from these information to know beneficiaries problems and difficulties in service offices in the another hand.

<u>The research goals- In relation to essential goals of research, are indicated as follows</u>

<u>First:</u>

Illustrating work system of social and psychological researchers and singling out specific aspects that are related to work system, throughout taking information form researchers themselves.

<u>Second:</u>

Selecting and pointing out problems and demands of beneficiaries in General directorate of social development and care and its sub-offices.

Social and psychological researcher are considered as active and essential elements in the Ministry of Labor and Social Affairs, to carry out daily businesses in centers and service offices, especially in the General directorate of social development and care.

In relation to offices which are offering direct services to beneficiaries in various aspects, for instance the aged house, and youth care institution for boy and girls, also in the area of children and

women protection, and family and nurseries care, however they perform their work in the special needs institutions like (Hana institution for disabilities +Awat institution for mental retardation +Ronaki Institution for +Hewa institution for mute and deaf.

The research got to bunch of results, and we are going to present them as follows:

First: Setting the system of work assignment for social researchers in a way that conform to their works throughout taking benefit from opinion of experts and organizing workshops and seminars.

Second: Explanation the new system of work for social researchers by Ministry of Labor and Social Affairs, when they will issue the new system in the Ministry.

Third: One of the main reasons of social researcher's success is, their work should be suitable for their wishes, until the researcher is able to gain more knowledge and becomse creative in his or her work.

Four: Arranging courses for social researcher are necessary in order to learn how to perform their jobs.

Five: Paying more attention to researcher skills and experiences and exploit these experiences for serving society in a better way.

Six: An effort to activate an association of social science, due to it's consider as a second home for social researchers after Ministry of Labor and Social Affairs.

Seven: Dispatching of social researchers to courses outside Region, to gain new experiences skills for public interest.

Eight: Social researchers should organize workshops for employers who are responsible for decision making in the ministry, so throughout these occasions social researchers could express their problems and solutions for these problems freely an with no scare.

# دەستپێکێك لەبارەی (زمانپارێزی) سیاسەتی زمانی کوردی لە هەرێمی کوردستاندا ١٩٩٢ - ٢٠٠٩

پارێزەر/ تارق جامباز
ئەندامی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان

**سیاسەتی زمان**

پلانـدانان بـۆ زمـانو رێکخـستنی زمـان لـە (یاسـای زمانـە فەرمییـەکان)و، بەدواداچـوونو جێبـەجێکردنی ئـەو پلانـە لـە هـەموو ئاسـتو بوارەکانـداو چاودێریکردنی رێکوپێك و هەمیشەیی پلانەکە لە هەر کەموکوڕی و کەمتەرخەمیو خەمساردیو بێباکییـەك، هـەروەها لابردنـی هۆکارەکـانی یەکسەرو دەسـتبەجێو گەرماوگەرم کە خەمخۆرانە چارەسەرێکیان بۆ بدۆزرێتەوە. ئەو لایەنەی بەم ئەرکە لە ئاسایشی نەتـەوەیی (سـتراتیژە) رادەبـێ (ئـەکادیمیای زمانـە) نـەك لـە وڵاتـان بەڵکو لە هەرێمـەکانیش هەیـە. سیاسـەتی زمـانو یاسـای زمـان هاوتـای یـەکترن، چـونکە زمـان، هـەر زمانێـك دەبـێ ببێتـە بەشـێك لـە هـزرو بـیری هـەر تـاکێکی نەتەوەکە، چونکە زمان ئاسایشی نەتەوەییەو بـەبێ هەسـتی نەتـەوەیی، ئـەنجام نادرێت. لە سەرتاسەری دونیا ٤٧٠ یاسای زمان هەیە کە ٣٤٥ یان لە هەرێمـەکانی وڵاتاندایە، لەبەر ئەوەش کە یونسکۆ (زمان) بـە کەلـەپووری مرۆڤایـەتی دادەنـێ، بۆیە بەهەموو شێوەو شێوازێك بایەخو گرنگیو بـەها بـەم لایەنـە دەدات، هـەر بـە نموونـە زمـانی (چـەرکەز) مەترسـی لەناوچـوونی لێ دەکرا، بۆیـە لـە ئـوردن ئـەم رێکخـراوە بەپلانـدانان هـەوڵی بووژاندنـەوەی دا تـاکو بـەرەو لەناوچـوون نەچـێ، هەروەها لە ولایەتی ئۆرۆناشال برادیش لە بـاکوری رۆژهـەڵاتی هینندسـتان زمانێـك دۆزرایـەوە (زمـانی کـۆرو) کـە تـەنها (٨٠٠) کـەس قـسەی پێدەکـات، پرۆژەیـەك دانـراوە تـاکو پارێزگـاری لـەم زمانـە بکـرێو پـرۆژەی (دەنگـە نـەمرەکان) بـۆ کۆکردنەوەی ئەرشیفی دەنگو قاموسـی زمانەکـە لەسـەر ئەنتـەرنێت دانـرا، تـاکو سەرنجی هەموو دونیا رابکێشرێ بۆ ئەوەی بەردەوام بـەکاربهێنرێو لـەناو نەچـێ،

چونکە زمان گیانلەبەرێکە گەر پلاندانانی بۆ نەکرێ‌و بە یاسای زمان رێك نـەخرێ‌و سالآنە بژار نەکرێ‌و وشەی نوێی بۆ دانەڕێژرێ ئەوا لەجیاتی بووژاندنەوە، زمانەکە تووشی کزی‌و سستی‌و لاوازی دەبـێ‌و دواتـر بـەرەو هەڵـدێرو پووکانـەوە دەچـێ، چونکە دوو هەفتە جارێك زمانێك لە سەرتاپای دونیا نامێنـێ‌و سـالآنەش ٥٢ زمـان لەناو دەچێ‌و، لەبەر جیهانگیری ئەنتەرنێت‌و سەتەلایت‌و ئـەوانی دیکـە وا مەزنـدە دەکرێ کە لەو شەش هەزار زمانەی سـەر گـۆی زەوی هـەر تـەنیا (٢٠٠ تـاکو ٥٠٠) زمان دەتوانێ خۆی لەبەردەم گۆڕانکارییـە خێـراو بەلـەزەکانی هـەموو لایەنـەکانی ژیان رابگرێ، بۆیە هەرچەند زمـان لـە بـواری خوێنـدن‌و نووسـین‌و لـە کەناڵـەکانی بینراو و بیستراو و خوێنراو بەکاربهێنرێ ئەوا پـتر دەبووژێتـەوە، بەمـەرجێ تـاکی ئەو نەتەوەیە زمانەکەی بەخوێنـدن‌و نووسـین لەهـەر کوێیـەکی دونیابـێ بەئـەرکی هەبوونی خۆی بزانێ، نەك فێر ببێ، بـەڵکو منداڵەکانیـشی وا رابێنـێ کـە پێویـستە زمانەکە فێر بن. گـەر بڵێـی لـە هـەرێمی کوردسـتان یاسـاو بڕیارەکـان بەهـەردوو زمانی عەرەبی‌و کوردی دەردەچن، دەربچێ‌و ژمارەی ئـەو قوتابخانانـەی بـەزمانی کـوردین لـە وەزارەتـی پـەروەردەی حکومـەتی کوردسـتان (٥٧٤٠) خوێنـدنگاو قوتابخانەیـەو سـەدان بەرهـەمی چـاپەمەنی لـە چـاپخانەکانی حکومـەت‌و ئـەهلی بـــەزمانی کـــوردی چـــاپ کـــراون‌و لـــە دەســـەڵاتی دادوەریـــش زمـــانی کـــوردی بەکاردەهێنرێ‌و سەدان کەناڵی بینـراو و بیـستراو و خـوێنراو هـەن کـە مـرۆڤ پێـدا ڕاناگات هەموویان بخوێنێتەوەو گوێ بیستیان بێ‌و سەیریان بکات، ئەمانە هـەموو هەنگاوی باش‌و خاسن، بەڵام ئایا سیاسـەتی زمانیـان بـۆ دانـراوە؟ نـەك هـەر لـە هەڵمـــەتی هەڵبژاردنـــەکان، بـــەڵکو لـــە کارنامـــەی کابینـــەی حکومـــەت‌و لایەنـــە سیاسییەکانیـشدا تـا چ رادەیـەك ئـەو تـابلۆو نووسـینانەی لەسـەر دەزگاکـانی حکومەت‌و کەرتی تایبەت دەنووسرێن رەچـاوی زمـانی کوردییـان تێـداکراوە؟ کـە بەکوردییەکی پاراو بنووسرێن؟ ئایا ئەکادیمیای کوردی کە پێشتر کـۆڕی زانیـاری کوردســتان بــوو بەئــەرکی پێویــستی سەرشــانی رابــووە؟ ئــەمڕۆ پێویــستیمان بەئـەکادیمیای زمـانی کـوردی هەیـەو دەتـوانین سـوود لـە ئـەزموونی وڵاتـان‌و هەرێمــەکانی (فرەزمــان) وەربگــرین کــە سیاســەتی زمــان لــە کرۆکــی ئاسایــشی نەتەوەییانە، بۆیە لە کارنامەی هەڵمـەتی هەڵبژاردنـەکان‌و کابینـەکانی حکومـەت‌و

لایەنەکان جەختی لەسەر دەکەن، نەك بەچەند وشەیەکی بێ سیاسەتی زمان، بەڵکو زمان بووەتە خەمێکی ولاتپارێزانەو تا ئەو رادەیەی ئەوانەی بواری فێربوونی زمانیان نەداوە یان لە ولاتەکەیاندا فێربوونی زمان قەدەغەیە، ئەوا لەماڵەوە نەك خۆی فێر دەکات، بەڵکو منداڵەکانیشی هان دەدا کە فێری ببن و، بەناوی نەتەوەیی خۆیان ناویان دەنێن.

جاڕی گەردوونی مافی زمان لە ٩ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ لە بەرشلۆنەی ئیسپانی دەرچووەو لە ٥٢ ماددە پێك دێت.

ویب سایتێکی تایبەت بۆ سیاسەتی زمان لە سایتەکانی هەیەو لە یەکێتی ئەورووپیش بەشی سیاسەتی زمانیان داناوەو لە کۆماری ئێرلەندا زمان بەسامانێکی کەلتووری گرنگ بۆ گەلی ئێرلەندا دادەنێن و پارتی سەوز (کەسك) کارنامەی بۆماوەی بیست ساڵ لە ٢٠٠٩ تاکو ٢٠٢٩ کە لە ٧ لاپەڕەی A4 پێکهاتووە بۆ پارێزگاری کردن لە زمانی ئێرلەندی (گێلك) لە کرۆکی بنەماو ئامانجە سەرەکییەکانی داناوە ( بڕوانە پاشکۆی ژمارە ١) کە باس لەم لایەنانە دەکات :

١. زمانی ئێرلەندی‌و بنەماکانی پارتی سەوز.
٢. زمانی ئێرلەندی‌و هەرێم (مەبەستی ئێرلەندای باکوورە).
٣. پلانی نیشتمانیی ماوە درێژو ناوخۆیی بۆ زمانی ئێرلەندی.
٤. زمانی ئێرلەندی لە پەروەردەدا.
٥. زمانی ئێرلەندی لە کۆمەڵگەی گێلتاخت واتە لەنێو ئێرلەندە پێی دەدوێن.
٦. زمانی ئێرلەندی لە کۆمەڵگا — لە دەرەوەی گلێتاخت.
٧. زمانی ئێرلەندی‌و تەکنەلۆجیای زانیاری.
٨. زمانی ئێرلەندی لە یەکێتی ئەورووپی.

دەقی سیاسەتی زمان لە ئێرلەندا لە پاشکۆی (ژ ١) بابەتەکە بڵاو دەکەینەوە. دەبا لەم بارەوە لاپەڕەکانی ئەو نۆزدە ساڵەی ئەزموونی هەرێمی کوردستان بەخێرایی هەڵدەینەوەو بزانین چیمان لەم بارەوە کردووە؟ و تا چەند ئێمەش لەم بوارەدا خەمخۆرانە پلانمان هەبووەو تا چ رادەیەك توانیومانە (زمان) کە ئاسایشی نەتەوەییمانە کارمان بۆ کردووەو بۆچ تاکو ئێستا یاسای سرووی کوردستان دەرنەچوێندراوەو؟! چەندین بابەتی زانستە مرۆڤایەتییەکان بەفەرمان‌و چاودێری

وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی (وەرگێڕان یا ئامادەكردن یا دانراو) چاپو بڵاو كراونەتەوە؟ بۆ ئەوەی لە سەرجەم زانكۆكانی حكومەتو تایبەت (ئەهلی) بخوێندرێو، چەندین رێكخراوی كۆمەڵگەی مەدەنی لەم بارەوە دامەزراونو؟ ئەمڕۆ زمانی كوردی لە دەسەڵاتی چوارەمدا بۆتە خەمێكی هەمیشەیی.

زۆر پرسیارو هێمای سەرسوڕمان لە هزرو بیرمان دەخولێتەوە، ئایا ئەو دەسەڵاتانەی باسیان لێوە دەكەین لەتوانایاندا نەبووە ئەم لایەنە پترو فراوانتر بكەنو وەختیان بۆ تەرخان بكەن؟ دەبا بەچڕوپڕی راستییەكان وەكو خۆی باسیان لێوە بكەین بێ چاوپۆشینو پاساو و بیانوو و هەنجەت هێنانەوە.

ئەم دەستپێكە تەنیا بەكارهێنانی زمان لە هەرسێ دەسەڵاتی هەرێمی كوردستانو دەسەڵاتی چوارەمیش میدیاو كۆمەڵگەی مەدەنی دەگرێتەوە، چونكە بەكۆنگرەیەكو سیمینارێكو كۆنفرانسێك نەك ناتوانرێ باسی لایەنێك بكەن، بەڵكو پێویستی بە بەستنی بەردەوامی ساڵانەی سیمینارو كۆنگرە لەلایەن لایەنە پەیوەندارەكانەوە هەیەو پۆلینكردنیان بۆ چەندین تەوەر بۆ نموونە (زمانو ئاین، زمانو ئابووری، زمانو دەسەڵات، زمانو هزرو بیر، یاسای زمان، لەناوچوونو بووژاندنەوەی زمان، ئەتلەسی زمانو... هتد). و ئەز لەم دەستپێكەدا باسی رێزمانو زمانناسیو زمانی ستاندەردو رێنووس ناكەم، بەڵكو باس لە بەكارهێنانی زمانی كوردی بەرێكوپێكی لە هەموو ئاستو بوارێكدا دەكەین.

زمان لە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەییە، دەبا بزانین لەبارەی سیاسەتی زمانی كوردی لە هەرێمی كوردستان لەم بارەوە چ كراوەو چ بكرێ بۆ ئەوەی سیاسەتی زمانمان هەبێ؟

**لە بەرەی کوردستانی، واتا لە (دیفاکتۆوە)، بۆ پەرلەمانی کوردستان**

سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی– عێراق ساڵی ١٩٨٨ لە هەشت لایەنی گۆڕەپانی کوردستان پێکهاتبوو، لە یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتی سیاسی لە حوزەیرانی ١٩٨٨دا بڕیاری بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی بەرەی کوردستانی عێراق، گەرچی لەشێوەی نامیلکەیەك بەزمانی کوردی لە ٣٧ لاپەڕەی قەوارە مامناوەندیدا دەرچووە، لەبەردەستدایە، بەڵام ناوی زمانەکان ناهێنێ‌و پلان‌و نەخشە چییە لەم بوارەدا باسی لێوە ناکرێ (بڕوانە پاشکۆی ژ ٢).
دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ بەرەی کوردستانی بوو بەدەسەڵاتی دیفاکتۆ، هەر ئەویش لیژنەیەکی پێك هێنا بەناوی لیژنەی پڕۆژەی یاسایی‌و هەر ئەو لیژنەیە دوو یاسای نووسینەوەو لە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانیش بڕیاریان لەسەر دا:

١. یاسای ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق ژمارە ١/ ١٩٩٢ لە ٦١ مادده پێکهاتووە.
٢. یاسای هەڵبژاردنی سەرکردەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ژمارە ١٩٩٢/٢ لە ١٥ مادده پێکهاتووە.

هەردوو یاساکە لە رۆژنامەی بەرەی کوردستانیدا بڵاو کراونەتەوەو لە رۆژی بڵاوبوونەوەیاندا کاریان پێ‌کراو لە هەردوو یاساکەدا باسی زمان نەکراوە، گەرچی هەردوو یاسایەکە بەزمانی عەرەبی‌و کوردی بڵاوکراونەتەوە.

دەبوایە لە بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆی بەرەی کوردستانی‌و لە هەردوو یاساکەشدا مادەی تایبەت بۆ زمان تەرخان بکرایە. دەبا ئەم خاڵە بەوردی بخوێنینەوە:

سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ پڕۆژە یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان– عێراق، لە راپۆرتی کۆتاییان کە ئاڕاستەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانییان کردووە لە ساڵی (١٩٩١– ١٩٩٢) لە خاڵی (١) لەبارەی زمان نووسیویانە: (وامان بەپەسەند زانی یاساکە لە سەرەتاوە بەزمانی عەرەبی دابڕێژرێت، دوای ئەوەی لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانییەوە پەسەند ئەکرێ‌و بڕیاری لەسەر ئەدرێ وەرگێڕرێتە سەر زمانی

کوردی لەلایەن پسپۆڕانی یاساو زمانـەوە، هـەروەها وەرگێڕانـی یاسـاکە بـۆ سـەر زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیو ئەڵمانی کارێکی پیرۆزە). (بڕوانە پاشکۆی ژ ٣).

لێرەدا دوای نۆزدە ساڵ دەپرسین بۆچ ئەوسا سەرکرایەتی سیاسی بـەرەی کوردستانی– عێراق یاسایەکی پێویستی هەمیشەیی دیرۆکی دەرنەچواند؟ ئەویش (یاسای زمانـەو لـە مـاددەو بڕگەکانیـدا کـە بـەوردیو قـووڵی باسـی بـەکارهێنانی لەهەموو ئاستو بوارەکان بکردبایە) لە وڵاتانو هەرێمەکانیان ئـەم یاسـایە هەیـە، بە نموونە هەر لە هەرێمی کیبیك چوار یاسای زمان تاکو ساڵی ١٩٩٣ دەرچـووەو، هەڵبــژاردنی پەرلــەمانی کوردســتان بــەپێی یاســای ژمــارە ١٩٩٢/١و هــەروەها هەڵبـژاردنی سـەرکردەی رزگـاریخوازی بزووتنـەوەی کـورد بـەپێی یاسـای ژمـارە ١٩٩٢/٢ ئەنجامدراو، دواتر یاسای ژمارە ١٩٩٢/١ چەندین جار هـەموار کـرا، بـەڵام لەمانیش ناوی زمان نەهێنراوە، و کە بەکارنامەی هەڵمەتی لایەنەکانی سیاسی بـۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هەر لـە ١٩٩٢ تـا ٢٠٠٩ دا چـوومەوە لـە هـەردوو خولی پەرلەمانی کوردستان یەکەمین (١٩٩٢– ٢٠٠٥) دووەمین (٢٠٠٥– ٢٠٠٩) و لە هەموویان زۆر بەپەلـەو بەلـەز باسـی زمـان کـراوەو گـەر بڵـێن ئەمـەیان (تحـصیل حاصلە) لەبەر ئـەوەی دیـارەو روونو ئاشـکرایە چ زمانـێ لـە هـەرێمی کوردسـتان فەرمییە، چونکە وڵاتانو هەرێمەکانیان نەوەك لە دەستووریان، بـەڵکو لـە یاسـای زمانو گشت یاساکانی دیکە (ئەوانەی فرەزمانن) بەدانانی خـاڵ لـە سـەر پیتـەکان پلانو نەخشەیان لە نێو یاسای زمانو یاساکانی دیکە هەیـەو نموونـە لـەم بـارەوە یاسـای زمانـە فەرمییـەکانی کەنـەدا ١٩٨٨ لـە ١١٢ مـاددە پێـك هـاتووەو یاسـای وەزارەتی پەروەردە لە ٣١٦ ماددە پێك هاتووە. دەبا بزانین (تحصیل حاصلەکە) تەواوەو زمانی فەرمی (زمانی کوردییـە) دەڵـێم پـشووتان فـراوان بـێ بـە هزرێکـی سارد تەنیا تاکە رستەیەك دەخوێنینەوە لەسەرووی لاپەڕەکانی یاساو بڕیارەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق لەناو لاکێشەیەك نووسـراوە **(وێنەیـەکی تەرجەمەکراوی دەقـە عەرەبییەکەیـە)**، واتـا یاسـاو بڕیارەکـان بـەزمانی عـەرەبی دادەڕێژرێنو دواتر وەردەگێڕدرێنەوە سەر زمانی کـوردی، واتـا زمـانی کـوردی لـە پەرلەمانی کوردستان لەگەڵ زمانی عەرەبی یەکسان نییە، بـەڵکو زمـانی دووەمـە، چونکە دەمانتوانی سوود لە ئـەزموونی وڵاتـانو هەرێمـەکانیان وەربگـرین بـۆ ئـەم

مەبەستە دەبوایە هەر لە ١٩٩٢ تاکو ٢٠٠٩ لیژنەیەك بۆ داڕشتنی یاساو بڕیارەکان، لیژنەیەك لە پسپۆڕو لێزانو شارەزایانی یاساییو زمانزانان لە مامۆستایانی زانکۆو دادوەرانو پارێزەرانو مافپەروەرانو کەسانی دیکە بۆ (کوردandن) پێك بهێنرایەو بەپلانێکی تۆکمەی نەخشە بۆ داڕێژراوی درێژخایەن ئەنجام بدرێ، بۆچ تاکو ئێستا نەکراوە؟ چ وەختێ دەکرێ؟ و لەهەندێ پەرلەمان لیژنەی زمان لە لیژنە هەمیشەییەکاندا هەیە بۆ زمانپارێزی، دەپرسین بۆچ یاسای زمانە فەرمییەکان گەرچی پڕۆژەیەك لە خولی دووەمەوە لە پەرلەمانی کوردستانە بۆچ نەخراوەتەوە بەرنامەی کاری دانیشتنێك؟ دەبێ ئاماژە بەڕۆڵی چەندین پەرلەمانتار بدەین کە لە دانیشتنەکان زۆر جەختیان دەکرد لە ناردنی یاساو بڕیارەکان بەهەردوو زمانی فەرمی عەرەبیو کوردی. دوو نووسراویش لەم بارەوە ناردراوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، تاکو خولی دووەمیش تەواو بوو وەڵامی نەگەیشتەوە پەرلەمانی کوردستان، چونکە زۆرینەی یاساو بڕیارەکان هەر بەزمانی عەرەبی رەوانە دەکران. دواتر دەکرێتە زمانی کوردیو لەلایەن ئەو کەسانەشەوە ئەم ئەرکە بەکارێکی فەرمانبەری ئاسایی ئەنجام دەدرێ، نەك لیژنەیەکی تایبەت بۆ داڕشتنی یاساییو زمانەوانی هەبوونی هەبێ، هیوادارین کە ئەم کارە بەگوێرەی یاسای ژ ١٤/٢٠٠٨ کە ئاسایشی نەتەوەییە بێتە بواری جێبەجێکردن.

گەر بەوەرگێڕانی هەموو دەقە کوردییەکانی یاساو بڕیارەکانی پەرلەمانی کوردستان (١٩٩٢– ٢٠٠٩)دا دابچینەوە ئەوا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان وەرگێڕانەکاندا هەیە. دەبا بزانین چ لایەنێك ئێستا بەرپرسە لە داڕشتنی پڕۆژە یاساکان.

## یاسای ژ ١٤/٢٠٠٨
## یاسای ئە نجومەنی شورای هەرێمی کوردستان- عێراق

**ماددەی حەوتەم:**

ئەنجومەن لە بواری تەقنیندا ئەم ئەرکانە دەگرێتە ئەستۆ:

**یەکەم**: ئامادەکردنو دارشتنی پرۆژەی یاساکان لە هەرێمداو، ئەمەش لەسەر داوای ئەنجومەنی وەزیران یاخود وەزارەتە تایبەتمەندەکان یان لایەنەکانی کە نەبەستراونەتەوە بەوەزارەت دەبێ.

**دووەم**: لیّ وردبوونەوە لەو پرۆژە یاسایانەی کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە یان وەزارەتەکانەوە یاخود لایەنی نەبەستراو بەوەزارەتەوە ئامادە دەکرێن لەرووی شێوەو بابەتەوە.

**سێیەم**: پرۆژەی یاساکان بەنووسراوێك دەنێردرێن بۆ ئەنجومەن کە وەزیری تایبەتمەند یان سەرۆکی لایەنی نەبەستراو بەوەزارەت ئیمزای کردبێ لەگەڵ دەرخستنی هۆیە پێویستییەکانیو هەموو کارە ئامادەباشییەکانیدا.

**چوارەم**: وەرگرتنی بیروڕای وەزارەتەکان یان ئەو لایەنانەی پەیوەست نین بەوەزارەت لەبارەی پرۆژەی ئەو یاسایانەی کە بۆی هاتوونو بۆی هەیە بۆ مەبەستی ناوبراو داوای ئامادەبوونی نوێنەریان بکات بەمەرجێك پلەکەی لە بەڕێوەبەری گشتی کەمتر نەبێ.

**پێنجەم**: ئەنجومەن لە پرۆژەکە دەکۆڵێتەوەو ئەگەر پێویستی کرد دووبارە دادەڕێژێتەوەو داوای ئەو بەدیلانە دەکات کە بەپێویستی دەزانێ لەگەڵ ئەو راسپاردانەی ئەنجومەن بۆ ئەنجومەنی وەزیرانی بەرز دەکاتەوەو وێنەیەك لە پرۆژەکەو راسپاردەکانی بۆ وەزارەت یا ئەو لایەنەی کە بەوەزارەتەوە نەبەستراوەتەوە دەنێرێ.

گەرچی یاسایەکە لە ٢٠٠٨ دەرچووە تاکو ئێستاشی لەگەڵدابێ کاری خۆی ئەنجام نەداوە.

ژمارەی ئەو یاساو بڕیارانەی لە ١٩٩٢– ٢٠١٠ کە لە پەرلەمانی کوردستان دەرچوێندراون سەرجەمیان (شەش سەد پترە) ، بەڵام یەکجار کەم باسی زمانیان تێدا کراوە. هەر بۆ نموونە:

نموونەی یەکەم: لە یاسای ژ ٢٠٠٨/١٠ خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی باسی زمان نەکرابوو، بۆیە بەپێویستم زانی لەلیژنەی یاسایی لەو کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی زانکۆکانی کوردستانو پەیمانگاکانی سەر بەزانکۆکان یا لەلیژنەی هاوبەشی یاساییو پەروەردەو خوێندنی باڵا باسی بکەمو لەهەردوو کۆبوونەوەش وەزیر ئامادەبوو جەختم لەسەر ناوهێنانی زمانی کوردی کردەوە، دەرەنجام توانیمان کە بۆ یەکەمین جار لە یاسای وەزارەت لەبڕگەی دوازدەهەم لەماددەی دووەمی دابنرێ کە ئەمە دەقەکەیەتی (کارکردن لەپێناوی کردنی زمانی کوردی بەزمانی فێرکردنو خوێندن لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵا لە زانستە مرۆییەکانداو هاندانی وەرگێڕانو دانانو چاپەمەنییە زانستیو رۆشنبیریو ئەکادیمییەکان بۆ زمانی کوردی).

لە بەیاننامەیەکی پەرلەمانی کوردستان بە ژ ١٦٢٨ لە ٢٠١٠/٩/٢٣ (بڕوانە پاشکۆی ژ ٤) لەبارەی ماددەیەکی هەمان یاسا بەم جۆرە باسی زمانی کوردی کراوە: (لەبەر ئەوەش کە نوسخە عەرەبییەکە بەئەسڵ دادەنرێ، بەو پێیەی کە دەقێکی ئەسلییەو لەلایەن پەرلەمانەوە دەنگی لەسەر دراوەو نوسخەی کوردییەکە وەرگێڕانی دەقە ئەسڵییەکەیە دەبێ وەك ئەو بێ. وەبۆ ئەوەی ئەمە رەچاو بکرێو بەپێی ئەو دەقەی لە نوسخە عەرەبییەکەدا هاتووە پشت بەماددە (٤٤)ی یاسای ناوبراو ببەسترێ، بەپێویستمان زانی ئاماژەی پێ بدەینو ئەم بەیاننامەیە دەربکەین).

نموونەی دووەمیش: کۆتایی پارساڵ ٢٠١٠ پرۆژەی یاسای زانکۆ تایبەتییەکانی هەرێمی کوردستان– عێراق لە ئەنجومەنی وەزیران نێردرا بۆ پەرلەمانی کوردستان، بەڵام لە ٢٠١٠/١١/٢٩ بڕیار درا دوابخرێ، لەماددەی ٧ لەم پڕۆژەیەدا گەر وردبینەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی (**زمانی وانە گوتنەوە لە زانکۆو کۆلیجە زانکۆ ئینگلیزییە** لەگەڵ رەچاوکردنی هەندێ پسپۆڕی مرۆیی بەرێژەیەکی دیاریکراو کە وەزارەت دەستنیشانی دەکات بەزمانە ناوخۆییەکان دەبێ).

دەستخۆشی لـە دواخستنی پرۆژەكـە لـە پەرلـەمانی كوردسـتان دەكـەین، چونكە ئەم ماددەیە بەپێچەوانەی ماددەی چوارەمی دەسـتووری كۆمـاری عێراقـە ٢٠٠٥ كە لە سەرتاسەری عێراق دوو زمانی رەسمی (عەرەبیو كوردی) هەیە، ئەمە لەلایەكو لەلایەكی دیكە دەپرسین لەكام كۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییـەكان جگـە لـە بەشی (زمانی ئینگلیزی) سەرتاپای وانەكانی خوێندنیان تێدا بەزمانی ئینگلیزییەو ناو هێنانی زمانـەكانیش زمانـە خۆجێییەكانـە؟ ئەمـەیان یاسـای ژ ١٩٣١/٧٤ بـەبیر دێنێتەوە كە پێش هەشتا ساڵ دەرچووە.

نموونەی سێیەم: لە یاسای بەرەنگاربوونـەوەی جگەرەكێـشان لـە هـەرێمی كوردستان– عێراق ژ ٢٠٠٧/٣١ كە لە ماددەی (٥) ناوی زمانی كوردی هـاتووە كـە ئەمەش دەقەكەیەتی (ئاگاداریكردنەوەیەكی تەندروستی بەهەردوو زمانی كـوردیو عەرەبی بەپێی بەرزەفتیانەكانی رێكخراوی تەندروستی جیهانی). دوای ماوەیـەكی كەم هەمواركردنێك بۆ یاسایەكە هاتو كە گەیشتە لیژنـەی یاسـایی تێكڕاوپێكـڕای ئەندامانی لیژنەكە رەتیان كردەوە لەبەر ئەوەی داوای لابردنی زمانی كـوردی تێـدا كرابوو... دەبوایـە پەرلـەمانی كوردسـتان دوای راگەیانـدنی جـاڕدانی فیـدڕاڵی لـە ١٩٩٢/١٠/٤ بڕیار لەسەر پرۆژەی دەستووری كوردستان بـدات، نـەك دوابخـرێ بـۆ ٢٠٠٢/١١/١٧، و یاسـای زمـانیش سـاڵی ١٩٩٢ دەرچـوێندرابایەو لـە یاسـایەكە سیاسەتی زمان دادەنراو ئەوەی ئەمڕۆ باسی دەكرێ لەوێ چارەسەر كرابوایە.

پەرلـەمانی كوردسـتان بـە دە پەرلـەمانتار بـۆ پـشتیوانی فراكـسیۆنی هاوپەیمانی كوردستان بەشدارییان لـە نووسـینەوەی پـرۆژەی دەسـتووری عێـراق (٢٠٠٥) كرد كە پرۆژەكە تەواو بـوو، پێـشنیازی (سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان)م كرد كە لەتەك زمانی عەرەبی بـەزمانی كـوردیش چـاپو بـڵاو بكرێتـەوەو یەكسەر رەزامەنـدی دەربـڕی ئێمـەش (پـارێزەران مـن و كـەریم بـەحری و زانـا رۆسـتاییو مامۆستا كـەرخی ئـالتی بـەرماخ) وەرمانگێڕایـە سـەر زمـانی كـوردیو تایـپ كـراو دواتریش لەلایەن (UN) ٩٥٠٠٠٠ نۆسەدو پەنجا هەزار دانەی لێ چاپو بڵاوكرایەوە، هەروەها پێشنیازم كرد كە پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردسـتان– عێـراق ٢٠٠٩ لاپەڕەیەكی بەزمانی كـوردیو ئـەوی بەرامبـەری بـەزمانی عـەرەبی بـێ، بـەڵام لـە

لیژنـەی پێداچـوونەوەی پـڕۆژەی دەسـتووری هـەرێمی کوردسـتان پێـشنیازەکە سەری نەگرت. (بڕوانە پاشکۆی ژ ٥).

سروودی (ئەی رەقیب) بۆتـە سـروودی کوردسـتانو لـە بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتان. دانـی پیـانراوە، بـەڵام دەپرسـین بـۆچ تـاکو ئێـستاشی لەگـەڵ دابـێ (٢٠١١) سروودی کوردستان لە چوارچێوەی یاسایەك رێك نەخراوەو دەرنەچـووە؟ دەبوایە لە تەك یاسای ئاڵای کوردستان لە (١٩٩٩) یاسای سروودی کوردسـتانیش دەربچوێنرایە، چونکە نابێ لە هەرێمی کوردستان سروودی بێ یاسا هەبێ.

**حکومەتی کوردستان ( ١٩٩٢- ٢٠٠٩ )**

گەر کارنامەی (بەرنامەی) کابینەکانی حکومەتی کوردستان (یەکگرتوو/ دوو ئیدارەیی/ یەکگرتوویی) بخوێنینەوە ئەوا بەچەند وشەیەك باسی زمانیان تێدا کراوە، لەبەر ئەوە پلانو نەخشە رێگایەك دانەنراوە، کە بەرێکوپێکی (بەدامەزراوەیی) کابینە دوای کابینە پتر گرنگیو بایەخو بەهای پێ بدرێ، بەلاّم نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە لەوەزارەتی پەروەردە بۆ هەموو قۆناغەکانی خوێندن پرۆگرامەکانی بەچاپ گەیاندراوە، خوێندن لە قۆناغەکانی بنەڕەتیو ئامادەیی لە هەرێم سەرەڕای زمانی کوردیو عەرەبی، بەزمانی تورکمانیو سریانیو ئەرمەنیش هەیە، ژمارەی ئەو خوێندنگاو قوتابخانانەی کە تاکو قۆناغی ئامادەیی لە هەرێمی کوردستان بەزمانی کوردی دەخوێنن ٤٩٧ لە بەرامبەردا ١٧ بەزمانی عەرەبی هەیە (بڕوانە پاشکۆی ژ ٦)، بۆیە کە ئەو خوێندکار (قوتابیانەی) خوێندنی شەشەمی ئامادەیی (بکالۆریا) بەزمانی کوردی تەواو دەکەنو لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان وەردەگیرێن ئەوا تووشیان بەتووشی دیواری بەرلێن دەبێ، چونکە جگە لە بەشی کوردی لە ئادابو پەروەردە دەنا کۆلیژەکانی دیکە (زانستە مرۆڤایەتییەکان) هەر هەموو بابەتەکانی قۆناغەکان خوێندنیان بەزمانی عەرەبییەو ئەوانەی خوێندنی قۆناغی بنەڕەتیو ئامادەییان بەزمانی کوردی تەواو کردووە، بابەتەکانی خوێندنیان لە لا زۆر سەختو دژوارە، چونکە تێ ناگەن لەبەر ئەوەی بەزمانی عەرەبین، لەم بارەوە کە تاوتۆی پرۆژەی یاسای خوێندنی بالاّو توێژینەوەی زانستی (٢٠٠٨) بەئامادەبوونی وەزیرو سەرۆك زانکۆکانو پەیمانگاکانی سەر بەزانکۆکان لە لیژنەی یاسایی پەرلەمانی کوردستان کرا، منیش پرسیارێکم لەم بارەوە کرد کە چ کراوەو دەکرێ؟ گوتیان بەرێنمایی رێژەیەکی دیاریکراو بوار دەدرێ بەزمانی کوردی شرۆڤە بکرێ، منیش لە وەلاّمدا گوتم رێنمایی لە رووی یاساییەوە بەپلەی سێیەمین دێت، چونکە (١- یاسا، ٢- رێسا، ٣- رێنمایی) و دواتر برگەی دوازدەهەم لە ماددەی ٢ی وەزارەت دانرا، بەلاّم ئەمەیان چارەسەر نییە، بەلّکو بەنجکردنە، چونکە گەر هەر لە ١٩٩٢ تاکو ٢٠٠٩ بەپلانێکی درێژخایەن لەلایەن وەزارەتەوە دەتوانرا لەهەر بەشێکی زانستە مرۆڤایەتییەکان سالاّنە تەنیا دوو کتێب بە (نووسین یان وەرگێڕان یان

ئامادەکردن) ئەنجام بدرایە، ئەمڕۆ تێکڕاو پێکڕای (بابەتەکانی بڕیار لەسەردراو بۆ خوێندن) بەزمانی شیرینی کوردی دەخوێندران، چونکە هیچ بەشێك پڕۆگرامی ئەو بابەتانەی دەخوێندرێ لە چل ناونیشان پتر نابن (۱۹× ۲) =۳۸ واتە خوێندن بەرێکوپێکی بەزمانی کوردی بەڕێوە دەچوو، نەك وەکو ئەمڕۆ (هەندێ مامۆستای زانکۆ بێ لێ وردبوونەوە) دەڵێن (**وەڵامدانەوە بەزمانی کوردی قەدەغەیە**)، گەرچی کوردن‌و دەتوانن پرسیارەکان بەزمانی کوردی دابنێن‌و وەڵامەکانیش بخوێننەوە، هەندێ جاریش لەبەر ئەوەی پرسیارەکان بەزمانی عەرەبین‌و ئەوانەی خوێندنیان بەزمانی کوردی تاکو زانکۆ تەواو کردووە لە مانای پرسیارەکان ناگەن، بۆیە داوای وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی دەکەن‌و لە هەندێ زانکۆ ئەمەشیان (**قەدەغەیە**) ئەو دوو رەفتارکردنەی ئەم جۆرە مامۆستایانە پێشێلکردنی زەقی ماددەی (٤) ی دەستووری کۆماری عێراقە (۲۰۰۵) کە لە سەرتاسەری عێراق دوو زمانی فەرمی عەرەبی‌و کوردی هەیەو هەروەها پێچەوانەی مافی مرۆڤ و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکانە، سەرەڕای ئەوەش بریندارکردنی هەستی چل ملیۆن کوردەو، دەبوایە نەك ئەم مامۆستایانە لە بەش‌و زانکۆو وەزارەت بانگ بکرێن، بەڵکو دەبوایە هۆشداری بکرێن گەر ئەم قسانە دووبارە بکەنەوە ئەوا نابێ وانەبێژی لەهیچ بەش‌و زانکۆو ئامۆژگایەکی کوردستان بکەن‌و، لەبەر ئەوەی ئەوانەی بەزمانی کوردییان خوێندووە بۆ تێگەیشتن‌و پێڕاگەیشتن کە ناچارن وشە بەوشە بۆیان بکرێتە زمانی کوردی، بۆیە لەبارودۆخێکی دەروونی وا دەژین‌و ناچار دەبن هەندێ جار بڵێن بۆ چ بەزمانی کوردی خوێندوومانە؟ بەڵام ئەوانەی بەزمانی عەرەبی خوێندوویانە گەر لەشوێنی نیشتەجێبوونیشیان خوێندن بەزمانی کوردی هەبووە، ئەمانە یەکسەر لە بابەتەکان دەگەن‌و کتێبەکانیش بەئاسانی دەخوێننەوە، لە کابینەکانی حکومەتی کوردستان بەتایبەتی لە بەرنامەی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی چاوەڕوان بووین ئەم دیواری بەرلینییە برووخێنرایەو تەختیان بکردبایە، ساڵانە سیمیناری تایبەت بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرێ کوێرەیە ببەسترابایەو خاڵ لەسەر پیتەکان دانرابایە، نەك خۆیان لە ئاست ئەرکێکی دیرۆکی بێدەنگ بکەن‌و، تا ئەم نووسینەش بەخەمخۆری بەدواداچوون‌و پێداچوونەوە بۆ ئەم ئاستەنگە (گەرماو گەرمە)

دەستبەجێ نەکراوەو بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی کە زمانی کوردی بەچاوێکی کەمو نزمو خوارتر لە زمانی عەرەبی تەماشا دەکەنو ئەوەی ئێمە دەیزانین لەم بارەوە تەنیا کۆڕێکیش نەبەستراوە، نەمانزانیوە مامۆستایانی زانکۆش ئەم لایەنە گرنگە پڕ بەهایە بکەنە هەوێنی نووسینەکانیانو کەسیان پەنجەی لەسەر زامی زمانی کوردی لە زانکۆکان دانەناوە، بەلای منەوە فێربوونی زمان هەر زمانێ لەسەر (سیستمی پرۆگرامی پەروەردەو فێرکردن+ قسە پێکردن+ خوێندنەوەو بەدواداچوون) دەوەستێ، چونکە هەر لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی وانەیەك تاکو تەواوکردنی زانکۆ بەزمانی ئینگلیزی دەخوێندرێ، بەلام چەند کەس دەتوانێ دوو رستەی رێکوپێك قسەی پێبکات؟ دەڵێم لە ژمارەی دەست تێپەڕ ناکاتو فێربوونی زمانی عەرەبی دەبێ بەئامادەکردنی پێداویستییەکان چونکە بەم جۆرەی ئێستا تەنیا مەبەست لەم قۆناغە بۆ قۆناغێکی دیکە سەرکەوتن بەدەست بێنی، بەڵکو دەبێ سیستەمی فێرکردنی زمان لەگەڵ سەردەمو ئامێری فێرکردن هاوتابن.

وەزارەتی رۆشنبیری لەبارەی ئەو (C.V)یەی بۆ منداڵان کراون بەزمانی کوردی لەگەڵ پەروەردە، ئاسمانو رێسمان لێك دوورن، چونکە پڕ لەقسەی نابەجێو شەڕەجنێوو...هتد. ئەمەیان دیاردەیەکی ترسناکە کە جگەرگۆشەکانمان بەزمانێکی زبر لێی رادێن. خۆزیا وەزارەتی رۆشنبیریو ئەکادیمیای کوردیو نووسەرانو رۆژنامەنووسانو پارێزەرانو...هتد بەدەنگ هاتبانو، دەپرسین بۆچ ئەم بێدەنگییە لەم لایەنانەی باس کران؟ چونکە ئەمەیان شێواندنی زمانی کوردییە کە ئاسایشی نەتەوەییەو، لەهەموو دونیا هێڵی سوورەو بەزاندنی هەموو لایەنەکان لە وڵاتانو هەرێمەکان بەدەنگ دێن، چونکە ئەم شێواندنەی زمانی کوردی دەبێ رابگیرێو سزای یاسایی ئەوانەش بدرێ کە بەم کارە هەڵدەستنو دەیفرۆشنو کۆپی دەکەن، لەبەر ئەوە کۆڕی زانیاری کوردستان (١٩٩٧– ٢٠٠٧) لەئاستی پێویستدا نەبووەو، گەرچی ئەکادیمیای کوردیش هەیە، بەلام ئێمە پێویستیمان بەئەکادیمیای زمانی کوردیمان هەیە بۆچ و لەبەر چی؟ لەوەلامدا دەڵێم چونکە جارێ گەنجینەی وشەی کوردی بەهەموو شێوە زارەکان کۆنەکراونەتەوە، چ وەختێ دەست بەکاربینو ئەمڕۆ هەر پەیڤینو ئاخاوتنو

قسەکردن بێ پلاندانان کەڵکی نییە، بەڵکو ڕۆژی کارو کردەوەو کردارەو، گەر باسی نووسینەکانی سەر تابلۆی شوێنە گشتییەکانی حکومەتو تایبەتی بکەین هەر یەکەو بەجۆرێ نووسیویانە، لە ولاتانو هەرێمەکانیان لە یاسای زمان – کۆمسیۆنێك هەیە، دەسەلاتی دادوەری هەیە. بۆ نموونە پێش ٦٥ ساڵ لە کۆماری کوردستان لە چەندین خالدا دەرچووەو ئەوەی ئێمە مەبەستمانە تەنیا یەکێکیانە: (٣– پەسنە کرا هەموو نیشانە (تابلۆ) ئیداراتو مەکتەبو تیجارەتخانانو عیمارەتان بگۆڕنو بەکوردی بنووسێ (بنووسرێن).

لەیاسای زمانە فەرمییەکانی ولاتانو هەرێمەکانیاندا گەر کەسی سروشتیو مەعنەوی یاسایەکە بەتەواوەتی جێبەجێ نەکەن ئەوا سزای داخستنی شوێنەکە دەدرێو غرامەی بۆ دەبڕنەوەو ئەوانەی دووبارەی بکەنەوە ئەوا سزایەکی قورسترو گرانتر دەدرێنو ئەوانەی بەزمانەکەش نانووسنەوە سزا دەدرێن، گەر سەیری نووسینەکانی سەر شوێنە گشتیو تایبەتییەکان بکەین (مرۆڤ بێکەسی زمانی کوردی) دێتە بەرچاو، چونکە لایەنەکانی پەیوەندیدار بێدەنگنو هیچ لایەنێك خۆی ناکاتە بەرپرس، منیش دەڵێم هەموومان بەرپرسو لێپرسینەوەی دیرۆکی نەوەکانی ئایندە دەکەوێتە ئەستۆمان، دەپرسین تاکەی بەم جۆرە فەرامۆش بکرێو لایەنەکانی پەیوەندیدار بەئەرکی نەتەوەیی رانەبن؟

**ئە نجومەنی دادوەری ( دەسەلاتی دادوەری )**

گەرچی لە یاسای دەسەلاتی دادوەری ژ ١٩٩٢/١٤ لەبارەی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە ماددەی پێنجەمیدا هاتووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی : (زمان لە دادگاکاندا کوردی دەبێ، بەلام دادگا بۆی هەیە بەهۆی وەرگێڕەوە دوای سوێنددانی گوێ لە قسەی دژکاران "الخصوم" و شایەتەکان بگرێ). بەلام دەقنووسەکە جێبەجێ نەدەکرا، بەلکو لەجیاتی ئەوەی رێکارەکانی دادگاکان بەخێرایی بەرێوە بچن، زمانی کوردی دەکرایە زمانی عەرەبی ئینجا لە تۆمارگاکان تۆمار دەکرا، گەر بەلگەکانیش بەزمانی کوردی بوونایە ئەوا بڕە پارەیەك دەدرا بەوەرگێڕ تاکو بیکاتە زمانی عەرەبی. لەژیانی پارەێزەرایەتیم هەستم کرد ئەو مافەی هەمانە بۆچ پراکتیزە ناکرێ؟ ئەو مافە دەبێ جێبەجێ بکرێ، بۆ ئەم مەبەستە بەبۆنەی (٢٠٠٠/٣/١٦) رۆژی کیمیابارانی هەلەبجە لەگەلّ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری یاساپارێزی چووینە سەردانی وەزیری دادو داوایەکمان پێشکەش کرد کە دەبێ زمانی کوردی لە دادگاکانو فەرمانگەکانی سەر بەوەزارەتی داد (دادنووس، جێبەجێکاری دادی، ناکامەکان، تاپۆ) بەکار بهێنرێت، وەزیر داواکارییەکەی زۆر پێ باش بوو، بەلام گوتی پێویستی بەئامادەکاری هەیە، منیش گوتم: وا هەشت سالّ بەسەر دەرچوونی ئەم یاسایەدا تێدەپەرێ، بۆ ئەوەش کە چیتر دوا نەخرێت، ئێمە لەدەستەی نووسەرانی یاساپارێزی کە هەموومان پارێزەرینو پارێزەری دیکەش لەگەلّماندایە پێکەوە هەموو کاتێکمان تەرخان دەکەین بۆ کارئاسانی ئەنجامدانی پرۆسەکە، هەر کە هاتینە دەرەوە هەمان رۆژ، پێنج پارێزەر (کەریم بەحریو سەردار کاوانیو برهان عوسمانو احمد عبدالله خدرو طارق جامبان) بۆ پراکتیزەکردنی ئەم ئەرکە مێژووییە رۆژانە کۆدەبووینەوە سوودمان لە ئەزموونی ئەوانەی پێشتر لەم بوارە کاریان کردووە وەردەگرت، هەروەها چەندین فەرهەنگمان لەبەر دەستدا بوو، پرسی زمانزانانو یاساناسانی دیکەشمان دەکرد، لیژنەی پشتیوانی لە بەکوردیکردنی دادوەری توانی حەفت سەد زاراوەی یاساییو بڕیارنامەو فۆرمی چۆنیەتی پێشکەشکردنی دەقی جۆری داواکانو... هتد (بڕوانە پاشکۆی ژ/٧) ئامادە بکات، کە بڕیارەکەش دەرچوو ژ ٣٤٣/٣ لە ٢٠٠٠/٥/٢٢ (بڕوانە پاشکۆی ژ

٨) هەندێ پارێزەر بە تەوسەوە دەیانگوت: (**قانونو زمانی کوردی کوجا مەرحەبا؟**) وەلێ بەئامادەکاری کەرەستەکانی سەرکەوتنی ئەم هەنگاوە پیرۆزە وەڵامیان درایەوە، هەندێکی دیکەش سەردانی لایەنەکانیان کرد بۆ راگرتنی یان دواخستنی، بەڵام کارەکەیان مایەپووچ دەرچوو، دواتر لە وەزارەتی داد لیژنەیەك بەفەرمانێکی وەزاری بۆ بەکوردیکردنی ئەو بابەتە پێك هێنرا، لیژنەکە ژمارەی ئەندامانی حەوت کەس بوون لە دادوەرو داواکاری گشتیو پارێزەرو دەرچووی بەشی کوردی پێك هات، ئەوانیش توانییان نزیکەی هەزار زاراوەی یاسایی (ساڵی ٢٠٠٠) ئامادە بکەنو دوو سەد فۆرمی فەرمانگەکانی سەر بەوەزارەتی داد ئامادە کرا سەرەڕای بریکارنامەی گشتیو تایبەتیو بۆ مەبەستی بەشداریکردن لە کورداندنی یاسا (بڕوانە پاشکۆی ژ/٩)، وەزارەتی داد نووسراوی بۆ زۆر لایەنی پەیوەندیدار نووسی (کۆڕی زانیاری کوردستان) وەلێ مامۆستا شوکر مستەفا بەتەنیا بوو، بۆیە نەیتوانی بەشداری کۆبوونەوەی لیژنەکە بکات، بەڵام کە لیستەکەی بەدەست گەیشت دوای ماوەیەك راو بۆچوونی خۆی بەنووسین بۆ نووسەری ئەم بابەتە نووسیو پاساوی هێنایەوە، بەڵام ئەوانی دیکە بێ دەنگ بوونو نوێنەری لایەنێکیان هات، کە زانی لیژنەکە پارەی تێدا نییە، (بەشداریی تاقە کۆبوونەوەیەکیشی نەکرد).

فەرهەنگۆکی زاراوە یاساییەکان کە لیژنەی بەکوردیکردن لە وەزارەتی داد ئامادەیان کردبوو بۆ کۆڕی زانیاری کوردستانیان نارد تاکو بەسەرنجو تێبینیو راو بۆچوونیان دەوڵەمەندتری بکەن، بەڵام ئەوان بەلیستی ژمارە (٤)ی کتێبەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان بەناوی (زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان) ساڵی ٢٠٠٤ بەچل لاپەڕە چاپو بڵاویان کردەوە (بڕوانە پاشکۆی ژ ١٠)، بێ ئەوەی ئاماژە بەلیژنەی بەکوردیکردنی وەزارەتی دادی حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەن کە ئەوان ئەم زاراوانەیان بۆ ناردوون، بەڵکو لیژنەیەکیان پێك هێناو بۆ ئامادەکردنیان نەك پێداچوونەوەیان، دەتوانن بەراوردێك لەنێوانیان بکەن کە زۆرینەیان هی لیژنەکەی وەزارەتی دادنو لە پێشەکییەکەیدا داوا دەکەن زمانی کوردی ببێتە زمانی فەرمی هەموو دادگاکانی

هەرێمی کوردستان، گەرچی ئەوسا چوار ساڵ بوو فەرمانە وەزارییەکەی ساڵی (٢٠٠٠) جێبەجێ دەکراو کەوتبووە بەرکار.

لێرەدا قافی خۆیەتی بڵێم: دەبوایە هەر دوای دەرچوونی بڕیارەکە لە ٢٠٠٠ ئەم لایەنانە (پارێزەرانو دادوەرانو مامۆستایانی زانکۆ... هتد) یەکسەرو گەرماوگەرم لیژنەی (پشتیوانیو پشتگیرییان) پێك بهێنایە، بەڵام ئەوانەی خۆبەخشانە ئامادەیییان دەربڕی بۆ سەرکەوتنی کوردانـدنی یاسا ژمارەیان زۆربوو، بەڵام دەبوایە هەر ئەو لایەنانە لەبارەی داڕشتنی یاساو بڕیارەکانی پەرلەمانی کوردستان هەڵوێستیان هەبوایەو لیژنەیەك لە یاساناسانو زمانزانان پێك بهێنرایە، واتە بەسازدانو هەڵمەتێکی تێکڕاو پێکڕا لایەنەکانی پەیوەندیدار لە ڕێگای کۆنگرەو سمینارو کۆبوونەوەوە ڕۆڵی کاراو کاریگەریان هەبوایە، نەك بەنووسینێكو دووان. ئێستاش نەچووە بچێ، ئەوانەی زمانی کوردیو زمانی عەرەبییان لە ڕووی یاساییو زمانەوانی باشە لە مامۆستایانی زانکۆو دادوەرانو پارێزەرو مافپەروەرو... هتد. دەتوانن دەستبەکار بن بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە نەتەوایەتییە بگرنە ئەستۆو پاڵپشتی ئەو لیژنەیە بکەن کە بەپێی یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ٢٠٠٨ (یاسای ئەنجومەنی شوورای هەرێمی کوردستان) پێکهێنراوە. هیوادارین کە بەم ئەرکە دیرۆکییە رابن.

## میدیاکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی

میدیاکان (بینراو، بیستراو، خوێنراو) تا چ ڕادەیەك ڕۆڵیان لەم بارەوە هەبوو؟ ئاماژە بەژمارەی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە دەکەین کە لە هەرێمی کوردستان دەردەچنو ژمارەیان (٦٣٣)یە، زۆربەی زۆریان بەزمانی کوردی دەردەچن، سەرەڕای ٨٠ ئێزگەی ڕادیۆ کە بەشەپۆلە جیاجیاکانو (١٠٠) سەد تەلەفزیۆنی لۆکاڵیش پەخش دەکرێنو هەروەها ٢٠ بیست کەناڵی ئاسمانیو سایتەکان لە ئینتەرنێت بەزمانی کوردیش پەخش دەکرێنو دەخوێنرێتەوە، بەڵام چەندیان بە بەردەوامی لەبارەی زمانو ناسنامەی نەتەوەیی جەختو داکۆکییان کردووە؟ ئەگەر هەر ڕەخنەو گلەییەك لەهەر لایەنێك کرابێت ئەوا دەستبەجێ لەکاتو ساتی خۆیدا وەڵامیان داونەتەوەو بەدەنگ هاتوون، بەڵام لەم بوارەدا لەئاستی پێویستدا نین، بۆ نموونە (وەڵامدانەوە بەزمانی کوردی قەدەغەیە) بۆ چ بابەتەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان نەکراون بەزمانی کوردی و؟...هتد. ڕایان لەبارەی ئەم نووسینانەی لەسەر تابلۆی شوێنی گشتیو تایبەتییەکان لە دامو دەزگاکانی حکومەتو لە چێشتخانەو پسوولەی کڕینو نووسین لەسەر کیسی نایلۆنو کاغەزو... هتد. لەهەندێ شوێن ناونیشان بەزمانی کوردی فەرامۆش کراوە، وا دەزانن لێرە زمانێك نییە پێی بوترێ زمانی کوردی، ئەمەیان پێچەوانەی دەستووری کۆماری عێراق ماددەی ٤ (٢٠٠٥) کە دوو زمانی فەرمی عەرەبیو کوردی لە سەرتاسەری عێراق هەیە، بۆچی لەبارەی دەرنەچوونی یاسای زمان نانووسنەوە؟ ئەوەی نووسراوە، دەڵێن ژمارەیان یەکجار کەمە بەگوێرەی ئەو ئەرکە دیرۆکییەی دەکەوێتە ئەستۆی هەموومان، چونکە ستراتیژە (ئاسایشی نەتەوەیییە). دەپرسم ئەی ئەوانەی سووکایەتی بەزمانی کوردی دەکەن؟!
داواکاری گشتی کە نوێنەری مافی گشتییە تەنیا داواکارییەکیان لەم بارەوە تۆمار کردووەو زمانی کوردی بە بابەتێکی لاوەکی زانراوەو دانراوە، دەنا بۆچ ڕاگەیاندن گەرماو گەرم چاوپێکەوتنو ڕا و بۆچوون لەم بارەوە ساز ناکاو بەرنامەی تایبەتیش پێشکەش ناکرێ؟ ئەو ئەرکە دەبێ خەمی هەمیشەیی ڕاگەیاندن بێ، بەداخەوە وانییە، چونکە جاروبار بەبۆنەو ڕێکەوت باسێکی دەکەنو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیش کە ژمارەیان لە سەدانی تێپەڕ کردووە،

نەمانبیستووە جگە لە تاقە رێکخراوێك نەبێ کە زمانپارێزی بەئەرکی سەرەکی خۆی زانیبێ‌و بەکردار بەدواداچوون‌و پێداچوونەوەو سەردانی لایەنەکانی پەیوەندیداری کردبێت، بەرپرسەکان مناڵەکانیان تا نووکەش دەنێرنە بەرخوێندن بەزمانی عەرەبی، ناونانی منالآنی کورد زۆربەیان بەناوی کوردی ناونانرێ، ئەی لە بارەی ئەم دیاردەیە بۆچ و لەبەرچی باوك ناوی کوردییەو منالەکانیشی ناویان عەرەبییە؟ بەکورتی‌و کرمانجی راگەیاندن‌و میدیاکان‌و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە ئاستی پێویستدا نین‌و دەبێ بەخۆیاندا بچنەوە، چونکە زمان ستراتیژە، ئاسایشی نەتەوەییە، بەزاندنی هێڵی سوورە، تاکەی لەم بوارەدا زمانی کوردی بشێوێنرێ‌و لایەنەکانی پەیوەندداریش بەدەنگ نەیەن؟ (سەیری چاپەمەنییەکانی قۆناغەکانی خوێندن‌و ئەوانەی وەردەگێڕدرێنە زمانی کوردی) بکەن، ئایا بەکوردییەکی پاراو نووسراونەتەوە؟ پرسیارێکە ئایا (میدیاکان‌و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی) ئەم پرسە نەتەوەییە کە بەپلاندانان ئەنجام دەردێ هیچ چارەسەرێکیان بۆ دۆزیوەتەوە؟ نەخێر چونکە پێویستی بە کات‌و کاری زۆری هەمیشەیی هەیە.

**دەرەنجام**

بۆ ئەوەی سیاسەتی زمان وەکو وڵاتانو هەرێمەکانیان بەپلانـدانان بـەڕێوە بچێ، پێویستییەکی هەمیشەییمان بەم خاڵانە هەیە، تاکو بەرێکوپێکی لـە هـەموو ئاستو بوارەکاندا جێبەجێ بکرێت:—

١. دەرچـوواندنی یاسـای زمانـە فەرمییـەکان لـە پەرلـەمانی کوردسـتانو لـە پەرلەمانی عێراق، تاکو ماددەی چوار لە دەستووری کۆماری عێـراق ٢٠٠٥ بەڕاستیو دروستی پراکتیزە بکرێ.
٢. لیژنەی زمانپارێزی لە لیژنـە هەمیـشەییەکانی پەرلـەمانی کوردسـتان لـە نزیکترین دەرفەتدا لە یاساناسانو زمانزانان بڕیاری پێکهێنانی بـدرێ، بـۆ ئەو پڕۆژە یاساو بڕیارانەی بە دە پەرلەمانتار پێشکەش دەکرێن.
٣. لیژنەیەکی هەمیشەیی (لـە زمانناسـانو یاساناسـان) بـۆ داڕشـتنی یاسـاو بڕیارەکان بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبی لە ئەنجومەنی وەزیـران پێـك بهێنـرێ بـۆ ئـەو پـڕۆژە یاسـاو بڕیارانـەی لـە ئەنجومـەنی وەزیـرانو لایەنەکانەوە پێشکەش دەکرێن، نـەك فەرمانبـەرێك یـا دووان وەکـو هـەر ئەرکێکی فەرمانبەری ئاسایی ئەنجامی بدەن.
٤. دەبێ ئەکادیمیای کوردی پترو فراوانتر کـاتی بـۆ زمـانی کـوردی تـەرخان بکات چونکە رابوون بەم ئەرکە دیرۆکییە ئەمڕۆ یەکجار پێویـستە ئـەویش بەدانانی زاراوە بـۆ هـەموو بوارەکـانی ژیـانو سـاڵانە بەدواداچـوونیان بـۆ بکـات بـەگوێرەی گۆڕانکارییـەکان. هـەروەها لەگـەڵ لایـەنی پەیوەندیـدار تـابلۆی نووسـینی دەزگاکـانی حکومـەتو کـەرتی تایبـەتی لەلایـەنی زمانـەوانی بـە بـەردەوامی جـەختی لەسـەر بکەنـەوە، تـاکو پەرەپێـدانی ئەکادیمیای زمانی کوردی.
٥. بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکانیش لە زانکۆکانی کوردستان دەبـێ بەپلانـدانان لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی هـەموو بابەتـەکان بـەوەرگێڕانو دانـانو ئامـادەکردن ئـەنجام بـدرێنو چـیتر دوانـەخرێ کـە نـۆزدە سـاڵە دواخـراوە، تـاکو دیـواری بـەرلین تـەخت بکـرێو نـەمینێو جگەرگۆشەکانمان لەجیاتی ئەوەی دڵەڕاوکێو بێزارییان لە زمانی کـوردی

هــەبێ، بەئاســوودەییو دڵنیــایی بــەزمانێكی كــوردی پــاراو بخــوێننو سەرچاوەش بەزمانی كوردی پترو فراوانتر بكرێت، ئەمڕۆ تێـزی ماسـتەرو دكتۆرا لە زانكۆكانی كوردستان ڕێژەیەكی زۆر كەمیان بـەزمانی كـوردینو ئەوانی دیكەش زۆرینەیان بەزمانی عەرەبین.

٦. دەبـێ ڕاگەیانـدن (میـدیاكان) و ڕێكخراوەكـانی كۆمەڵگـەی مـەدەنی بـە خەمخۆرییــەكی وڵاتپارێزانــە چــاودێری زمانپــارێزی بكــەنو بەئــەركی دیرۆكەییان بەگوێرەی پێویست رابن، كـە تـاكو ئێـستاشی لەگـەڵ دابـێ بەڕێكوپێكی جەختی لەسەر نەكراوە.

٧. زمان بنەمایەكە لە ئاسایشی نەتەوەیی، ستراتیژە، دەبێ ببێتـە بەشـێكی دانەبڕاو لە هزرو بیری هەر تاكێكی كـورد لـە هـەر شـوێنێكی دونیـادا بـن. ئەوەی بەچـاوێكی كـەمو نـزمو خـوارتری دابنـێ ئـەوا پێویـستە یەكسەر وەڵامی بدرێتەوەو داواكاری گشتی لە دادگاكان داوای لەسەر تۆمار بكات، چونكە پەیوەستە بەپیرۆزیو مەزنیو بەرزی لە لای چل ملیۆن كوردو لـە هیچ زمانێكی دیكە كەمتر نییە، بەڵكو یەكسانە لەگـەڵیانو پێكـەوەژیانو لێبوردەیی وای كردووە كە نەتەوەكانی دیكـەی كوردسـتانیش ئـەم مافـە ڕەوایەیان هەبێ چ لە شاخ چ لە شار پراكتیزە كراوە بەخوێنـدن بـەزمانی توركمانیو سـریانیو ئەرمـەنیو هەرسـێ دەسـەڵاتی هـەرێمی كوردسـتان بەشــداری دەكــەن. بــەڵام هەنــدێ لــەو قوتابخانانــەی لــە كوردســتان كراونەتەوە جگەرگۆشەكانیان لـە هەسـتی نەتەوایـەتی دوور دەخەنـەوەو پێویستە لایەنی بەرپرس پلانیان هەبێ بۆ نەهێشتنی ئـەم مەترسـییە كـە لەئایندەدا چاوەڕوان دەكرێ.

٨. دەبوایــە ئەوانــەی زمــانی بیــانی دەزانــنو توانــای وەرگێڕانیــان هەیــە ئەزموونی وڵاتانی فرەزمان بكەنە زمانی كـوردیو عـەرەبی چ دەسـتووری وڵاتو هەرێمەكانیان یان یاسای زمـانی وڵات یـا هەرێمـەكانیان، هـەروەها ئــەو شــاندانەی ســەردانیان كــردوون دەبوایــە لــەبارەی ئــەزموونیان لــە كەناڵەكانی ڕاگەیاندن بینـراو، بیـستراو، خـوێنراو پـەخشو بڵاوبكەنـەوە، چونكە لەم بارەوە نەك بەزمانی كوردی، بەڵكو بەزمانی عـەرەبیش نییـەو

بۆ وشیاری نەتەوەییو یاساییو فیدراڵی ئەم جۆرە بابەتانە یەکجار پێویستێکی هەمیشەیین بۆ ئەو کەسانەی لەیەك زمانو یەك نەتەوە راهاتوون.

٩. پێویستە لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی (پەرلەمانی کوردستانو پارێزگاکانو ئەوانی دیکە) دا لە خاڵە سەرەکییەکان بێتو پێویستە نەك هەر لە پەیرەو و پرۆگرامی ناوخۆی لایەنەکان دابێ، بەڵکو هەریەکێکیان بەرنامەی تایبەتی خۆی هەبێ بۆ سیاسەتی زمان هەروەکو پارتی سەوز لە کۆماری ئێرلەندا کە ماوەی بیست ساڵە (٢٠٠٩– ٢٠٢٩) سیاسەتی زمانی داناوە. پێویستە سیاسەتی زمان هەمیشە جەختی لەسەر بکرێو لە کارنامەی کابینە یەك لەدوا یەکەکانی حکومەتی کوردستان دابنرێت، تاکو هەر لایەنێك سیاسەتی زمانی خۆی هەبێو ململانێ لە نێوانیاندا لەسەر زمانپارێزی بێ، چونکە لە ستراتیژی ئاسایشی هەر نەتەوەیەکدایە، گەر سیاسەتی زمانمان نەبێ، نەوەی ئایندە پەنجەی کەمتەرخەمیو خەمساردیو بێباکیمان ئاڕاستە دەکات، منیش دەڵێم راست دەکەنو دەپرسم تاکەی بێدەنگیو خۆکرکردنو تاکەی سیاسەتی زمانمان نەبێ؟ بەڵام چ کاتو وەختێ؟ دەبا چیتر دوانەکەوێو دەستبەجێ دەستبەکار بین.

١٠. لە مەرجەکانی ئەو کەسەی دەیەوێ بە بەردەوامی لە هەرێمی کوردستان نیشتەجێ بێ، پێویستە تاقیکردنەوەی زمانی کوردی بەنووسینو خوێندنەوەی بۆ بکرێو هەمان تاقیکردنەوەش بۆ دامەزراندن لە دەزگاکانی حکومەت ئەنجام بدرێ. جگە لەوانەی کە بەزمانی کوردی خوێندوویانە.

١١. لە بودجەی ساڵانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان برە پارەیەکی چاك بۆ سیاسەتی زمانی کوردیو زمانەکانی دیکەی کوردستان تەرخان بکرێ، چونکە زۆر دیدارو سیمینارو کۆنفرانس دەبەسترێو پارەیەکی زۆری لێ سەرف دەکرێ، بەڵام ئەم بوارە ناگرێتەوە، بۆچو لەبەر چی ئەم بوارە

(سیاسەتی زمان) کە لە ستراتیژی نەتەوەییە سیاسەتێکی تایبەتی بۆ دانانرێ؟

١٢. کۆمسیۆنی زمانە فەرمییەکان بەئەرکی پراکتیزەکردنی بەکارهێنانی لە هەموو بوارەکانو لە ئانو ساتی خۆیدا هەڵدەستێت بەهۆشداریو سزای ئەوانەش دەدا کە دەستبەجێ نایخەنە بواری جێبەجێکردنو لە هەندێ وڵاتیش پۆلیسی زمان هەیە کە چاودێری نووسینەکانی سەر دەزگاکانی حکومەتو کەرتی تایبەت دەکات.

١٣. بەپلانێکی درێژخایەن زمانپارێزی لە بواری پەروەردەو فێرکردنو میدیاکان کاری بۆ بکرێو دەستبەجێ خەمخۆرانی بەم ئەرکە رابن.

١٤. لیژنەی تایبەتی هەمیشەیی بۆ زمانپارێزی لە ئەنجومەنی وەزیرانو وەزارەتەکانو ئەنجومەنی پارێزگاکان بەسەرپەرشتی لایەنە پەیوەندیدارەکان پێك بهێنرێ بەمەرجێ بەپلاندانانی تۆکمە کارەکانیان ئەنجام بدەن تاکو جگە لەنووسراوەکان، نووسینی سەر شوێنە گشتیو تایبەتییەکانیش بەوردیو قووڵی چاودێری بکرێنو، دەبێ بەهەردوو زمانی فەرمی عەرەبیو کوردی بەپاراویو رێکوپێکی بنووسرێن.

## پاشکۆی ژمارە (١)
## سیاسەتی زمان لەلایەن حزبی کەسك (سەوز)ی کۆماری ئیرلەندا.
## سیاسەتی گشتیی زمانی ئیرلەندی

دەقی کۆتایی (ئادار ٢٠٠٩)

**پێشەکی:**

**١- زمانی ئیرلەندی و بنەماکانی پارتی سەوز**

پارێزگـاریی لـە زمـانی ئیرلەنـدی کۆکـە لەگـەڵ بنـەما سـەرەکییەکانی دامەزراندنی پارتی سەوز. ئێمە بڕوامان وایـە کـە گفتوگۆ لەسـەر سـامان کـارێکی گرنگە بۆ کۆمەڵگایەکی بەردەوام، کەواتە زمـانی ئیرلەنـدی سـامانێکی کـەلتووریی گرنگە بۆ گەلی ئیرلەندا، بەڵام پێگەی ناسکەو تووشی شکست هـاتووە، کـە دەبـێ پارێزگاری لێ بکرێت. ئێمەش وەك پاسـەوانی خـاك، بەرپرسـین لـە گواسـتنەوەی سامانەکانی، بە سامانە ڕۆشنبیری و زمانەوانییەکەیـەوە، بـۆ نـەوەی داهـاتوو، بـە دروستی و بێ کەموکورتی.

زاناکانی زمان بەمتمانەوە دەڵێن" لە سـەدەی داهـاتوودا، رێـژەی ٩٠ ٪ لـە کۆی ٦٠٠٠ تا ٧٠٠٠ زمان لەسەر زەوی مەترسی لەناوچوونی لێ دەکرێـت و ڕێـژەی ٥٠٪ی زمانەکانی جیهان لە گیانەلادان، واتە منـاڵان بـە شـێوەیەکی زگمـاك پێیـان نادوێن. بۆ وێنە، هەرچـەندە لـە ئەمـەریکای بـاکوور ٢٠٠ زمـانی نیـشتمانی هەیـە، زۆربــەیان لەگیانــەلای لەناوچــووندان، ئەمــەش کارەســاتێکە بەســەر کــەلتوورو ناسنامەدا دێت بێ ئەوەی گەل هەستی پێبکات. وا مەزەندە دەکرێت کـە لـە هـەر دوو حەفتەدا زمانێك لـە جیهانـدا لەناودەچـێت، نـاش زانـین ئایـا زمـانی ئیرلەنـدی لەنێو ئەو پێکراوانەیە، یان نا؟ هەرچەندە ١،٦٥ ملیۆن هاووڵاتی لە کۆمـاردا، یـان بڵـێین ٤٠،٨٪ دانیـشتوان دەڵـێن ئێمـە بـەزمانی ئیرلەنـدی دەدوێـین و هەرچـەندە ٤٥٣,٢٠٧ یان بڵێین ١١،٢٪ی هاووڵاتیان دەڵـێن رۆژانـە لـە سیـستەمی پـەروەردە زمـانی ئیرلەنـدی بـەکار دەهێـنن، کەچـی تـەنها ٧٢,٠٠٠ کـەس یـان ١،٧٨٪ی دانیشتوان رۆژانە لە دەرەوەی سیـستەمی پـەروەردەدا بـەکاری دەهێـنن. زمـانی ئیرلەندی وەك زمانی کۆمەڵگای گێلتاخت 'Gaeltacht'(واتە ئـەو ناوچـانەی تـا ئێستا بـەزمانی گێـل دەئـاخڤن. وەرگێـڕ) ئێـستا بـەرەو نـەمان دەڕوات کـە بۆتـە

سەرمەشقی زاناکانی زمانەوانیی نێونەتەوەیی بۆ لێکۆڵینەوە لە پرسی مردن و لەناوچوونی زمان.

پارتی سەوز ناتوانێ ئەو هێرشە دڕندانەیە لەسەر سامانەکانی کەلتووری سەر گۆی زەمین پشتگوێ بخات، ئەوەتا هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە، وەك سامانێکی ڕۆشنبیریی ئیرلەندا، گرنگییەکی تایبەتی بە زمانی گێل دراوە. ئەم نامیلکە پلانەش کە لەسەر بنەمای ژینگە و سیاسەتی گشتیی زمانەوانی ڕێکخراوە، ئامانجی چارەسەرکردنی ئەم گرفتەیە و ئەمەی خوارەوەش ئاکارێکی درێژی ئەو ڕێکارانەیە کە پارتەکەمان پێشنیازی کردووە بۆ چارەسەرکردنی پرسی زمانی ئیرلەندی.

## ٢- زمانی ئیرلەندی و هەرێم

بەهۆی ئەوەی پارتی سەوز پارتی سەرتاپای ئیرلەندایە، پێویستە چاو بە سیاسەتی گشتیی زمانەوانی فەرمیی هەر دوو هەرێم بخشێندرێت. بەهۆی هۆکارە مێژووییەکانەوە تا ئێستا جیاوازییەکی گرنگ هەیە لە نێوان سیاسەتی زمانی ئیرلەندی کە ویلایەتی ئیرلەندا و دەوڵەتی ئینگلیز پیادەی دەکەن و لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە سیاسییانەی ئێستا لە ئیرلەندای باکوور هاتوونەتە کایەوە، بۆی هەیە ئەو جیاوازییە تا ماوەیەکی دیکەش بمێنێت. لە ڕووی مێژووەوە ویلایەتی باشوور دەستی یارمەتیی فەرمی درێژ کردووە بۆ پەرەپێدانی زمانی ئیرلەندی (هەرچەندە کەلێنێکی فراوان هەیە لەنێوان ڕوانگەی فەرمی و کرداری)، بەڵام ئیرلەندای باکوور تا ئەو نزیکانەش هەڵوێستی ناحەزانە بوو.

**أ) پلانی نیشتمانی ماوە درێژو ناوخۆیی بۆ زمانی ئیرلەندی:**

- پارتی سەوز پێشوازی لە بەڵێنی حکومەت دەکات بۆ دامەزراندنی ستراتیجی بیست ساڵەی زمانی ئیرلەندی کە لەسەر بنەمای چاکترین پیادەکردنی نێودەوڵەتی لە ڕووی پلاندانان و سیاسەتی زمانەوانی داندراوە. پارتیشمان بەشداری لە پێشخستنی ئەم ستراتیجە کردووە.

- بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی کە ستراتیجەکانی نێوخۆیی و نیشتمانیی زمانی ئیرلەندی بەرێکوپێکی نوێ دەبنەوە، پارتی سەوز داوا دەکات پرۆسەکە لە دواڕۆژدا بنەتانێکی یاسایی پێبدرێت (هەر وەك لە سکۆتلانداو وێلز پێیدراوە) و بەشی کاروباری کۆمەڵگا و دێهات لەدواڕۆژدا ڕۆڵی ئامادەکردن و پیادەکردنی ستراتیجەکانی نیشتمانی و گێلتاخت و ناوخۆیی (دەرەوەی گێلتاخت) یان پێبدرێت.
- لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٧دا راپۆرتێکی دوورو درێژ لەبارەی دەوڵەت و باری زمانی ئیرلەندی بڵاوکراوەتەوە (بڕوانە خاڵی ٥). پارتی سەوز دەستخۆشی لە بڵاوکردنەوەی تۆژینەوەکە دەکات.

**ب) یاساکاری زمان:**

- پارتی سەوز داوای زێدەکردنی سەرلەبەری بڕو پێوەری خزمەتگوزارییەکانی زمانی ئیرلەندی دەکات کە دەوڵەت پێشکەش بەو کەسانەیان دەکات کە ئارەزوو دەکەن کاروبارەکانیان بە زمانی ئیرلەندی ڕایی بکەن. بۆیە پارتی سەوز بەتوندی پاڵپشتی لە پیادەکردنی تەواوی یاسای زمانە فەرمییەکانی ساڵی ٢٠٠٣ لە کۆمار و لە هەڵمەتی یاسای زمانی ئیرلەندی دەکات لە ئیرلەندای باکوور.
- پارتی سەوز پاڵپشتی لە بەرنامەی ئێرلەندا دەکات سەبارەت بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بە دوو زمان (پێشنیازەکە کارایە). بەپێی بەرنامەکە، دامەزراوە گشتییەکان خزمەتگوزارییە دوو زمانییەکانی خۆیان چالاکانە و بەردەوام بڵاوبکەنەوە بەشێوەیەك کە کۆمەڵگای زمانە کەمینەکان تێبگەن کە ئەو خزمەتگوزارییانە بێ ئاستەنگ لەبەر دەستدان. ئێستا ئەو بەرنامەیە کاری پێ ناکرێت و کارابوونی یاسای زمانەکانی فەرمی ڕاگرتووە.
- بۆئەوەی سەرکردایەتییەکی سیاسی بەهێز پیشان بدرێت سەبارەت بە یاساگەری، پارتی سەوز داوای دامەزراندنی یەکەیەکی زمانی ئیرلەندی لە سەرۆکایەتی حکومەت دەکات بۆ دڵنیایی لە پیادەکردنی یاسای زمانەکان لە گشت فەرمانگەیەکی حکومەت لە سەرانسەری کۆماردا.

- لەبەر ئەوەی هەڵەیەکی زمانەوانی زۆر هەیە لە تابلۆ هەڵواسراوەکان (بەتایبەتی لە تابلۆکانی ڕێگاوبان) لە سەرانسەری وڵات، پارتی سەوز داوا دەکات دەسەڵاتێکی زیاتر بە کۆمیساری زمان بدرێت بۆ ئەوەی وابکات گشت تابلۆکانی گشتی بەزمانی ئیرلەندی بەهەڵە نەنووسرێن.
- دەکرێ خزمەتگوزارییەکانی گشتیی زمانی ئیرلەندی بە دوو شێوە پێشکەش بکرێن:( أ) بە وەرگێڕانی دۆکیۆمەنتە فەرمییەکان و هەر شتێکی تر. (ب) بە دامەزراندنی ئیرلەندی زمانەکان لە دەسگا گشتییەکان. پارتی سەوز شێوەی (ب) بەباشترین ڕێگەچارە دەزانێ لە ڕووی خەرجی و زمانەوە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری زمانەوانی، بەڵام ئێستا شێوەی (أ) مان پێویستە تا ئەوکاتەی ژمارەی پێویست لە فەرمانبەری گشتی دوو زمانزان دادەمەزرێن. بۆ دڵنیابوون لە زمانێکی ئیرلەندیی بە پێوەرێکی بەرز لە هەر بابەتێکی وەرگێڕدراو، پارتی سەوز داوا دەکات فەرمانگە حکومییەکان ئەو وەرگێڕانە کار پێ نەکەن کە مۆری ڕێپێدانیان لەلایەن ستانداردی زمانی گێڵ یان نەبێ.

**ج) دەوڵەت و کەرتی زمان**

- لەبەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوە لەسەر کەرتی خۆبەخشکاری زمانی ئیرلەندی، پارتی سەوز هانی ئەوە دەدات کە چاو بخشێندرێتەوە بە سەراپای پەیکەری کەرتەکە و لێتۆژینەوە بکرێت لەسەر خەرجی و بەرپرسیارێتی نێوان فەرمانگەکانی تایبەتمەند بە زمان و دەسگا هەمەجۆرەکانی خۆبەخشی زمانی ئیرلەندی لە سەرتاپای وڵات.
- پارتی سەوز داوا لە فەرمانگەی ستاندەردی زمانی گێڵ دەکات لێتۆژینەوەیەك ئەنجام بدات لەسەر بەکارهێنانی زمانی ئیرلەندی لەسەر ئاستی نیشتمانی و باکوور و باشوور و لەسەر هەڵوێستەکان لەبارەیەوە بەپێی بەرپرسیاریی یاسایی ئەو فەرمانگەیە.

## ٣- زمانی ئیرلەندی لە پەروەردەدا

### أ) زمانی ئیرلەندی لە قوتابخانەدا:

- پارتی سەوز داوا دەکات چاوخشانەوەیەکی سەرانسەری بکرێت سەبارەت بە فێرکردن و فێربوونی زمانی ئیرلەندی لە سەر ئاستەکانی سەرەتایی و دوای سەرەتایی لە کۆماردا، لە ئیرلەندای باکوور (هەروەها بڕوانە هەنگاوی ٤٢ لە سیاسەتی پەروەردە).
- تا ئەو کاتەی چاوخشانەوەکە دەری دەخات کە دەبێ ڕەوتێکی تر بگرێتەبەر، پارتی سەوز پاڵپشتی لە داخوازی ئەوە دەکات کە چاکسازی بکرێت لە فێرکردنی زمانی ئیرلەندی (تەنها لە کۆماردا) بەمەرجێك مامۆستاو دایك و باوکان پشتگیری لە ڕێکارەکە بکەن.
- لە کاتی ڕاهێنانیاندا، دەبێ گشت مامۆستایانی قوتابخانە سەرەتاییەکان، بە زمانی ئیرلەندی، ژینگەی دروست و بەپێزی ئیرلەندایان فێر بکرێت و بەقەد ساڵێکی خوێندن خولی ڕاهێنانیان چڕوپڕ بێت و دابەش بکرێت بەسەر سەرجەم خولەکە بە یەکەم مانگی پڕ چالاکییەوە.
- هەر منداڵێکی قوتابخانەی سەرەتایی جگە لە زمانی ئیرلەندی دەبێ بابەتێك بە زمانی ئیرلەندی بخوێنێت. ئەمەش دەبێ پێشەکی لەو شوێنانە پیادە بکرێت کە دانیشتوانی 'سەڵت' نەبن، ئینجا بەرەبەرە لە سەرانسەری وڵات پیادە بکرێت.
- دەبێ بەرنامەی دوو زمانەی ئیرلەندی لەدوای قۆناغی سەرەتایی پەرەی پێبدرێت (زمانی ئیرلەندی و ڕۆشنبیریی ئیرلەندی). دەبێ لە ئەزموونەکانی خولی زمانی ئیرلەندی، لە چوارچێوەی ئاماژەکارییەکانی گشتی ئەورووپی سەبارەت بە فێربوونی زمان، تواناکانی قوتابیان لەبارەی قسەپێکردن و نووسین و تێگەیشتن و نووسینەوەیان تاقی بکرێنەوە. دەبێ کۆرسی ڕۆشنبیریی زمانی ئیرلەندی لە گشت ناوچەکانی 'گێل' و 'سەڵت' نشین بکرێنەوە.
- هەرچەندە پارتی سەوز باوەڕی بەگرنگیی تواناکانی زارەکی هەیە، بەڵام سوورە لەسەر ئەوەی کە دەبێ سیستەمی پەروەردە لە هەردوو بەشەکەی

ئیرلەندا گرینگی یەکسانە بەتواناکانی تری زمانەوانی بدرێت (خوێندنەوە و نووسین و تێگەیشتن). بەتایبەتی گرنگی بە ئاستە نزمەکانی ئەدەب بە زمانی ئیرلەندی بدرێت.

- لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی لەبارەی بەدەستهێنانی زمان، پارتی سەوز زۆر پشتگیری لە پەروەردەی چڕوپڕ بە زمانی ئیرلەندی دەکات لە گشت قۆناغەکانی پەروەردە، لە باکوور و باشووردا، بە قۆناغی پەروەردەی چڕی پێشەکییەوەش. هەروەها، پارتی سەوز داوا دەکات لێکۆڵینەوەیەکی تر ئەنجام بدرێت لەسەر پەروەردەی چڕ لە ئیرلەندا هەروەك لەلایەن (فەرمانگەی زمانی گێڵ و.......و......و..).

**ڕاهێنانی مامۆستا:**

- پارتی سەوز داوای پلانێك دەکات بۆ زمانی ئیرلەندی لە خولەکانی ڕاهێنانی فەرمانبەران بۆ مامۆستایانی قۆناغی سەرەتایی و ئامادەیی. لە پلانەکەدا کۆرسەکانی نوێکردنەوەی زمانی ئیرلەندی و بەرنامەڕێژی بۆ زمانی ئیرلەندی لە قوتابخانەکانی هەردوو ناوچەی گێل و سەڵت و قوتابخانەکانی تردا.

**ج) خزمەتگوزارییە پەروەردەییەکانی تر:**

- پارتی سەوز داوا لە حکومەت دەکات بەزووترین کات، دامەزراندنی (بنکەی نیشتمانی بۆ پەروەردەی زمانی ئیرلەندی) دابین بکات لە (Baile Bhuirne) لە (Kork) ی ناوچەی گێل نشین، هەر وەك چەندین ساڵە بەڵێن دراوە (بڕوانە خاڵی ٥ لەخوارەوە).
- پارتی سەوز داوا دەکات ئەو قوتابیانەی بیرکۆڵن هاوکارییان پێشکەش بکرێت لە خزمەتگوزارییەکاتی زمانی ئیرلەندی و پێویستییە تایبەتییەکانی زمانەوانییان پێبدرێت، بە تایبەتی لە ناوچەی گێل نشین (بڕوانە ٥ی خوارەوە).
- دەبێ لە سەرانسەری وڵات یانەکانی ئەنجامدانی ئەرکیماڵەوە دابمەزرێن لە سەنتەرەکانی زمانی ئیرلەندی لە ناوچە شارنشینەکان، بۆ مێرمنداڵانی

ئیرلەندی زمان، یان بۆ ئەو مێرمندالآنەی زمانی ئیرلەندی دەخوێنن (بڕوانە ٦ لە خوارەوە).

- پارتی سەوز داوا دەکات سیستەمێکی نیشتمانی بۆ خوێندن دابمەزرێت بۆ ئەوەی ماوە بە گەنجان بدات کە لە کۆلێژەکانی زمانی ئیرلەندیی هاوینە دەوام بکەن.
- پارتی سەوز تێبینی دەکات کە زۆر لە کەسانی گەورە لە ئیرلەندا ئارەزوو دەکەن زمانی ئیرلەندی خۆیان نوێ بکەنەوە. بۆیە پارتی سەوز لەسەر بنەمای شێوازی مۆری وەرگێڕ، (بڕوانە ١ی سەرەوە) داوا لە دەستگای 'ستاندەردی زمانی گێل' دەکات بە هاوکاریی بەشداربووانی وەك (سەنتەری زمان لە 'نوی مەینووس')، سیستەمێکی نیشتمانیی پەروەردەی گەوران بۆ زمانی ئیرلەندی بێنێتە کایەوە بۆ دابینکردن و کردنەوەی چەند کۆرسێکی زمانی ئیرلەندیی ئاست بەرز بۆ گەوران لە سەرانسەری ولآتدا.
- پارتی سەوز داوا لە فەرمانگەی دارایی دەکات کە هاندەرەکانی باج دەربکات بۆ ئەو گەورانەی کە لە سیستەمی پەروەردەی گەوران دەخوێنن یان ئارەزوو دەکەن کە چەند کاتێك ڕابوێرن لە 'گێلتاخت' بۆ ئەم مەبەستە.

## ٤- هۆیەکانی ڕاگەیاندن

### أ) تەلەفزیۆن

- پارتی سەوز پشتگیری لە زێدەکردنی پشتەوانەی دارایی دەکات بۆ تەلەفزیۆنی TG4 و داوا لە حکومەت دەکات کە تەلەفزیۆنەکە بە 'لیستی بەراوردکاری' ببەستێتەوە.
- پارتی سەوز داوا لە تەلەفزیۆنی TG4 دەکات زۆر لەو پرۆگرامانە پەخش بکات کە بۆ خوێنەرانی زمانی ئیرلەندی ئاڕاستە دەکرێن.
- پارتی سەوز دەزانێت کە تەلەفزیۆنی TG4 بودجەکەی کەمەو ماوەی نادات کە خزمەتگوزاریی تەواوی زمانی ئیرلەندی پێشکەش بکات، بۆیە ناچارە پرۆگرامی ئینگلیزیش پێشکەش بکات. لەگەڵ ئەمەش پارتی سەوز داوا لە TG4 دەکات دەرامەتی تر بەکاربێنێت بۆ ئەوەی، بەپێی توانا، وەرگێڕانی

دامەنی شاشە پێشکەش بکات وەك رێگەچارەی بژاردە بۆ زۆر لە پرۆگرامەکان، هەر وەك تەلەفزیۆنی S4C لە 'وێلز' پیادەی دەکات.

- پارتی سەوز داوا لە تەلەفزیۆنی BBC ی ئیرلەندای باکوور دەکات پرۆگرامەکانی بە زمانی ئیرلەندی زیاد بکات.

**ب) خزمەتگوزاریی تر:**

- پارتی سەوز تێبینی دەکات کە رادیۆی RTE گێلتاخت بەکەڵکە بۆ کۆمەڵگای زمانی ئیرلەندی لە ئیرلەنداو دەرەوەیدا، بۆیە داوا لە حکومەت دەکات دارایی "لە لیستی بەراوردکاری" زیاد بکات.
- پارتی سەوز پشتگیری لە سیاسەتێکی پەخشکاری وا دەکات کە هەر پەخشکارێکی کەرتی گشتی و تایبەت لە کۆماردا برێکی بەرچاو لە زمانی ئیرلەندی پەخش بکات و BBCی ئیرلەندای باکوور پرۆگرامەکانی بە زمانی ئیرلەندی زیاد بکات. پارتی سەوز داوا دەکات 'یەکەی زمانی ئیرلەندی' لە نێو 'کۆمیساری پەخشی ئیرلەندا' دابمەزرێتەوە بۆ بەدواداچوونەوە بە برِو شێوازو پێوەری پرۆگرامەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن بە زمانی ئیرلەندی.

## ٥- زمانی ئیرلەندی لە کۆمەڵگادا: 'گێلتاخت'

- لە کۆی (٩١٨٦٢) دا، ٦٤٢٦٥ هاوولاتی، یان بلێین ٧٠٪ ئیرلەندی زمانن. تەنها ٢٢٥٥٠، یان ٢٤,٥٪ رۆژانە لە دەرەوەی سیستەمی پەروەردە، بە ئیرلەندی دەئاخڤن. لەگەڵ ئەمەش هێشتا زمانی ئیرلەندی زمانی کۆمەڵگایە لە زۆر جێگاو ئەمانەش ناوچە چرِەکانی زمانی ئیرلەندییە: (باکووری رۆژئاوای دۆنیگال.......هتد....). وا مەزەندە دەکرێت کە نزیکەی ٢٠,٠٠٠ هاوولاتی لەو ناوچانە بژین کە ئیرلەندی ـ زمان کۆمەڵگا پێك دەهێنن لە نزیکەی گشت بوارەکانی کۆمەلایەتی لە نێو ولاتدا. لە نێوان ٥٠٠٠ تا ١٠٠٠٠ ئیرلەندی ـ زمان هەیە لەو ناوچانەی کە رێژەیەکی بەرچاو لە هاوولاتیان زمانی ئیرلەندی بەکاردەهێنن لە ژمارەیەکی کەم لە بوارە کۆمەلایەتییەکاندا.
- ئاوابوونی زمانی ئیرلەندی وەك زمانی کۆمەڵگا کە لە نەوەیەك بۆ نەوەیەك دەرباز بووە، چاوی تێ برِیوین بە شێوازی هەرەشەی گۆرِانی کەش و هەوای

نالەبار کە لە دەرکردەکانی $CO_2$ دێتە کایەوە و هەڕەشە لەو ژینگەیە دەکات کە تێیدا دەژین. دەبێ پلانێکی کاری فریاگوزاری دابنـدرێت لـە ناوچـە گێـل ـ نشینەکان و پیادە بکرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی پتر دارمانی زمـانی ئیرلەنـدی لەو ناوچە گێـل ـ نـشینانەی هێـشتا پێـی دەئـاخڤن. پـارتی سـەوز دووبـارەی دەکاتەوە کە ئەمە گفتوگۆی سەوزە و نابێ پـارێزگـاری لـە زمـان و کـەلتووری ئیرلەندی جیا بکرێتەوە لە پارێزگاری لە ژینگە.

- پارتی سەوز دەستخۆشی لە گەلێك لەو ڕاسپاردانە دەکات کـە لێتۆژینـەوەی بـالا (.........) پێـشکەشی کـردوون و داوا دەکـەن ڕاسـپاردەکان بێنـە واری کردەنییەوە. پارتی سـەوز داوا لـە حکومـەت دەکـات گرنگییـەکی تایبـەت بـە ڕاســـپاردەکانی تایبـــەت بـــە ســـەنتەرەکانی پـــشتگیریی خێـــزان و خزمەتگوزارییەکانی گەنجان بدات، لەژێر ڕۆشنایی گرنگی جەماوەری گـەنجان بۆ بەرگریکردن لە زمان.
- پـــارتی ســـەوز پـــشتگیری لـــە داوای دامەزرانـــدنی دەســـتەی پـــەروەردەی "گێلتاخـت" دەکـات. (گێلتاخـت ئـەو ناوچـانەیە کـە تـا ئێـستا جێنـشینی ئیرلەندییەکانە- وەرگێڕ.) کە بەرپرسیاربێ لە گـشت قۆناخـەکانی پـەروەردە، لە قۆناخی پێش سەرەتاییەوە تا پاش سەرەتایی. دەستەکە هەمان فـەرمان و دەسـەڵاتی یاسـایی پێبـدرێت کـە بـە لیژنـەی پـەروەردەی پیـشەیی دراوە لـەبارەی بـەکرێگرتنی مامۆسـتایان و ڕاهێنـانی فەرمانبـەران و کردنـەوەی قوتابخانەو بەڕێوەبردنیان. ڕادەسپێرن لە هۆبەی پەروەردە بەرپرسیارێتی لە گێڵتاخت و گشت پەروەردەی زمانی ئیرلەندی بدرێت بە وەزیـری دەوڵـەت لـە بەشی پەروەردە.
- دەبـێ قوتابخانـەکانی گێڵتاخـت ئـەوە دابـین بکـەن، قوتابییـەکانی گێڵتاخـت تێگەیـشتنێکی قووڵتریـان پێبـدرێت سـەبارەت بـە قـسەپێکردن و شـێوەزاری زمانەکـەیان، سـەرباری فێرکردنـی گونجـاوی زمـانی سـتاندەرد (فەرمانگـەی تێگەیشتنی ستاندەرد). دەستەی پەروەردەی گێڵتاخـت لـەم بارەیـەوە ڕۆڵـی خۆی ببینێ.

- پارتی سەوز داوا دەكات حكومەت هەنگاو بنێت بۆ دامەزراندنی سەنتەری نیشتمانی بۆ پەروەردەی گێڵتاخت لە (Baile Bhuirne) لە ( Cork Gailtacht) هەروەكو چەند ساڵ لەمەو پێش بەڵێن درابوو (بڕوانە ٣ لەسەرەوە).
- پارتی سەوز ڕادەسپێرێت كە بەشێكی تایبەت لە 'دەسەڵاتی دەڤەری گێلتاخت' (Udaras na Gaeltacht) بكرێتەوە كە ئەركی ڕاپەڕاندنی كاروباری نیشتەجێكردنی قوتابیان بێت لە گێڵتاخت بۆ ئەوەی زمانی ئیرلەندی بپارێزێت.
- پارتی سەوز داوای هەرچی زووە پێشكەشكردنی هەمواركردنی یاساگەری دەكات بۆ ئەوەی ئەركەكانی 'دەسەڵاتی دەڤەری گێڵتاخت' لە پیشەسازییەوە فراوان بكرێت بۆ پرسەكانی كۆمەڵایەتی و كەلتووری و زمانەوانی. ئەم داوایەمان هاوتەریبە لەگەڵ ئارەزووەكانی چەند ساڵەی كۆمەڵگای گێڵتاخت.
- پارتی سەوز داوا دەكات كۆلێژێك لە گێڵتاخت بكرێتەوە بۆ ڕاهێنانی مامۆستایان بۆ پاراوكردنی كەسانی ئیرلەندی زمان، ئەو قوتابخانانەش لە بواری زمانی ئیرلەندی وانە بڵێنەوەو بەشێوەی سەرەكیش مامۆستایانی سەرەتایی ڕابهێنن لە قوتابخانەكانی گێڵتاخت و 'Gascoileanna'.
- پارتی سەوز داوا دەكات دارایی دابین بكرێت بۆ هاندانی پێشخستنی گەنجان لە ڕێگەی زمانی ئیرلەندی لە دەڤەرەكانی گێڵتاخت و لە كۆلێژەكانی ئاستی پلە سێ لە سەرانسەری وڵاتدا.

### ٦- زمانی ئیرلەندی لە كۆمەڵگا: لە دەرەوەی گێڵتاخت

- پارتی سەوز تێبینی دەكات كە كاری پێشەنگیی سەنتەری خۆبەختی زمانی ئیرلەندی ڕۆڵی خۆی هەیە لە پێشخستنی زمانی ئیرلەندی لە دەرەوەی گێڵتاخت.
- بۆ مسۆگەركردنی پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەو كەسانەی دەیانەوێت زانیارییان لەبارەی زمانی ئیرلەندی زیاد بكات، یان خزمەتگوزارییەكانیان

چاکتر بە زمانی ئیرلەندی پێشکەش بکرێت، پارتی سەوز رادەسپێرێت کە لە هەموو شارێکی ئیرلەندا تۆڕێکی زانیاری دابمەزرێت لە سەنتەرەکانی زمان کە ژمارەکانی ڕاستەقینەی ئەو کەسانە لەخۆ بگرێت کە بەزمانی ئیرلەندی دەئاخڤن (بەپێی سەرژمێرییەك - بۆ هەردوو کۆماری ئیرلەنداو ئیرلەندای باکوور). لەو سەنتەرە برێکی زۆر لە خزمەتگوزارییە زمانەوانییەکان پێشکەش بکرێن وەك: منالْ بەخێوکردن (دایەنگە)، وەرگێڕان، ئامۆژگاری بەکارهێنانی زمانی ئیرلەندی لە ئیشوکارەکان، پۆلەکانی خوێندنی زمانی ئیرلەندی، یانەکانی ئەرکی مالْەوە، ئامۆژگارییەکانی چۆنیەتی پێگەیاندنی منداڵان بەزمانی ئیرلەندی.و..هتد. ئێستا ئەم جۆرە سەنتەرە لە 'وێلز'دا هەیە.

- پارتی سەوز پێشوازی لە هەولْ و تەقەلاکانی رێکخراوی خۆبەخشی بێلْ (Baile) دەکات لە دامەزراندنی کۆمەلْگایەکی ئیرلەندی زمان لە لێنستەر (Leinster).

### ٧- زمانی ئیرلەندی و کۆچبەران

- پارتی سەوز بڕوای وایە کە دەبێ زمانی ئیرلەندی بۆ گشت کەسێك والاّ بێت، بێ لەبەرچاوگرتنی پێشینەی توخم، نەتەوە، یان ولاّتنامەیان. پارتی سەوز دەیەوێت کە زمانی ئیرلەندی بەکار نەیەت وەك ئامرازی توخم پەرستی دژی کۆچبەران، بۆیە داوا دەکات زمانی ئیرلەندی پێشخستنێکی ئەرێنی بەخۆوە ببینێ لەنێو کۆمەلْگاکەیاندا.
- پارتی سەوز داوا لە رێکخراوەکانی زمانی ئیرلەندی دەکات کە فەرمانبەرێکی بەرپرسیار دەستنیشان بکەن بۆ پێشخستنی زمانی ئیرلەندی لەنێو کۆمەلْگاکانی کۆچبەران.
- پارتی سەوز داوا لە حکومەت دەکات کە پۆلەکانی زمانی ئیرلەندی بەخۆڕایی بکرێنەوە بۆ هەموو ئەو کۆچبەرانەی ئارەزوومەند، هەر وەك وانەکانی زمانی ئینگلیزی کە ئێستا پێشکەش دەکرێن.
- پارتی سەوز پشتگیری لە دەرکردنی نامیلکەکانی هەمەزمان دەکات بە زمانی ئیرلەندی و بە زمانەکانی کۆچبەران بۆ ئەوەی کۆچبەران ڕستە سەرەکییەکانی ئاخاوتن بە زمانی ئیرلەندی فێر بن.

- پارتی سەوز داوا لە وەزارەتی داد دەكات كە هەر كەسێك داوای ولاتنامەی ئیرلەندی بكات بتوانێت تاقیكردنەوەی توانایی بە یەك لە زمانەكانی ئیرلەندی یان ئینگلیزی پێشكەش بكات و ئاسانكاری تەواو پێشكەش بەو كەسانە بكرێت كە هەر زمانێك لەو دوو زمانە هەڵدەبژێرن لە تاقیكردنەوەكە.

## ٨- زمانی ئیرلەندی و تەكنەلۆجیای زانیاری

- پارتی سەوز ڕۆڵی فێربوونی تەكنەلۆجیای زانیاری بە زمانی ئیرلەندی لەنێو نەوەی ئێستا بەگرنگ دەزانێت.
- پارتی سەوز دەزانێ كە ئەنتەرنێت، وەك تەلەفزیۆن، ناوەندێكی گرنگە بۆ فێربوونی زمان و زۆر ئامرازێكی گرنگە بۆ پێشكەوتنی دواڕۆژی زمانی ئیرلەندی.
- پارتی سەوز پشتگیری لە كارەكانی 'دامەزراوەی زمان ' Foras na Gaeilge' دەكات لە پێشخستنی تەكنەلۆجیای زمانی ئیرلەندی.

## ٩- زمانی ئیرلەندی لە یەكێتی ئەوروپا

پارتی سەوز پشتگیری لە پێگەی بەهێزی زمانی ئیرلەندی دەكات وەك زمانێكی فەرمی لە یەكێتی ئەوروپا كاردەكات بۆ ئەوەی پێگەكە بەتەواوی پیادە بكرێت. پشتگیری لە دەستپێشخەرییەكی پەروەردەیی یان ڕاهێنكاری دەكات بەئامانجی پتركردن و پێشكەشكردنی ڕاهێنراوانی وەرگێڕ و شیكەرەوە. پارتی پێشوازی ئەو ڕاستییە دەكات كە پێگەی فەرمی هەلی دارایی ڕەخساندووە بۆ پرۆژەكانی پەروەردەیی و كەلتووری بە زمانی ئیرلەندی لەسەر ئاستی ئەورووپی و هەلی كاری بەهێز كردووە بۆ ئەو هاوولاتییە ئیرلەندییانەی بەدوای كارەوەن لە دامەزراوە ئەورووپییەكاندا.

**وەرگێڕ لە ئینگلیزییەوە**
**پارێزەر عبدالكریم هەمەوەند**
**١٥-١٠-٢٠١٠**

**پاشکۆی ژمارە (٢)**

بەرەی کوردستانی عیراق

دەزگای ڕاگەیاندن

## بەرنامەی پەیڕەوی ناوخۆی

## بەرەی کوردستانی عیراق

لە یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتی

سیاسی لە حوزەیرانی ١٩٨٨ دا

بڕیار دراون

**ئەم بەرهەمە چاپکراوە گەرچی بەزمانی کوردی نووسراوە**

**بەڵام ناوی هیچ زمانێکی تیا نەهێنراوە**

## پاشکۆی ژمارە (٣)



KURDISTAN PARLIEMENT
LAW PROJECT COMMITTEE

لیژنەی پرۆژەی یاسای پەرلەمانی
کوردستانی عیراق

ژمارە /
بەروار /

[illegible] سەرۆکایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی بەڕێز

سەرۆ ویزنان هەیە :

جێی شانازی وسەربەرزیە کە بەرەی کوردستانی ئیمەی هەلبژارد ووە بۆ دانانی پرۆژەی یاسای ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان کە یەکەم یاسا ئەبێ کورد بۆ گەلی کوردستانی دائەنێ [illegible] سەرداواکاری بەڕێزتان لیژنەکەمان دەست بەکار بوو لە ماوەی رابردوودا بۆهێنانەدی داواکەتان لە رۆژانی ٢٣ و ١٩٩١/١٢/٢٤ دا وە لە رۆژانی ٢ و ٣ و ٤ و ١٦ و ١٧ و ١٨ و ٢٠ و ٢٧ و ١٩٩٢/١/٢٨ دا لە کۆلیجی یاسای زانکۆی صلاح الدین بەکاری خۆی هەلسا و توانی ئەم پرۆژەیە دا بنێ کە لەگەڵ ئەم یادداشتە داینە .

بەڕێزان :

هەولمان دا ئەو پرۆژە کە بگونجێ لەگەل مبادیء گشتی یاسا و بە شێوەیەکی دیموکراتیانە پرۆژە خوازراوە بێ . دوای ئەوەی سوودمان لە چەند تەدبین سەرچاوە وەرگرت هەروەها ئەڤەلامان سەبەت بوو پرۆژە کە بگونجێ لەگەل بارودۆخی کوردستاندا . واتە ئەتوانرێ لە ئاینەدەدا لە لایەن خودی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانەوە گۆڕان کاری تێدا بکرێ بەپێی پێویست .

بەڕێزان :

شاراوە نیە کە شێوەی هەلبژاردن . واتە زوور بەجێی لە لایەن بەڕێزتانە وە پەسند کراوە ژمارەی (٣٠) هەزار کەس نوێنەرێکمان هەبێ بڕیاری بەرەی کوردستانی یە . ئاشکرایە ئاوچەیکی کراوان لە کوردستان دا بڕاوە لەم کاتە دا لەژێر دەسەلاتی بەرەی کوردستان دا نیە بۆیە پێویستمان زانی لە پرۆژەکەدا ئەم لایەنە رەچاو بکرێ بۆیە مادەی (١٢) بۆ ئەم مەبەستە دا ڕێژراوە . هەرکاتی ئەو ناوچانە ئەبەزانەوە پال ناوچەکانی ئازاد کراو ئەتوانرێ هەلبژاردنێکی تایبەتیان بۆ ئەنجام بدرێ بۆ نوێنەرەکانیان بچنە ناو ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عیراقەوە .

هەروەها بۆ ئەوەی هەموو کە مایەتی یەکان بەشداری هەلسوڕاندنی کاروباری ولات بن و نوێنەری خۆیان هەبێ لە ئەنجومەنەکەدا مادەی (١٣) دا ڕێژرا .

بەڕێزان : ئێمەمان وایە ئەم خالانەی خوارەوە جێ بەجێ بکری :-

١) وامان بەپەسند زانی یاساکە لە سەرەتاوە بە زمانی عەرەبی دابنرێت . داوی ئەوەی کە لە [illegible] لایەن [illegible] رکردا یەتی سیاسی بەرەی کوردستانی یەوە پەسند ئەکرێ و بڕیاری لە سەر ئەدرێ

## پاشکۆی ژمارە ( ٤ )

رۆژنامەی وەقایعی کوردستان  جريدة وقائع كوردستان

**پەرلەمانی کوردستان - عیراق**

**ژمارە : ١٦٢٨ لە ٢٠١٠/٩/٢٣**

**بەیاننامە**

پشت بەحوکمی ماددەی هەشتەم لە ( یاسای بلاوکردنەوە لە رۆژنامەی فەرمی وەقایعی کوردستان ) ژمارە (٤)ی سالی ١٩٩٩ و لەبەر ئەوەی هەلەیەك لە وەرگێرانی ماددە (٤٤) نوسخە کوردییەکەی ( یاسای وەزارەتی خوێندنی بالاو توێژینەوەی زانستی ) ژمارە ( [illegible] )ی سالی ٢٠٠٨ دا روویداوە . کە لە ژمارە (٩٠)ی لە (٢٠٠٨/٨/١١) رۆژنامەی وەقایعی کوردستاندا بلاوکراوەتەوە ، چونکە دەقە راستەکەی ماددەی ناوبراو لە نوسخەی عەرەبییەکەدا بەم جۆرەیە :-

( أولاً : يحتفظ أعضاء الهيئة التدريسية بمراتبهم العلمية و سائر الحقوق في هذا القانون و القوانين الأخرى و الانظمة و التعليمات الصادرة بموجبها في حالة تنسيبهم أو تفرغهم في وظائف خارج الجامعات و الهيئات و تعيينهم أو نقلهم الى وظائف في مركز الوزارة أو مراكز الجامعات و الهيئات ، وتعتبر مدة قيامهم بهذه الوظائف خدمة جامعية فعلية لأغراض الترقية والعلاوة و الترفيع والتقاعد ) .

کەچی رستەی ( في مركز الوزارة ) کە لەدێری چوارەمی ماددەکەدا هاتووە بە هەلە وەرگێرانەکەی کراوە بە (دەرەوەی سەنتەری وەزارەت) و راستەکەشی ( لە سەنتەری وەزارەت )ــە ، لەبەر ئەوەش کە نوسخە عەرەبییەکە بە ئەسل دادەنرێ ، بەو پێیەی کە دەقێکی ئەسلییەو لەلایەن پەرلەمانەوە دەنگی لەسەر دراوە و نوسخەی کوردییەکە وەرگێرانی دەقە ئەسلییەکەیە دەبێ وەك ئەو بێ .
وە بۆ ئەوەی ئەمە رەچاو بکرێ و بەپێی ئەو دەقەی لە نوسخەی عەرەبییەکەدا هاتووە پشت بە ماددە (٤٤)ی یاسای ناوبراو ببەسترێ ، بە پێویستمان زانی ئاماژەی پێ بدەین و ئەم بەیاننامەیە دەربکەین .

**فرست أحمد عبدالله**

**سکرتێری پەرلەمانی کوردستان - عیراق**

## پاشکۆی ژمارە ( ٥ )

# پرۆژەی دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق
## ٢٠٠٥

### وەرگێران بۆ زمانی کوردی

١- پارێزەر طارق جامباز

ئەندامی پەرلەمانی کوردستان ـ لیژنەی یاسایی.

٢- پارێزەر کریم بحری برادۆست

ـ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان ـ لیژنەی یاسایی.

٣- پارێزەر قادر سعید (زانا ڕۆستایی)

ـ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان ـ لیژنەی یاسایی.

٤- مامۆستا کرخی نجم الدین ئالتی بەرماخ

ـ ئەندامی پەرلەمانی کوردستان ـ لیژنەی مافی مرۆڤ.

### پێداچوونەوەی

١- دکتۆر حسین محمد طه بالیسانی

ـ بریادەری لیژنەی دارشتنی دەستوور لە کۆمەڵەی نیشتمانی عێراق.

٢- پێداچوونەوەی زمانەوانی

ـ مامۆستا مەجید ئاسنگەر- ڕاوێژکاری ڕاگەیاندن لە پەرلەمانی کوردستان.

## پاشکۆی ژمارە ( ٦ )

پوختەی ئاماری بە ژمارەی قوتابخانەکانی خوێندنی کوردی و خوێندنی عەرەبی لە هەرێمی کوردستان

| پارێزگا | باخچەی ساوایان | | بنەرەتی | | دواناوەندی | | ئامادەیی | | پیشەیی | | پەیمانگە | | خوێندنی خێرا | | کۆی گشتی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی | خ. کوردی | خ. عەرەبی |
| هەولێر | 145 | 0 | 1589 | 6 | 145 | 0 | 152 | 8 | 10 | 0 | 8 | 0 | 32 | 0 | 2081 | 14 |
| سلیمانی | 150 | 0 | 1414 | 2 | 44 | 0 | 181 | 1 | 11 | 0 | 8 | 0 | 15 | 0 | 1823 | 3 |
| دهۆك | 27 | 0 | 1288 | 15 | 18 | 2 | 140 | 8 | 5 | 0 | 6 | 0 | 21 | 0 | 1505 | 25 |
| گەرمیان | 12 | 0 | 254 | 1 | 16 | 0 | 24 | 0 | 1 | 0 | 4 | 0 | 20 | 0 | 331 | 1 |
| کۆی گشتی | 334 | 0 | 4545 | 24 | 223 | 2 | 497 | 17 | 27 | 0 | 26 | 0 | 88 | 0 | 5740 | 43 |

## پاشکۆی ژمارە ( ٧ )



فەرهەنگۆکی یاساپارێزی

بۆ پشتگیری کوردانەنی یاسا بەتایبەتی دوای ئەوەی فەرمانی وەزاری ٣ / ٣٤٣ لەرێکەوتی ٢٠٠٠\٥\٢٢ لە وەزارەتی داد دەرچوو بە ئەرکی سەر شانمان زانی تاکو جێبەجێ بکرێت ئەم زاراوە یاساییانە پێشنیار دەکەین کە لە کارو باری کوردانەنی یاسا بەکار بهێنرێن تا وشەو دەستەواژەی رەسمیو دیاریکراو دەخرێتە بەر دەست .

٢٠٠/٥/٣١

| ژ | عەرەبی | کوردی | ژ | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١. | إصرار | سوور بوون_شێلگیری | ٢٠ | إدارة | بەڕێوەبردن |
| ٢. | إحضار | هێنان | ٢١ | إنكار العدالة | نکوڵیلەدادپەروەری |
| ٣. | إحضار جبري | پەلکێش | ٢٢ | إناطة | پێسپاردن |
| ٤. | أداء | بەجێ هێنان | ٢٣ | أناط | پێی سپارد |
| ٥. | استثناء | بەدەر | ٢٤ | إحقاق الحق | ماف پێدان |
| ٦. | اقتباس | لێوەرگرتن | ٢٥ | إعانة | یاریوو |
| ٧. | إقرار | دان پێدانان | ٢٦ | استمد | وەرگرتن |
| ٨. | إنذار | هۆشداری | ٢٧ | انكماش | پووکانەوە |
| ٩. | تفكك | ترازان | ٢٨ | امتناع | مل نەدان |
| ١٠. | أهلية | تواناداری_لێهاتوویی | ٢٩ | اتباع | پەیڕەوکردن |
| ١١. | إحالة | رەوانەکردن | ٣٠ | استناد | پشت بەستن |
| ١٢. | إخلال | پابەندنەبوون | ٣١ | استيعاب | وەرگرتن-وەریگرت |
| ١٣. | التزام | پابەندبوون | ٣٢ | اضطراب | شڵەژان |
| ١٤. | إرساء | جێگیربوون | ٣٣ | إثارة | وروژاندن |
| ١٥. | أمام المحكمة | لەپێش دادگا | ٣٤ | إعادة | گێڕاندنەوە |
| ١٦. | احتراز | چەپارەدان | ٣٥ | اختفاء | خۆشاردنەوە |
| ١٧. | اتفاقية | رێکەوتننامە | ٣٦ | إضبارة | پەروەندە |
| ١٨. | إعادة الدعوى | گێڕاندنەوەی داوا | ٣٧ | منتحر | خۆکوژ |
| ١٩. | بنظر الاعتبار | بەلەبەرچاوگرتن | ٣٨ | انتحار | خۆکوشتن |

| ٣٩ | إشكال | گرفت | ٧٠ | أحكام | فرمانەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤٠ | حكم | فرمان | ٧١ | إرادة القتل | ویستی کوشتن |
| ٤١ | استمرار | بەردەوام | ٧٢ | الأحكام المتناقضة | فرمانە دژیەکەکان |
| ٤٢ | اختصاص | تایبەتمەندی | ٧٣ | إرادة | ویست |
| ٤٣ | استجواب - دواندن | لێپرسینەوە | ٧٤ | إبعاد | دوورخستنەوە |
| ٤٤ | استسلام | خۆبەدەستەوەدان | ٧٥ | اعتراض | ناڕەزایی |
| ٤٥ | إزعاج | جاڕسکردن | ٧٦ | اعتيادي | ئاسایی |
| ٤٦ | استئناف | تێهەڵچوونەوە | ٧٧ | اعتراف | دانپێدانان |
| ٤٧ | المستأنف | تێهەڵچوو | ٧٨ | إبراء الذمة | گەردن ئازادی |
| ٤٨ | المستأنف عليه | تێهەڵچوولێکراو | ٧٩ | إبراز | دەرخستن |
| ٤٩ | استيلاء | دەست بەسەرداگرتن | ٨٠ | اتخاذ القرار | بڕیاردان |
| ٥٠ | إطاعة | گوێڕایەڵی | ٨١ | إتلاف | کەڵکبڕین |
| ٥١ | إلغاء | هەڵوەشاندنەوە | ٨٢ | إثبات | سەلماندن |
| ٥٢ | إبطال | پووچەڵکردنەوە | ٨٣ | أثر | شوێن |
| ٥٣ | اغتصاب | خراپ کردن -بڕدان | ٨٤ | عديم الأثر | بێسەروشوێن |
| ٥٤ | غصب | زەوتکردن | ٨٥ | اجتهاد | خۆشرایی - کۆشش |
| ٥٥ | إعفاء | بەخشین | ٨٦ | الاجتهاد القضائي | خۆشرایی دادوەری |
| ٥٦ | الدعاوى المستعجلة | داواپەلـــــــەلێکراوەکان-داوابەلەزەکان | ٨٧ | أتعاب | ئەرکانە-ماندووبوونێتی |
| ٥٧ | ارتكاب | کردن | ٨٨ | إجماع | تێکڕا |
| ٥٨ | عفو | لێبوردن | ٨٩ | احتراف | پیشەگەری |
| ٥٩ | انتظام | بەرێکی | ٩٠ | احتضار | گیاندان |
| ٦٠ | إلزام | ناچارکردن | ٩١ | احتفاظ | هێشتنەوە |
| ٦١ | ملزم | ناچارکەر | ٩٢ | احتقار | سووکایەتی پێکردن |
| ٦٢ | ملزم | ناچار کراو | ٩٣ | إقامة الدليل | بەڵگە سازی |
| ٦٣ | اعتداء | دەستدرێژی | ٩٤ | احتمال | ئەگەر |
| ٦٤ | أمر | فەرمان | ٩٥ | احتيال | فێڵ کردن |
| ٦٥ | إرجاع | گەڕاندنەوە | ٩٦ | استنتاج | ئەنجامگیری |
| ٦٦ | ادعاء | داواکردن | ٩٧ | إجازة | مۆڵەت |
| ٦٧ | ادعى | داوایکرد | ٩٨ | أصول | باوان |
| ٦٨ | إفراز | جیاکردنەوە | ٩٩ | فروع | نەوە |
| ٦٩ | انحراف | لادان | ١٠٠ | إثبات | سەلماندن |

| ١٠١ | أحداث | نەوجەوانان | ١٣١ | إبراء | پاکانە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٢ | إبهار | بەکرێدان | ١٣٢ | إقامة الدعوى | داواسازی |
| ١٠٣ | إيجار من الباطن | بەکرێدان لەژێرەوە | ١٣٣ | إعلان | جاڕدان - بانگەواز |
| ١٠٤ | استعجال | لەزکاری-پەلەکردن | ١٣٤ | أسباب موجبة | هۆیەپێویستەکان |
| ١٠٥ | اتهام | تۆمەتبارکردن | ١٣٥ | إستعارة | خواستن |
| ١٠٦ | استدلال | بەڵگەدان | ١٣٦ | ادعاء العام | داواکاری گشتی |
| ١٠٧ | استيضاح | روونکردنەوە | ١٣٧ | أسبقية | پێشتری |
| ١٠٨ | استقدام | داواکردن | ١٣٨ | اجر المثل | کـــرێی هاوچەشـــن-<br>کرێی‌هاوتا |
| ١٠٩ | أسلوب | شێواز | ١٣٩ | اجر المسمى | کرێی‌دیاری‌کراو |
| ١١٠ | استفزاز | ەمارگرتن | ١٤٠ | إفادة | گوفتار |
| ١١١ | استنباط | هەڵهێنجان | ١٤١ | إفادة المتهم | گوفتاری تۆمەتبار |
| ١١٢ | اكتساب القرار الدرجـــة القطعية | بڕیارەکـــە پلـــەی بنـــڕبوونی وەرگرت | ١٤٢ | بموجب القانون | بەپێی یاسا -<br>بەگوێرەی یاسا |
| ١١٣ | إكراه | زۆرلێکردن | ١٤٣ | إيداع | سپاردن |
| ١١٤ | إنكار | نکوڵی‌کردن | ١٤٤ | إيقاف | وەستاندن |
| ١١٥ | إطلاق السراح | بەرەڵڵاکردن | ١٤٥ | معاشرة | بەیەکەوە ژیان |
| ١١٦ | اختلاف | جیاوازی | ١٤٦ | تعويض | قەرەبووکردن |
| ١١٧ | بالضبط | کت و مت | ١٤٧ | تجاوز | تێپەڕاندن |
| ١١٨ | باعث | پاڵنەر | ١٤٨ | تصحيح القرار | راستکردنەوەی بڕیار |
| ١١٩ | باطل | پووچەڵ | ١٤٩ | تدوين | نووسینەوە |
| ١٢٠ | بكر | کچێنی | ١٥٠ | تقنين | بەیاساکردن |
| ١٢١ | بدل | بایی | ١٥١ | تطبيق القرار | هەڵپەساردنی بڕیار |
| ١٢٢ | بينة | بەڵگە | ١٥٢ | تأجيل | دواخستن |
| ١٢٣ | البينة الشخصية | بەڵگەی کەسایەتی | ١٥٣ | استمهال | ماوەدان |
| ١٢٤ | البينة التحريرية | بەڵگەی نووسراو | ١٥٤ | طبق الأصل | وەکو خۆی |
| ١٢٥ | عاجز عن الاثبات | پەککەوت لە سەلماندن | ١٥٥ | تأكيد | جەخت کردن |
| ١٢٦ | بصمة الإبهام | پەنجە چاپ | ١٥٦ | تأييد | لاگیری |
| ١٢٧ | براءة | بێتاوانی | ١٥٧ | طلب | خواستن |
| ١٢٨ | بلوغ | خۆناسین - رەسین | ١٥٨ | طعن | تانە |
| ١٢٩ | تقادم | بەسەرچوون | ١٥٩ | طارئ | ناکاو |
| ١٣٠ | تقادم مسقط | بەسرچوونی نۆڕێنەر | ١٦٠ | تكيف | سازاندن - گونجاندن |

| ١٦١ | تقادم مكسب | بەسەرچوونی وەدەستهێنەر | ١٩١ | تفريق | جیابوونەوە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٦٢ | تحقيق | لێكۆڵینەوە | ١٩٢ | تعديل | هەمواركردن |
| ١٦٣ | تحقيق أولي | لێكۆڵینەوەی سەرەتایی | ١٩٣ | دعوى الاعتراضية | داوای ناڕەزایی |
| ١٦٤ | تحقيق نهائي | لێكۆڵینەوەی كۆتایی | ١٩٤ | السارق | د ز |
| ١٦٥ | تهديد | هەڕەشە | ١٩٥ | الراشي | بەرتیل دەر |
| ١٦٦ | شكوى | سكالا | ١٩٦ | المرتشي | بەرتیل خۆر |
| ١٦٧ | المشتكي | سكالا كار ـ داد خواز | ١٩٧ | المسروق | دزراو |
| ١٦٨ | المشكو منه | سكالاٌ لێكراو | ١٩٨ | سجن | زیندان |
| ١٦٩ | الحاكم | دادوەر | ١٩٩ | حبس | بەند كردن |
| ١٧٠ | اتهام | تاوانبار كردن | ٢٠٠ | محضر | كۆنووس |
| ١٧١ | اشتباه | گومانلێكردن | ٢٠١ | اصلاحية | چاكسازی |
| ١٧٢ | متهم | تاوانبار - تۆمەتبار | ٢٠٢ | مخدرات | هۆشبەرەكان |
| ١٧٣ | مشتبه فيه | گومانلێكراو | ٢٠٣ | بغاء | لەش فرۆشی |
| ١٧٤ | جريمة | تاوان | ٢٠٤ | الشك | گومان |
| ١٧٥ | تجريم | بەتاوانكردن | ٢٠٥ | الشك يفسر لمصلحة المتهم | گومان لەبەرژەوەندی گومانلێكراو شیدەكرێتەوە |
| ١٧٦ | اوراق تحقيقية | پەروەندەكانی لێكۆڵینەوە | ٢٠٦ | دليل | بەڵگە |
| ١٧٧ | موقوف | گیراو | ٢٠٧ | ادلة | بەڵگەكان |
| ١٧٨ | موقوفية - موقف | گرتوخانە | ٢٠٨ | رفض الشكوى | ڕەتكردنەوەی سكالاٌ |
| ١٧٩ | افراج | بەرەڵاكردن | ٢٠٩ | غلق التحقيق | داخستنی لێكۆڵینەوە |
| ٨٠ | افراج شرطي | بەرەڵاكردنی مەرجدار | ٢١٠ | عدم المحكومية | بێ تاوانی |
| ١٨١ | الكفالة | زامنی | ٢١١ | جثة | لاشە |
| ١٨٢ | كفالة شخصية | زامنی كەسێتی | ٢١٢ | مخطط | هێڵكاری |
| ١٨٣ | كفالة ضامنة | زامنی دابین | ٢١٢ | محل الحادث | شوێنی ڕوداو |
| ١٨٤ | محكومية | تاوانی | ٢١٣ | تنازل | خۆشبوون |
| ١٨٥ | توقيف | گرتن | ٢١٤ | قتل | كوشتن |
| ١٨٦ | حجز | گلدانەوە | ٢١٥ | قاتل | بكوژ |
| ١٨٧ | تقرير طبي | ڕاپۆرتی پزیشك | ٢١٦ | مقتول | كوژراو |
| ١٨٨ | الطب العدلي | پزیشكی دادوەری | ٢١٧ | الرشوة | بەرتیل |
| ١٨٩ | السرقة | دزی | ٢١٨ | ثأر | تۆڵەسەندن |
| ١٩٠ | التحري | پشكنین | ٢١٩ | عقاب | سزا |

| ٢٢٠ | التزوير | گزی-مزور-گزی کراو | ٢٥٠ | قانون اصول المحاكمات الجزائية | یاسای ئسولی دادگەری سزاییەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٢١ | المساهم | بەشدار | ٢٥١ | شاهد | شایەد |
| ٢٢٢ | الشريك | هاوبەش | ٢٥٢ | شهادة | شایەددان |
| ٢٢٣ | الفاعل | بکەر | ٢٥٣ | الجرم المشهود | تاوانی بینراو |
| ٢٢٤ | مسائلة | پرسینەوە | ٢٥٤ | سبق الاصرار | سووربوونی پیشینەیی |
| ٢٢٥ | المحرض | هاندەر | ٢٥٥ | المدعي | داواکار |
| ٢٢٦ | تحريض | هاندان | ٢٥٦ | المدعى عليه | داوالیکراو |
| ٢٢٧ | مسبب | هۆکار | ٢٥٧ | وجه الدعوى | ناوەرۆکی داوا |
| ٢٢٨ | مضاهاة | بەراوردکاری | ٢٥٨ | محكمة الأحوال الشخصية | دادگـــای بـــاری کەسایەتیەکان |
| ٢٢٩ | قصاص | تۆلە | ٢٥٩ | قاضي | دادوەر |
| ٢٣٠ | حد | رادە | ٢٦٠ | طلاق | تەلاق ـ بەربان |
| ٢٣١ | الظروف المشددة | بارەتوندەکان | ٢٦١ | الطلاق الخلعي | دەست لیکبەربان |
| ٢٣٢ | الظروف المخففة | بارەسوکەکان | ٢٦٢ | الطلاق الرجعي | تەلاقی هینانەوە |
| ٢٣٣ | هتك العرض | سووک کردن ـهەتك کردن | ٢٦٣ | البينونة الصغرى | دابرانی بچووك |
| ٢٣٤ | هامش | پەراویز | ٢٦٤ | البينونة الكبرى | دابرانی گەورە |
| ٢٣٥ | مطالعة | بینین | ٢٦٥ | تفريق | جیابوونەوە |
| ٢٣٦ | قابل للقسمة | هەلگری دابەشکردن | ٢٦٦ | التفريق القضائي | جیابوونەوەی دادوەری |
| ٢٣٧ | قتل العمد | کوشتنی بە ئەنقەست | ٢٦٧ | مطاوعة | گویرایەلبوون |
| ٢٣٨ | قتل الخطأ | کوشتنی بە هەلە | ٢٦٨ | بيت الشرعي | مالی شەرعی |
| ٢٣٩ | الإجهاض | لەباربردن | ٢٦٩ | فراش الزوجية | سەرجیی هاوسەری |
| ٢٤٠ | قصد | مەبەست | ٢٧٠ | الداخل بها شرعاً | جووتەلای |
| ٢٤١ | القاء القبض | دەستگیرکردن | ٢٧١ | وصية | راسپاردن |
| ٢٤٢ | سراً | بەنهینی | ٢٧٢ | ميرث | میرات |
| ٢٤٣ | علناً | بەئاشکرا | ٢٧٣ | الوصي | پیسپیردراو |
| ٢٤٤ | نشوز | ناچیزە | ٢٧٤ | الموصي | پی سپیر |
| ٢٤٥ | حامل | ئاوس | ٢٧٥ | الموصى له | بۆ سپیردراو |
| ٢٤٦ | عنين | نەمیرد | ٢٧٦ | الموصى به | راسپاردە |
| ٢٤٧ | عقيم | نەزۆك | ٢٧٧ | الوارث | میراتگر |
| ٢٤٨ | حضانة | دایانی | ٢٧٨ | الارث – التركة | جی‌ماو |
| ٢٤٩ | مشاهدة | دیتن | ٢٧٩ | المورث | میراتدەر |

| ٢٨٠ | المضمون | ساوا | ٣١٢ | المطلقة | تەلاق دراو |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٨١ | الوصاية | پیسپێری | ٣١٣ | طلاق | تەلاق دەر |
| ٢٨٢ | الموصي | راسپێردەر | ٣١٤ | عقد الزواج | هاوسەرنامە-مارەبڕین |
| ٢٨٣ | الوديعة | سپاردە | ٣١٥ | الزوج | مێرد |
| ٢٨٤ | المودع | سپێردەر | ٣١٦ | الزوجة | ژن |
| ٢٨٥ | الايداع | سپاردن | ٣١٧ | الحالة الزوجية | باری هاوسەری |
| ٢٨٦ | المودع لديه | لاسپێردراو | ٣١٨ | الخاطب | داخوازکار |
| ٢٨٧ | نفقة | خەرجی | ٣١٩ | المخطوبة | داخوازکراو |
| ٢٨٨ | الإنفاق | خەرج کردن | ٣٢٠ | المهر | مارەیی |
| ٢٨٩ | النفقة الماضية | خەرجی رابردوو | ٣٢١ | المهر المعجل | مارەیی پێشەکی |
| ٢٩٠ | النفقة المستمرة | خەرجی بەردەوام | ٣٢٢ | المهر المؤجل | مارەیی پاشەکی |
| ٢٩١ | النفقة المتراكمة | خەرجي کەڵەکەبوو | ٣٢٣ | المانع الشرعي | بەربەستی شەرعی |
| ٢٩٢ | النسب | رچەڵەك | ٣٢٤ | ارمل | بێوە مێرد |
| ٢٩٣ | النسل | وەچە | ٣٢٥ | ارملة | بێوە ژن |
| ٢٩٤ | حفيد | نەوە | ٣٢٦ | تصديق | پەسندکردن |
| ٢٩٥ | الحاضن | دایان | ٣٢٧ | الزواج الخارجي | مارەیی دەرەکی |
| ٢٩٦ | مهر المثل | مارەیی هاوتا | ٣٢٨ | القبول | رەزامەندی |
| ٢٩٧ | مهر المسمى | مارەیی دیاریکراو | ٣٢٩ | حيض | بێنوێژی |
| ٢٩٨ | دعوى مقاولة | داوای بەڵێندەری | ٣٣٠ | دفع - دفوعات | داکۆکی |
| ٢٩٩ | الدية | خوێن دان | ٣٣١ | مرافعة | دادبینی |
| ٣٠٠ | الغائب | نادیار | ٣٣٢ | ترافع | دادبینکاری |
| ٣٠١ | القيم | دەمراست | ٣٣٣ | وكالة | بریکارنامە |
| ٣٠٢ | حجة الولادة | بەڵگەنامەی زایین | ٣٣٤ | وكيل | بریکار |
| ٣٠٣ | حجة الوفاة | بەڵگەنامەی مردن | ٣٣٥ | موكل | بریکاردار |
| ٣٠٤ | حجة الزواج | بەڵگەنامەی هاوسەریتی | ٣٣٦ | الشخص الثالث | کەسی سێیەم |
| ٣٠٥ | حجة التخارج | بەڵگەنامەی وەدەرخستن | ٣٣٧ | البينات القانونية | بەڵگە یاساییەکان |
| ٣٠٦ | حجب | بێ‌نەدان | ٣٣٨ | الأدلة الثبوتية | بەڵگە سەلمێنەرەکان |
| ٣٠٧ | القسام الشرعي | دابەشنامەی شەرعی | ٣٣٩ | الدعوى المتقابلة | داوای بەرامبەر |
| ٣٠٨ | القسام القانوني | دابەشنامەی یاسایی | ٣٤٠ | الدعوى الأصلية | داوای بنەرەت |
| ٣٠٩ | حجة القيمومة | بەڵگەنامەی دەمراستی | ٣٤١ | الدعوى المنضمة | داوای خستنەپاڵ |
| ٣١٠ | مفقود | وون بوو | ٣٤٢ | الأحتفاظ | هەڵگرتن |
| ٣١١ | مناداة | بانگکردن | ٣٤٣ | الدعوى الحادثة | داوای نۆژەن |

| ٣٤٤ | حضر | ئامادەبوو | ٣٧٤ | الحضور | ئامادەبوون |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٤٥ | تحكيم | ناوبژیوانی | ٣٧٥ | الغياب | ئامادە نەبوون |
| ٣٤٦ | حكم | ناوبژیوان | ٣٧٦ | المرافعة الحضورية | دادبینی ئامادەگی |
| ٣٤٧ | خبير | لیزان ـ شارەزا | ٣٧٧ | المرافعة الغيابية | دادبینی نا ئامادەگی |
| ٣٤٨ | خبرة | لیزانی ـ شارەزایی | ٣٧٨ | المرافعة العلنية | دادبینی ئاشکرا |
| ٣٤٩ | اصلاح ذات البين | پیکهینانەوە | ٣٧٩ | عريضة الدعوى | داوانامە |
| ٣٥٠ | اجر الخبير | کرێی لیزان | ٣٨٠ | اساس الدعوى | بنچینەی داوا |
| ٣٥١ | تقصير | کەمتەرخەمی | ٣٨١ | الخصم | هاودژ ـ ناکۆك |
| ٣٥٢ | الايجاب | لەروونان | ٣٨٢ | خصومة | هاودژیتی ـ ناکۆکیتی |
| ٣٥٣ | قيمةالدعوى | بەهای داوا | ٣٨٣ | اطراف الدعوى | لایەنەکانی داوا |
| ٣٥٤ | تكملة | تەواوکردن | ٣٨٤ | النزاع | کیشە |
| ٣٥٥ | رد الدعوى | رەتکردنەوەی داوا | ٣٨٥ | موضوع الدعوى | بابەتی داوا |
| ٣٥٦ | رفض الطلب | رەتکردنەوەی خواستن | ٣٨٦ | المصلحة | بەرژەوەندی |
| ٣٥٧ | العلاقة السببية | پەیوەندی هۆکاری | ٣٨٧ | بالتضامن والتكافل | بە هاوکاری و هاوبەشی |
| ٣٥٨ | اثبات الضرر | سەلماندنی زیان | ٣٨٨ | ترك الدعوى | بەجیهیشتنی داوا |
| ٣٥٩ | حجز الاحتياط | گلدانەوەی کاتی | ٣٨٩ | انقطاع المرافعة | پچرانی داوا |
| ٣٦٠ | حجز التنفيذي | گلدانەوەی جیبەجیکاری | ٣٩٠ | توحيد الدعوى | یەکخستنی داوا |
| ٣٦١ | الكشف | نۆرین | ٣٩١ | رسم الدعوى | پارەی داوا |
| ٣٦٢ | جزافا | گۆتره | ٣٩٢ | صدر القرار | دەرچوونی بریار |
| ٣٦٣ | تحليف | سویند دان | ٣٩٣ | رؤية الدعوى | بینینی داوا |
| ٣٦٤ | اليمين | سویند | ٣٩٤ | حارس قضائي | پاسەوانی دادوەری |
| ٣٦٥ | اليمين الحاسمة | سویندی یەك لا کەرەوە | ٣٩٥ | منقول | گویزەوە |
| ٣٦٦ | اليمين المتممة | سویندی تەواوکەر | ٣٩٦ | عقد رضائي | گریبەستی ئارەزوومەندانە |
| ٣٦٧ | الانكار | نكولی | ٣٩٧ | عقار | نەگویزەوە |
| ٣٦٨ | الاعتراض | نارەزایی | ٣٩٨ | عقد شكلي | گریبەستی روالەیی |
| ٣٦٩ | المعترض | نارازی | ٣٩٩ | عقد ملزم من جانب واحد | گریبەستی یەك لاگیر |
| ٣٧٠ | المعترض عليه | نارەزا لەسەر | ٤٠٠ | عقد ملزم للجانبين | گریبەستی دوولاگیر |
| ٣٧١ | المعترض اعترف الغير | نارازی نارەزایی دیکە | ٤٠١ | عقد معاوضة | گریبەستی گۆرینەوە |
| ٣٧٢ | اصدار القرار | دەرچوواندنی بریار | ٤٠٢ | عقد فوري | گریبەستی دەستبەجی |
| ٣٧٣ | وسائل الاثبات | هۆیەکانی سەلماندن | ٤٠٣ | عقد مستمر التنفيذ | گریبەستی بەجیهینانی بەردەوام |

| ٤٠٤ | سابقة قضائية | پێشینەی دادوەری | ٤٣٤ | عقد نافع نفعا محضا | گرێبەستی تەواو سوود بەخش |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ٤٠٥ | تحميلة المصاريف | جەرجیەكانی بخرێنە سەر | ٤٣٥ | عقد ضار ضارا محضا | گرێبەستی تەواو زیان بەخش |
| ٤٠٦ | الزام | پابەند | ٤٣٦ | عقد احتمالي | گرێبەستی ئەگەری |
| ٤٠٧ | واقعة قانونية | ڕووداوی یاسایی | ٤٣٧ | عقد باطل | گرێبەستی پوچەڵ |
| ٤٠٨ | غصب | زەوت كردن | ٤٣٨ | اركان العقد | پایەكانی گرێبەست |
| ٤٠٩ | غاصب | زەوتكەر | ٤٣٩ | الأستئثار | دەست بەسەر داگرتن |
| ٤١٠ | مغصوب | زەوتكراو | ٤٤٠ | حق شخصي | مافی كەسی |
| ٤١١ | ضرر | زیان | ٤٤١ | حق عيني | مافی عەینی |
| ٤١٢ | متضرر | زەرەرمەند | ٤٤٢ | عرف | داب |
| ٤١٣ | ضار | زیان بەخش | ٤٤٣ | عادة | نەریت |
| ٤١٤ | احداث ضرر | زیان لێدان | ٤٤٤ | اعتراف منشيء | دانپێدانانی دروستكەر |
| ٤١٥ | قبض | سەندن | ٤٤٥ | تصرف منشئ | كرداری دروستكەر |
| ٤١٦ | تصرف كاشف | كرداری بەدەرخەر | ٤٤٦ | سلف | پێشین |
| ٤١٧ | اعتراف كاشف | دانپێدانانی بەدەرخەر | ٤٤٧ | تفسير | شرۆڤە ـ ڕاڤە |
| ٤١٨ | الشخصية المعنوية | كەسێتی مەعنەوی | ٤٤٨ | مستأجر | كرێچی |
| ٤١٩ | الشخصية الطبيعية | كەسێتی سروشتی | ٤٤٩ | مأجور | بەكرێدراو |
| ٤٢٠ | الخطأ المادي | هەڵەی ماددی | ٤٥٠ | مؤجر | بەكرێدەر |
| ٤٢١ | اكتساب | وەرگرتن | ٤٥١ | عيوب الارادة | خەوشەكانی ویست |
| ٤٢٢ | دين | قەرز | ٤٥٢ | الغلط | بەهەڵەداچوون |
| ٤٢٣ | دائن | قەرزدەر | ٤٥٣ | التغرير | خەڵەتاندن |
| ٤٢٤ | مدين | قەرزدار | ٤٥٤ | قسط | پاژ - قیست |
| ٤٢٥ | مديونية | قەرزدارێتی | ٤٥٥ | شاذ | ڕیزپەڕ |
| ٤٢٦ | حين الطلب | ساتی خواستن | ٤٥٦ | مستند | پاڵگە |
| ٤٢٧ | مستحق الأداء | پێویست بە دان | ٤٥٧ | عقد الأذعان | گرێبەستی ملدان |
| ٤٢٨ | الساحب | پێدەر | ٤٥٨ | ظروف طارئة | كاودانی ناكاو |
| ٤٢٩ | المسحوب عليه | پێدراوەسەر | ٤٥٩ | بالأكثرية | بەزۆرینە |
| ٤٣٠ | تسوية | سازش | ٤٦٠ | قاطع | بن بڕ |
| ٤٣١ | سند | قەواڵە | ٤٦١ | محكمة العمل | دادگای كار |
| ٤٣٢ | سماعي | بیستراو | ٤٦٢ | محكمة التحقيق | دادگای لێكۆڵینەوە |
| ٤٣٣ | عياني | بینراو | ٤٦٣ | محاكم الدرجة الثانية | دادگا پلە دووەمەكان |

| ٤٦٤ | تسليم | پێدان | ٤٨٩ | ازالة الشيوع | لابردنی کۆیەشی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤٦٥ | مستلم | وەرگر | ٤٩٠ | هيئة | دەستە |
| ٤٦٦ | استلام | وەرگرتن | ٤٩١ | الهيئة العامة | دەستەی گشتی |
| ٤٦٧ | بالإجماع | بەتێکرا | ٤٩٢ | اقدم النواب | لەپێشترین جێگر |
| ٤٦٨ | بالاتفاق | بەرێکەوتن | ٤٩٣ | الهيئة الموسعة | دەستەی بەرفراوان |
| ٤٦٩ | خلف | پاشێن | ٤٩٤ | الهيئة الجزائية | دەستەی سزایی |
| ٤٧٠ | الهيئة الادارية | دەستەی کارگێری | ٤٩٥ | حيازة | بن دەستی |
| ٤٧١ | مدة طلب تمييز القرارات | ماوەی داواکاری پێداچوونەوەی بڕیارەکان | ٤٩٦ | غرامة | پێبژاردن ـ بەریار |
| ٤٧٢ | القضاء المستعجل | دادگەری بەپەلە | ٤٩٧ | ماهر – مختص | پسپۆر |
| ٤٧٣ | الركن المادي | کۆڵەگەی ماددی | ٤٩٨ | مرافعة | داخوازی |
| ٤٧٤ | عقد | گرێ بەست | ٤٩٩ | مترافع | داخواز |
| ٤٧٥ | تعاقد | بەلێنکاری | ٥٠٠ | محكمة البداءة | دادگای بەرایی |
| ٤٧٦ | الدعوى | داوا | ٥٠١ | محكمة استئناف | دادگای تێهەڵچوونەوە |
| ٤٧٧ | الدفع | داکۆکی | ٥٠٢ | محكمة تمييز | دادگای پێداچوونەوە |
| ٤٧٨ | تصحيح القرار | راستکردنەوەی بڕیار | ٥٠٣ | محاكم الدرجة الاولى | دادگا پلە یەکەمینەکان |
| ٤٧٩ | الدعوى المتقابلة | دژە داوا | ٥٠٤ | اعادة النظر | تێروانینەوە |
| ٤٨٠ | مأجور | بەکرێدراو | ٥٠٥ | تدقيق | وردبینی |
| ٤٨١ | اساءة استعمال الحق | لەوتاندنی ماف | ٥٠٦ | افلاس | نابوتی - بەرووت |
| ٤٨٢ | حق الحبس للضمان | مافی گلدانەوە بۆ دڵنیایی | ٥٠٧ | تبليغ | پێ راگەیاندن |
| ٤٨٣ | فوائد قانونية | سوودە یاساییەکان | ٥٠٨ | مديرية التبليغات القضائية | بەڕێوەبەرایەتی راگەیاندنە دادگەریەکان |
| ٤٨٤ | النظام العام والآداب | سیستەمی گشتی وخووڕەوشتەکان | ٥٠٩ | المحكمة الادارية | دادگای کارگێری |
| ٤٨٥ | علاقة جنسية غير مشروعة | پەیوەندی لەشیی نارەوا | ٥١٠ | بوشر باجراء المرافعة الحضورية | دەست کرا بەدادبینی ئامادەیی |
| ٤٨٦ | المسؤلية المدنية | بەرپرسیاریتی شارستانی | ٥١١ | في اليوم المعين للمرافعة | لەرۆژی دیاریکراو بۆ دادبینی |
| ٤٨٧ | العلاقة السببية | پەیوەندیی هۆکاری | ٥١٢ | حضر وكيل المدعية | بریکاری داواکار ئامادە بوو |
| ٤٨٨ | خطر | مەترسی | ٥١٣ | محكمة الجنح | دادگای کەتن |

| ٥٦٦ | تشهير | ناوزڕاندن | ٥٩٠ | تبديل | لەجی‌دانان |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ٥٦٧ | سب | جنێو | ٥٩١ | تصحيح | ڕاست کردنەوە |
| ٥٦٨ | قذف | ئابروو بردن | ٥٩٢ | تغير | گۆڕین |
| ٥٦٩ | لائحة | پارێز نامە | ٥٩٣ | شروع | دەست دان-دەستنان |
| ٥٧٠ | ديوان التدوين القانوني | دیوانی دارشتنی یاسایی | ٥٩٤ | الشروع في القتل | دەست دانە کوشتن |
| ٥٧١ | المدون القانوني | دارێژەری یاسایی | ٥٩٥ | الخيانة الزوجية | ناپاکی هاوسەرییتی |
| ٥٧٢ | جامع - مانع | کۆکر - بەرگر | ٥٩٦ | لواطه - ملاوطة | نێربازی |
| ٥٧٣ | عدم الاختصاص | تایبەتمەند نەبوون | ٥٩٧ | لوطي | نێرباز |
| ٥٧٤ | القانون الواجب التطبيق | یاسای پێویست بەجێبەجێکردن | ٥٩٨ | اضافة لوظيفته | سەرەرای فەرمانبەرییتی |
| ٥٧٥ | لدى التدقيق والمداولة | لەووردبوونەوەو ئاوتوێکردن | ٥٩٩ | تقدير | خەملاندن - دانان |
| ٥٧٦ | يترتب على ذلك | لێی کەوتەوە | ٦٠٠ | دعوى النفقة | داوای خەرجی |
| ٥٧٧ | التنحي الجوازي | لاچوون | ٦٠١ | دعوى الطلاق | داوای تەلاق |
| ٥٧٨ | التنحي الوجوبي | لاچوواندن | ٦٠٢ | دعوى التفريق | داوای جیابوونەوە |
| ٥٧٩ | تنحي | لاچوون | ٦٠٣ | دعوى تصديق الطلاق | داوای پەسندکردنی تەلاق |
| ٥٨٠ | عزل | لابردن | ٦٠٤ | دعوى حضانة | داوای بەخێوکردن |
| ٥٨١ | اعتزال | خۆلابردن | ٦٠٥ | دعوى مشاهدة | داوای دیتن |
| ٥٨٢ | خبير | شارەزا | ٦٠٦ | دعوى اسقاط النفقة | داوای نەهێشتنی خەرجی |
| ٥٨٣ | المأذون بالقضاء باسم الشعب | دادوەری ڕێپێدراو بە ناوی گەل | ٦٠٧ | دعوى انقاص المهر | داوای کەمکردنەوەی مارەیی |
| ٥٨٤ | استجواب الخصوم | لێپرسینەوەی هاودژەکان | ٦٠٨ | دعوى تصحيح القسام | داوای ڕاستکردنەوەی دابەشنامە |
| ٥٨٥ | استجواب الشهود | لێپرسینەوەی شایەدەکان | ٦٠٩ | دعوى تعديل القسام | داوای هەموارکردنی دابەشنامە |
| ٥٨٦ | دعوى غصب الاثاث البيتية | داوای زەوتکردنی کەل ویەلی ناومال | ٦١٠ | دعوى اثبات النسب | داوای سەلماندنی ڕەچەلەك |
| ٥٨٧ | دعوى الطلاق الخلعي | داوای دەست لێکبەردان | ٦١١ | دعوى التولية | داوای سەرکار |
| ٥٨٨ | دعوى الوقف | داوای وەقف | ٦١٢ | دعوى التمليك | داوای مولکدارێتی |
| ٥٨٩ | دعوى عزل الوصي | داوای لادانی سەرەوسبەت | ٦١٣ | دعوى رفع التجاوز | داوای هەلگرتنی زیدەڕۆیی |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦١٤ | دعوى نصب الوصي | داوای دانانی سەروەسیەت | ٦٤٢ | دعوى الاستملاك | داوای مولك ساندن |
| ٦١٥ | دعوى التخلية | داوای چۆل کردن | ٦٤٣ | دعوى فسخ العقد | داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست |
| ٦١٦ | دعوى ازالة الشيوع | داوای نەهێشتنی هاوبەش . | ٦٤٤ | دعوى الحيازة | داوای بەدەستەوەبوون |
| ٦١٧ | دعوى الاثاث البيتية | داوای ناو ماڵ | ٦٤٥ | دعوى الملكية | داوای مولکدارێتی |
| ٦١٨ | دعوى منع المعارضة | داوای ڕێگرتنی بەرهەڵست | ٦٤٦ | دعوى اجر المثل | داوای کرێی هاوتا |
| ٦١٩ | دعوى منع التعرض | داوای ڕێگرتنی | ٦٤٧ | دعوى تصفية الشركة | داوای پاکتـــاوکردنی کۆمپانیا |
| ٦٢٠ | دعوى طلب | داوای خواستن | ٦٤٨ | دعوى المحاسبة | داوای لێپێچینەوە |
| ٦٢١ | دعوى تعويض | داوای قەرەبووکردنەوە | ٦٤٩ | دعوى غصب | داوای زەوتکردن |
| ٦٢٢ | دعوى كشف المستعجل | داوای نۆرینی خێرا | ٦٥٠ | الصعقة الكهربائية | کارەباگرتن |
| ٦٢٣ | تزييف | قەڵبی | ٦٥١ | اختلاس | دزکاری |
| ٦٢٤ | مزيف | قەڵبی | ٦٥٢ | مختلس | دزکار |
| ٦٢٥ | استرداد | گێراندنەوە | ٦٥٣ | حل المساطحة | مافی بانەوانی |
| ٦٢٦ | الدفوع الشكلية | داکۆکیە ڕواڵەتیەکان | ٦٥٤ | استدعاء | داوانامە |
| ٦٢٧ | الدفوع الموضوعية | داکۆکیە بابەتیەکان | ٦٥٥ | تنازل | لێخۆشبوون - دانیان |
| ٦٢٨ | احداث تغيرجوهري في المأجور | گۆرانکـــاری بنـــەڕەتی لـــە بەکرێدراو | ٦٥٦ | راسخ | پتەو |
| ٦٢٩ | صلاحية | دەسەڵاتدارێتی | ٦٥٧ | قرينة | نیشان ـ بەرژەن |
| ٦٣٠ | التكييف القانوني | سازاندنی یاسایی | ٦٥٨ | حالة طارئة | باری ناکاو |
| ٦٣١ | تقليل العدالة | چەواشەکردنی دادپەروەری | ٦٥٩ | مالك | خاوەن ـ خودان |
| ٦٣٢ | التماس | تکاکردن | ٦٦٠ | اعالة | بەخێوکردن |
| ٦٣٣ | تحريم | حەرام کردن | ٦٦١ | افتراء | بوختان |
| ٦٣٤ | تلبس | خەوش پۆشین | ٦٦٢ | اقتران | پێك گەیشتن |
| ٦٣٥ | لغو | بێ‌بادی | ٦٦٣ | رضاعة | شیردان |
| ٦٣٦ | تناوب | نۆرە بەندی | ٦٦٤ | رضيع | شیرخۆر |
| ٦٣٧ | نيابة | لەجیاتی | ٦٦٥ | حضانة | دایەنگەری |
| ٦٣٨ | توكيل | بریکارپێدان | ٦٦٦ | زجر | سزادان |
| ٦٣٩ | نفاس | زەیستان | ٦٦٧ | لااساس له من الصحة | دوورە لە ڕاستی |
| ٦٤٠ | نشل | گیرفانبڕی | ٦٦٨ | مذكرة القبض | پسوڵەی دەستگیرکردن |
| ٦٤١ | حجر | گلدانەوەی | ٦٦٩ | مخالفة القانون | سەرپێچی یاسا |

ئه‌وه‌ی پێویست بوایه پێشکه‌شیان ده‌کرد. له دێهاته‌یلی په‌ڕپووتدا، باوه‌ڕمان نه‌ده‌کرد هه‌تا مریشکێش بدۆزینه‌وه، که‌چی ده‌مبینی قامچی له‌ناکاو ده دوانزه مریشکێکی ته‌واوی ده‌دۆزییه‌وه و له شوێنگه‌لێك که گژوگیای پێویستمان نه‌ده‌بینی بۆ له‌وه‌ڕی مه‌ڕان، ڕێگه‌یان ده‌دا له‌ناو سه‌رله‌به‌ری مێگه‌ڵه‌کانیان ئه‌وه‌ی بمانبویستبایه هه‌ڵبژێرین. به یه‌ك وشه قامچی چه‌کی سروشتیی ته‌تار و سه‌رچاوه‌یلی تاقانه‌بوو له هه‌موو ده‌رفه‌تێکدا.، جا ئه‌گه‌ر شتێك هه‌بوایه سه‌راسیمه‌ی بکردبوومایه، ئه‌وه‌بوو ببینم که ئه‌م کلۆڵانه که به تاقیکردنه‌وه ده‌زانن چ مامه‌ڵه‌یه‌ك چاوه‌ڕوانیان ده‌کات، بۆیه هه‌رگیز نایانه‌وێ به‌هیچ شێوه‌یه‌ك داوایه‌کانیان به‌جێنه‌گه‌یه‌نن پێش ئه‌وه‌ی ببینن به‌وه‌ی به زه‌بری قامچی ناچار بکرێن.

که‌وایه ده‌بینین بۆچی ئه‌م گه‌لانه ڕقێکی ئه‌ستووریان دژی سته‌مکاران هه‌ڵگرتووه.، بۆچی شمشێره‌کانیان له‌ناو کێلانه‌کان هه‌ڵناکێشن و کالانه‌کانیان فڕێ نادەن؟ ئه‌مه پاشماوه‌ی خه‌مساردێکی گشتییه، که وای کردووه هه‌موو که‌سێك هه‌رچه‌نده هه‌ستیاری به‌رانبه‌ر به ئێش و ئازاری که‌سیی خۆی هه‌بێ که‌چی هیچ تروسکه‌یه‌کی ڕۆحی گشتیی دانه‌گیرسێنێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر چاوێك بۆ دوارۆژ بگێڕین ده‌بینین هه‌زاران له‌و هۆزگه‌له شه‌رکارانه وه‌ڵامی بانگه‌وازی یه‌که‌مین ئازادیخواز ده‌ده‌نه‌وه که بانگه‌وازیان لێده‌کات و ئه‌وکاته چه‌ك به‌ڕووی سته‌مکاران به‌رز ده‌که‌نه‌وه. ده‌شێ پێشبینی ڕووخانی ئه‌م هێزه له‌بننه‌شکاوه خۆسه‌پێنه‌ره بکه‌ین که هه‌ردوو دیوی جیهانی به فرمێسك و خوێن ژیاندووه و به خێرایی به‌ره‌و وێرانه‌بوونی خۆی هه‌نگاو ده‌نێ. ئه‌م هێزه ده‌بێ به‌مزوانه ڕێگه بۆ سه‌ردارگه‌لی نوێ چۆڵبکات یان نوقمی ناو پاشاگه‌ردانیی ببێ. ئیمپراتۆریای عوسمانی ئێستەکه له‌به‌رده‌م هه‌ره‌سهێنانیه‌تی له یۆنانستانی کۆن، به‌هه‌مان ئه‌ندازه له‌وپه‌ری لاوازی دایه له لایه‌کانی دیکه‌یه‌وه. مه‌گه‌ر ته‌نها له حاڵێکدا که به گردبوونه‌وه‌یه‌کی هێزی خۆی، یه‌ك هێزی نوێ دروستبکات که ئه‌وکات ئێمه لامان وایه ده‌شێ له‌نێوان سنورگه‌لێکی وا به‌رته‌سك گیر بخوات که چیایه‌کانی تۆرۆس و پرده‌که‌ی بۆسفۆر و بیابان بۆی دیاری ده‌که‌ن. ده‌توانین بپرسین داخۆ چ هێزێك شوێنی ده‌گرێته‌وه به‌ڵام لێره ئه‌م گفتوگۆیه له‌م گه‌شته‌ی من دا نامۆیه.

٨ ی مانگ کاتژمێر شەشی بەیانی بەرێکەوتین، ئێمە کە لەسەر ڕووی ئاستی پێدەشتەکانەوە بووین، بۆیە هاتنەخوارەمان خێراتر بوو و وڵات دیمەنێکی زۆر جوانتری نیشان دەدا. کاتێك بەتەك گروپێکی کورددا ڕۆیشتین کە لە بناری چیایەکدا ڕەشماڵیان هەڵدابوو، تەتارەکانمان بە هەنگاوی خێرا بەرەو لایان هەرایان کرد و دەستیان بەسەر هەموو ئەسپەکانیان دا گرت کە توانیان دەستیان بەسەردا بگات. سەرۆکەکانیان بەدوامالدا کەوتن.، بەڵام ئێمە ژمارەمان زۆرتر بوو بۆیە نەیانویست پەلامارمان بدەن. هاوڕێگەکانم زۆرجار نەفرەتیان لەو وڵاتەدەکرد کە پیایدا تێپەڕ دەبووین وەك ئەوەی ئەم وڵاتە تەنها تالانچی و ڕێگری تێدا بژی.، بەڵام دەبێ من ئەوە ئیسپات بکەم کە ئێمە خۆمان گەورەترین تالانچی بووین کە لەهەر کوێیەك بووینایە ئێمە بەهێزتربووین.

بەو ئەسپانەی کە تازە دزیبوومان شوێنی ئەسپە خراپەکانمان پێگرتەوە و لە چیاییەکی بەرز دابەزین کە بێگومان پێویستی بە ئەسپی بەهێز بوو. ئەوکاتە بە تەواوی ئەو بەفرە سەرمەدییەمان جیاکردەوە کە دۆندی چیایەکەی داپۆشیبوو و تەنها لە دوورەوەوە بینیبوومان. من لەگەڵ یەکێك لە تەتەرەکان لە دواوە بووم. لەو دیو یەکێك لە گاشە بەردەکانەوە تەقەیان لێکردین. من بە توندی داوام لێکرا بۆ ئەوەی لە کاروانەکە دوور بکەومەوە چونکە لە نزیکمانەوە گروپگەلێکمان بینی کە جێگەی گومان بوو: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئێمە تووشی هەر پیاوێك بووینایە بە دوژمنمان دادەنا. بەوەی حەزم دەکرد لەو دیمەنە جوانە ڕابمێنم کە لە هەموو لایەکەوە خۆی نیشان دەدا، هەستیشم بە ماندوێتی ئەسپەکەم کرد بۆ ئەوەی هێواشتر بڕۆم، بەڵام ئەوان هەمان ڕێگەی تایبەتی خۆیان بەکارهێنا کە هێندە بەتاو بازیان دەدا ئەوی پێی ڕانەهاتبا دەترسا.

لەوەتای ٤ ی مانگەوە ئێمە هەمیشە هەر بەسەردەکەوتین و هێشتا سەرکەوتنی زیاترمان کە زۆر بێشومارتر دیاربوو لەبەرمان مابوو. بە چۆڵەوانیەکدا تێپەربووین کە بە ئاستەم تاقە گوندێك، جۆگەلەئاوێك، درەختێکمان بینی، ئێستە وڵات باشتر ئاوەدان تر دیارە و لە دوورەوە سیمای دانیشتوانێکی زۆر نیشان دەدات. دارودرەختی چیایەکان تا دەهات زیاتر شوێنکاری زستانی نیشان دەدات و بەفرەکە قووڵتر دەبۆوە. دواجار گەیشتینە لووتکەکە کە دەیڕوانیە سەر چیای لە

خۆی به‌رزتر و ده‌ستمان کرد به‌وه‌ی له لێژاییه‌کی هێنده خێرا دابه‌زین که هاتنه خواره‌که‌مان زۆر سه‌خت بوو. به‌ده‌گمه‌ن وا رێك ده‌که‌وێ که ته‌تاره‌کان له زه‌وی وردببنه‌وه بۆ زانینی ئه‌وه‌ی داخۆ پێویست به‌وه ده‌کات خێرایی رۆیشتنه‌که‌یان زیاد بکه‌ن یان که‌می بکه‌نه‌وه. هه‌رامان ده‌کرد وه‌ك ئه‌وه‌ی له پێده‌شتێکی پان و پۆڕدا بین. له هه‌ر چرکه‌یه‌کدا پێشبینی ئه‌وه‌م ده‌کرد که من و ئه‌سپه‌که‌م له لاپالێکی چیادا هه‌ڵده‌دێرین، به‌ڵام من بۆ پاراستنی که‌رامه‌تم، خۆم نیگه‌ران نیشان نه‌ده‌دا به‌ڵام هاوڕێکانم به قۆشمه‌بازییه‌وه لێیان ده‌پرسیم داخۆ حه‌زده‌که‌م له‌سه‌ر شێوازی ته‌تاری سه‌فه‌ر بکه‌م. وه‌ختایه‌ك گه‌یشتینه خوارووی ئه‌م چیایه، رێگه‌که هێشتا به‌ره‌و خواره‌وه ده‌هات، به‌ڵام به لێژاییه‌کی زۆر زیاتر هێواشتر. ده‌بوو له رێڕه‌وی جۆگه‌له‌ئاوێك که له چیایه‌کان ده‌رده‌چوو بپه‌ڕینه‌وه. ئه‌سپه‌کانمان شوێنی پێیان نه‌ده‌بینی و یه‌کێکیان نغرۆ بوو و ئاوه‌که رایماڵی.

ئێواره له دۆڵان[*]، که گوندێکی جوان و که‌وتبووه ناو دۆڵێك و چیای که‌مێك به‌رز ده‌وریان دابوو وه‌ستاین. گونده‌که دوو یان سێ جۆگه‌له ئاوی روون ئاویان ده‌دا، خۆم خسته ناو یه‌کێکیان بۆ ئه‌وه‌ی ماندوێتی خۆم لاببه‌م. چه‌ند ژنێك که ئه‌وانیش له دوورییه‌کی که‌مدا مه‌له‌یان ده‌کرد، دوودڵ نه‌بوون له‌وه‌ی هێمای ئه‌وه‌م بۆ بکه‌ن بچمه لایان. من ده‌مزانی ده‌شێ ترسناك بێ وه‌ڵامی داواکه‌یان بده‌مه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی راستی بلێم ئافره‌تگه‌لی به‌ته‌مه‌ن بوون و له ناویاندا یه‌کێکیان ئه‌وه‌هێنده شۆخ و شه‌نگ نه‌بوون که گه‌رۆکێکی ماندوو فریو بده‌ن. دوای ئه‌وه‌ی مه‌له‌م ته‌واو کرد، چوومه ناو ئه‌و ماڵه‌ی که تێیدابووین، بینیم هاوڕێیه‌کانم گوێیان بۆ شایه‌رێکی چیایی هه‌ڵخستبوو. پێستی ورچی له‌به‌رکردبوو، قژی به نارێکی به‌سه‌ر شانی دا هاتبۆوه خواره‌وه و گۆرانی به‌سه‌ر پاڵه‌وانێتی کۆنه سه‌رۆکه‌کانی ده‌چڕی و هێماگه‌لێکی شێتانه‌ی ده‌کرد و ده‌هۆڵی ده‌کووتی. دوای ئه‌وه‌ی برێك پاره‌ی کۆکرده‌وه ئێمه کشاینه‌وه و بۆ ئه‌وه‌ی خۆم له ئه‌سپێ و دووکه‌ڵ دووربکه‌ومه‌وه که کوخه‌که‌ی ته‌نیبوو بڕیارمدا له‌به‌ر رۆشنایی ئه‌ستێران له ده‌ره‌وه بخه‌وم. له‌م

[*] Dollan

ڕۆژەدا بیست و یەك میلمان بڕی. ئەو دۆڵەی کە بەناو چیایەکانا پێیدا تێپەردەبووین ناوی سەگرمە بوو.

یەکشەممە ٩ ی مانگ، دوای ئەوەی بیست و یەك میلمان بەناو چیا و شیوەکاندا بڕی، بەڵام چونکە بەشێوەیەکی گشتی لە دابەزین دابووین، چووینە ناو پێدەشتێکی بە پیت نزیکەی دە بۆ دوانزە میل پانایی و سی بۆ سی وپێنج میلێك درێژایی بوو و ڕووبارۆچکەیەك ئاوی دەدا کە بەناو سلێمانی پایتەختی کوردستاندا تێپەر دەبوو و نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ. ئەوەی کە دەبێ لە ڕاستیدا لەم شارە ببینین ئەوەیە کە شارەکە چێوەکەی دوو میلە، بەڵام زۆر زیاتر درێژدەبێتەوە، ئەگەر بمانەوێ ئەپارتومانە سەربەخۆیەکان و ئەو گوندانەش بگرێتەوە کە لێیەوە نزیکن. ماڵەکان لە قوڕ و خشت دروستکراون. زۆربەیان تەنها یەك نهۆمن و بانەکەی قوڕ و پانە. بە گشتی ماڵەکان ناڕێك و ئاسوودە نین و دانیشتوانەکەی کە ژمارەیان لە دوانزە هەزار کەس یان پانزە هەزار کەس تێپەرناکات زۆربەیان کوردن جگە لە بڕێك خێزانی جوولەکە و ئەرمەنی نەبێت کە بە مەبەستی بازرگانی لەوێدا دەژین و وادیارە بە تەواوی هەموو کاروبارێکی بازرگانیان قۆرخ کردووە.

بەو پێیەی کە نامەمان پێبوو و دەبوو تەسلیم بە دەسەڵاتکارانی ناوخۆیی بکەین لە لایەن سەرۆکەکانیانەوە، پاشای کوردستان کە ئەوکات لە خیوەتگای داود–ئەفەندی بوو بەشێوەیەکی شکۆمەندانە پێشوازی لێوەکردین. لە سەرای شار دابەزین و ئێوارە خوانێکی نایابی پێشکەش کردین کە لەو خواردنانە دەچوو کە لە ئێران و تورکیا پێشکەشی دەکەن کە من باسی ناکەم چونکە زۆر لە گەڕاڵەکان وەسپی ئەو خواردنانەیان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ وشەیەك لەبارەی ئەو خواردنە باسبکەم کە بە شێوەیەکی تایبەتیی پێشکەشیان کردم، وەك ئەوەی دەڵێن ئەوە خواردنی پەسنکراو بووە لە کوردستان. خواردنەکە بریتیبوو لە چەلاوگۆشتی کەروێشکی کێوی کە بۆنەکەی وای دەگەیاند کە هەڵیانگرتبوو تاوەکو تەواو بەخوێنەوە بۆگەنی کردبوو و بە چەوری و سیر و هەموو جۆرە بەهاراتێك لێدەنرێ. هەرچەندە من ڕاهاتووم لەسەر پلاوی پڕ لە بەهارات بەڵام نەمتوانی نە بەرگەی تامەکەی نە بەرگەی بۆنەکەی بگرم و ناچاربووم قاپەکە بنێرمەوە بە دڵخۆشیەکی زۆرەوە لەگەڵ خاوەنەکەی کە لەوە

باشتر تەسەوریان نەدەکرد، بەڵکو سەرسام بوون لەوەی کە من ناتوانم تامی خواردنەکە بکەم. بەلام وەختایەك ڕازەکەم ئاشکرابوو، میوانەکان زانیان من ئەوروپی و پیاوێکی ئینگلیزی بەم خواردنە نوێیە ڕانەهاتووم، وای بۆچووم کە پارچە پارچەم دەکەن، ئەوان هێندە کونجکۆڵ بوون بەپەلە بوون ئەوەی کە خۆیان پێی دەڵێن کەسێکی فرەنجی ببینن و دەستی لێبدەن. هەموویان لەیەك کاتدا پرسیاریان لێدەکردم و هەموویان دەیانویست کارسازی دەمانچەکەم کە بە وردی سرنجی ڕاکێشا بوون ببینن و دەترسام کە لە هەر ساتێکدا شتەکانم لەدەست بچێ، بەڵام خۆشبەختانە لەکاتی حەسانەوە دابوون. داوایان لێکردم تەقە لە یەکێك لە ئەستوونەکانی گۆڕەپانەکە بکەم و منیش زۆر کەیفسازبووم بەوەی بە گوللەیەك ئەستوونەکەم پێکا. بەو خێراییە سەرسام بوون کە دەمانچەکەم پێ پڕکردەوە و باوەڕیان هێنا کەوا ئەوروپاییەکان بێگومان سەرسامترین گەلانی جیهانن.

پێیان وتم کە چۆن جاران وڵاتەکەیان لە لایەن ئەسکەندەری گەورە، جەنگاوەری ئەوروپی داگیرکراوە و دەستیان کرد بە گێڕانەوەی سەربووردەی پالەوانێتی و حەکایەتگەلی بێ مانا کە من هەر بە تەواوی تێشیان نەگەیشتم. دواجار پێیان گوتم کە تەنها ڕووسەکان دەتوانن وڵاتەکەیان داگیربکەن و ئەم داگیرکردنەشیان پێراگەیەندراوە و داوایان لێکردم داخۆ ئینگلیز دەتوانن لەگەڵ ئەم هۆزە لە ئاشتی دا بژین. لەناو گەلانی جیهانا تەنها ڕووس و ئینگلیز و فرەنسی یان دەناسی. ئینگلیزەکانیان دەناسی چونکە هێندێکیان لە بەغدا بوون، هەرچی لەبارەی فرەنسییەکانەوەیە ئەوە لە سۆنگەی داگیرکردنی میسرەوە بوو کە دەیاناسین.

ئەمە ڕاستیەکە شایانی سرنجدانە، ترس لە داگیرکردنی ڕووس بە هەموو گۆشەیەکی وڵات کە من سەردانیم کردبوو بڵاوبووبۆوە. ئەمە بابەتی گفتوگۆی ناو هەمووان بوو. لە هەموو شوێنێك لێیان دەپرسیم: ئەوکاتە ئینگلیز و بۆناپارت چ هەڵوێستێك وەردەگرن. وەڵامم دانەوە کە بۆناپارت لە لای ئێمە زیندانییە و لەژێر چاوەدێریەکی توند دایە، بەڵام ئەوان نەیاندەویست باوەڕ بەوە بکەن و وا دیاربوو حەزیان دەکرد پێچەوانە بووایە.، چونکە ئەوان وەکوو دوژمنی ڕووسیا سەیریان

دەکرد کە بەشێوەیکی گشتی ڕقیان لە ڕووسیا دەبۆوە و وەکوو هێزێکی تێکنەشکاو تێیان دەڕوانی.

لە ١٠ ی مانگ، بە درێژایی دۆڵێکمان بڕی و نزیکەی بیست و پێنج میلمان بڕی و بە چوار گوند تێپەڕین و گەیشتینە کەناری حەوزێکی گەورەی شێوە بازنەیی لە بناری گردێکدا کە دە دوانزە جۆگەلە ئاوی زوڵاڵی تێدا دەڕژان کە لە کۆتاییەکەی دا ڕووبارێکی تا ڕادەیەك گەورەی لێوە دەڕژێ. ئەم ڕووبارە بۆ خۆی بەردەوام دەبێت بەسەر زەوییێکی تاڕادەیەك فراوان و درێژ و وەك هەموو ڕووبارەکانی دیکە بە ئاو دەدرێ کە لە سەریەوە دەڕژێ، کە ئەمە خاڵێکی لێکچووی ئاشکرایە لەگەڵ سەرچاوەکانی نیل وەك ئەوی بووس وەسپی کردووە. لە ئاواییەکی چکۆڵە بەناوی سوسێ[*] وەستاین، حەوزێکمان بینی  وەك ئەو حەوزەی کە تازە باسم کرد، برێك ماسی بێشوماری تێدابوو کە لەگەڵ بچووکترین دەنگەدەنگ ماسییەکان بەسەر ڕووی ئاوەکە دەکەون و برنج و لەتە نان کە بۆیان فڕێ دەدرێ دەیگرنەوە[5].

---

[*] Suza

[5] ئەم کردەیە زۆر زیاتر سەراسیمەی دەکردم ئەگەر پێشتر هەمان شتم لە ڕەوشێکی هێشتا سەرسامانەتر نەبینیبوایە. لە دەوروبەری مانانتودەی لە مالابار، نزیك لە یەکێك لە پەرستگەکان لە کەناری ڕووبارێکدا، ژمارەیەکی بێشومار ماسی تەواو ماڵیی دەبینین کە هەرگیز لەو ناوچەیە دوورناکەونەوە. وادیارە تێگەیشتوون کە لە ئەمان دان. بۆ خۆشی لەگەڵ برێك لە هاورێکانم بەرەو ئەو پەرستگایە چووین و دەستمان بە تاقیکردنەوەکەمان کرد بەوەی برێك لەتە نان و برنج و هێندێك گژوگیامان بۆ فڕێدان. وێرای ئەو هەراوزەنایەی کە ئێمە نامانەوە بەوەی بەردمان فڕێدەدایە ئەوبەری ڕووبارەکە کەچی ماسییەکان هەتا کەنارەکە دەهاتن و بە ژمارەیەکی ئەو هێندە بێشومار کە ڕووی ڕووبارەکیان دادەپۆشی. ماوەیەکی کەمێك پێشتر، جۆرێکیان لە داری قامیشی باریك (بامبۆ) یان دۆزیبۆوە کە دەیانتوانی بەسەریەوە هاتووچۆ بکەن و لەوێوە ئەم ماسییانە دەهاتن ئەوەی لە دەستمان بوایە وەریاندەگرت و هەردەموودەست پارچەکەیان بەردەست دەخست و دەچوونەوە ژێر ئاوەکە و ماوەیەکی کەمتر دواتر دەهاتنەوە بۆ ئەوەی ئەوەی پارچەیەکی دیکە ببەن. زۆر لە ماسییەکان چوار تا پێنج پێ درێژبوون، وێرای ئەوەی کە ئەم ڕووبارە زۆر گەورە نەبوو کەچی پێیان وتین مەلەکردن لەناویدا مەترسیدارە. خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە باوەڕیان وایە کە ئەم ماسییە بێشومارانە لەژێر پاراستنی تایبەتیی ئەو خوداوەندە دەژین کە سەرۆکایەتی پەرستگەکە دەکات و ئەوەی بیانگرێ یان بیانکوژێ ئەوا هەستی ئایینی



**په‌ره‌مووچی شاری سلێمانی**

هه‌رکه پێمان نایه سه‌ر زه‌وی ده‌ستمان کرد به داگرتنی باره‌کانی سه‌ر ئه‌سپه‌کان و ده‌ستمان به‌سه‌ر جۆره ته‌وێڵه‌یکدا گرتبوو هه‌رچه‌نده به بێ ویستی خه‌ڵکه‌که‌ی بوو که ده‌ستمان به‌سه‌ریانداگرتبوو.، که داوایان له ئێمه کرد ده‌ربچین به‌ڵام ئێمه ده‌رنه‌چووین و ڕه‌تیانکرده‌وه که که‌مترین شتمان پێشکه‌ش بکه‌ن. وه‌ك چۆن ته‌نها پیره‌مێرد و ژن و منداڵمان ده‌بینی. ئێمه سی که‌سێك ده‌بووین، ته‌تاره‌کانمان په‌نایان بۆ ڕێگه‌چاره‌ی ئاسایی برد و قامچیه‌کانیان ڕاکێشا و ئه‌زموونی په‌سندکراوی خۆیان به ئازادی پیاده‌کرد. ده‌مووده‌ست، بینیمان گروپێك سواره‌ی ته‌واو ساز له پێده‌شته‌که‌وه گوێبیستی شه‌قه‌ی قامچی بووبوون به هه‌ڵه‌داوان به‌ره‌و لای ئێمه هاتن. من که ئه‌و هێنده‌جار کاریگه‌ری گورزی قامچیم بینیبوو، ده‌ستم نه‌کرد به داگرتنی باری ئه‌سپه‌که‌م و هه‌ستم به مه‌ترسی

---

خوداوه‌نده‌که‌ی برینداره ده‌کات. باوه‌ڕ ناکه‌م هیچ ئه‌وروپییه‌ك توانیبێتی جۆری ئه‌م ماسیانه دیاری بکات. خه‌ڵکه ئه‌وه دووپات ده‌که‌نه‌وه ئه‌وه‌ی گۆشتیان بخوات ده‌مرێ چونکه گۆشته‌که‌یان پیرۆزه و ده‌شێ خه‌ڵکی ڕه‌سه‌نی ناوچه‌که به شێوه‌یه‌ك ڕه‌فتار بکه‌ن له به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌ی که ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی که‌سێکی ژیاندۆستی شانازیکار به‌خۆی هه‌بێ جورئه‌تی ئه‌وه بکات ته‌حه‌دای ئه‌و ترسه بکات که هێمای بۆ ده‌که‌ن.

نەکرد تەنها ئەوکاتە نەبیّ کە بیستم تەتارەکان هاواری جەنگ دەکەن و ئاوڕم بەلایان دایەوە بینیم هەموویان شمشێرەکانیان هەڵکێشاوە.

دەموودەست، دوژمنەکان پەلاماریان داین، لەکاتێکدا خەڵکی گوندەکە لە دواوە بە بەرد پەلاماریان دەداین. دوژمنەکان ژمارەیان لە ئێمە زیاتر بوو بەڵام چەکەکانیان لە ئاست چەکەکانی ئێمەدا نەبوو هەر وەکو پیاوەکانی ئێمە لە شەر ڕانەهاتبوون کە ئازایەتیەکی بێوێنەیان نواند. عەلی ئاغا چولنگی لەناویان دا دیاربوو و توانیمان ناچاریان بکەین ڕابکەن. یەکێك لە پیاوەکانی ئێمە بە شمشێر ناولەپی بریندار بوو و یەکێکی دیکەش بە برینێکی ترسناك شانی بریندار بوو. هەرچەندە ئەسپەکانمان لە ڕەوشێکی باشدا نەبوون بەڵام هەر بەدوایاندا کەوتین و دوژمنەکانمان کشانەوە ناو شەقامێکی تەسك و تریسك کە پەلاماردانیان مەترسیدار بوو.

سەرۆکەکەمان زۆر لەوە وریا بوو کە نەوەکا ئەوەی پێی دەڵێن موخاتەرەی پێچەوانە بکات.، بەم سەرکەوتنە دەستبەردار بوو و ڕایسپاردین کە وریا بین و لە یەکتر دانەبڕێین. هەموو ماڵەکان داخراو بوون یان چۆڵکرابوون و دەبوو واز لە نەوا و ئازووقە بهێنین. چاوەڕوانی شەومان دەکرد بۆ ئەوەی بڕۆین، بەڵام ڕێبەرە کوردەکانمان شێوە گرێبەستێکی ئاگربڕیان لەگەڵ دانیشتوانەکە بەستبوو کە قەناعەتیان بەوە هێنابوو کە ئێمە ئامادەین داکۆکی لە خۆمان بکەین و ئێمە هیچ شتێکی ئاوەها لە دەست نادەین.، بۆیە ئەوان ڕازی بوون لەسەر ئەوەی هەموو چەشنە تەقوتۆقێکی دوژمنکارانە ڕابگرن بەڵام سەرسەختانە ڕەتیانکردەوە کە بە هیچ شێوەیەك هیچ چەشنە ئازووقەیەکمان پی˝نەدەن.

سبەینەیەکەی ١١ ی ئادار، بەیانی لە کاتێکی زوودا ڕۆیشتین، بەڵام نەمانتوانی متمانە بە ڕاستگۆیی نیازی دوژمنەکانمان بکەین و حەزیشمان دەکرد خۆمان لە هێرشێکی نویّ وەدوور بگرین، شارۆچکەکە کەوتبووە ناو چیایەکەوە و نیوەڕۆیەکەی گەیشتینە ئاواییەك لەسەر کەناری ڕووبارێك کە برێك لە ڕێبەرەکانمان ناویان نابوو زەر*، بەسەر حەسیر بەسەر ئاوەکە بە پێستی مەری

* Zer

فووکراو پەڕینەوە. ڕێڕەوی ئاوەکە زۆر تیژڕۆ بوو و پانییەکەی نزیکەی دووسەد و چڵ پێ دەبوو و هەرگیز بە وردی لەسەر هیچ نەخشەیەك نەمبینیبوو. ئاوەکە بە ئاڕاستەی چیایەکان دەڕۆیشت و پاشان دوورتر بەرەو لای ڕۆژهەڵات دەڕۆیشت و ئەو ڕێگەیەی دەبڕی کە ئێمە لامان وابوو هەرقەڵ لە گەرانەوەی لە گوزاوجە* بڕیویەتی، ئەم ڕووبارە سنووری ئەو زەوی و زارەیە کە سەر بە سلێمانییە. کاتژمێر و نیوێك لە کەناری ڕووبارەکە وەستاین و پاشان بە ڕێکەوتینەوە و دوای ئەوەی بەلای کەمییەوە سی و حەوت میلێکمان بڕی و گەیشتینە ئاواییەکی چکۆڵە بەناوی گوڵێخان.

لەکاتی باسکردنی کشانەوەی هەرقەڵ دوای هێرشی سێیەمی، دەبێ ئەوە قەبووڵ بکرێ کە وێرای ئەوەی کۆلۆنێل کینئەر باسی دەکات، ئەوا زۆر لە خۆمان دەکەین ئەگەر بڵێین دەتوانین بڕێك شوێنەوار بدۆزینەوە. لەگەڵ ئەوشدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە ئەم ژمارە زۆرەی گۆڕستان کە ئەمڕۆ بینیمان وامان لێدەکات باوەڕ بەوە بکەین کەوا جەنگێکی کۆنی زۆر گەورەی سەخت لەسەر ئەم خاکە ڕوویداوە، چونکە شوێنەواری هیچ شارێك یا گوندێك یان کەلاوەیەك نابینین کە ئەوە بگێڕێتەوە کەوا شارێکی گەورە لێرەدا هەبووە. سەرەڕای ئەوە ئەم گۆڕستانانە بەو شێوەیە ڕیز نەبوون کە لەو سیستەمە ناسراوەدا هەیە کە لە گۆڕستانگەلی ناوچە ئاوەدانەکاندا بینیمان. ئەو گۆڕستانانە لە شوێنێکی تایبەت کۆنەکراونەتەوە کە ئامادەبن بۆ ئەوەی مردووی تازە بەخۆوە بگرن، بەڵکو بە هەموو لایەکەوە پەرت و بڵاوبوونەتەوە و بازنەیەك پێکدەهێنن کە لە ناوەڕاستەکەی گۆڕێکی کەمێك بەرزتری تێدایە و بە بەرد داپۆشراوە و ئەوە ئیشارە بۆ ئەوە دەکات کە دەشێ ئەمە گۆڕی سەرۆکێك بێ و لە دەوروبەریشیەوە گۆڕی سەربازەکانی بن. دواجار ڕەوشی نیسبیی ئەو گۆڕستانانە ئەوەیە کە لەنێوان خۆیاندا هێشتا ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم گۆڕانە دەبێ دوای شەڕێکی خوێناوی هەڵنرابن.، و هێلێك پێکدەهێنن کە ناوەڕاستەکەی زیاتر لە ئەوپەڕەکانی زیاتر درێژتر دەبێتەوە.

---

* Guazuca

لە گوڵیخان[*] قاڵی زۆر جوان بـە جـوانترین ڕەنـگ دروسـت دەکـەن. کوردەکـان ڕێگەیان داین لە یەکێك لە کوخە پەڕپووتەکان بمێنینەوە، بەڵام خواردنێکی نایابی برنج و قەیسیان پێشکێش کردین. بڕێك لە کوردەکان لەم گونـدە دوو دەمانـچەیان لای یـەکێك لـە تـەتارەکان بینیبـوو کـە لوولەکـەی درێژییەکـەی بـەلای کەمییـەوە هەژدە پەنجە دەبوو و هی یەکێك لە تەتـەرەکانی ئێمـە بـوو، پێیـان لەسـەر ئـەوە داگرت کە پێیان بفرۆشێ. وەختایەك تەتەرەکە نەیویست بیفرۆشـێ، داوای بیـست دۆلاری کرد، دەموودەست پارەکەیان دا، لە حاڵێکدا نرخی ئەم دەمانچەیە ناگاتـە چل سەنت. تەتارەکەم کە گاڵتەی بە نەزانیی کوردەکـان دەهـات بـە پێکەنینـەوە پێـی وتم کـە سـەروەتێکی چـکۆڵەی کۆکردۆتـەوە لـەوەتای دوو هەفتـە دەبـێ لـە خیوەتگاکەی داود ئەفەنـدی وەختایـەك کاروانەکـە سـێ ڕۆژە ڕێیـەك لـە بەغـداوە دوور بوو، هەموو شتێك کە لە کۆنستانتینۆپلەوە بهێنی دەیکڕن. ئەو شێوازەی کە ئەم بازرگانییە بەزۆرییەی پێدەکرێ ئاماژە بـە زانـینی داب و نـەریتی ئـەم هۆزانـە دەکات کە برێکجار هێندە دەستبڵاو خۆیـان نیـشان دەدەن کەچـی بەشـێوەیەکی ئاسایی تالانچین. لـەو خیوەتگایـەی کـە هـی داود ئەفەنـدی بـوو گرتبوویـان و لـە کاتێکـدا کـە کاروانەکـە تـەنها سـێ ڕۆژ لـە بەغـداوە دوور بـووە گلیانداوەتـەوە و چـەندین جـار هـەوڵیان دابـوو بـە بێهوودەییـەوە ناچـاری بکـەن تـا جانتایـەکانی بکاتەوە. شەو بەزۆر کردبوویانەوە و لە بەیانییەکەی داوایان لێکردبوو نرخـی هـەر کەلوپەلێك دیاری بکـات و دەموودەسـت نرخەکـەیان دابـوویێ، ئـەوە چـونکە وەك هاوڕێ مامەڵەیان لەگەڵدا کردبوو، بەڵام ئەگەر مامەڵەیان دوژمنکارانە بوایە دەشیا ژیانی لەدەست بدات دوای ئەوەی کەلوپەلـەکانی ون دەبـوو، ئەمـە ئەگـەر هـەوڵی بدابوایە بەرەنگاریان بکات.

---

[*] Kouli-Khan



**په‌ره‌مووچی پێده‌شتی سلێمانی**

له دوانزه‌ی مانگ، دوای ئه‌وه‌ی شانزه میل و نیومان بڕی و له رێگه‌یه‌کی چیایی سه‌خت و دژوار چووینه ناو شیوێك که شاری کۆیسنجاقی تێدابوو. پێش ئه‌وه‌ی بگه‌ینه ناو شار که‌لاوه‌ی بینایه‌کی گه‌وره‌مان بینی، رێڕه‌وی ئاوێکمان بڕی که لقێکی رووباری کارپووس* یان زێی بچووك بوو و پردێکی به‌ردینی جوانی له‌سه‌ر بوو که له کۆندا هه‌بووه به‌ڵام داڕووخابوو. ئه‌م شاره که‌وتۆته ناو به‌رزاییێك که له‌م رووباره‌وه دووره. ئه‌م رووباره به‌شێوه‌یه‌کی به‌شیی پاراستوویه‌تی و شاره‌که له سلێمانی گه‌وره‌تره و بینایه‌کانی باشتر دروست کراون. له‌وانه‌یه ژماره‌ی دانیشتوانی به‌لای که‌مییه‌وه بگاته دوانزه هه‌زار که‌سێك. مزگه‌وتگه‌لی جوانی تێدایه که گومبه‌زی به‌سه‌ره‌وه‌یه. هه‌روه‌ها برێك باخچه‌ی دلگیری تێدایه که که‌وتوونه‌ته سه‌ر که‌ناری رووباره‌که. به‌گشتی ده‌توانرێ به‌شێکی زۆری به‌سه‌ر زۆر شارگه‌لی ئاسیه‌وی دا په‌سند بکرێن. شارێکی زۆر پاك و خاوێنه و ئاو و ئاوه‌ڕۆ و برێك دامه‌زراوه‌ی گشتی دیکه‌ی تێدایه که ناتوانین لێره‌دا ناویان ببه‌م. بازاری کۆیسنجاق بازارێکی گه‌وره‌یه و پڕه له که‌ل وپه‌ل. نابێ ئه‌وه له‌یاد بکه‌م بڵێم له کاتی هاتنه‌خواره‌مان له‌و رێڕه‌وه‌ی که به شاره‌که ده‌گه‌یشته‌وه،

---

*Carpus

ئاماژەیان بۆ چیایەك بۆ کردم بەناوی قەندیل-داغ کە بە گوێرەی گێرانەوەکان ئەسکەندەر شەڕێکی گەورەی تێدا کردووە.

کۆیسنجاق ئەم ناوچە چیاییە بەرزە بە کۆتایی دەگەیەنێ کە سلێمانی لەوانەیە وەکوو خاڵی سەرەکی سەیر بکرێ، هەرچەندە بەرزتریش نییە. ئەم بەشە شاخ و داخاوی ترین بەشی کوردستانە و ڕۆژێك دەزانرێ کەوا ئەم تێبینیانەی خوارەوە هەموویان ڕاست و دروستن: ١-ئاڕاستەی گشتیی ڕێگەی کفری-کیتشان، بە بەردەوامی بەرزدەبێتەوە و بۆ ماوەی نزیکەی ٥٨ میل چیا و دۆڵ دەبڕێ و بە ئاڕاستەی باکووری ڕۆژهەڵات دا دەڕوات.، ٢-لەنێوان کیتشان و دۆلان، بەناو زنجیرە چیایەکی گەورەدا دەڕۆین کە تا کۆیسنجاق دادەبەزێ و لە باکوورەوە بۆ باشوور و زیاتریش بەرەو لای ڕۆژئاوا هەڵدەکشێ هەروەك ئەوەی نەخشەکان ڕوونی دەکەنەوە.، ٣-ڕێگەکە بەشێوەیەکی گشتیی لە دۆلانەوە تا دۆڵی سلێمانی کەمێك دادەبەزێ و بەرەو باکوور بە ئاڕاستەی ڕێڕەوێکدا دەڕوات کە دەگاتە کۆیسنجاق و پاشان بەرەو ڕۆژئاوا درێژدەبێتەوە تا دەگاتە ئەربیل.، ڕێگەی ڕاستەوخۆ لە بەغداوە بۆ مووسڵ.، ٤- ڕێگەکە لە سلێمانییەوە تا لووتکەی ڕێڕەوی کۆیسنجاق کەمێك بەرزدەبێتەوە بە هەمان ئەو ماوەیەی کە لە دۆلانەوە نزمدەبێتەوە.

کەوایە سلێمانی ناوەندی بەرزترین دۆڵی کوردستانە.، هەروەك چۆن ئەم دۆڵە بە چیای سەرکەش دەورەدراون کە لەماوەی زۆرترینی کاتەکانی ساڵدا بەفر داپۆشیون و هەموو تایبەتمەندێتییەکانی ئاو و هەوای زۆر مامناوەندی ئێمەی هەیە بە بێ ئەوەی ئەو پیت و فەڕییە نایابەی کە شان لە شانی پیت و فەڕی ناوچە گەرمەکان دەدات، لە دەستبدات. ڕاستییەکەی دۆڵی سلێمانی بە یەکێك لە بە پیت و فەڕترین دۆڵەکانی جیهان دەژمێردرێ. کوردەکان خۆیان لە دەورانی هەرە کۆنەوە نەتەوەیەکی کۆچەرن و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچن و نەوەی فارسە کۆنەکانن، و تا ئێستەکەش داب و نەریتی کۆنی خۆیان لەم چیایانە پاراستووە کە شانازی بە سەربەخۆیی خۆیان دەکەن و ئەم ڕۆحیەتی سەربەخۆییە ئەو هێندە سەیروسەمەرەیە کە برێکجار تێبینی ئەوە دەکرێ کە جێگەی مەترسییە هەتا چاویشت پێیان بکەوێ. چیانشینەکان جیاوازن لە

هاونیـشتمانییه‌کانیان کـه لـه پێده‌شـته‌کاندا ده‌ژیـن، ئـه‌و چیانـشینانه بـه پیـشه ڕێگرن، به به‌رده‌وامی چالاکن و تاقه کاریان ئه‌وه‌یه که به دوای ده‌رفه‌تێکی شـیاو دا ده‌گه‌ڕێن بۆ تالآن و بڕۆیی. به‌شێوه‌یه‌کی گشتیی پێکهاته‌یان بـه‌هێزه ،چـالاك و جه‌سوورن. ڕیشێکی پڕ چه‌نگه و خوارووی گۆنایان داده‌پۆشێ بـه‌لام بـه ده‌گمـه‌ن لێده‌گه‌ڕێن ئه‌و هێنده درێژ ببێ. سمێلێکـی ڕه‌ش کـه جۆرێـك لـه نـاکۆکی له‌گـه‌ڵ چاوی شین دروستده‌کات که وه‌کوو چاوی هه‌ڵۆ وایه و واپێده‌چێ هه‌میشه به‌دوای نێـچیر و لـه‌رزه‌تی تۆڵه‌سـه‌ندنه‌وه‌دا بگـه‌ڕێ. هه‌میـشه چـه‌کدار، لـه مالّـه‌وه ده‌مانـچه‌یه‌ك، خه‌نجـه‌رێك یـان حه‌ربه‌یـه‌ك و زرێپۆشـێك هه‌ڵـده‌گرن و کـاتێکیش ده‌چنه ده‌ره‌وه هه‌میشه له‌گه‌ڵ خۆیانا ته‌ورێك یان ده‌مانچه‌یه‌ك یان ڕمێك له‌گـه‌ڵ زرێپۆشـێك هه‌ڵـده‌گرن. نیـشانه‌گه‌لی بـه‌هێزی و له‌شـساغیی کـه بـه‌و ڕه‌نگـه زه‌یتوونییه‌وه دیاری ده‌دا ئه‌وا پـۆترێتی ئـه‌و چیانـشینانه تـه‌واو ده‌کـات و جـاڕی ڕێگرێکی به‌هێز و سه‌رسه‌خت ده‌دات.

دوای ئه‌وه ئافره‌تی کورد دێت و ئه‌م تابلۆیه ته‌واو ده‌که‌ن کـه لـه ده‌ورانـی گه‌نجایه‌تیاندا پێستی ڕووخساری ئه‌سمه‌ریان زیندوێتی لێوه‌ده‌تکێ و ڕووخۆشـن و ده‌شێ به فریشته‌ی چیایان دابنێین، به‌لام هـه‌رزوو ده‌بنـه سوارچـاك و لـه هـه‌موو گه‌شته‌کانیاندا به‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌کانیان ده‌کـه‌ون و لـه سۆنگه‌ی شـه‌که‌تی ژیـانێکی کۆچه‌رییه‌وه هه‌ر زوو شۆخ و شـه‌نگیان نـامینێ. ئه‌فـسوونی جوانییـان بـه هـه‌موو ناسکیانه‌وه له پانزه تا بیست سالّی دایه و له بیست و پێنج سـالّیدا ئیـدی له‌سـه‌ر که‌وتن دان. هه‌میشه به‌سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌وه‌ن، ته‌حه‌دای مێرده‌کانیان ده‌کـه‌ن لـه جه‌سـاره‌ت و خێرایـی ئه‌سـپه‌کانیان و کـه‌م ئه‌سـپ هه‌یـه شـان لـه شـانی ئه‌سـپی کوردستان بدات به تایبه‌ت له خێرایی به‌سه‌رکه‌وتن و هاتنـه‌خواره‌وه‌ی گردۆلکـه‌ی زۆر لێژاولێـژ و سـه‌ختدا. کـورد عاشـقی ڕاوه ئاسـکن و بـه هـه‌مان جـۆش و حه‌ماسه‌ته‌وه ڕه‌دووی ئه‌م ئاژه‌ڵه ده‌کـه‌ون بـه‌بێ ئـه‌وه‌ی بـچووکترین حیـساب بـۆ سه‌ختیی زه‌وییه‌کانیان بکه‌ن، ئه‌سپه‌کانیان بارستیان له ئه‌سپی دیکه گـه‌وره‌تره، سواربوونیان دڵنیاتره و زوو ماندوو نابن، جوانی و چـالاکی و زینـدوێتی یـان لێـوه ده‌بارێ.

من ناتوانم بە دڵنیاییەوە باسی دابەشبوونە جوگرافییەکانی کوردستان بکەم. لەناوەوەی ئەم وڵاتە  کە زۆر نەناسراوەو هیچ گەڕۆکێکی ئەوروپی لەوانە نییە توانیبێتی ئەم چیاوچۆڵانە بەو ئاڕاستەیە ببڕێ کە ئێمە بڕیمان. لەگەڵ ئەمەشدا وا دیارە ئەم ناوچەیە لە کۆندا زۆر ناسراو بووە، ئەگەر بمانەوێ پشت بەو پارە زێڕ و زیوە یۆنانی و ڕۆمانییە ببەستین کە لەو وڵاتە دەبینرێ و دانیشتوانەکەی زۆربەی جار بۆ خۆ جوانکردنی ژنان و منداڵان بەکاری دەهێنن. ئەمڕۆ بەشێکی کوردستان سەر بە تورکیا و بەشێکی دیکەشی سەر بە ئێرانە و دابەشی سەر چەندین حکومەتی چکۆڵە کراوە کە لە لایەن پاشایەکانیەوە کە لە پلەی پاشایەتی یەکدان حوکمڕانی دەکرێن و تەنها بەشێوەیەکی ڕواڵەتی ددان بە دەسەڵاتی سەرۆکەکانیان دادەنێن لێرە و لەوێ بەردەوام لەناو خۆیاندا لە شەڕدان و جیاوازیەکانیان بە دەستی شمشێرەوە چارەسەر دەکەن و کێشە و ناکۆکی بە میرات بۆ هۆزەکانیان بەجێدەهێڵن و ڕۆحی تۆڵەسەندنەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان دەگوازنەوە. تاڵان و بڕۆیی بەوپێیەی بەرنامەی ڕۆژیانە و ئەم حاڵەتی پاشاگەردانییە دەبێتە بیانووی زۆر تاوانکاری و وەك چۆن کوردەکان تاڵانچی پیشەکارن و کاراکتەری تۆڵەسەندنەوەیان هەیە، خوێناوی و شەڕانین، بۆیە ژیانی حکومەتەکانیان هیچ تاسیرێکی وا لەسەر ژیانی ئاسایی ئەوان دانانێ.

هەرچەندە ئەو چیایانە بە مانای تەواوی وشەکە کۆتاییان بەو ڕێڕەوە دەهێنا کە دەگەیشتەوە کۆیسنجاق، بەڵام تەواوی ڕۆژی ١٣ ی مانگ و ١٤ ی مانگیش تاوەکو نیوەڕۆ هەر بەسەر ئەو گردۆلکە بەردینانەدا ڕۆیشتین کە پێدەشتێکی پان و بەرین و ڕێگەیەکی سەخت و مەترسیدار دەیبڕی. دزەکان چەندینجار هاتنە پێشەوە بۆ ئەوەی کاروانی پێشەوەمان بوەستێنن، بەڵام ئێمە ئەوەهێندە هێزەمان هەبوو تا ئەوەی وەلامیان بدەینەوە و ئەوەهێندەش جانتامان پێنەبوو تا چاوچنۆکی ئەوان بوروژێنین. بە بێ هیچ ڕووداوێك گەیشتینە ئەربیل، ئەربیلای کۆن و دوای ئەوەی بەناو بازاڕ و شەقامی زۆر پیس و پۆخڵدا ڕەتبووین، ئێمەیان بردە ناو جوانترین ماڵی شارەکە. ئاسان بوو کە ببینرێ وێرای ئەو پێشوازییە گەرمییەی کە لێیان کردین، هاوڕێگە جۆرجییەکەمان، کۆیلەی گوێڕایەڵی پاشای بەغدا، پێی وابوو بە گوێرەی پێویست پێشوازیان لێنەکردووە. ڕۆڵی

که‌سایه‌تیه‌کی گه‌وره‌ی گێرا و بۆ پاراستنی که‌رامه‌تی خۆی بێده‌نگیه‌کی زۆری هه‌ڵبژارد و ته‌حه‌فوزێکی لووتبه‌رزانه‌ی نیشاندا و ره‌فزی ئه‌و له‌باوه‌شگرتنه دۆستانه‌یه‌ی کرده‌وه که حاکمی شار ویستی بۆ رازیکردنی دۆستایه‌تی ئه‌و نیشانی بدات. ئه‌م زیاره‌ته به گوێره‌ی رێوره‌سمی ئه‌ته‌کێتخوازی دواکه‌توو بوو. جۆرجیه‌که له هه‌ڵسوکه‌وتی حاکم هه‌ستی به سووکایه‌تی کرد که حاکم نه‌هاتبووه ده‌ره‌وه‌ی شار بۆ پێشوازیکردنی و مه‌راسیمی رێزلێنان و سڵاو بۆکردنی بۆ نه‌کرد له‌کاتی گه‌یشتنیدا، که ئه‌مه رێزلێنانێکه پێم وایه زۆر له پایه‌ی جۆرجییه‌که گه‌وره‌تره. حاکم به ساردییه‌وه خزمه‌تی نێردراوی داود ئه‌فه‌ندی کرد و زۆر له‌سه‌ر هه‌ق بوو و ترسی له ئه‌نجامی ئه‌و هه‌ڵه سیاسییه بوو، بۆیه هه‌وڵیدا ئه‌و که‌سایه‌تییه گرینگه هێور بکاته‌وه به‌وه‌ی مه‌رایی بۆ ستایشیکردنی بکات.

دوای ئاشته‌وایی و له ئه‌نجامدا وتوێژ له‌نێوان ئه‌و سه‌رۆکه به‌جه‌رگانه، حاکم هه‌موو له‌شکره‌کانی ئۆردوو و پیاوانی وڵاتی له‌ناو ئه‌و گۆره‌پانه کۆکردنه‌وه که له‌و ماڵه‌دا بوو که ئێمه‌ی تێدابووین و دوای ئه‌وی چه‌ند ته‌قه‌یه‌ك به ئاسماندا کران، ئه‌و فرمانه‌ی سوڵتانی گه‌وره خوێندرایه‌وه که تێیدا داود ئه‌فه‌ندی کراوه به پاشای به‌غدا. هه‌موو پیرۆزباییان له‌یه‌ك کرد و ده‌ستی یه‌کیان گرتبوو و شاییێکی خۆشی هێمنیان ده‌ستپێکرد و له‌گه‌ڵ گۆرانیه‌کی به منگه‌منگ و بێزارکه‌ر که سه‌رۆکی ئاهه‌نگه‌که پێشکه‌شی ده‌کرد. ئاسان بوو ببینرێ که ئه‌م دیارده‌گه‌لی خۆنیشاندانانه له دڵه‌وه نییه، هه‌ندێکیان ته‌نها ئاهه‌نگ ده‌گێرن بۆ گۆرینی سته‌مکارێك به سته‌مکارێکی دیکه، که ئه‌مه گۆرانێکه لێره له رۆژهه‌ڵاتدا له‌سه‌ر حیسابی حاکمه‌کان ده‌بێ، چونکه خه‌ڵك له ده‌سه‌ڵاتدا شوێنه‌که به ده‌ستکه‌وت ده‌زانن و جێیناهێڵن ته‌نها ئه‌وکاته نه‌بێ که سه‌ریان بپه‌رێ. ناوه ناوه خه‌ڵکی ره‌شۆك ده‌هاتنه ناو ئاهه‌نگه‌که و هیتافیان ده‌کێشا. هه‌رکاتێکیش ده‌نگیان زۆر به‌رز نه‌بوایه خه‌ڵکانێك به‌بیانووی پاراستنی ریزه‌کانه‌وه شانی خه‌ڵکه‌کانیان له راست و چه‌پ ده‌جوولاند تا ئه‌وه‌ی زۆر به‌رزتر هاوار بکه‌ن. له کۆتایی شاییه‌که به‌شێوه‌یه‌کی نارێك و پێك به هه‌موو چه‌ك و چۆڵ و ده‌مانچه‌کانی ئۆردووه‌که ته‌قه به ئاسماندا ده‌کرا و جا وه‌ك چۆن زۆربه‌ی ئه‌م چه‌کانه فیشه‌کیان تێدابوو، خۆشبه‌ختانه هیچ رووداوێك روویان نه‌دا.

وەختایەك ئاهەنگ گێڕانەکە کۆتایی هات، بەدبەختی ئەوەم بوو وەکوو ئەوروپیەك ناسێنرام و هەر دەموودەست هەموو نەخۆش و پەککەوتەکانی شارەکە هوروژمیان بۆ هێنام کە لایان وابوو من چاکیان دەکەمەوە و شاشبوون و باوەڕیان پێم نەکرد کە من ئاماژەم بۆ شمشێر و دەمانچەکەم کرد کە پیشەی من کوشتنە نەك چاککردنەوە. یەکێك لەنێویاندا پێی داگرت کە من ڕۆڵی "بەزۆر کراوە بە دوکتۆر"[6] ببینم و هەموو نەخۆشەکانی لێم دوورخستەوە و پێی وتم کە ئەو هەقی بووە بیانووەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لێیان ڕزگاری ببێ و خۆی وەك پیاوێکی گرینگ و لەسەر ئاستی حاکمی شار ناساند و داوای لێکردم ڕای خۆم لەسەر ئەو نەخۆشیەی بدەم کە وەسپی کرد و ئەو چاك دەزانێ کەوا ئەوروپییەکان و بە تایبەتی ئینگلیزەکان لە پزیشکەوانیدا زانستکارن هەتا ناوی چەند ژمارەیەك لە کاربەدەستانی ئێمەی هێنا کە ئەوانە پزیشکەگەلی کارامە و زیرەکن و هەتا ئاماژەی بە ڕیشی درێژی یەکێکیان و جدیەتی ئەو کرد لە مامەڵەکردندا. ئیدی هیچ دەرفەتێکم لەبەردەمدا بۆ نەمایەوە بۆ ئەوەی خۆمی لێ ڕزگار بکەم و لە ترسی ئەوەی نەوەکا هەیبەت و قیمەتی خۆم وەکو ئینگلیزێك لە دەست بدەم و لەبەر ئەوەش کە حەزم نەدەکرد ڕۆڵی پزیشك یاری بکەم، ئامۆژگاریم کرد تا سەفەری بەغدا بکات بۆ عەملیاتێك کە دەمزانی نەخۆشیەکەی پێویستیەتی و بۆ ئەوەی خۆم لە دەست ئیلحاحکردنی ڕزگار بکەم ژەمێك لەو دەرمانانەی کە پێم بوو دامێ.، پاشان داوای لێکردم چارەسەرێکی بۆ لاوازی یەکێك لە ئۆرگانە دیاریکراوەکانی بۆ بدۆزمەوە، دەزانم هیچ شتێك نییە لە جیهان چارەسەری ئەمە بکات، پێم گوت کە من نازانم و بە هیچ شێوەیەك نازانم دەرمانێك بۆ چارەسەری ئەم لاوازی و بێتواناییە هەبێت. کاتێك ئەوەم پێگوت، پێی گوتم کەوا دەرمانەکەم تاقیدەکاتەوە بەڵام چیتر باوەڕی بە زانایی من نەکرد.

ئێوارە داوەتی خواردنێکی شاهانە کراین کە بەلای کەمییەوە چل جۆر خواردنی هەمەچەشنەی تێدابوو. کوڕگەلی حاکم پێشکەش بە میوانەکان کران بۆ ناسینیان و پاشان چەرۆکگێڕەوە و دواتر مۆسیقازانەکان کە بۆ خۆشی ئێمە هاتبوون پێشکەشکران. بەو پێیەی کە بە قورسی لە مانای گشتی ئەوە دەگەیشتم کە بە تایبەتی پێیان دەوتم، بە ئاسانی گریمانەی ئەوەیان کرد کە من هیچ

---

[6] ئاماژەیە بە شانۆنامە بەناوبانگەکەی مۆلیێر (بەزۆر کراوە بە دوکتۆر).

خۆشیه‌ك له‌ گوێگرتنی چیرۆك گه‌لێك نابینم كه‌ بابه‌ته‌كانی بۆ من نادیارن و ناتوانم تێیان بگه‌م. هه‌رچی تایبه‌ت به‌ مۆسیقاكه‌ بوو ئه‌و هێنده‌ سه‌ره‌تایی و نه‌شاز بوو كه‌ ته‌نها گوێچكه‌ی توركی ده‌یتوانی به‌ دڵی بێت و به‌ سروودی شاعیره‌




په‌ڕه‌مووچی چه‌ند كوردێكی چه‌كدار

گه‌ڕۆكه‌كانی ناوچه‌كانی باشووری فرانسا ده‌چوو كه‌ له‌ ئاواییه‌كی لۆنگدۆكی* (باشووری) ئه‌و وڵاته‌ گوێبیستی بووبووم.، به‌ڵام جیاوازیان زۆر بوو و مۆسیقاكه‌ زۆر له‌ خوارووتر بوو. له‌گه‌ڵ ئه‌وشدا هاوڕێیه‌كانم خۆشنوود بوون و به‌ بێ په‌شیمانبوونه‌وه‌ وه‌كو باجی سوپاسگوزاری و پێزانینی ئه‌و پێشوازییه‌ی كه‌ لێوه‌یان كردم چه‌په‌ڵه‌م بۆ لێدان. توركه‌كان وه‌ك ئاسیاییه‌كان هه‌ستیار نین له‌به‌رانبه‌ر سازانیی ئاواز و وه‌بیرم دێ كه‌ له‌ یه‌كێك له‌ ئاهه‌نگه‌ گشتییه‌كان و له‌ ده‌رباری نیزامدا، وه‌ختایه‌ك گروپی مۆسیقای سه‌ربازی ئێمه‌ یه‌كێك له‌ جوانترین

* Languedoc

سەمفۆنییەکانی دەژەنی، داوایان لێکرد ئەو مۆسیقایە دووبارە بکاتەوە کە پێشتر ژەنیبووی و تەنها سازانێکی ئامێرەکان بوو و بەس.

دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆیشتن، خۆم ئامادەکرد لەسەر ئەو قاڵی و ئەم بالیفەی ناو هۆڵەکە بخەوم کە ئێوارە نانمان تێدا خوارد، وەختایەك تەتەرە چەپەڵەکە هات و داوای لێکردم تا بچمە ژوورێکی دیکە لە نهۆمی خوارەوە. سەرەتا وای بۆ چووم کە ئەو هۆڵەی ئێمەی لێبوو بۆ کاری دیکە تەرخانکراوە و لەسەر ئەوە بووم دەربچم، زانیم کەوا ویستوویانە من بگوازنەوە تەنها بۆ ئەوەی جوانترین بینایەکە بۆ هاوەڵە جۆرجیەکەمان بەجێبهێڵن، هەستم بە تووڕەیی کرد بەو ئیهانەکردنەم، بۆیە وێرای ئەو هاوارانەی کە دژی من بەرزبوونەوە کەچی من ئەو شوێنەم هەڵبژارد کە بۆ من ئاسوودەتر بوو و بە ئارامی تێیدا خەوتم. لەوانەیە بڕێکیان ڕەخنەیان لە هەڵسوکەوتی من بووبێ و منیان بە کەم ئەدەب و نەزاکەت دانابێ، بەڵام تاقیکردنەوەم لەگەڵ سروشتی ئاسیاییەکان، فێریان کردم کە ئەگەر ئەم دەرفەتە لە دەست بدەم ئەوا هەیبەت و ئەو مەرتەبەیە لە دەست دەدەم کە لە نەفسیەتی ئەواندا هەمە. لەو دەروناوچانەی کە باڵادەستیی قانوون ناناسن، ئەگەر نەوازش و خاکڕایی خۆت نیشان بدەی، ئەوان ئەوە یان بۆ ترس یان بۆ هەستکردن بە کەمیی خۆت دەگێڕنەوە. بەو پێیەی کە شەرەف ئەوەم هەبوو لە حزووری پاشادا دابنیشم، وەختایەك ئەم کۆیلە پیسە هێشتا بە کۆیلەش قەبووڵ نەکرابوو، بۆیە لەوە بێگومانم کە لە خەیاڵدانی هاوڕێکانم وا هێمام بۆ دەکەن کە لە مەرتەبەیەکدا بم کە بۆ من گرینگە لەو مەرتەبەیە نەیەمە خوارەوە.

ئەربیل، ئەربیلای کۆن بەو جەنگەی کە ئەو ناوەی هەڵگرتووە، وێرای ئەوەی کە جەنگەکە لە دوورییەکی لەو دوورتر ڕوویداوە و بەو پەنا بردنەی کە داریۆش دوای شکستەهێنانەکەی پەنای بۆ بردووە، بەناوبانگ بووە. ئەربیل، شارێکی ناشرین و پیس و پۆخڵە و ناوەڕاستەکەی پاشماوەی قەڵایەکی لێیە کە ڕووخاوە. هەروەها دەکەوێتە سەر ئەو بەرزییە دەستکردەی کە دەڕوانێتە سەر پێدەشتەکە. بەچاو وەکوو بارستێکی بێشوماری کەلاوە و کەرەسەی بەسەریەکداکراو دیارە. دانیشتوانەکەی بریتین لە مەسیحی، عەرەب، تورك، کورد، جوولەکە و ئێزیدی یان

شه‌یتان په‌رسته‌كان. له ئه‌ربیل جۆره په‌تووییێكی گه‌وره دروست ده‌كه‌ن كه ناسراوه به‌وه‌ی به‌رگری له شێ ده‌كات.

له پانزه‌ی مانگ به‌یانییه‌كه‌ی ئه‌ربیل—مان به‌جێهێشت و حاكم بۆ خۆی له‌گه‌ڵ یه‌كێك له پاسه‌وانه‌كانی شه‌ره‌ف بۆ ماوه‌ی سێ میل هاوه‌ڵی كردین و به ڕێزلێنانێكی گه‌لێك زۆره‌وه ئیزنی له جۆرجییه‌كه‌مان خواست به بێ ئه‌وه‌ی به باقی هاوڕێكانم بڵێ ماڵئاوا. دوای ئه‌وه‌ی ماوه‌ی پێنج كاتژمێر به‌ناو پێده‌شتێكدا ڕۆیشتین كه بڕێك گردۆلكه‌ی هه‌بوو، گه‌یشتینه زێی گه‌وره و هۆزێكی چكۆڵه‌ی ئیزێدی (شه‌یتان په‌رسته‌كان)مان بینی كه یاریده‌یان به‌سه‌ر قه‌میشی به‌ستراو به پێستی مه‌ڕی فووكراو به هه‌وا ئێمه‌یان په‌ڕانده‌وه. ئه‌وانه هه‌ر ته‌واوێك ڕووت و قووت بوون، هه‌ژار و كڵۆڵ دیاربوون و له كه‌ناری ئه‌م ڕووباره ده‌ژیان بۆ په‌راندنه‌وه‌ی گه‌ڕۆكه‌كان و كارامه‌ییه‌كی زۆر گه‌وره‌یان نیشاندا له په‌ڕاندنه‌وه‌ی ئه‌سپه‌كانمان.، هه‌تا منداڵه بچكۆڵه‌كانیان دوو یان سێ ئه‌سپیان زۆر به ئاسانی ده‌په‌ڕانده‌وه، ته‌نها تاقه ئه‌سپێكمان له ده‌ستدا كه دوای ئه‌وه‌ی خه‌ریك بوو بگاته ئه‌وبه‌ر كه‌چی ویستی بگه‌ڕێته‌وه دواوه. كاتێك هه‌مووومان گه‌یشتینه ئه‌وبه‌ری زێیه‌كه، له‌كاتی ئه‌وه‌ی خه‌ریكبوو بچمه سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌كه‌م، كه‌سێكی نامۆ ئه‌سپه‌كه‌ی گرتم و داوای به‌خشیشی لێكردم، بڕێك پاره به‌س بوو به‌ڵام لام نه‌بوو. قرۆشێكم دایێ، به‌چاوێكی سووكه‌وه قرۆشه‌كه‌ی دامه‌وه و داوای زیاتری لێكردم، منیش قرۆشه‌كه‌م وه‌رگرته‌وه و به هێمنی خستمه‌وه گیرفانمه‌وه. ئه‌و چاوه‌ڕوانی ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ی له من نه‌ده‌كرد و ویستی لغاوی ئه‌سپه‌كه‌م بگرێ و هه‌وڵیدا بمهێنێته خواره‌وه و به كافر و مه‌سیحی سه‌گ بانگی كردم، منیش به ده‌سكی قامچیه‌كه‌م لێم دا و به‌رم دایه‌وه هاوڕێكانم به‌م نمایشه زۆر پێكه‌نین و پێیان گووت كه ئه‌و من ناناسێ و من مه‌سیحی نیم به‌ڵكو ئینگلیزم. ئه‌مه ده‌ستنیشانكردنێكی زۆر سه‌یر و سه‌مه‌ره بوو بۆ من.

پانایی زێی گه‌وره سێسه‌د پێ یه و له‌م وه‌رزی ساڵدا قووڵ و زۆر تیژڕۆ بوو. پاشان پێده‌شتێكمان بڕی كه له پێده‌شتی پێشوو ده‌چوو، دوای ئه‌وه‌ی له‌م ڕۆژه‌دا نزیكه‌ی چل و دوو میلمان بڕی گه‌یشتینه قه‌ره‌قووش، ئاواییه‌كی گه‌وره‌ی زۆر پیس، به‌شێكی دانیشتوانه‌كه‌ی ئێزیدیه‌كانن. زۆر له ماڵه‌كانی قوبه‌یه‌كی

بچووکیان لە ناوەڕاستدایە کە ئەمە ڕووکارێکی جیاکەرەوەی بەم ناوچەیە بەخشیوە. دانیشتوانەکەی شەرافەتمەند دیارن و باری گوزەرانیان چاکە، پیاوەکانیان توووند تۆڵ و مکومن و ژنەکانیان تا دوا ڕادە جوانن. لەگەڵ ئەوەشدا کە من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە زانیارییەکانی کاپیتان ماکدۆنالد کینئەر[٧] بەگشتی زۆر وردن، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێم کە من تێنەگەیشتم بۆچی کینئەر ئەم گوندەی بە مەمیومی کۆن[*] دادەنێ، قەرەقووش بەلای زۆرییەوە چل و دوو میل لە ئەربیل دوورە، لە کاتێکدا ئاوایی مەمیوم بەلای ئەوەوە خۆی بە ماوەی چوار ڕۆژ دادەنێ کە بەلای کەمییەوە بە کەمتر لە هەشتا میل ناخەملێندرێ.

لە قەرەقووش تەتەرەکەم بەتەواوی پەردەی لەسەر خۆی هەڵماڵی، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی برێك لە هاوڕێکانم وەکوو نموونەی ئاغڕیی خۆی نیشان بدات. پیاوە گەبجارەکە لە مەنزڵ خانە خۆی خزاندە ناو ژوورێکی تایبەت لەگەڵ چوار لە هاوڕێیە سەرەکیەکانمان بە مەبەستی شەراب خواردنەوە تا سەرخۆش بوون بە هەمان ئەو ئاستە جدییەی کە نوێژەکانی تێدا دەکات. بۆ بەدبەختی، یان بۆ ئەوەی باشتر بلێم بۆ خۆشبەختیی، شەرابیان کەمبووە و بۆ ئەوەی بتوانن پرۆژەکەیان جێبەجێبکەن، وەك ئەوەی چیتر شەراب لەناو شاردا نابینن، ناچار دەبن بچن بخەون پێش ئەوەی بە ڕەوشی خۆشنوودی سەرخۆشیان بگەن کە بە نیاز بوون بەسەری ببەن.

لە ١٦ ی مانگ، بەوەی بەسەر پشتی ئەسپگەلی چاك و نایاب کەوتین و بۆنی شەراب کە پێنج لە هاوڕێیەکانمان شەوی پێشتر خواردبوویانەوە هێشتا تەواو

[7] مەبەست لەوە ئەو سەفەرنامەی کینئەرە کە ساڵی ١٨١٨ لە لەندەن بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە، بڕوانە:

John Macdonald Kinneir, Journey through Asia Minor, Armenia, and Koordistan, in the years 1813 and 1814 ; with remarks on the marches of Alexander and retreat of the Ten Thousand. London : John Murray, 1818, 1 vol. (XII-603 p.)

[*] Memmium

نه‌بووبوو، وایان لێکردین كه‌ به‌ خێراییه‌كی زۆر سه‌فه‌ر بكه‌ین كه‌ له‌سه‌فه‌ره‌كانی پێشووماندا نه‌مانبینیوو.، وه‌ك تووڕه‌ ڕایان ده‌كرد، به‌ به‌رده‌وام قامچیان له‌ ئه‌سپه‌كانیان و ئه‌سپه‌كانی دیكه‌ ده‌دا بۆ ئه‌وه‌ی خێراتر بڕۆن و به‌رده‌وام به‌ هه‌نگاوی گه‌وره‌، به‌ نزیكه‌ی كاتژمێر و نیوێك گه‌یشتینه‌ مووسڵ، هه‌رچه‌نده‌ ماوه‌كه‌ به‌گوێره‌ی نه‌خشه‌كان پانزه‌ میل ده‌بێت.

**(ماویه‌تی)**

**سه‌رچاوه‌:**

William Heude, *Voyage de la côte de Malabar à Constantinople par le golfe Persique, l'Arabie, la Mésopotamie, le Kourdistan et la Turquie d'Asie, fait en 1817 par William Heude*. Traduit de l'anglais par le traducteur du voyage de Maxwell, Paris : Gide fils, 1820, pp: 263-302

### هەندێك ڕا و بۆچوون لەسەر دوكتۆرا نامەیەك بە ناونیشانی

# "كوردستانی عێراق لە مێژووی كۆندا لەبەر تیشكی سەرچاوەكانی بزماری لە هەزارەی سێیەمی پ. ز تاوەكو ٦١٢ی پ. ز"دا

**كەمال نووری مەعرووف**

ئەم نامەیە لەلایەن بەڕێز (ڕافیدە عەبدوڵڵا عەبدولسەمەد قەرەداغییەوە) لە زانكۆی سلێمانی نووسراوە و پێشكەش بە مەجلیسی كۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەكانی كردووە لە زانكۆی سلێمانی كە بەشێكە لە پێداویستییەكانی وەرگرتنی بڕوانامەی دكتۆرا لە مێژووی كۆندا.

نامەكە پێكهاتووە لە چوار فەسڵ لەگەڵ پاشكۆ و وێنەكانیی و چەند لیستێك بەناوی سەرچاوەكانی و لەكۆتاییدا هاتووەتە سەر پوختەی نامەكەی بە زمانی كوردی و پوختەیەكی تری بە زمانی ئینگلیزی.

دوای خوێندنەوەی نامەكە چەند جارێك بۆم دەركەوت دوور لە ڕێبازی زانستی نووسراوە كە دەبوایە پێڕستی ناوەڕۆكەكەی بەپێی فەسڵەكانی لە خزمەتی یەكتریدا بوونایە، لە هەمان كاتیشدا پەیوەندییان بە یەكترەوە ببوایە و لە یەكتری نە پچڕانایە كە لە ئێستادا ئەوەی نامەكە دەخوێنێتەوە و بە فەسڵەكانیا دەچێتەوە ئەو پچڕاندنەی پێوە دەبینێ كە بەیەكترەوە پەیوەست نابن، وا دیارە ئەم لایەنەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرپەرشتیاری نامەكە كە لەبەر ئەوەی پسپۆڕ نەبووە لە بابەتەكەدا، بۆیە نەیتوانیوە سەركەوتووانە ئەو لایەنە فەرامۆش نەكات، وا دیارە سەرپەرشتی دووەمیش ئەو كاتەی نەبووە كە بتوانێت وردەكاری ناو نامەكە بەباشی و زانستییانە كارەكەی تەواو بكا و سەركەوتوو بێت. بۆیە دەتوانین بڵێین نامەكە لە سەرەتاوە تا كۆتایی بەو شێوەیە نووسراوە كە وەكو كتێبێكی مێژوویی كۆن لەسەر شارستانێتی عێراق نووسرابێت بە مانا نامەكە

هاوشێوەی کتێبەکەی مامۆستا (تەها باقر)ە؛ بەشی یەکەم کە تایبەتە بە مێژووی شارستانێتی نێوان دوو ڕووبار. لێرەدا بە پێویستی دەزانم سەرنجەکانم لەسەر نامەکە بخەمە ڕوو بۆ ئەوەی سوود بە مێژووی کۆنی نەتەوەکەم بگەیەنم، لە هەمان کاتیشدا خزمەت بێت بە نامەکە تاوەکو ڕاستییەکان شوێنی هەڵەکان بگرنەوە کە ئەمانەن:

١- دانەر لە لاپەڕە (١)ی نامەکەیدا و لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ:... تووشی ناڕەحەتی بووم لەبەر ئەوەی سەرچاوەی تایبەت بە باسەکەم دەست نەکەوت کە دەبوایە بچوومایە بۆ بەغدا و مووسڵ بۆ دەستکەوتنیان چونکە بارودۆخی خراپی ئاسایشی ناوچەکە کۆسپبوو لە بەردەمما، بەڵام بە هاوکاری هاوڕێکانم ئەم ئەرکەم نەهێشت کەموکوڕیم پێوە دیار بێت.

لەوەڵامی ئەم بڕگەیەدا دەڵێم: گەڕانێك بەناو ئەو سەرچاوانەی کە بە زمانە جیاجیاکان لە نووسینەوەی نامەکەدا بەکار هێنراون دیارن لە هەموویان سەرچاوەی ئاسایین کە لە کتێبخانەکانی زانکۆی سلێمانی و زانکۆکانی تری کوردستان دەست دەکەون کە باوەڕ نامەکەم کەمی سەرچاوەی ڕەسەن لە کوردستاندا هەبێت، جگە لەوانەش کتێبخانەی ڕەسەنی تریش لە شارەکانی کوردستان زۆرن کە پڕن بەو جۆرە سەرچاوانە، نموونە بۆ ئەمەش کتێبخانەی گشتیی سلێمانییە، کە تەمەنی زۆر کۆنە. لەلایەکی ترەوە خۆ ئەگەر خاوەن نامە تۆزێك خۆی ماندوو بکردایە دەیتوانی سەردانی بەغدا و موسڵیش بکات وەکو دەیان قوتابی خوێندنی باڵا ئەو جۆرە سەردانانە دەکەن و بەدوای زانیاریدا وێڵن، بێ ئەوەی کێشەیەکیش بێتە ڕێگایان. لە سەرووی ئەمانەشەوە دەتوانم بڵێم: ئەگەر ناوبراو سەردانێکی ئێرانی بکردایە بە دەیان سەرچاوەی فارسی ڕەسەنی دەست دەکەوت کە بۆ نووسینەوەی نامەکەی بەهای گەورەی پێ ئەدا، هەروەها بەو سەردانەشی لەوە ڕزگاری دەبوو پێمان بڵێ کەمی سەرچاوە کۆسپ بوو.

٢- دانەری نامە دەبوایە سنووری بۆ ناونیشانی نامەکەی دانەنایە چونکە مێژووی کۆنی ئەم بەشەی کوردستانی باشوور پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە خۆرهەڵاتی کوردستانەوە بە گشتی و ناوچەی (زاگرۆس)ەوە هەیە بۆیە دەبوو ناونیشانەکەی گشتی بووایە بۆ کوردستان. دەبوو خاوەن نامەش لەوە بە ئاگا

بوایه وشەی عێراق نوێیه و ناونیشانەکەی به ناوی باشـوور دیـاری بکردایـه باشـتر بوو. چونکه مێژووی کۆنی هەرێمەکه و بەشەکانی تریشی به هـەموویان زنجیرێکـن و ئەڵقەکانیان به یەکترەوه بەستراون، و له یەکتری جیا نابنـەوه، و بـه هـەموویان ئەو مێژووه کۆنه بۆ ئێمەی کورد دروست دەکەن که ئێستا بـەو جـۆره ناویـان لـێ ناوه و لای شارەزایانی مێژووی کۆنیش ئـەوه ئاشـکرایه کـه زۆرینـەی ئـەو شـار و شارۆچـکانەی ناویـان لـەو مێـژووه کۆنـەدا هـاتووه دەکەونـه نـاو ئـەو بەشـەی کوردستان کـه بـه خۆرهـەڵات ناسـراوه. وا دیـاره دانـەری نامـه بـۆ نووسـینەوەی نامەکەی سوودی له نامەی دکتۆراکەی "نائل حنون"یش دیوه کـه ناونیـشانەکەی (جوگرافیای وڵاتی ئاشوور)ه بۆیه قەرەداغیش بەو گەرمییه ناوی هێناوه.

٣- دانەری نامه له لاپـەڕه (٣)ی نامەکەیدا دەڵـێ: "داگـیر کردنـی نەینـەوا لـه ساڵی ٦١٢ی پ. ز تەنیا ڕووداوه مێژووییەکـەی تـەواو نـەکردووه، بـەڵکو بەدوایـدا ڕووداوی تریش هات که بووه هۆی پچڕاندنی ئەو پەیمانەی که لەنێوان وڵاتـی بابـل و دەوڵەتی میدیادا بەسترابوو ساڵی ٦٠٤ی پ. ز".

بۆ وەڵامی ئەم بڕگەیه دەڵێم: به درێژایی فەرمانڕەوایەتیی کەیخوسرەو (٦٢٣ – ٥٨٥ پ. ز) گەوره پادشای ماد هیچ پچڕانێك لـه پەیوەندییـەکانی نێـوان پادشـای ناوبراو و (نەبوبۆلاسەر) و (نەبوخەزنەسری) کوڕیدا دروست نەبووه، وا دیـاره ئـەو پێشبینییەش پێوەندی به داهـاتوو هـەبووه بۆیـه شـورای مـادی دروسـتکرد. ئـەو پچڕانەش که ئاماژەی پێ ئەدات لەو ساڵەدا نەبووه که بۆی دیاریکردووه، چـونکه هەتاکو ئەوکاتەش نێوانی وڵاتی شوورای مادی کرد نێوانی وڵاتی بابل و مادیش لـه ئارامیـدا ماوەتـەوه و پـەیمانی نێوانیـان نەشـکێنراوه، پێدەچـێت بەشـێکی ئەمـه پێوەندی به سەرقاڵبوونی گەوره پادشای ماددا، بووبێت له بەرەکانی تری شـەڕ و گەوره کردنی سنووری دەوڵەتەکـەی بـەڵام کاتێـك دوا پادشـای مـاد (ئاسـتیاگس) هاته سەر تـەختی فەرمانڕەوایـەتی لـه سـاڵی (٥٨٥/ ٥٨٤ – ٥٥٠)ی پ. ز پیلانـی بنەماڵەی بابلی نوێ دژی مادەکان فراوانتر بوو، ئەوەش له سـەردەمی (نابونیـدی) پادشـایان دابـوو کەپـەیمانی لەگـەڵ (کـۆرش)ی دووەمـدا بەسـت و کـۆرش شـاری (حەران)ی له ساڵی ٥٥٤ی پ. ز داگیر کرد.

لێرە بەدواوە ئەو پەیمانەی نێوانیان پچڕاو (ئاستیاگس)یش لە تۆڵەی ئەوەدا ناوچەی (خوزستان)ی داگیر کرد کە بەر لەو مێژووەدا لەژێر دەسەلاتی بابلییەکاندا بوو. بۆیە ناوبراو ئەگەر دەیەوێت درێژە بە باسەکەی بدات دەبێت هەتاکو دوا دوایی دەسەلاتی ئەو پادشایەی ماد مێژووی نامەکەی درێژ بکاتەوە واتە بۆ ساڵی ٥٥٠ی پ. ز ئەو کاتەی (کۆرش) ئەکبەتانەی پایتەختی داگیر کرد.

٤- دانەری نامە، لە فەسڵی یەکەمی نامەکەیدا، لە لاپەڕە (٤)ی دا هاتووەتە سەر باسی کاریگەریی ژینگەی سروشتی لە مێژووی کۆنی کوردستاندا، بەلام بەر لەوەی بچێتە ناو بابەتەکەیەوە سەرەتا هاتۆتە سەر باسی ڕەگو ڕیشەی ناوی کورد لەبەر تیشکی نووسراوە مێژوویەکاندا. لێرەدا دەڵێم: نووسەری نامە دەبوایە ساخکردنەوەی ناوی کوردی بەپێی سەرچاوە مێژوویەکان ببردایەتە دوای فەسڵی یەکەم چونکە لێرەدا بۆ باسکردنی پەیوەندییەك نابینم، واتە شوێنی شیاوی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە مێژوویەکان، بەلام بۆ باسی زاراوەی میسۆپۆتامیا دەبوایە لە پەراوێزدا جێگای بکردایەتەوە بەهۆی ئەوەی ئەو زاراوەیە ڕاستەوخۆ ناچێتە ناو باسەکە و زاراوەکەش بەشێکی کەمی باشووری کوردستان دەگرێتەوە بەهۆی ئەوەی زیاتر لای عەرەبەکان ناسراوە کە بەشێکی کەمی ناوەڕاست و باشووری عیراقی عەجەمی سنووردار دەکات، زاراوەکەش یۆنانییە و ئەو ناوە بۆ دیاریکردنی سنووری عیراق لەسەر ئەو بەشە دانراوە.

لە باسی ڕەگ و ڕیشەی ناوی کورددا، دەتوانم بڵێم نا زانستییانە هاتووەتە ناو باسەکەیەوە، هەروەکو دەڵێ: وشەی کوردستان لە دوو وشە پێکهاتووە، یەکەمیان (کورد) و دووەمیان (ستان) کە وشەیەکی ئێرانی کۆنە بە مانای هەرێم یان ویلایەت دێت، هەروەها دەڵێ: ئەم نازناوە بۆ یەکەمجار لە سەردەمی سەلجوقیدا دەرکەوت کە ناوی یەکێك بوو لە هەرێمەکان، دواتر بۆ دۆزینەوەی بنەچەی ناوەکە دێتە سەر باسی سەردەمی سلوکی - ئاشکانی (٣١٢ پ. ز - ٢٢٧ز)، هەروەها سەردەمی هاخامەنشی (٥٥٠ - ٣٢٧ پ. ز) لەگەڵ هێنانەوەی چەند نموونەیەکە لەسەر باسەکە بەناوی وڵاتی (کوردا) لە سەردەمی (ئاشمی دوگان) (١٧٨٠ - ١٧٤١ پ. ز) واتە سەردەمی ئاشووری کۆن، هەروەها جارێکی تر دەڵێ: وڵاتی کورد بەپێی سەرچاوەکانی بزماری ناوچەیەکی سەربەخۆ بووە.

جگە لەوانەش بۆ ساخکردنەوەی ناوەکە دێتە سەر چەند ئاماژەیەکی حامورابی کە باسی پادشای (کوردا) دەکات لەکاتی هاتنی پێشەواکانی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار کە پێی گەیشتووە، لە بابل و ئاشنۆناوە هاتوون، هەروەها جارێکی تریش دەگەڕێتەوە سەر چاخی بنەماڵەی ئوری سێیەم کە وڵاتی (کورد) یان (کاردای) وەکو ناوچەیەك داگیریان کردووە. لە کۆتایی ئەم بڕگەیەدا دانەری نامە دەڵێ: کۆنترین ئاماژە بۆ وڵاتی کوردا لە دەقێکی ئەکەدی سەردەمی (نەرام سین) (٢٢٩١ – ٢٢٥٥ پ. ز)ەوە هاتووە.

لە وەڵامی ئەم بڕگەیەدا دەڵێم: بەدواداچوونێکم نەدی لەناو ئەوانەی لەمەوبەر ئاماژەم پێدان بۆ دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی کورد کە لە چییەوە هاتووە، جگە لەوەش وشەی (ستان) کە بەلای دانەرەوە وشەی ئێرانی کۆنە، بۆی ڕوون نەکردووینەتەوە کە ڕەگ و ڕیشەی وشەکە بۆ کام سەردەم لە ئێراندا دەگەڕێتەوە، بەڵام دوای گەڕانێك بە سەرچاوەکانی مێژووی ئێرانی کۆندا و وردبوونەوە لە سەرچاوەکانی تایبەت بە ئاینی زەردەشت، دەرکەوت کە وشەکە لە بنەمادا (ئاڤێستا)ییە و کاریگەریی ئاینی ڤیدای بەسەرەوەیە و سەرەتا مادەکان وەریانگرتووە و لەوانیشەوە گەیشتووە بە (هاخامە نشینەکان)، بۆیە دەبوو ناوبراو بەو جۆرە ڕاڤەی نەکردایە و بە بنجوبناوانیدا بچوایەتە خوارەوە، جگە لەوەش ئەو سەرچاوانەی ئاماژەی بە شێوەیەك لە شێوەکان بە وشەی (کوردستان) داوە یان بە وڵاتی (کوردا) زانیارییەکانی گواستنەوەیەکی ئاسایی ناو سەرچاوەکانە و ناوەکە دوورە لە ساخکردنەوە، جگە لەوەش دانەر لەو ناوهێنانانەیدا زنجیرەی سەردەمەکانی دەبوو بەدوای یەکتردا بهێنایە و ڕیزبەندیی فەرامۆش نەکردایە. بۆ تێگەیشتن لە ڕەگوڕیشەی ناوی کورد کە لە چییەوە هاتووە کۆنترین ئاماژە کە لە سەردەمی کۆندا پێمان گەیشتووە ڕای زەینەفونە کە بە پێشەوایەتی لەشکرێکی دە هەزار سەربازی لە خزمەتی (کۆرشی) بچکۆڵەدا بوو کە لەگەڵ براکەی (ئەردەشێری دووەم)ی هاخامە نشیی لەشەڕدا بووە، دوای کوشتنی کۆرشی بچکۆڵە گەڕایەوە بۆ یۆنان، لای سەرەوەی (ئورفە) و (موسڵ) کە دانیشتوانی ناوخۆیی تێدابوو دووچاری هێرشێکی توند بۆتەوە کە زۆرینەی

لەشکرەکەی بەو هۆیەوە لەدەست داوە. (زەینەفون) ئەو ناوچەیەی بەسەر زەمینی (کاردۆسییەکان) ناوبردووە.

واژەی کورد بەپێی بەڵگەکانی (درایڤەر) کە ڕای لەسەر داوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە لەژێر ناونیشانی (کاردۆنی — کاردا — کورتۆخی — کارداك — کوردوئە — سیرتی — کاردایە — کارتاوای — کاردایا و — کاردۆخی)یەوە هاتووە (زەینەفون) بەڵگەی دەستیشی بۆ ئەم ساخکردنەوەیە تابلۆکەی (ئارادنانار)ی قۆناغی سێیەمی حکوومەتی ئوره لە (لەگش) کە فەرمانڕەوایەتیی کردووە و پەیوەستە بە سەدەی ٢٤ پ. ز. ەوە.

نووسەران و لێکۆڵەرانی کلاسیکی یۆنانی ڕۆمیش ئەو ناوانەی نزیك بە وشەی (کورد) چەند جارێك لە پاشماوەکانی خۆیاندا باسیان کردووە، لەوانە: کوردوویین — گوردیای — کاردۆك، کە بەر لە هەزاران ساڵ ناویان هێناون. بەڵام مێژوو نووسان و جوغرافیا دانانی عەرەب، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی (کورد)یان بە کەمی لە تیۆرەکانیان هێناوە، یان قسەیان لەسەر باوك و بنەچە و شوێنی کوردەکان و ناونیشانیان کردووە بەڵام تیۆرەکانیان بە نازانستی نیشاندراون.

بەو جۆرە (کورد) و (گورد) بە مانای ئازا، یان دلێر، یان شەڕکەر هاتووە، بەو جۆرەی لە (کرینلوس)ی مێژوو نووسی ڕۆمی گوێزراوەتەوە، ئێرانییەکانیش بە لەشکری خۆیان گوتووە (کورداس) یان (کوردو). هەر بەو جۆرەش (کاردو) ناوێکە و لەسەر زمانە، نموونەش بۆ ئەمە لە تابلۆیەکی بابلی و ئاشووریدا (کوردۆ) بەمانای هێز و پاڵەوانی بەهێز دێت، هەروەها (کوردوش) بە مانای بەهێز دێت. لە هەمان کاتیشدا واژەی کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکانیشدا بە مانای دەوارنشین هاتووە.

### جوغرافیای مێژووی کورد:

(سێرمارك سایکس) و (پرۆفیسۆر سپایزەر) کە مێژووی کورد بۆ شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لە کوردستاندا دەبەنەوە، و بەدواداچوونیان بۆ کردووە لە نووسینەکانیانا، دەڵێن: (کوردوئین) یان (کوردەکان) لە نێوان دیاربەکر و سەرچاوەکانی زێ تاوەکو دەگەنەوە بەعیلام بەڵگە هەیە کە ژیانیان لەو ناوچانەدا

بەسەر بردووە. لەو گۆشە نیگایەوە (زەینەفوون) شوێنی ڕەسەنی خاکی کورد بە هەمان (کاردوشوی) کۆن دەزانێت. (ئۆژن پێتار)ی نەژادناسی سویدی لە ڕەچەڵەکدا کوردەکانی لەناو گەلانی ئێران داناوە، ئەمانەی بە دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان ناساندووە کە هاتوچۆکردن لە ناوچەکەیاندا بەهۆی خراپی ڕێگاوبانەوە گران بووە و کەمتر توانیویانە هێرش بەرن بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە شوێنی دانیشتنی گەلی کورد سنووردار بووە بە (کوردستان) (زاگرۆس)، بەڵکو بەوەش نەوەستاون لە ئەترافی زاگرۆسیش تێپەڕیون و بەشێك لە ئەرمەنستانیش لە قەڵەمڕەوی ئەم گەلەدا بووە.

### ڕەگ و ڕیشە و ڕەچەڵەکی کورد:

بۆ ئەم باسە سێ تیور هەیە کە ناویان دەهێنین.

١- تیورێك کە گەلی کورد بە بەشێك لە گەلانی ڕۆخەکانی دەریای باڵتیك دەناسێت کە کۆچیان بۆ کوردستان کردووە. لەوانەی کە باوەڕیان بەم تیۆرە هەیە (ڤۆن لۆشان) و (باشماکۆڤ)ە کە دەتوانین ناویان بهێنین، نموونەی دیاریش بۆ ئەمە کوردی ناوچەی (موکریان)ە کە باڵایان بەرزە و موویان زەردە و برپرەیان (دو لیکۆسفال)ە، ئەم تیۆرە لێرەدا کۆتایی دێت.

ئەم تیۆرە بەپێی بەڵگەکان نەیتوانیوە پایەی زانستی و مەنتیقی خۆی بپارێزێت، چونکە لەناو کوردا باڵا و ڕەنگ و دەم و چاوی جیاواز هەیە، ئەمەش بابەتێکی دوورە و مرۆڤ ناتوانێت ڕەزامەندی لەسەر بدات.

٢- تیوری دووەم کوردەکان لە گەلانی ئاریی دائەنێت کە لە تایەفە و عەشیرەتی جیاجیا دروست بوون. لەوانەی باوەڕیان بەم تیۆرە هەیە لە لێکۆڵەرانی گەورە (کۆنتینۆ) و ڕەشید یاسەمی کە لەو ڕووەوە یاسەمی لە کتێبی خۆیدا (کورد و پەیوەستەگی نەژادی و مێژوویی) نووسیویە: بنەچەی کورد بۆ ئارییەکان دەگەڕێتەوە نەوەك لە گەلانی کۆچەری دانیشتووی کوردستانن وەکو گوتی و کاسی و لۆلۆیی و... باوەڕدارانی ئەم تیۆرە کوردییە گەلێك لە گەلانی کۆچکردووی ئاریایی دائەنێت لە هەزارەی یەکەمی پ. ز کە لە ناوچەیەکدا بوون لە کۆندا بەناوی (قردۆ) و تیایدا دانیشتوون، دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ناوچەکەش لە

ترسا هەڵهاتوون، مێژووش بەناوی شوێنەکەوە ناوی بردوون، هەروەکو چۆن (کاسییەکان) بەناوی کۆنی (کاشۆ) لە لورستان ناسراون، لەوەش زیاتر هەتاکو خوای تایەفەیەکی خۆشیان لەبەر پێویستی شوێنە نوێکەیان بەو ناوە ناسیوە. بەو پێیە گەلی کورد لقێکە لە نەژادی ئاریایی و برای مادەکانن کە بەو ناوە نوێیەوە لە ناوچەکەدا فەرمانڕەوایەتییان کردووە و گەلانی زاگرۆس و گەلانی تری بەر لە خۆشیان بوونەتە بەشێك لە کورد و لەناویا تواونەتەوە. داریوشی یەکەم (٥٢٢ — ٤٨٦ پ. ز) بەپێی نووسینەکەی بێستوون ئاماژە بە گەلێك و شارێك ئەدا بەناوی (کوردۆ) و شاری هەولێر لە کوردستانی باشوور.

بەپێی ئەم تیۆرە کوردەکان دانیشتووی ڕەسەنی کوردستانن کە خاوەنی مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی بوون، ژمارەیەکی زیادیش لە زانایان و مێژوو نووسانی وەکو پرۆفیسۆر (سپایزەر) و (مینورسکی)ش باوەڕیان وایە کوردەکان یەکەمین مرۆڤ بوون لە چاخی بەردینی کۆنەوە لە دەربەندەکانی باشووری ئێرانەوە بەرەو باکووری خۆرئاوا بڕاون و لە دەربەندەکانی سلێمانی و ڕواندزەوە هاتوونەتە کوردستان بەڵگەش بۆ ئەمە پاشماوە شوێنەوارییەکانیانا لە ئەشکەوت و پەنا بەردینە بەربڵاوەکان.

ئەمڕۆ لەسەر زمانە جیاجیاکاندا کورد لە ژێر ناوی جیاجیادا دەخوێندرێتەوە هەرچەند ئەم گەلە پێشینەی مێژووییان هەیە و بۆ هەر یەکێك بەڵگە و قەواڵەی خۆیان هەیە، بەڵام تیورێك کە لەلایەن ئەو زانایانەوە گوتراوە و نیشانیانداوە، گەلێك کە کۆنتربێت لە کورد لە ناوچەی زاگرۆسدا نەبینراوە.

بەهەرحاڵ ئەگەر مادەکان تایەفەیەك بن لە گەلی کورد، یان کوردەکان لقێك بن لەوان شتێك لە پرسەکە ناگۆڕێت. لەلایەکی ترەوە مێژوو نووسان لەسەر ئەو ڕایەن کە قەومی ماد و تایەفەکانی تری لە لقە جیاکانی کورد جیا بوونەتەوە.

لەم ساڵانەی دواییشدا زانایانی گەورەی وەکو (هارتمان) و (نولدکە) و (وایسباخ) لە ڕێگای یاساکانی زمانناسییەوە باوەڕیان وایە (کورد) و (گوت) لە دوو ڕیشەی جیاوازەوە هاتوون، بۆیە زاناکان ڕایان وایە کە قەومی (گوتی) و (کوتی) کە مێژوو نووسانی یۆنانی کۆن بە بەشێك لە تایەفەی (ماد) و (فارس)یان داناوە، هەمان کوردن، ئەوەی پشتگیری لەم ڕایە دەکات بوونی تایەفەکانی

کوردە لەناو فارسدا. لەو ڕووەوە (دارمستر) وا دەری دەخات زمانی کوردی لە زمانی مادەکان وەرگیرابێت، هەتاکو هەندێك لە لێکۆڵەرانی تریش زمانی پشتۆنی ئەفغانی بەوە دەربڕینی لێ دەکەن کە لەو زمانەوە وەرگیراوە. بۆیە بە باوەڕی زانای دیاری ئەوروپایی (میلەر) کوردەکان بە دانیشتووی ناوچە شاخاوییە ڕەسەنەکەی ئاسیای بچووك دائەنێن.

شێوەی لەیەکچوونی ئەم تیورانە و هیند و ئاریایی و ناوچەیی بوونی بنەچە و شوێنی بڵاوبوونەوەی کورد بەپێی تیوری مینۆرسکی و بوونی بنەمای شوێنی ناوچەیی کورد لای (مار) کۆتایی پێ دێنین کە بەلایەوە بەشی مادەکان لەو دروستبوونە نەژادییەی کوردەکاندا بە دروست لەبەرچاو دەگیرێت.

سەرئەنجام بەپێی لێکۆڵینەوەکانی زانایان و لێکۆڵەرانی تریش سەر زەمینی کوردستان بەپێی ئەو بۆچوونانەی کە هەن و ڕایان لەسەر داون شوێنی پەیدابوونی دووەمین بنەچەی مرۆڤە کە سەرەتاکەی لە مێژووی گەلانی زاگرۆسەوە پەیدا دەبێت، ئەم گەلانە لە کورد و لقەکانی تری وەکو لۆلۆیی — کاسی و سۆباری و خوری، کە لەگەڵیان لە ناوچەکانی باشووری خۆرهەڵات هەبوون، شوێنی دانیشتنی گەلانی عیلامیش بوون کە ڕیشەیان لە کورد کۆنتر نییە لە سەردەمەکانی ئەکەدی و سۆمەری و سەرەتای قۆناغی ئاشووری بەڵگە بەدەستەوە هەیە کە بوونی سیاسییان هەبووە و دەرکەوتوون و لەناویانا کۆچی ڕەگەزی هیند و ئەوروپایی، یان ئاریایی بۆلای خۆیان بۆ زاگرۆس بردووە و گەلانی ڕەسەنی زاگرۆسیش لەناویانا تواونەتەوە. بەو پێیە کورد کۆنترین مرۆڤی زاگرۆسە (کوردستان)ە و ئەو نیشتیمانە ناسیونی، بۆیە کنە و پشکنینەکانی کۆمەڵناسان و شوێنەوار ناسان و ژینناسان لەسەر ئەو ڕایەن کە کورد لە گەلانی ئاریایی هیندۆ ئەورووپین و لە کۆچیانا دوورتر و کۆنترن لە کۆچی هەزارەی یەکەمی ئارياييەکان کە لەو ناوچەیەدا دانیشتوون، ئەمەش ئەو بۆچوونە ئەداتە دواوە گوایە دەڵێن ئارياييەکان هەر لە ئەزەلەوە یەکەم دانیشتووی ئەو خاکە بوون.

لەناو ئەو ڕایانەشدا ڕایەکی نوێش هەیە کە ناوی (کوردستان) واتە خاکەکە بەر لەناوی کورد واتە قەومەکە زووتر دەرکەوتووە، بەو پێیە ناوی قەومەکە لەناوە جوغرافیەکەوە وەرگیراوە، بەڵگەش بۆ ئەو بۆچوونە لەسەردەمی بنەماڵەی ئوری

سێیەم بەدەستەوە هەیە واتە (٢١١٢ — ٢٠٠٤ پ. ز) کە بەناوی هەرێمی شاخاوی ناویان براوە.

٥- لەباسی رووە جوغرافییەکەی ئەو بەشەی کوردستان واتە (باشوور) خاوەننامە (١٥) لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە کە لاپەڕە (٨ — ٢٣)ی نامەکەی گرتوەتەوە، نامەکە چونکە مێژووییە ئەو بڕگەیە لەناو نامەکەدا بەپێویست نازانرێ، دەبوو قەرەداغی زیاتر لاپەڕەکانی تەرخان بکردایە بۆ بابەتە مێژووییەکەی خۆی چونکە نامەکە هێندە گەورە نییە کە تا بتوانێت ئەو بابەتانە لەناویا جێ بکاتەوە، پەنا بردنیشی بۆ ئەوە بۆ گەورە کردنی قەوارەی نامەکەیەتی لەسەر ناوەرۆکەکەی، خۆ ئەگەر دەیویست لەڕووی جوغرافییەوە شتێك بڵێت دەیتوانی بە پوختی و بە کورتی بەچەند لاپەڕەیەکی کەم کۆتایی پێ بهێنێت. یان لەو رووەوە شتێکی کەمی لەسەر تۆبۆگرافیای ناوچەکە بگوتایە بەو بەشەش کە دەکەوێتە ناوچەی زاگرۆس لە کوردستانی خۆرهەلات کە لە پێشیانەوە دیاریکردنی سنوورەکەیەتی، تاوەکو بتوانین سەرەتای نیشتەجێبوونی مرۆڤ لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا لە کۆندا دیاری بکەین بۆ ئەمەش دەتوانین ئاماژە بە هەندێك لەو شوێنەوارانە بدەین کە کاری کنە و پشکنینیان تێدا کراون کە بۆ سەردەمەکانی بەر لە مێژوو دەگەڕێنەوە وەکو نموونە بەلام کورت و پوخت.

٦- دانەری نامە لاپەڕە (٢٣ — ٣٥)ی باسەکەی تەرخان کردووە بۆ چاخەکانی بەر لە مێژوو لە کوردستاندا لەکاتێکدا نامەکەی لەسەر چاخە مێژووییەکانە. من لێرەدا لە خاوەن نامە دەپرسم و دەڵێم: ئایا باشتر نەبوو لەجیاتی هێنانی ئەو زانیارییانە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە باسەکەوە نییە بهاتایە سەر باسەکەی و بەدوای کۆمەڵێك زانیاریا بگەڕایە لەبارەی مێژووی هەرێمەکەوە بۆ خزمەتی نامەکەی کە لە سەرچاوە بیانییەکاندا دەست دەکەون، من لای خۆمەوە لەباسی گەلانی زاگرۆسدا دەیانخەمە ڕوو کە لە نامەکەدا بەرچاو ناکەون، بەلای منەوە لەم بڕگەیەدا دەبوو هەروەکو بەر لە ئێستاش ئاماژەم پێدا لەوە زیاتری نەگوتایە کە بەپێی سەرچاوە مێژوویەکان لەکاری کنە و پشکنیندا دەرکەوتووە ئەم بەشەی کوردستان لەکۆنەوە ئاوەدان بووە ئەوەش بەهۆی ئاو و هەوای خۆشی و خاکی بەپیت و فەڕ و ئاوی زۆرییەوە بووە. بەڵگەش بۆ ئەمە هەندێك لەو شوێنەوارانەی

بە نموونە بهێنایەتەوە کە کاری کنە و پشکنینیان تێدا کراوە هەروەکو بەو پێیە کە ئاماژەمان بۆ کرد لێرەوە دەمانتوانی بەر لە مێژوو ببەستینەوە بە چاخی مێژوویی لە کوردستاندا، واتە نووسینەوەی ڕووداوەکانی بەپێی ئەو باسانەی لەدەقە بزمارییەکاندا و لەسەردەمە جیاجیاکاندا تۆمار کراون. من لە نووسینەوەی ڕووداوەکاندا پێویستیم بە باسی سەرەتای دەرکەوتنی نووسین نییە لەوڵاتی میسۆپۆتامیادا هەروەکو خاوەن نامە لەلاپەڕە (٣٤)ی نامەکەیدا باسی کردووە، بەقەوارەی ئەوەی ئەوکاتەی نووسین باسی لەشکرکێشی زلهێزەکانی کردووە، لەبەر تیشکی دەقەکانی پادشایانی سەردەمی ئەکەدی (٢٣٧١ — ٢٢٣٠ پ. ز) کە کۆنترینیانە و سەرەتاکەی بۆ ڕۆژگاری (نەرامسین) ئاماژەی پێدراوە لە شەڕیدا دژی لۆلۆییەکان. بەڵام بەر لەو ڕۆژگارە لە سەردەمی چاخی بەرەبەیانی بنەماڵەکاندا شتێك لەو ڕووداوانە لە مێژووی هەرێمەکەدا تۆمار نەکراون بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو بنەماڵانە زیاتر لە ناوەڕاست و باشووری میسۆپۆتامیا دەرکەوتوون و لەناو خۆیاندا هەردەم لە شەڕ و شۆڕدا بوون لەسەر ئاو و زەوی و گەورەکردنی سنووری دەسەڵاتیان، بەڵام دواتر لە سەردەمی ئاشووریدا و لە قۆناغە جیاجیاکانیدا بەپێی نامەکانی (ماری) دەوڵەتی بچکۆڵە لە کوردستاندا دەرکەوتن.

لەلایەکی ترەوە لە لاپەڕە (٢٣)ی نامەکەدا و لە پەراوێزی (٢) دا بۆ دانانی مێژووی پاشماوەی ستوونەکەی (بەردەبەلکە) دانەر دەڵێ: پێدەچێت بۆ سنووری (١٠) هەزار یان هەشت هەزار ساڵ پ. ز بگەڕێتەوە. لەوەڵامی ئەو بۆچوونەدا بەلامەوە نامۆیە پاشماوەیەکی خاکناسی کە تەمەنی بە چینەکانی خاکناسی دیاری دەکرێت و هیچ بەڵگەیەکیشمان لەو ڕووەوە بە دەستەوە نییە چۆن توانیویە بەو شێوەیە سنوور بۆ تەمەنی دیاری بکات، لە کاتێکدا دەبوایە ئەوەی بزانیایە کە ئەو پاشماوە لمە بەردەی بە پێوە وەستاوە بەشێك بووە لە پاشماوەیەکی زۆر گەورەتر لە سەردەمە زووەکاندا کە بەهۆی ئاو و هەواو و بەفر و بارانەوە بچکۆڵە بووەتەوە و سەردەمەکەشی بە چاخی خاکناسی (پلایستۆسین) ڕووپێو دەکرێ کە بۆ (٦٠٠) هەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە.

بەپێی راپۆرتێکی دکتۆر (ناجی الاصیل) کە لە ساڵی ١٩٤٩ سەری لەو پاشماوە خاکناسییە داوە لەو رووەوە لەسەر پاشماوە ئاسەوارەکانی دەڵێ: ئامێرە بەردینەکانی چواردەوری ئەو بەردە قنجە کە بەشێکە لە تەکنۆلۆژیای سەردەمی بەر لە مێژوو بۆ چاخی ئاشووریی، یان مستێری دەگەڕێنەوە واتە (١٠٠ — ٨٠) هەزار ساڵ پ. ز. ئەو بەردە قنجە کە بە (بەردەبەلکە) لە ناوچەکەدا ناسراوە هەتاکو ساڵی ١٩٩١ هەر مابوو بەڵام دواتر قاچاخچییەکانی شوێنەوار شکاندیان، وا تێگەیشتبوون ئاڵتوونی لەژێردایە.

جارێکی تر دانەر لە لاپەڕە (٢٧)ی نامەکەیدا ئاماژە دەدات کە چاخی بەردینی ناوەڕاست قۆناغێکی گواستنەوەیە و سیفاتی ئامێرەکانی بەو جۆرەن کە بەوردی دروست کراون و لەبەر چاو گیراون، بۆیە پێیان دەڵێن ئامێرە بەردینەکانی (مایکرۆلیثی) یان قۆناغی (زەرزی) بەناوی ئەشکەوتی زەرزی لە گوندی زەرزی چەمی ڕێزان.

لێرەدا دانەر ئەوەمان پێ ناڵێت، کە ئەم پیشەسازیی بەردینە وردە بۆ دەشت دەگەڕێتەوە کە مرۆڤ دوای بەجێهێشتنی ئەشکەوت دروستی کردووە یان بەشێکە لە پیشەسازی ئەشکەوت و بەردەوامی پێداوە؟ ئەمە لەکاتێکدا کە زۆرینەی لێکۆڵەران ڕایان وایە ئامێرە بەردینە وردەکانی (مایکرۆلیثی) پیشەسازی ئەشکەوتە و مرۆڤ بەردەوامی پێداوە کە بە قۆناغی زەرزی ناسراوە، هەمان پاشماوەی ئەو ئامێرانەش لە (تورکەکە) و (کاوری خان) و (قەرە چێوار) لە دەشت لە ناوچەی چەمچەماڵ و شوان بەرچاو دەکەون.

جارێکی تر خاوەن نامە لەلاپەڕە (٣٥)دا دەڵێ: لەوانەیە سەرچاوەی کانەکانی (مس) لە شاخەکانی زاگرۆسدا هەبووبێت بەتایبەتی ناوچەکانی (کیماش)، هەروەها دەڵێ: هەیشە باوەڕی وایە (کیماش) دەکەوێتە بەرزاییەکانی باشووری کەرکووك یان شاخەکانی حەمرین. من لای خۆمەوە ڕایەکی جیاوازترم لەم دوو ڕایە هەیە، خۆ ئەگەر خاوەنی ئەم دوو ڕایە، یان دانەر کەمێك ئاگادار بوونایە بۆیان دەرئەکەوت کە هەمان (کیماش) لە ناوچەی شارەزووریش هەیە لەژێر ناوی (قوماش) نزیك بە گردی موان، وادیارە هەمان (کیماش) بێت لەگەڵ تۆزێك گۆڕان کە بەسەر ناوەکەدا هاتووە لەسەر زمان و بووەتە (قوماش).

٧- بەر لەوەی دانەری نامە لە فەسڵی دووەمدا بێتە سەر باسی چاخە مێژووییەكان كە لەلاپەڕە (٣٦)ەوە دەست پێدەكات، سەرەتا دەبوو دانەر باسی ئەو سەرچاوانەی بكردایە كە لە كۆندا واتە چاخە مێژووییەكاندا زانیارییان لەسەر ئەو گەلانە بڵاو كردووەتەوە كە ئێستا بوونەتە كەرەسە بۆ نووسینەوەی مێژوومان لە سەریان. من لای خۆمەوە بەباشی دەزانم پێناسەیان بۆ بكەم بەپێی ڕیزبەندییان و گرنگییان لە نووسینەوەی مێژووەكەدا بەپێویست دەزانم.

**ئەلف**: سەرچاوەكانی مێخی ئاشووری كە بۆ هەزارەی دووەم و یەكەمی پ. ز دەگەڕێنەوە، ئەم دەستەیە لە دەزگایەكی مەزهەبی ئاشووریدا نووسراوە كە لە ناویانا سەركەوتنە پیرۆزەكانی پادشاكان باس كراون. لەناو ئەم نووسینانەدا ناوی وڵاتان و عەشیرەتەكان لەناو ڕووداوە مێژوویەكاندا و تەرزی ژیانیان و سیستمی فەرهەنگ و ئایین و پەروەردە و شارستانیەتی عەشیرەتەكان و گەلان باسیان كراوە.

ئەم دەستەیە بەپێی ڕیزبەندییان دەتوانین دابەشی بكەین بە:

١- ئەو نامانەی بۆ خوا لەڕووی گلێنەكان نووسراون و باسی یەكێك لە لەشكركێشییەكان دەكات وەكو لەشكركێشییەكەی سەرجۆنی دووەم ٧١٤ پ. ز كە پەیوەستە بە مێژووی مادەوە.

٢- ساڵنامەی ئاشووری باسی لەشكركێشیی ساڵانەی پادشاكانی ئاشووری دەكات لە نموونەی ئەو نووسینانەی ئاشووری كە پەیوەندی بە مادەوە هەیە و دۆزراوەتەوە، ساڵی ١٩٩٦ نووسینەكەی (تەنگی وەری)یە لە دووری ٤٥ كیلۆمەتری باكووری خۆرئاوای (كامیاران) لە پارێزگای (سنە) كە بەدەستمان گەیشتووە، نووسینەكەش پەیوەستە بە سەرجۆنی دووەم كە لە ڕووی بەرد لە (تەنگی وەری) هەڵكەنراوە. دەقەكە بزمارییە و بە زمانی ئاشووری نووسراوە و لەگەڵیا نیوەی مرۆڤێكیش لە بەردەكە دەرهێنراوە.

**بێ**: سەرچاوە سۆمەرییەكان – ئەكەدییەكان: كۆنترین زانیاری كە بەر لە ماد بۆ ئەو سەرزەمینە هەمانبووبێت سەرچاوەكانی (سۆمەری – ئەكەدی)یە كە باسی

لەشکرکێشییەکانی عەشیرەتەکانی (کوتی) دەکات لەسەر زەمینی ماد لەباشووری نێوان دوو ڕووبار کە لەناویانا دەربارەی شەڕی (تیریکان) (تیریگان)ی پادشای (کوتی) نووسراوە، نموونەی ئەو زانیاریانەش کە لەسەر گەلانی (کوتی) هەیە لەناویا باسی لۆلۆییەکانیش هاتووە کە دانیشتووی ناوچە شاخاوییەکەی (ماد) بوون.

**جیم**: سەرچاوە عیلامییەکان: نووسینەکانی فەرمانڕەوا عیلامییەکان، کە بە زمانی خۆماڵی عیلامی – سۆمەری – ئەکەدی دەرهێنراون دەتوانن بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی ماد سوودیان هەبێت. نموونەی گرنگی ئەو سەرچاوانە زانیارییەکانمان دەربارەی دانانی شوێن و پێکهاتەی نەژادی و قەومی مرۆڤەکانن کە لە ناوچەکانی دراوسێی سەرزەمینی (ماد)دا ژیاون.

**دال**: سەرچاوە بابلییەکان: ساڵنامە بابلییەکان لە کۆنەوە بە مێژووی گەلانی زاگرۆس ئاشنایان کردووین، هەروەها لە سەدەی شەشەمی پ. ز وە بە مێژووی ماد ئاشنایان کردووین ئەمانە گرنگیی خۆیان هەیە، جگە لەوەش نووسینەکانی قەشە (برۆس)ی ئەستێرەناسی کلدانی سەدەی سێیەمی پ. ز کە خاوەنی مێژووی بابلە ئاماژەی بە زنجیرەی کوتییەکان داوە کە پێکهاتووە لە ٢١ پادشا، کە تاوەکو ئەندازەیەك ڕاستە و دەتوانین وەربگرین، بەجۆرێك کە کوتییەکان بەشێك بوون لە ڕابردووی مادی ئایندە.

**هێ**: سەرچاوە یۆنانییەکان: بەباوەڕی لێکۆڵەران و شارەزایانی وەکو دکتۆر (ئاردەشێری خودادادیان) خاوەنی کتێبی (ئاریاکان و مادەکان)، سەرچاوەکانی یۆنانی لە ڕۆشنکردنەوەی مێژووی (ماد)دا زووتر زانیارییان دەست ئێمە خستووە کە لەو ڕووەوە هیرۆدۆت نەخشەی بۆ ئێمە داناوە. هەروەها ئاگاداری مێژوو نووسانی هاونیشتیمانی بەر لە خۆشی بووە، بۆیە دەتوانین لەو ڕووەوە سەرچاوەکانی یۆنانی بەپێی زانیارییەکان دابەش بکەین.

٨– دانەر باسی فەسڵی (٢)ی نامەکەی تەرخان کردووە بۆ چاخە مێژووییەکان لە (٣٠٠٠ – ٢٠٠٠ پ. ز) و چاخی بەرەبەیانی بنەماڵەکان لە (٢٧٠٠ – ٢٣٧٠ پ. ز)، لێرەدا دانەر ئاماژە بەوە دەدات کە سیستەمی بەرەبەیانی بنەماڵەکان بەپێی بەڵگە نووسراوەکان کە لەبەر دەستدان لە ناوەڕاست و باشووری نێوان دوو ڕووبار

هەبوون، هەمان ئەو سیستەمەش لە باکوور لە هەمان سەردەمدا دروست بووە لەوانە بوونی کۆمەڵێك لەو دەوڵەتۆکانە دێت کە لە هەرێمەکەدا دەرکەوتوون، وەکو (کوتیوم) و (لۆلۆبوم) و (گاسور) و (خەمازی)، بۆ وەڵامی ئەم بڕگەیە دەبوایە دکتۆرە ئەوەی بزانیایە کە ئەو دەوڵەتۆکانەی لەم بەشەی کوردستان دروست بوون هاوکات نین لەگەڵ ئەوانەی ناوەڕاست و باشووری نێوان دوو ڕووبارەکە زیاتر بەپێی ئەو زانیارییانەی بە دەستەوە هەن بۆ سەردەمی بنەماڵەی دوای ئەکەدی دەگەڕێنەوە واتە چاخی بنەماڵەی ئوری سێیەم و بنەماڵەی بابلی یەکەم بەدواوە، کە دوا دوای هەزارەی سێیەم دەگرێتەوە ئەوانە لە سەرەتای چاخی بابلی کۆندا زیاتر بڵاو بوونەوە. لای شارەزایانیش ئەوە ئاشکرایە کە سەردەمی بەرەبەیانی بنەماڵەکان ڕۆژگارێکی زووە لە مێژووی فەرمانڕەوایەتی مرۆڤدا، شەڕ و ئاژاوەکانی نێوانیان لە سنوورێکی تەسکی ناوچەکەدا لەسەر زەوی و ئاو بووە ئامانجیان لەمەدا بۆ گەورەکردنی دەسەڵاتیان بووە، بەڵگەی لەبەرچاویش شەڕی نێوان (لەگش) و (ئۆمایە). من لەوە تێناگەم کام بەڵگەی نووسراو هەیە سەبارەت بە دەوڵەتۆکەکانی باکوور کە دامەزراندنیان هاوکات بووە لەگەڵ ئەوانەی ناوەڕاست و باشوور، ئەی ئەگەر هەیە بۆ نایخاتە ڕوو، لەکاتێکدا بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستدان ئەو دەوڵەتانەی کە ئاماژەمان پێدان لە باکوور لە قەوارەیەکی گچکەدا نەبوون، بەڵکو سنووری دەسەڵاتیان بەرفراوان بوون و قورسایی خۆیان هەبووە لەناو کۆڕی زلهێزەکانی ڕۆژگارەکە و ڕووداوەکاندا.

جارێکی تر با بگەڕێینەوە لای دانەری نامەکە، ئەو مێژووەی کە بۆ چاخی بەرەبەیانی بنەماڵەکانی داناوە و سنوورداری کردووە لەنێوان (٢٧٠٠ — ٢٣٧٠ پ. ز) وا دیارە لە کتێبەکەی (تەها باقر) وەری گرتووە کە ڕای مێژوو نووسان لەسەری ئێستا جیاوازی هەیە و سەرەتاکەی دەبەنەوە بۆ (٢٦٠٠ پ. ز) واتە سەدەیەك دواتر. جارێکی تر ئەوە دەڵێمەوە: بەلای منەوە باشتر وابوو بەو شێوە پچڕ پچڕەی کە لەو گەلانە دواوە و زانیاری ناو کتێبە مێژووییەکان و بەڵگە بزمارییەکانی لەسەریان خستۆتە ڕوو، دەبوایە باسەکەی بەناوی دانیشتوانی ناوچەی ماد لە دوادوای هەزارەی سێیەمی پ. ز. باس بکردایە کە وەکو سەرەتا

لە پێشیانەوە لۆلۆییەکان دێت کە بـەپێی بەڵگـەکانی مێـژووی کـۆن و قەواڵـەکانی کـاری کنـە و پـشکنین سـنووری دەسـەڵاتیان لـە بـاکوور (زامـوا) و سـەرزەمینی (نـامری)یـە و لـە خۆرهـەڵات ناوچـەکانی (سـۆمی) و (هاشمـار) (نارمـان)ە و لـە ناوەندیـشا (ڕاپا) و (سـیماش) (سـورداش)ە و لـە باشووریـشدا سـەرزەمینەکانی (باراهش) و (توکریش)ە و، شـارەکانی عیلامـیش سـنووری باشـووری لۆلۆییـەکان بووە. لە خۆرئاواشـیدا سـەرزەمینی (ئۆرانـا) (ئارابخـا) دێـت. شـارە ناودارەکـانی وەکو (بابیت — داغارا — یارا — کاکری — زیمری — هـودن — مەسـۆ — ئـارزیرو — قەڵای ئوزی و کینبا) پەیوەستن بە سەرزەمینی لۆلۆ. شاخە ناسراوەکانی (نیسیر) یان (کیبنا) یاوەکو کێوی ڕزگاری — نیکدیم — ئیراسیمیاکی — ئازرو یـان (ئـەزمر) و — (کۆلار) و (لالار) و (سوانی) — (نیشپی) یـان کێـوی (ئورمـان) یـان (ئۆرمـان) یـان (ئۆرامـان) لـە ناوچـەکەیاندا هـەن. لـەناو ئەمانەشـدا ڕووبارەکـانی (ڕادنـو) و (ئادێر) هەن. بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی دیارە قەڵەمڕەوی ئەم قەومە بە شتێکی تەواوی بەرفراوانی شاخەکان و کێوەکانی سـەرەوەی (دیالـە) تـاوەکو دەریاچـەی (ورمـێ) و ژوورتـر بـەرەو بـاکووری خۆرئـاوا دەڕوات کـە ناوچـەکانی سـەرەوەی (زەهاو) یان بە قسەی ئەعرابەکان (حەلوان) و (سلێمانی) و بەشێك لە (سـوریا)ش دەگرێتەوە. ناوەندی سیاسی ئەو قەومە (زیمری) بووە.

واژەی لۆلۆیی لە زمانی ئۆراتۆرییدا بە مانـای بێگانـە و دوژمـن دێـت، لـە زمـانی خۆریشدا بە مانای ناخنشین هاتووە و ناویان براوە.

کۆنترین پاشماوە یەکن کە لەم قەومـە ماوەتـەوە کـە دواتـر بووەتـە یـەکێك لـە تایەفەکانی ماد، یان کورد، یان گەلانی زاگـرۆس ئەوەیـە ناویـان لـە نووسـینەکەی (نەرامسین)ی پادشای ئەکەد (٢٢٩١ — ٢٢٥٥ پ. ز) هاتووە کە ناسراوە بـە میلـی (سەرکەوتن)ی (نەرامسین) تێیدا باسی سەرکەوتنی خۆی دەکات بەسەر (ساتۆنی) پادشـای لۆلـۆیی کـە دادوەری ناوچـەکانی چـواردەوری ڕووبـاری دیالـە و سـیروان بووە.

(نەرامسین) لەم شەڕەیدا بەسەر لۆلۆییەکاندا سەرکەوت بەڵام ئەم سەرکەوتنەی زۆری نەخایانـد ئـەوەبوو، لەشـکری (کـوتی) شکـستی بـە سـوپای ئەکـەدی دا و دەوڵەتی ئەکەد کۆتایی هات.

پاشماوەی شوێنەواری کە پەیوەستە بە لۆلۆییەکان و دەتوانین ئاماژەی پێ بدەین نەخشی هەڵکۆڵراوی بەردینی (ئانۆبانینی) یە لە (سەرپێڵی زەهاو) کە پادشا لە بەردەم خوا (عەشتار) دا وەستاوە، نەخشەکەش لە کێوی (پاتیر) (پادیر) دەرهێنراوە. ناوەرۆکی نەخشەکە بەپێی نووسراوەکەی سەری، دەڵێ: (هەرکەسێك ئەم نەخشە یان ئەم تابلۆیە بکوژێنێتەوە نەفرەتی (ئانۆ) و (ئانتۆم) و (بێل) و (بلیت) و (ڕامان) و (عەشتار) و (شەمەش)ی لێ بێ و گرفتاری بکا و تۆوی بنەچەی بەدەم باوە) بدات.

(داند ئامابیف) باوەڕی وایە (داریوشی یەکەم)ی هاخامەنشی لە هەڵکۆڵینی نەخشەکەی و نووسینەکەی (بێستوون)یدا کە باسی سەرکەوتنی خۆی بەسەر دوژمنەکانیا دەکات پێدەچێت لە نەخشە و نووسینەکەی (ئانۆبانینی) سوودی وەرگرتبێت. مێژوو نووسانی چینی و ڕووسیش بۆ ئەوە دەچن کە لۆلۆییەکان لە نیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پ. ز خاوەنی حکوومەت و کۆمەڵی چینایەتی بوون. وێڕای ئەو نەخشەیەش، نەخشێکی هەڵکۆڵراوی بەردینی تریش هەیە دەکەوێتە ئەمدیوی سنووری باشووری کوردستان لە ناوچەی (هۆرین – شێخان) کە بە نەخشی دەربەند بێ لوولە ناسراوە. نەخشەکە پێکهاتووە لە جەنگاوەرێك لەسەر لا وەستاوە، بە دەستێکی کەوانێکی گرتووە و بە دەستەکەی تری ئامێرێکی نووکتیژی گرتووە، کە دەربڕین لە هێز و دەسەڵاتی دەکات، هەروەها تەورێکی هەڵواسیوە بە پشتێنەکەیدا، لە پشتییەوە تیردانێك هەیە کە پڕیەتی لە تیر، جەنگاوەرەکە ملوانکەیەکی لە ملدایە لە بەردی بە نرخ دروست کراوە، لە ناوەڕاستییا دروشمێکی بازنەیی هەیە و پێیدا هەڵواسراوە و گوارەی لەگوێدایە، کڵاوەکەی سەری لە کڵاوێکی لبادی لێوار بچووك پێکهاتووە لە شێوەدا دەچێتەوە سەر کڵاوی چاخی بابلی کۆن. جەنگاوەرەکە بێ ڕیشە و قاچی ڕووتە و لەسەر لاشەی دوژمنەکەی پێشەوەی داناوە و قاچی ڕاستیشی بۆ دواوە بردووەتەوە. دوژمنەکەی لەبارێکی خراپدا دەبینرێت هەروەکو کڕنۆشی بردبێت، لە پشتییەوە دیلی دووەم دەبینرێت کە دەربڕین لە دوژمنێکی تر دەکات. وادیارە خاوەنی نەخشەکە میرێك بێت، یان گەورەی عەشیرەتەکە کە لە ناوچەکەدا فەرمانڕەوایەتی کردبێت، لە پشتی دیلەکەوە ستوونێك هەیە کە نووسینی بزماری لەسەرە.

نووسینەکە دەڵێ: (تاردۆنی کوڕی ئیککی وڵاتەکەی گەڕاندەوە (یان نوێی کردەوە)، یادگارێکی دانا هەر کەسێك نەخشەکە لابەرێت تۆوی و ناوی خوداوەند (شاماش) و خواوەند (ئادەد) لەناوی بەرێت.

### ژیانی سیاسیی لۆلۆبییەکان:

گەورەترین هەڕەشەیەك کە لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەسەر لۆلۆبییەکان هەبووە، بۆ کۆتایی هەزارەی دووەم و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ. ز دەگەڕێتەوە، کە لەلایەن دەوڵەتی گەورە و بە توانای ئاشوورەوە بووە. لە پاشماوەی ئاسەواری ئاشووریدا لە بارەی لۆلۆبییەکان و کوتییەکان و کاسییەکان و سووبارییەکان ئاماژە هەیە بەڵام بەتەنیا هەر ئەوانە ناویان نەهاتووە.

ئاشوور ناسر پاڵی دووەم لە نێوان ساڵەکانی (٨٨٣ – ٨٥٩ پ. ز) چوار جار هێرشی بردووەتە سەر زەمینی لۆلۆبییەکان و (ئامیخا)ی فەرمانڕەوای لۆلۆبییەکانی لە شاخەکانی ناوچەکەدا دەستگیر کردووە. لە ساڵی ٨٨٠ پ. ز لۆلۆبییەکان بە پێشەوایەتی (ناسیکۆ)ی پێشەوای عەشیرەتی (ناسیکۆ) لەگەڵ بەشی (داگارا) بە پێشەوایەتی (نور ئاداد) بڕیاریان دا دژی داگیرکردنەکانی لەشکرکێشییەکانی ئاشووری بووەستنەوە، بۆ ئەمەش گەمارۆی (بابیتا)یان لە دەربەندی بازیان دا کە تاوەکو (ئاڵتون کۆپری) لەسەر زێی بچووك لە قەڵەمڕەویاندا بوو بەڵام ئاشوور ناسر پاڵی دووەم ئەم بەرەنگارییەی شکاند و توانی (٣) پادشای بچکۆڵەش لە لۆلۆبییەکان بگرێت، بەڵام دوای ساڵێك بەهۆی نەدانی باج بە ئاشوورییەکان عەشیرەتەکانی (مۆساسینا) و (کیرتیا) بەرەنگاری هێرشەکانی ئاشوور ناسرپاڵ بوونەوە، پادشا (ئاتا) کە هیچ پەیوەندییەکی بە پادشاکانی لۆلۆبییەوە نەبوو گرتیان، هەروەها (کوتیۆم)یش تاوەکو ساڵی ٨٢٨ پ. ز ژێردەستە بوو کە بووە بەشێك لە یەکێك لە ویلایەتەکانی ئاشووری کە ئەوەش وای کرد بارودۆخەکە لە رۆژگاری دەسەڵاتی ئاشوور ناسرپاڵی دووەمدا وەکو خۆی بمێنێتەوە هەتاکو کۆتایی فەرمانڕەواییەکەی کە بەکەمی بەرەو سنووری زاگرۆس رۆیشتووە بۆ گەیشتنی بە خاڵە دوورەکانی ناوچەکە.

جارێكی تر پادشای ئاشووری ئاشوور ناسر پالّی دووەم (٨٨٣ – ٨٥٩ پ. ز) دوای (٣)ی سالّ شەڕكردن توانی بەشێك لە ناوچەی هەورامان لە خۆرهەلاّتی شارەزوور كە سەر بە هەرێمی لۆلۆ بوو داگیر بكات لە ئەنجامی ئەمەدا شارێكی دروست كرد بەناوی (دور ئاشوور) لە شوێنی شارە كۆنەكەی (ئاتلیلا)و كردییە ناوەندی كۆكردنەوەی دانەوێلّە لە ناوچەكەدا كە بەرهەمیان هێناوە.

لە سەردەمی شەلما نەسری سێیەمدا بەبیانووی سەركوتكردنی سەرپێچیكردنەكەی (یانزی) (بیت هامبان) كە خۆی لە (نامار) بووە، سالّی (٨٣٤ پ. ز) لەشكركێشی كرد بۆ سەرزەمینی ماد (ناوچەی لۆلۆیی) ئەو هێرشە وایكرد سەر لە نوێ (نامار) و (پارسوا)و ناوچەكانی تری (ئارازیاش) و (خارخار) لەگەلّ چوار قەلاّدا داگیریان بكا و پادشاش لە سالّنامەكانی خۆیدا باسی كردوون، دواییش بەهێنانی دیل و تالاّنییەكی زۆرەوە بۆ ئاشوور گەڕایەوە.

یەكێك لە نەیارەكان كە لە شەڕێكدا دیلی ئاشوورییەكان بوو بەناوی (نور ئاداد) پێویستە لێرەدا سەیری ناوەكەی بكەین و لێی ورد ببینەوە لەگەلّ ناوەكانی تری لۆلۆیی وەكو (موساسینا – كیرتیارا – ئاتا – سابینی – ئاراشتوا)، ئەو ناوانە نیشانی دەدەن كە قەفقازین، ئەوەش دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی كە هیچ نیشانەیەك بە دەستەوە نییە كە هیند و ئارياییەكان هەتاكو (٩٠٠ی پ. ز) بە تێكەلاّوی پێكەوە ژیانیان لەگەلّ ئەو بەشەی زاگرۆسدا هەبووبێت. بەلاّم دواتر لە ناوچەی (زاموا)دا لە ڕوو بەڕوو بوونەوەیاندا بۆ سەربەخۆییان و ئازادییان توانییان لەژێر چەپۆكی ئیمپرلیالیزمی ئاشووری لە كۆتایی سەدەی (٩)ی پ. ز و سەرەتای سەدەی (٨) ڕزگاریان ببێ، بەو كارەشیان بناغەی یەكێتی و بەرەنگار بوونەوەیان لە بەرامبەر دژایەتی گەورەی ئاشووری دژ بە زاگرۆس دابمەزرێنن، ئەمەش لە دواتردا دامەزراندنی حكوومەتی میللی مادی لێكەوتەوە لە سەردەمی (هۆخشترە) _كەیخوسرەو) لە سالّی ٦١٢ پ. ز.

### دیاردەكانی نەژادی – زمانی – كۆمەلاّیەتیی لۆلۆییەكان:

بەلّگەكان بەزۆری نیشانی دەدەن كە لۆلۆییەكان، نزیكی، یان خزمایەتییان لەگەلّ فەرهەنگ و كۆمەلاّیەتی عیلامییەكاندا هەبووە. زمانەكەشیان لقێك بووە لە

زمـانی عیلامـی. نەخـشە بەرجەسـتەکراوەکەی (ئانۆبـانینی) سـیما و کـۆنترین پۆشـاکی دانیـشتوانی سـەرزەمینی مـاد دەردەخـات کـە پێکهـاتووە لـە جلکێکـی چنراوی دامێن ڕیشوودار کە پێستێکیان بـە شـانیانا داوە، پێڵاوەکانیـان (سـۆل)ە ئەمە بە واتای هێـرۆ دۆت لـە هـەزارەی یەکـەمی پ. ز پۆشـاکی مرۆڤـی (ماننـا) و (مادی) خۆرئاوا (کاسییەکان) و (پارتییەکان) بوو، ئاداب و ڕێوڕەسمی لۆلۆییەکان بەزۆری هاوشێوەی ڕسووماتی ئاسایی مادەکان بوو لەدواتردا. ئاشوور ناسر پـاڵی دووەم پادشای ئاشوور ئاماژەی داوە کە، گەلی لۆلۆ پێـشکەوتوو و شـارەزا بـوون لە بواری پیشەسازیدا بەجۆرێك لەڕێگای پیشەکەیانەوە دەوڵەتانی تریش بەکاریان هێناون.

من مەبەستم لە باسی لۆلۆییەکاندا بەو شێوەیە، بۆ ئـەوە بـوو نیـشانی دانـەری نامەی بدەم بەو پچڕپچڕەی دکتـۆرە باسـی لێـوە کـردوون بـە چـەند ئاماژەیـەکی سەرچاوەکان مێژووەکەیان تەمومژاوی دەکا و سەر لە خوێنـەر تێك دەدات. بۆیـە دەبوو ناوبراو زانستییانە و دوور لە هەموو گرێ کۆرەیەك باسی بکردنایـە، چـونکە گەلانی زاگرۆس مێژووەکانیان ڕەسەنە بـەهۆی ئـەوەی دانیـشتووی دێـرینی وڵاتـی کوردەوارین (کوردستان)، وەکو ئـەوەی کـە لـە باسـەکەمدا لەسـەر ئـەو گەلـە بـە کورتی نووسیومە دەبوایە قەرەداغیش هەر بەو جۆرە ڕێـچکەی یەکـە یەکـەی ئـەو گەلانەی بگرتایە و باسی بکردایە، چونکە بەچەند ئاماژەیەك کاری مەیسەر ناکات، بەهۆی ئەوەی هێڵی گشتی بەپێی ناونیشان لە باسەکانیدا لەسەریان نییە بـە مانـا دەبێت بەپێی ناونیشان نووسینەکەی دیاری بکات واتە بابەتەکانی.

٩- دانـەری نامـە لەلاپـەڕە (٤٤)دا، دەڵـێ: لـە زنجـیرە شـاخی (بـەمۆ) و لـە دەربەندی بێلولە یەکێك لە پادشاکانی لۆلۆیی بەناوی (تاردۆنی) میلێکـی بـەردینی بەڕووی بەردی دەربەند بۆ داناوین، هەروەها دەڵێ: لەوانەیە ناولێنانی (بێلولە) لـە (بێل) و (لۆلۆ)وە هاتبێت کە مانای گەورەی لۆلۆییەکان ئەدات — بـۆ وەڵامـی ئـەو بڕگەیە هەر ئەوەندە دەڵێم: (تاردۆنی) یەکێك نییە لە پادشـاکانی لۆلـۆیی چـونکە هێمای پادشایەتی بەم جەنگاوەرەوە نییە کەتاجە.

لای شـارەزایانی مێـژووی کـۆنیش ئـەوە ئاشـکرایە لـە شارسـتانێتی نێـوان دوو ڕووباردا هێما دەوری بینیوە لە هونەردا واتە هێماکە بەشێکە دەربـڕینی لـە گـشت

کردووه لەو سەردەمە کۆنانەدا، بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نەخشە هەڵکۆڵراوەکەی (ئانۆبانینی) له سەر پێلی زەهاو، ئەوەی لە وێنەکەی ناوبراودا دیاره تاجی پادشایەتییه کە لە خوا عەشتاری وەرگرتووه کە هێمایه بۆ بەخشینی پادشایەتیی پێی بەو جۆرەی له بەردەمیا وەستاوە. هەروەها عەشتار ئەلقەیەکی بەدەستەوە گرتووه دەیدات بە ئانۆبانینی کە هێمایە بۆ دەسەڵات و هێز. بە پێچەوانەوە هیچکام لەم هێمایانه له نەخشەکەی (تاردۆنی)دا نییە، بۆیە دکتۆر (فازیل عەبدولواحید عەلی) زانا لە بواری نووسینی بزماریدا خاوەنی نەخشی دەربەند بیلۆلە بە گەورەی عەشیرەتێك یان شێخێك یان میرێك داناوه کە دەسەڵاتدار بووه لە ناوچەکەدا. بەراوردێکیش لەنێوان ئەو دروشمەی لە ملی (تاردۆنی) دایه بەوانەی له ملی پیاوانی دیواری وێنه کراوی ئادەمی (ماری)دایە، دەرئەکەوێت ئەو دروشمە بەپێی سەرچاوەکان نیشانەیەك بێت دەربڕین لە میرێك بکات یان دەسەڵاتدارێك بکات.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا دانەری نامە دێتە سەر باسی شیکردنەوەی ناوی (دەربەند بیلوله)، هەروەکو دەڵێ: ئەم ناولێنانه له (بێل) و (لۆلۆ)ی ئەکەدییەوه هاتووه کە مانای گەورەی لۆلۆییەکان دەگرێتەوە.

بۆ ئەو بۆچوونه دەڵێم: دەربەندێکی باریك کە تووله ڕێیەکی سەڵتە زەلامە یان کاروانچییەکه له زووەوە ڕێگای هاتوچۆکردن بووه بۆ دیوی سنووری کوردستانی ئێران، بە چ پێوەرێك ئەو مانایە دەبەخشێت، ئایا لێکدانەوەی لەفزی مەرجە مانای ڕەسەنی ناوەکە بپێکێت. من کاتێك بەڕێوەبەری شوێنەواری گەرمیان بووم چەند جارێك بە ناوچەکەدا گەڕاوم، لای دانیشتوانی ناوچەکە وا ڕاڤەی دەکەن کە ناوێکی کوردی ڕەسەنە و بە ڕێگایەکی لوولەکی تەسکی بار دەربڕینیان لێکردووه. وا دیاره پێدەچێت پێوەندی بە گەورەیی لۆلۆییەکانەوە نەبێت هەروەکو دانەر باسی کردووه، چونکە ئەو ناولێنانە بەسەر ڕێگایەکدا ناگوترێت چونکە پەیوەندییەك لەنێوان ڕێگایەك و گەورەی لۆلۆییەکان گونجاو نابێت مەگەر بەزۆر بیسەپێنین خۆ ئەگەر دانەر بیوتایە ماناکەی (بێل) و (لولو) دەبەخشێت کە واتای مەردۆخی خوا و لۆلۆییەکانه هێشتا بەلامەوە باشتر بوو، هەرچەندە من لەگەڵ ئەم

بۆچوونەشدا نیم. وەکو ئـەوەی دانـەر دەڵـێ: گـەورەی لۆلۆییـەکان چـونکە ئەمـە نازناوێکە بۆ مرۆڤ نەوەك بە دەربەندێك بوترێت.

لـە شـوێنێکی تـردا لـە پـەراوێزی ژمـارە (١)ی لاپـەڕە (٤٤)ی نامەکەیـدا دانـەر دەڵێ: لەوەی لەمەوبەر ئاماژەی پێکرا، تێگەیشتم کە ناوی کۆنی حەوزی ڕووبـاری (ئەڵوەند) و (حەمرین) پێدەچێت (باتیر) بێت.

لەوەڵامی ئـەم برگەیـەدا دەڵـێم: (بـاتیر) یـان (پـادیر) بـە بـڕوای خوالێخۆشـبوو ڕەشـیدی یاسـەمی نـاوی کـۆنی (زەهـاو)ە و وشـەکەش لای ئـەو (میـدی)یـە و لـە (باتور)ەوە شێوەی خۆی وەرگرتووە کە مانای سەر زەمـینی وێرانـە دەگرێتـەوە، لەوانەیە (زەهاو) لەسەر وێرانەی شاری (حەلوان)ی کۆن بینـا کرابێتـەوە. وادیـارە قەرەداغی لـەم سـاغکردنەوەیەدا نـەیتوانیوە شـتێکی نـوێ بڵـێ بـەڵکو هـەر دوای ڕایەکـەی دکتـۆر (ئەحمـەد کامـل) کـەوتووە و بۆچـوونەکەی ئـەوی دووبـارە کردووەتەوە. هـەر لـە هـەمان لاپەڕەشـدا نـاوی کۆمـەڵێك گونـدی هێنـاوە بـەناوی ئـەوەی کـەلتوورێکی زمانـەوانی لۆلۆییـان هەیـە وەکـو (تـەق تـەق) و گونـدەکانی (قەشقە) و (داوداوە) بێ ئەوەی بۆمان ڕوون بکاتـەوە ئـەو کـەلتوورە زمانەوانییـە چییە و بنەچەی ناوەکان لەچییەوە هاتوون.

١٠- دانـەری نامـە لاپـەڕە (٥١ – ٥٨)ی دانـاوە بـۆ باسـی کوتییـەکان لێـرەدا دەتوانم بڵێم کۆمەڵێك زانیاری تێکەڵاوم بـەو بابەتـە خوێنـدەوە کـە لـە زنجـیرەی باسەکەدا پـەیڕەوی ڕیزبەنـدی زنجـیرەی ڕووداوەکـان نـەکراوە، واتـە ڕووداوەکـان نەخراونەتە ڕوو، لەلایەکی ترەوە دانەر دەڵـێ: وڵاتـی (کوتیـۆم) دەکەوێتـە نێـوان (لۆلۆبـۆم) و (ئارمـانۆم) و (ئەکـەد) لـە بـاکووردا و (نیقـۆ) و (دێـر) لـە باشـووردا. ئەوەی ئەم وڵاتی کـوتی لـە نامەکـەدا دەبینـێ بـەو ڕایـە دەگـات کـە دیـاریکردنی سنووری جوگرافی نابێت تەمومژاوی بێت چونکە هەتاکو ئێستا نازانرێت (ئەکـەد)ی پایتەخت کەوتووەتە کوێ، یان (ئارمانۆم) لەکوێیە.

لێرەوە دەچینە ناو بابەتێکی تـری باسـەکەوە ئـەویش ئایـە (کوتـو) نازنـاوێکی جوگرافییە و کۆمەڵێك عەشیرەت هاوفیـد ڕاسـیۆن لەسـەر خاکەکـەی دانیـشتوون، یان ناوی عەشیرەتێکە و لە مێژووی کۆندا بەو ناوە ڕۆشتووە. لە باسەکەی دانەری نامەدا وا هاتووە کە (کوتو) عەشیرەتێك بێت بەو ناوە لە مێژوودا ڕۆڵی بینیبێ کـە

کۆتایی هێنا بە فەرمانڕەوایەتی ئەکەدییەکان، ئەمەش بۆچوونی دانەری نامەکەیە. بەڵام لە سەرچاوە فارسییەکاندا وا هاتووە ناوی (کوتی): واژەیەکی گشتییە و تەواوی دانیشتوانی زاگرۆس بە عێل و عەشیرەتەکانیەوە دەگرێتەوە، هەروەها (دیاکۆنۆف)یش لە مێژووی (ماد)دا لەو بارەیەوە دەڵێ: ناوی (کوتی) تەنیا لە هەزارەی سێیەم و دووەمی بەر لە زایندا هاتووە و بەکۆمەڵێکی هاونەژادیان وتووە، کە لە خۆرهەڵات و باکوور و باکووری خۆرئاوای لۆلۆییەکان ڕەنگبێت لە ئازەر بایجانی ئێستای ئێران و کوردستاندا ژیابن، هەروەها دیاکۆنۆف لەسەری دەڕواو دەڵێ: لەوە دەچێت ئەو زاراوەیە بەو هۆزە جۆراوجۆرانە گوترابێت کە لە باکووری خۆرهەڵاتی بابل ژیابن کە هەتا ئێستا ناوچەکەیان شوێنێکی دیاریکراوی یەکپارچەیی نەگەیاندبێت. لە هەزارەی یەکەمی پ. ز بە خەڵکی (ئۆرارتۆ) و (ماننا) و (ماد)یان وتووە (کوتی). لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە گەلێك یان عەشیرەتێك بە ناوی کوتی نییە بەڵکو ناوەکە لە کۆمەڵێك عەشیرەت پێکهاتووە کە لە ناوچەیەکی فراواندا ژیاون. هەر ئەوەش وای کردووە هەتاکو ئێستا بەپێی زانستی شوێنەوار ناسی نەمانتوانیوە دەستنیشانی ئاسەوارێکی کوتی بکەین.

١١- دانەری نامە لاپەڕە (٥٩ - ٦٠)ی داناوە بۆ باسی سەردەمی ئەکەدی (٢٣٣٤ - ٢٢٧٣ پ. ز)، وا دیارە هەستی بەو تێکەڵاوییە لێرەدا نەکردووە کە لە باسی ڕووداوەکانی گەلانی زاگرۆس (کوردستان)دا نووسیونی، ئەمەش بەڵگەیەکی ترمان دەداتێ کە شێوەی باسکردنەکەی لەو ئاماژانە دەچێت کە مۆرکی هاوشێوەی کتێبە مێژووییەکانی تری پێوە دیارە لەوانەی لەسەر شارستانێتی نێوان دوو ڕووبار نووسراون کە ناتوانین بەم دیارییەی ناوبراو بڵێین مێژوویەکی دێرینی پوختی کوردە.

لێرەدا جارێکی دیکە دەڵێم دەبوایە نووسەری نامە سەردەمی ڕووداوەکان و پادشاکانی ئەو بنەماڵەی جیا بکردایەتەوەو باسی بکردایە. بەلامەوە ئەگەر ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی دابەش بکردایە لە نێوان (سەرجۆنی ئەکەدی) و (ڕیمۆش) و (مانشتۆسۆ) و (نەرامسین) و (شارکالیشاری)، باسەکانی ناو مێژووەکە زیاتر ڕوونتر و زانستییانەتر و یەکگرتوو دەبوو لەو پچرپچرپەی ئاماژەکانیش ڕزگاری دەبوو کە دانەر بۆ نووسینەوەیان پەنای بردونەتە بەر.

لەلایەکی ترەوە لە نامەیەکی مێژوویی دکتۆرادا دانانی (٢) پـەڕە بـۆ باسـکردنی سەردەمی ئەکەدی کە پڕ لە ڕووداوی گەورەیە بۆ مێژووی کۆنی کورد، لـە شـوێنی خۆیدا نییە چونکە باسەکان زۆرن، هەروەها پاشماوە ئاسـەوارییەکانیش زۆرن کـە پێویستییان بە باس و لێکۆڵینەوە هەن، لەوانە میلی سەرکەوتنی نەرامسین.

لەلایەکی تر دانـەر لـە لاپـەڕە (٦٠)ی نامەکەیدا تـوانجی نووسـەرێکی بنەچـەی پادشاکانی هێناوە، کە دەڵێ: (پادشا کێیە و غەیری پادشا کێیە). نووسەری نامە ئەم وتەیەی لە باسەکەیدا ڕوون نەکردووەتەوە کە ئایا بەکێ گـوتراوە بـە مانـا بـە پادشـاکانی دوا دوای ئەکـەدی گـوتراوە یـان توانجەکـە بـەرەو ڕووی کوتییـەکان کراوەتەوە. لە سەرچاوە مێژووییەکانیشدا ئەوە دیاری کـراوە کـە ئـەم وتەیـە بـۆ نووسەرێکی سوومەری دەگەڕێتـەوە کـە تـوانجی گرتووەتـە گوتییـەکان بـۆ گاڵتـە پێکردنیـان کـە مەبەسـتی ئـەوە بـووە ئەمانـە لـەناو ئـاژاوەدا ژیـاون. شـتێکی ئاشکراشـە ئەگـەر نووسـەرێکی بێگانـەی دوژمـن لەسـەر قـەومێکی تـری نـەیار بنووسـێت لـەوە زیـاتر بـە دەمیـا نایـەت، وەکـو مێـژوو نووسـێکی ناسـیۆنالیزمی هاوسنوور لەسەر کورد بنووسێت.

١٢- بەهەمان شێوە دانەری نامەکە لە لاپـەڕە (٦١ - ٦٣)ی باسـەکەی دانـاوە بۆ بنەماڵەی ئووری سـێیەم (٢١١٢ - ٢٠٠٤ پ. ز) لێرەدا هـەمان ڕێچکەی باسـی سـەردەمی (ئەکـەدی) گرتـووە کـە تایبەتمەنـدیی مێـژووی کـۆنی کـوردی سەردەمەکەی تیـادا ون کـردووە جگـە لـە هێنانـەوەی چـەند نموونەیـەکی کـورتی مێژوویی کە ئاماژەی لەناو ڕووداوەکاندا پێداوە لەسەر مێژووی گـەلانی زاگـرۆس و هەرێمەکەمان، ئەمە لە کاتێکدایە کە سەردەمی ناوبراو پـڕ لـە ڕووداوی گرنگـە بـە سـەردەمی فەرمانڕەوایـەتی شـولگی (٢٠٩٤ - ٢٠٤٧ پ. ز) ناسـراوە کـە دەبـوو لەسـەر هێـرش و پـەلامارەکانی بـۆ سـەر لۆلۆییـەکان و شـوێنەکانی تـری وەکـو دەشتی بیتوێن لە ناوچەی ڕانیە و هەولێر گرنگی زیاتری پێبدایە، ئـەوەبوو لـە دوا هێرشیدا بۆ ناوچـەکە بـەپێی دەقێکـی بزمـاری وەکـو گۆزەیـەك چـۆن ئەیـدی بـە زەویدا لەتوپەت دەبێت بەو جۆرە بە قەمە پارچە پارچە بوو.

١٣- دانەر لاپەڕە (٦٤ - ٧٥)ی نامەکەی داناوە بۆ هەزارەی دووەمی پ. ز بـە ناونیـشانی (چـاخی ئیـسن - لارسـا) (٢٠٠٤ - ١٧٦٣ پ. ز). بـەلای منـەو

ناونیشانەکەی لە شوێنی خۆیدا نییە و تێکەڵاوکردنی سەردەمی دوو بنەماڵە لەگەڵ چاخی بابلی یەکەمدا و هاتنی پادشای گەورەی وەکو (حامورابی) بە یەکترەوە پەیوەست نابن، بۆیە دەبوایە لە باسی هەزارەی دووەمی پ. ز تەنیا باسەکانی لە سەر سەردەمی بابلی یەکەم و بەتایبەتی حامورابی بوایە، چونکە ئەو بنەماڵەیە واتە (ئیسن — لارسا) لەناو ڕووداوەکاندا ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبووە لەناو مێژووی ڕووداوەکانی کۆنی کوردستاندا. هەر لەم سەردەمەشدا کۆچی گەلانی ئامووری دەستی پێکرد بۆ باشوور و ناوەڕاستی عێراق کە حامورابی و دەوڵەتەکەی لقێکن لەوان. کە دەبوو ناونیشانەکەی لێرەدا: کوردستان لەبەردەم ڕووداوەکانی هەزارەی دووەمی پ. ز کە باساکەی (سیمۆرۆم "ئالتون کۆپری" و "توروککونا" و "ئارابخا" و "کاکمۆم" و "لۆلۆبۆم" و "کاکمۆم"ی لەخۆ بگرتنایە و بەهەر یەکێك بەپێی ئەو زانیارییانەی لەنامەکانی شمشارە دا هەن باسێکی جیای بۆیان بنووسیایە.

ئەوەی لەم بەشەدا دەردەکەوێت زانیارییەکان لەناو باسەکاندا زۆر چڕ و ئاڵۆزن و چوونەتە ناو یەکترەوە، بەوەش دانەر نەیتوانیوە هۆکاری ئاڵۆزییەکەیان باس بکات، هەروەکو بە لاپەڕە (٦٦)ی نامەکەیدا دیارە، کە دەڵێ: پەیوەندی تووروکییەکان کە یەکێکن لەو گەلانە لەگەڵ کوتییەکان باش نەبووە، ئەوە وای کردووە کوتییەکان بە سەرکردایەتیی پادشاکەیان (ئەندۆشی) گەمارۆی شاری (کۆنشۆم)ی پایتەختی مەملەکەتی خوری بدات ...). وادیارە دانەری نامە لە باسەکەیدا ڕاستەوخۆ هاتووە دەقی نامەکانی شمارەی خستووەتە ناو نامەکەیەوە بێ ئەوەی پێشەکییەك بدات لە باسەکەدا لە نەبوونی پەیوەندییان بکۆڵێتەوە، کە دەیتوانی سەرچاوەی تریش بهێنێ بۆ پتەوکردنی مێژووی سەردەمەکە و نووسینەوەی نامەکەی لەسەری.

بۆیە پێویست بوو لەناو نامەکانی کواری و مەملەکەتی (شوشرا)ی ناوچەی ڕانیە ئەو گەلانەی ناویان نەهاتووە لەناو نامەکاندا هەریەکێکیان بەجیا باسیان هەبووایە ئەوسا ئەنجامێك لە نووسینەوەی مێژووەکەیان دروست دەبوو کە تێیدا ڕۆژگارەکە و ڕۆڵی زلهێزەکان بۆ هاتنە ناوەوە و پەیوەندییان بە ئاشوورییەکانەوە لە سەردەمی شەشی ئەکەدی یەکەم (١٨١٣ — ١٧٨١ پ. ز) ئاوێنەیەکی ڕوون دەبوو

بۆ دیاریکردنی مێژووەکە، بەڵام بەشێوەی ئێستای تەمومژاوییە و سەر لە خوێنەر ئەشێوێنی لە باسی ڕووداوەکاندا. بەڵگەش بۆ ئەمە بڕوانە نووسەر چۆن لە لاپەڕە (٧٢)ی نامەکەیدا لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان و بارودۆخی ئاشوورییەکان ئەدوێ: خراپی بارودۆخی ئاشوورییەکان لە هەرێمی کوردستاندا دەوڵەتان و هێزە سیاسییەکانی ڕاکێشاوە لەو ڕۆژگارەدا بۆ بازنەی شەڕ، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو پەیمانە دیبلۆماسیانەدا هاتووەتە گۆڕێ کە بە یەکترەوە بەستوویەتەوە، وەکو پەیمانی نێوان (ئاشنونا) و (ئاشوور) بۆ لێدانی (ئارابخا) و دانانی سنوورێکی سیاسی و سەربازی بۆیان و وەستاندنیان لە داگیرکردنی ئاشووردا.

قەواڵە نووسراوەکانیش زانیاریمان پێ ئەدەن کە حامورابی سوپایەکی ناردووە بۆ یارمەتی (زمریلم) پادشای (ماری) (ئەلبومەکەمال) بۆ کردنەوەی گەمارۆ لەسەر (رازاما...).

ئەوەی ئەم بڕگە مێژووییە دەخوێنێتەوە هێندە ئاڵۆزە کە ناتوانێت باسەکان لە یەکتر جیا بکاتەوە، یان سەرەداوی مەبەست لەناویاندا بدۆزێتەوە.

لێرەدا ڕووی دەمم دەکەمە دانەری نامەکە ئایا مێژووی کۆنی کورد ئاوا ئاڵۆزە کە بەو جۆرە باسی لێوە دەکەی.

١٤- دانەر لاپەڕە (٧٦ – ٨٦)ی نامەکەی ناونیشانی ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ. ز داوەتێ، لێرەدا هاتووە باسی مێژووی گەلانی میتانی و هیتی و پەیوەندییان لەگەڵ ئاشوورییەکان و ئۆرارتۆییەکاندا دەکات کە کاریگەرییان لە ڕووداوە مێژووییەکان و شارستانێتی کۆنی جیهانی خۆرهەڵاتی کۆندا لەبەر چاو دیارن. دەبێت ئەوەش بزانین کە دەستنیشانکردنی ناوەڕاستی هەزارەی دووەم هاوکاتە بۆ بەردەوامی کۆچی گەلانی هیندۆ ئەورووپی کە ڕۆڵیان لە مێژووی ناوچەکەدا دەست پێدەکات کە تێیدا سەرکەوتوو بوون لە سەرکردایەتی دنیای خۆرهەڵاتی دوور لەڕووی ڕامیاری و شارستانیەتەوە کە بە هۆیانەوە تەرازووی هێز گۆڕا.

هەروەکو لەوەوبەر چەند جارێك ئاماژەم لەبارەی ئەو گەلانەوە داوە، دانەر کەمێك زانیاری هێناوە بەڵام نەیتوانیوە لەباسی سەربەخۆدا بۆ هەر یەکێکیان بەکاری بێنێت لەڕووە جیاجیاکانەوە، هەروەها لەناو ساڵەکانیشیانا کە دایناوە بۆ

کۆتـایی هێنـان بـە دەسـەڵاتی کاشـییەکان، یـان میتانییـەکان جیـاوازی لـەناو سەرچاوەکانا زۆرن کە دەبوو زیاتر وردبوایـە لـە دانانیانـا. لەسـەروو ئەوانەشـەوە دەبوایە دانەر هەنـدێك زانیـاری لەسـەر شارسـتانێتی ئـەو گەلانـە بدایـە بـۆ بـەهێز کردنی نامەکەی.

دانەر لە لاپەڕە (٧٨)ی نامەکەیدا دەڵێ: لە ڕاستیدا دەسەڵاتی بابـل لـە شـاخی (سەگرمە) لە قەرەداغ تێپەڕی نەکردووە. لـە وەڵامـدا دەڵـێم: قـەرەداغی بەڵگـەی چی بەدەستەوەیە کە فەرمانڕەوایەتی بابلی یەکەم وەکـو دەسـەڵات لـەو ناوچـەیە تێپەڕی نەکردووە، لە پەراوێزی لاپەڕەکەشدا بۆی گەڕام کە ژمـارە (٦)ی داوەتـێ سەرچاوەیەك بەو ژمارەی پەراوێزە نـەبوو. لـە سەرچـاوە مێژووییەکانیـشدا ئـەوە ئاشکرایە کە دەسەڵاتی بابلی نەگەیشتووەتە ناوچـەی شـاخاوی لـە کوردسـتاندا، بەڵگەش بۆ ئەمە گـەلانی زاگـرۆس وەکـو لۆلـۆ و کـوتی لـە ناوچـە شـاخاوییەکاندا خاوەنی دەسەڵاتی بەرفراوان بوون بەڵکو دەسەڵاتیان هـەتاکو پێدەشـتەکان بـڕی کردووە، نموونەی لەبەرچاویش بۆ ئەمە پاشماوە ئاسەوارییەکانە لە لەتـە گـۆزە و گلینەی (قەڵای سپی حەسار) و شوێنەواری قەڵای شێروانە کە زۆرن و بەربڵاون.

جارێکی تر لە هەمان لاپەڕەی ئاماژە پێکراودا و لـە پـەراوێزی (٧)ی دا دانـەری نامە باسی دۆزینەوەی پاشماوەی ئاسەواری سـەردەمی کاشـی دەکـات لـە گـردی شێروانەی کەلار، کە بەڵگەنامە بوون بەڵام لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ لەناوچوون، هەروەها دەڵێ: لەکاتی گەڕانماندا لەناوچەی ناوبراو لەتە گۆزەی (کاشی)مان دۆزییـەوە کـە دەوری قەڵاکەیان داوە. لەوەڵامدا دەڵێم: ساڵی ١٩٨٩ لەگەڵ چاککردنەوەی قەڵای شـێروانەدا، کـاری کنـە و پـشکنین لـە بەشـی باشـووری خۆرهـەڵاتی قەڵاکـەدا بـە سـەرۆکایەتیی ڕێـزداری شـوێنەوارناس موعتەسـەم ڕەشـید ئەنجامـدرا، هـەر لـەو ساڵەدا کە من فەرمانبەری بەڕێوەبەرێتی ئاوی سلێمانی بووم چەند جارێك دییـەنی (کـەلار)م کـرد و چـوومە سـەردانی قـەڵای شـێروانە بـۆ سـەیرکردنی کـاری کنـە و پـشکنینەکە، کـە بـەڕێز سـەردار ڕەشـید چـاودێری بـوو. ئـەوەی مـن دیـیم کـە قـەرەداغی نـاوی پاشمـاوەی (کاشـی) لێنـاوە، چـەند پاشماوەیـەکی ئاسـەواری ئاشـووری بـوو کـە پەیوەنـدی بـە کاشـییەوە نـەبوو. بـاوەڕیش ناکـەم قـەرەداغی شارەزایی لە سواڵەت ناسیندا هەبێت، چونکە لەگەڵ خۆمدا ماوەیەك کـاری کنـە و

پشکنینمان کرد ساڵی ١٩٩٩ لە گردی (یاسین تەپە)، پێوەی دیار نەبوو کە سواڵەت بناسی و بەپێی سەردەمەکان جیایان بکاتەوە، هەروەها لە دانانی ئاسەوارەکانی مۆزەخانەی سلێمانی ساڵی (٢٠٠٠)یش کە بەندە بەڕێوەبەری شوێنەواری سلێمانی بووم پەنای دەبردە بەر (کنوز المتحف العراقي) بۆ دانانی گۆزە و گلێنەکان، کە تێکەڵاوییەکی زۆر لە دانانیانا لەناو سەردەمەکانا هەر بوو، بەتایبەتی سەردەمەکانی پارثی و ساسانی.

جارێکی تر هەر لەو ساڵانەدا ناوبراو لەگەڵ هەندێك لە فەرمانبەرانی شوێنەواری سلێمانی دەڕوات بۆ سەیرکردنی پارچەیەك زەوی لە ناوچەی ئابڵاخ کە پاشماوەی لەتە گۆزە و گلێنەی تێدا دەبێت، وا دیارە زەوییەکە بەلایەوە شوێنەواری وێرانەیەکی کۆن بووبێت. لێرەدا قەرەداغی کە سەیری پاشماوە و گۆزە و گلێنەکان دەکات ڕاستەوخۆ سەرسوڕمانێك نیشان ئەدات، بەوانەی لەگەڵیایەتی و ئەڵێت: ئەم پارچانە زۆر کۆنن، بۆ چاخی قەڵا چەرموو دەگەڕێتەوە. بەر لەوەش من کاتێك بەڕێوەبەر بووم ڕۆشتمە سەردانی شوێنەکە، لەسەر داوای خاوەنەکەی، دوای سەیرکردنی پارچە سواڵەتەکانی بە شوێنەوار ناسەکانم گوت: ئەم پارچانە بۆ چاخی ئسلامی دوایی دەگەڕێتەوە و کۆن نین. ئەمانەی باسم کرد مشتێکن لە خەروارێك بۆی.

١٥- دانەر لە باسی هەزارەی یەکەمی پ. ز کە لاپەڕە (٩٩ – ١٦٥)ی نامەکەی پێ گرتووەتەوە، داینــاوە بۆ پادشـایانی ئاشـووری چـاخی نـوێ کە لە فەرمانڕەوایەتیی ئاشووردانی دووەم (٩٣٤ – ٩١٢)ەوە دەست پێدەکات هەتاکو دەگاتەوە بە فەرمانڕەوایەتیی ئاشوور پانیپاڵ (٦٦٨ – ٦٢٧ پ. ز) تێیدا باسی هێرش و پەلاماردانیان بۆ سەر هەرێمی کوردستان یان دوورتر لەو سنوورە دەکات. لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاو زلهێزەکانی وەکو میتانی و کاسی (کاشی) و (هیتی) لەم سەردەمەدا کۆتایی بە دەسەڵاتیان هاتووە. لێرە بەدواوە وەکو هێزێکی گەورە و دەسەڵاتدار مادەکان لە چاخی (حەوتەمی پ. ز) و بەدواوە توانییان لە ناوچەکەدا دەسەڵات پەیدا بکەن و وەکو زلهێزێك ئاشوور مامەڵەی لەگەڵیانا دەکرد، بۆیە هەردەم لەشکری بردووەتە سەریان بۆ دەست وەشاندن لێیان کە ئۆرارتییەکان و گەلانی تری ناوچەکەشی گرتووەتەوە کە لەناویانا

لۆلۆییەکان دێن. لەم فەسڵەدا دانەر هاتووە تەنیا باسی شەڕ و شۆڕەکانی دەکات کە دەبوو ئەوەی بزانیایە زۆر شتی تر هەبوو لەناو مێژووی سەردەمەکەدا لێیان بدوایە، کە بۆ مێژووی دێرینی کورد سوودی گەورەی دەبوو بۆیە لەدوای ئەم فەسڵەدا ناچارم ئەو شتانە بخەمە ڕوو کە دانەر پشتگوێی خستوون و لەسەریان نەدواوە.

١٦- دانەر لە پەراوێزی ژمارە (١)ی لاپەڕە (٩٩)ی نامەکەیدا دەڵێ: "دەقێك کە بۆ پادشا شالما نەسری سێیەم دەگەڕێتەوە، ئاماژە بە (کیروری) دەدات کە، کەوتووەتە بەرامبەری (ئاربائیلۆ) (هەولێر)، هەروەها لەسەری دەڕواو دەڵێ: نزیکترین شوێن کە ناوێکی نزیك بەوی هەڵگرتبێت شاخی (کیروری) ئێستایە کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی هەولێر، بەو پێیە ئەوە دەگەیەنێت وڵاتی (کیروری) لەناوچەی شاخاوی بەرامبەر هەولێر دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە هەتاکو دەگاتەوە بەزەوییەکانی پارێزگای سلێمانی. لەلایەکی تر، دانەر دێتە سەر ڕای (لیفاین) کە باوەڕی وایە: (کیروری) دەکەوێتە نێوان شاخەکانی (سەفین) و (ڕواندز) و (دیانا).

هەروەها جارێکی تر دانەر لە لاپەڕە (١٠٥)ی نامەکەیدا و لە پەراوێزی (٤)ی دا دەڵێ: ڕا و لێکۆڵینەوەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە دەشتی (حەریر) بەشێك بێت لە وڵاتی (کیروری).

بەلای منەوە ناوهێنانی وڵاتێك وەکو (کیروری) و دانانی سنووری جوغرافی بەو شێوەیە کە دانەر لە سەرچاوە جیاجیاکانی وەرگرتووە، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت لە ساخکردنەوەی شوێنە جوگرافییەکەیدا، هەروەها لەو ناوانەی تریشدا کە گواستنەوەی بۆیان کردووە لە سەرچاوەکانەوە کە بە وشەی لەوانەیە، یان پێدەچێت چووەتە ناو باسەکانیانەوە ئەمە وادەکات ساخکردنەوەکان لە تەمومژدا بمێننەوە، ئەو هەموو پەراوێزانەش کە لە نامەکەدا هاتوون و ڕووبەرێکی زۆریان گرتووە، ئەگەر تەواو دڵنیا نییە لە ساخکردنەوەی شوێنەکانیان باشتر وابوو لە شوێنی ئەوانە باسی لەو دیاردانەی تر بکردایە بۆ سوودی نامەکەی و مێژووە دێرینەکەی کورد وەکو شارستانیەت و فەرهەنگی دێرینیان لە ئایین و باوەڕ.

١٧- دانەر لە لاپەڕە (١٠٩)ی نامەکەیدا دەڵێ: ".. ئاشوور ناسرپاڵی دووەم دوای وێرانکردنی شاری (دمدموزا)ی پێشوو بەرەو شاری (تۆشخا) ڕۆشت.."... هەروەها ناوبراو لەسەری دەڕواو لە پەراوێزی (٤)ی هەمان لاپەڕەدا دەڵێ: لوا دیارە (دمدموزا) هەمان ناوی کۆنی قەڵای (دمدم)ی بەناوبانگ بێت، کە چیرۆکەکانی لەوێژەی کوردییا بە (چیرۆکی قەڵای دمدم) ناسراوە و ڕووداوەکانی لە سەردەمی عوسمانیدا بووە...

لە وەڵامدا دەڵێم: وادیارە دانەر زانیاری مێژوویی دەربارەی سەردەمی قەڵای (دمدم) کەمە، دەبوایە ئەوەی بزانیایە کە ڕووداوەکانی ئەم داستانە لە سەردەمی عوسمانیدا نەبووە بەڵکو بۆ سەردەمی (شا عەباسی سەفەوی) دەگەڕێتەوە کە توانیویە بە لەشکرێکی گەورە بچێتە سەر قەڵاتەکە و داگیری بکاو وێرانی کردووە، قەڵاکەش دەکەوێتە ناوچەی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ لە ناوچەی شنۆ لە ئازەربایجانی خۆرئاوای لە کوردستانی ئێران.

١٨- دانەر لە لاپەڕە (١١٢)ی نامەکەیدا دەڵێ: "... دوای چەند جار گەڕان لە دەربەندەکەدا (مەبەستی دەربەندی بازیانە) نەمتوانی پاشماوەی ئەو شوورایە بدۆزمە کە (نورئادەد) دروستی کردووە جگە لە پاشماوەی ئەو شوورایەی کە ئیبراهیم پاشای بابان لە سەدەی نۆزدەی زاینی دروستی کردووە، هەروەها لە سەری دەڕواو لە لاپەڕە (١١٣)دا جارێکی تر دەڵێ: "... لەگەڵ بینینی پاشماوەی بینایەك کە بۆ سەدەی (٥)ی زاینی سەردەمی ساسانی دەگەڕێتەوە، دەکەوێتە لای خۆرئاوای دەربەندەکە".

بۆ وەڵامی ئەم بڕگەیە دەڵێم: چۆن دەبێت لە دکتۆرا نامەیەکی وادا بەو شێوەیە هەڵە بکرێ و سەرپەرشت ئاگادار نەبێت لەوەی کە ئیبراهیم پاشا بەر لەو سەردەمە ژیاوە و خۆی شاری سلێمانی دروست کردووە لە ساڵی ١٧٨٤/ ١٧٨٥ی زاینی. وا دیارە قەرەداغی هەستی بەوە نەکردووە کە ئەو شوورایەی دەربەندی بازیان دروستکردنەکەی بۆ سەردەمی (ئەوڕەحمان) پاشای بابان (١٧٨٩ - ١٨١٣ز) دەگەڕێتەوە، واتە بەر لە کەوتنی دەسەڵاتی بابان لە سلێمانی بە ٣٨/٣٧ ساڵ. لێرەدا جارێکی تر ڕووی دەمم دەکەمەوە (دکتۆرە) و لێی دەپرسم: ئایا بە چ پێوەرێك تەمەنی پاشماوەی ئەو بینایەی دەربەندی بازیان دەبەیتەوە بۆ

سەردەمی ساسانی، ئایا بەپێی ئەو دراوانەی لە کاری کنە و پشکنیندا ساڵی ١٩٨٩ دۆزرانەوە کە بۆ چاخی ساسانی دەگەڕێنەوە، هەروەکو بەڕێز (شێخ موعتەسەم)ی چاودێری کاری ناوبراو بۆی باس کردم؟ بەر لەوەی بێمە سەر باسی دیاریکردنی تەمەنی بیناکە کە بۆ کام سەردەم دەگەڕێتەوە، دەرکەوت بەپێی نەخشەی بیناکە و دۆزراوەکانی کاری کنە و پشکنینەکە لەناویانا خاچ هەبوو، پاشماوەکە، هی (دێر)ێکی عیساییە.

دێرێکی عیسایی کۆنیش، نەخشەکەی تایبەتمەندی خۆی هەیە لە دروستکردنیا. لەلایەکی تریشەوە دراوی دۆزراوەی ساسانی ناتوانێت دەستنیشانی سەردەمی بیناکە بکات، چونکە دراوی ئەو سەردەمە هەتا ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانی (ئەمەوی) ماوەتەوە و مامەڵەی پێ کراوە، بۆیە نەمدیوە و نەمبیستووە لای شوێنەوار ناسانی وەکو (دکتۆر ئیسماعیل حجارە) و (بورهان شاکر) و گەلێکی تر بۆ دانانی سنووری تەمەنی پاشماوەیەکی شوێنەواری پەنایان بردبێتە بەر دراو. ساڵی ١٩٩٨ی زاینی کاتێك کاری کنە و پشکنینم لە قەڵای (شیلە)ی کۆیەدا ئەنجام دا، لە چینی سەرەوەیدا پەرستگایەکی زەردەشتی دەرکەوت کە بۆ چاخی ساسانی دوایی دەگەڕێتەوە بەپێی نەخشەکەی، سەرئەنجام هەندێك پاشماوەی ئاسەواری سەردەمەکە و لەتە دراوێکی سەردەمی (ئەمەوی)مان دۆزییەوە، ئایا دەتوانم بڵێم ئەم پەرستگایە بەپێی ئەو دراوە دروستکردنەکەی بۆ چاخی ئەمەوی دەگەڕێتەوە، وەڵام نەخێرە و لای بەڕێز (شێخ موعتەسەم)یش سەردەمی بیناکە بۆ چاخی ئەمەوی دەگەڕێتەوە کە خۆی کاری کنە و پشکنینی لە ساڵی ١٩٨٩ تێدا کردووە.

١٩– دانەر لە لاپەڕە (١١٦)ی نامەکەیدا دەڵێ: ".. پێشەوا نور ئاددی یاخی کاتێك لە شەڕی دەربەندی (بابیتا) (بازیان) ڕزگاری بوو، دوور کەوتەوە کە باوەڕ وایە شوێنەکەی ئەمین بووبێت و دەستی هێزەکانی ئاشووری نەگەیشتبێتێ، ئەم جارەیان لە شاخی (نیشبی) خۆی قایم دەکات کە نزیك شاخی (گامرو)وە، هەروەها ناوبراو جارێکی تر دەڵێ: "... شاخی ناوبراو باوەڕوایە هەورامان"ە، جارێکی تر دانەر دێتەوە سەر باسەکە و لە پەراوێزی (٢)ی هەمان لاپەڕەدا دەڵێ:

"... شاخی گامرو پێدەچێت ئەو ناوچەیە بێت دەوری گردی (کمریان)ی دابێت نزیك ڕۆخی چەپی ڕووباری زێی بچووك.

لەوەڵامدا دەڵێم: ئایە نەدەبوو بۆ دانانی شوێنی ئەو شاخانە ڕێکەوتنێك هەبێت لەناو شارەزایانی مێژووی کۆندا بۆ ئەوەی هێندە شوێن گۆڕکێیان پێ نەکرێن، چونکە دانەر جارێك (نیشبی) لە هەورامانـدا ئەنێت و جارێکی تریش نزیکی دەخاتەوە لە (شاخەکانی گامرو) کە دەوری گردی (کمریان)ی داوە لە ناوچەی ڕانیە، ئایە دانەر بۆی باشتر نەبوو بیزانیانە کە ئەو دوو شوێنە لە یەکترەوە دوورن بەپێی زانستی جوگرافیا و (مەنتیق)یش ئەو جۆرە بۆچوونانە دەداتە دواوە. مێژووش بە (پێدەچێت) نانووسرێتەوە ئەگەر بەڵگەی سەلمێنەر بەدەستەوە نەبێت.

٢٠- دانەر لە لاپەڕە (١٢٥)ی نامەکەیدا دەڵێ: "دەسەڵاتی (ئۆرارتۆ) درێژ بووەتەوە بۆ ناوچەکانی چیای قەندیلی ئێستا لە باکووری قەڵادزە کە دەشتی (دیانە)ش بەشێك بووە لە دەسەڵاتیان".

لە وەڵامدا دەڵێم: هیچ بەڵگەیەکی شوێنەواری، یان مێژوویی بەدەستەوە نییە کە ئەو بۆچوونە بچەسپێنێت لە گەیشتنی دەسەڵاتی ئۆرارتۆییەکان بۆ ئەو ناوچانە لە سەردەمی دەسەڵاتی شالمانەسری سێیەم (٨٥٨ — ٨٢٤ پ. ز)، هەتاکو دەگاتە سەرجۆنی دووەم (٧٢١ — ٧٠٥ پ. ز). میلە بەردینەکانی (کێلەشین) و (تۆبزاوە) کە نووسینی مێخییان لەسەرە و دەکەونە گۆشەی باکووری خۆرهەڵاتی هەرێمی شاخاوی لە کوردستانی باشوور کە لەسەر ڕێگای کاروان دانراون، ئەو ڕێگایانەش کە دەگەنەوە بە ناوچەی هەردوو گۆلاوی (ورمێ) و (وان) کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن ئازەربایجان، لەوێشەوە دەگەنەوە بە وڵاتی ئۆرارتۆ لە باکووری خۆرئاوای گۆلاوی وان، ئەوانە بەڵگەن کە دەسەڵاتی ئۆرارتۆییەکان هەتاکو ناوچەی ڕواندز هاتووە کە ناسراوە بە (موساسیر). ناوچەی (دیانە)ش لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ناوی نەهاتووە کە لەژێر دەسەڵاتی ئۆرارتۆییەکاندا بوو بێت جگە لە ناوی (باتاس) لە دەشتی حەریر کە لەسەر ڕێگای بازرگانی ئاشووری بووە بۆ گەیشتنیان بە ناوچەکە و هێنانی کەلوپەلی جیاجیا و بە نرخ کە پێویست بوون بۆ دروستکردنی کەلوپەلی سەربازی، هەروەها بۆ پیشەسازی

نــاوخۆش پێویــست بــوون وەکــو کەلوپــەلی ناومــاڵ. ئــەوەش وای کــردووە ئاشوورییەکان ئەو ڕێگا بازرگانییانە بپارێزن بۆ ئەوەی کاروانی بازرگانییـەکانیان بە سەلامەتی بگەن بۆ بەهێزکردنی ماکینەی سوپاکەیان.

٢١- دانــەر لاپــەڕە (١٥١ - ١٦٥)ی نامەکــەی دانــاوە بــۆ قــسەکردن لەســەر بنەماڵــەی ســەرجۆنی دووەم (٧٢١ - ٦١٢ پ. ز) کــە کۆتاییەکــەی بــە پادشــا (ئاشوور ئیتیلوئیلی) (٦٢٦ - ٦٢٤؟ پ. ز) هێناوە. لە سەردەمی ئەم بنەماڵەیەدا هەندێك ڕووداو و پەیمان بەستن لەناو زلهێزەکاندا دروست بوو، بـەڵام لـە نامەکـەدا ئاماژەیان پێ نەدراوە کە پێویست بوو بزانرێت چونکە بەشێکن لە مێـژووی مـاد و سەردەمەکە.

دوای کوشــتنی (فــراوەرتیس)ی پادشــای مــاد بەدەســتی ئاشــوورییەکان، (ئەســەرحەدون) پــەیمانێکی ئاشـتی لەگـەڵ (سـکێتی)یەکانـدا بەسـت بـۆ ئـەوەی بەکاریان بهێنێ دژی ماد، ئەوەبوو یەکێك لە پێشەواکانی سکایی بەناوی (پارتاتوا) کچە میرێکی ئاشووری مارە کرد تاوەکو سـکاییەکان بەلایـەنگری سـوپای ئاشـوور بمێننەوە و قورساییان هەبێت دژی مادەکان. بەم شێوەیە مادەکان بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سکاییەکان و باج و خەراجیان ئەدانێ، واتـە لـە (٦٣٥ - ٦٢٥ پ. ز) درێژەی کێشا چونکە هاوپەیمانی ئاشـوور بـوون. بـەڵام لـە دواییـدا (هووەخـشتەر) (کیاکـسار)ی پادشـای مـاد لـە پیلانێکـدا میوانـداری لـە کـوڕی (پارتـاتوا) و گـەورە پیـاوانی سـکایی کـە لەگـەڵیا بـوون کـردووە، دوای ئـەوەی سەرخۆشــی کــردوون، هــەموویانی کوشــتووە، بــەدوای ئەوەشــدا شــەڕی لەگــەڵ سکاییەکاندا کردووە کە لەژێر دەسەڵاتی گەورەکانی سوپای سکاییدا بوون، بـەڵام لەبەر ئەوەی بێ گەورە بـوون شکـستیان خـواردووە و لـە وڵاتـی مـاد کراونەتـەوە دەرەوە...

٢٢- دانەر لە لاپەڕە (١٦٥)ی نامەکەیدا دەڵێ: بەڵگـەی ئاسـەوارە دۆزراوەکـان لە ناوچەکانی هەرێمی کوردستاندا ئاماژەن بۆ بوونی میدی بەهێز لەو سەردەمەدا، ئەوەبوو سەرەنجامەکانی کاری کنە و پشکنین لە حەوزی دوکان بوونی چینەکانی میدی لەناو چینەکانی شوێنەوارەکانی حەوزەکەدا دەستنیشان کران.

لەوەڵامدا دەڵێم: لە پەنجاکاندا کاتێك شوێنەوارناسانی بەغدا ئەو شوێنەوارانەی دەکەونە ناو حەوزەکەی دوکان کە ژمارەیان خۆی ئەدا لە پەنجا شوێنەوارێك ڕووپێویان کرد. تیایانا بەڵگەی سەردەمی مادەکان دۆزرایەوە، بەڵام دوای ئەوەی دەست کرا بە کاری کنە و پشکنین لە (١٩٥٧) و بەدواوە کە شوێنەوارناسانی وەکو (عەبدولقادر تکریتی) و (بەهنام ناسر ئەبولسوف) و گەلێکی تر هاوبەشییان تێدا کرد ناوی سەردەمی (ماد)، لەپاشماوە دۆزراوەکانیانا و لەو گرد و تەپۆلکانەی وەکو (شمشارە) و (بازمۆسیان) و (گردە دیم) و (خوێرێس) و گەلێکی تر لەناو چینەکانیانە بەناوی مادەوە لە مێژووی ناوچەکە شاردرایەوە تێکەڵ بە سەردەمی ئاشووری کرا. من داوا لە دانەری نامە دەکەم یەکێك لەو گردانەم بۆ دەستنیشان بکات کە کاری کنە و پشکنینی تیادا کرابێت و بەناوی مادەوە پاشماوەی ئاسەواری دۆزرابێتەوە و لەسەریان نووسیبێت. ئەمەش ڕاستییەکە و ژمارەکانی گۆڤاری سۆمەری پەنجاکان ئەو شایەتییە ئەدەن.

جارێکی تر دانەری نامە لە هەمان لاپەڕەدا کە لە سەرەوە ئاماژەم پێدا، دەڵێ: لە شوێنێکی تر لە ناوچەی قلیاسان لە شاری سلێمانی ئاسەواری شوێنەوارێکی میدی دۆزرایەوە کە کارگەیەك بوو بۆ دروستکردنی ئامێر و قەڵغانی ئاڵتون و وەرشاو، کە بۆ دروستکردنی لەوحی کانزایی و ئامێری وەرشاو و زێڕ بەکار هێنراوە و لەو پارچانەش بوون کە بە ڕێکەوت دۆزرانەوە و زۆر جوان و دڵڕفێن بوون و کاریگەری بەهێزی هونەری ئاشوورییان بەسەرەوە بوو.

لەوەڵامدا دەڵێم : ئەو کەلوپەلانەی دانەری نامە ئاماژەی پێ کردوون لەکاتی بڕینی ڕێگای قلیاسان بەکرەجۆدا بەڕێکەوت دۆزراونەتەوە، شوێنەکەشی بەشێك بوو لەو بەرزاییەی کە دەڕوانی بەسەر زەوییەکی تەختدا کە بەڕێز شوێنەوار ناس موعتەسەم ڕەشید لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا کاری کنە و پشکنینی تێدا کرد. من لەو سەردەمەدا کە هێشتاکە فەرمانبەری شوێنەواری سلێمانی بووم بە پشکنەرەکەم گوت کە ئەم شوێنەوارە بەپێی بەڵگە دۆزراوەکان بۆ کام سەردەم دەگەڕێتەوە لە وەڵامدا گوتی: بەڕای من شوێنی سەربازگەیی ئاشوورییە و لە چینێکی نیشتەجێبوون دروست بووە.

لەو ڕۆژانەشدا واتا لە سنووری ١٠/ ٦/ ٢٠١١ بەدواوە ناوبراوم ئاگادار کردەوە کە ئەو شوێنەی کەلوپەلەکانی تێدا دۆزرایەوە، چ پەیوەندییەکی بە شوێنی کاری کنە و پشکنینەکەوە هەبووە، لەوەڵامدا ڕای وابوو کە هەردووکیان سەر بە شوێنێکن و لە کۆندا سەربازگە بووە و بەشێك لە دەشتی قلیاسانی گرتووەتەوە. بۆ ئەوەش لێم پرسییەوە کە ئایە ڕاستە دانەری نامە دەڵێ: ئەو کەلوپەلە دۆزراوانە بۆ سەردەمی ماد دەگەڕێنەوە؟ لە وەڵامدا گوتی نەخێر پاشماوەیەکن بۆ سەردەمی ئاشووری نوێ دەگەڕێنەوە، واتە (٩١١ – ٦١٢ پ. ن) بەمانا (میدی) نین کەلوپەلە دۆزراوەکانیش ساکار بوون و نەخش و نیگاریان لەسەر نەبوو.

٢٣– دانەر لە لاپەڕە (١٦٧)ی نامەکەیدا دەڵێ: "... سێ هاوپەیمانەکە، میدی و بابلی و سکایی چواردەوری (نەینەوا)یان گرت بۆماوەی (٣) مانگ لەساڵی ٦١٢ی پ. ز" لە وەڵامدا دەڵێم بە هەموو سەرچاوە مێژووییەکاندا گەڕام هەر ئەو دوو هاوپەیمانەم بینی واتە میدی و بابلی (کلدانی) کە توانییان شاری نەینەوا بگرن و کۆتایی بەدەسەڵاتی ئاشوورییەکان بهێنن. لە هیچ سەرچاوەیەکیشدا نەهاتووە هاوپەیمانەکان سییان بووبن تەنیا ئەوە نەبێت سوپای میدی بەهاوبەشی شەرکەرانی ئۆرارتی لەناویانا (مانایی) و سکاییش هەبوون. پێشبینییەکانی (حزقیال) و (ئارمیاش) شێوەیەکی ترە لەو بەڵایەی بەسەر شارەکەدا هاتووە لەکاتی داگیرکردنیا.

٢٤– دانەر لە باسی مادەکانا کە توخمی سەرەکین لە نامەکەیدا، لە باسی هەزارەی یەکەمی پ. ز دا تەنیا لەو لایەنەی مێژووە دواوە کە باسی لەشکرکێشی ئاشوورییەکان دەکات بۆ سەریان و شەڕکردن لەگەڵیانا. من لە بەڕێز قەرەداغی دەپرسم ئایا مێژووی مادەکان هەر ئەوەندەیە کە لە نامەکەدا هاتووە؟ یان کاتێك لەڕووی شارستانیەتدا ئەمانە کاریگەری شارستانێتی یۆنانی و دەوروبەریان بەسەرەوە بووە هیچ پاشماوەیەکیان لە بوارە جیاجیاکاندا بۆ جێ نەهێشتین کە دانەر باسیان بکات، من لێرەدا گەلێك شت دەخەمە بەرچاو کە گەوهەری فەرهەنگ و شارستانێتی مادەکان دەرئەخەن:

١– پەیدابوونی نووسین و قۆناغەکانی دروستبوونی لەوڵاتی ماددا.

٢– ڕەگوڕیشەی زمانی بنەماڵەکە و دروستبوونی.

٣- زمانی ماد.
٤- پۆشاکی ماد.
٥- باوەڕیان.
٦- ئاناهیتا لە باوەڕی مادەکانا.
٧- موغەکان و نەخشەیان لە کۆمەڵی ماددا.
٨- هونەری تەلارسازی لای ماد.
٩- تەلارسازیی کۆشکی (ئاکباتان) (هەمەدان).
١٠-پەیوەندیی نێوان (ماننا) و (ماد).

**سەرەنجام:**

لەبەر تیشکی هەموو ئەو زانیارییانەی خستمە ڕوو لەسەر نامەی ناوبراو گەیشتمە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- ناوەرۆکی نامەکە مێژووییکە بەجۆرێك نووسراوە ئەگەر ناونیشانەکەی خۆی لێ بکەیتەوە، هەر ناونیشانێکی تری بۆ دابنرێت بەپێی سەردەمەکانی دەگونجێت بیکەیتە مێژووی کۆن بۆ ئەکەدی و بابلی و ئاشووری چونکە ئەو تایبەتمەندییەی تێدا نییە.

٢- بەکارهێنانی وشەی (سۆبارتۆ) ناتوانرێت لە شوێنی وشەی کوردستان دابنرێت لەبەر ئەوەی ناوچەیەکی گچکە لە کوردستان دەگرێتەوە، وشەی کوردستانیش کۆنترە و وەکو سنووره جوگرافیەکەی بەرفراوانە کە خاکی گەلی کوردە.

٣- نووسین لەسەر مێژووی کۆنی کورد بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی باڵا پێویستی بە سەرپەرشتیاری وریا هەیە کە پسپۆڕ بێت لە بوارەکەدا نەوەك پسپۆڕی مێژووی ئیسلامی سەرپەرشتی مێژووی دێرین بکات وەکو لە کەسی یەکەمی ئەم نامەیەدا دەرئەکەوێت.

٤– لێژنەی وتووێژ لەسەر ئەم جۆرە نامانە ئەگەر لە بەغداوە بێن مێژوویـەکیان دەوێت کە بۆنی ڕازیبوونی ئەوانەی بەسـەرەوە بێـت، نـەوەك ئـەو مێـژووە بێت ڕاستی ڕووداوەکان و ڕەسەنایەتی مێژووی کوردی تێدا ڕەچاو کرابێت.

٥– بۆ خزمەتی مێـژووە دێرینەکـەمان و بایەخـدان بـە زمانـە کۆنـەکان قوتـابی کورد بۆ خوێنـدنی بـاڵا ئەگـەر بـەرەو وڵاتـانی هەنـدەران بـڕوات دەتوانێـت شوێن پەنجەی لەو خزمەتە گەورەیەدا دیاربێت بۆ دەرخستنی نهێنییەکانی مێژووی دێرینی نەتەوەکەی لەناو زمانە کۆنەکانـدا کـە پەپکـە قوڕینـەکانی پێ نووسراوەتەوە.

٦– وەزیری خوێندنی باڵا لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەرپرسە بەرامبـەر ئەو نامە لاوازانە کە بڕوانامەی بەرزییان لەو بوارەدا لەسـەر وەرگـیراوە کـە تایبەتمەندیی مێژووی دێرینی کوردییان پێوە نییە یان لەناویانا زلهێزەکانی ئـەو ڕۆژگـارە دێرینـە گـەورە کـراون وەکـو ئەکـەدی و بـابلی و ئاشـووری، مێژووی کوردیش کراوەتە پاشکۆ.

لە کۆتاییدا دەمتوانی زیاتر لەسەر نامەکە بنووسـم بـەڵام بەوەنـدە دەسـتم لێ هەڵگرت.

**سەرچاوەکان:**

١- بررسی ونقد منابع ایران عهد باستان/ مخطوطه لا ٣/ ٤/ ٥/ ٣٠/ ٣١/ ٥٦، ٥٨، ٦٠، ٦١.

٢- دیاکۆنۆف /میدیا/ برهان قانع لە فارسیەوە گۆڕیویەتی/ بەغدا/ دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی/ چاپی یەکەم ١٩٧٨ لا ٩٧، ٩٨.

٣- رشید یاسمی /کردو پیوستکی نژادی و تاریخی/ چاپ دوم ١٣٦٣ ص ٢٥.

٤- علی اکبر سرفراز/ بهمن فیروز مندی/ مجموعه دروس باستان شناسی وهنر دوران تاریخی چاپ اول/ ١٣٧٣/ ص ١٢، ١٣.

٥- رومن گیرشمن، ایران آز آغازتا اسلام، ترجمة محمد معین" چاپ هشتم/ ١٣٧٠/ ص ١١٩.

٦- دکتر رقیة بهزادي/ آریاهاونا آریاها در چشم اندازکهن تاریخ ایران/ چاپ دوم ١٣٨٣/ ص ٢٣، ٢٤.

٧- طه باقر/ مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة/ الجزء الاول/ الطبعة الثانية ١٩٨٦ ص ٢٥٤.

٨- ج/ آر/ درايفر/ الكرد في المصادر القديمة/ ترجمة فؤاد حمه خورشيد/ بغداد/ ١٩٨٦/ ص ٢٢، ٢٤، ٢٦، ٢٧.

٩- الدكتور سامي سعيد احمد/ رضا جواد الهاشمي/ تاريخ الشرق الادنى القديم (ايران والاناضول) ص ٧٧.

١٠- یورگین لیسۆ خشتەکانی شمشارە/ ڕاپۆرتێکی سەرەتایی/ عەزیز گەردی لە ئینگلیزییەوە گۆڕیویەتی لا ٢٦ - ٢٧.

١١- سبتينو موسكاتي/ الحضارات الاسلامية القديمة/ ترجمة د. يعقوب بكر/ مراجعة الدكتور محمد القصاص/ ص ١٠٦.

١٢- گۆڤاری پەیڤین ژ (٢٢) تەمووزی ٢٠٠٨ لا ٢٣١ - ٢٣٣.

# ئەم کتێبەم خوێندەوە
# مێژووی ناودارانی کورد

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

کە بەهاری ساڵی ٢٠١٠ بانگهێشت کرام بۆ بەشداریکردنی (کۆڕی نێودەوڵەتی ئەدەبیاتی کوردی) لە شاری سنە، لە تەك چەند زانا و مامۆستا و رۆشنبیری ئەو شارە و کوردستانی ئەودیوا ناسراویم پەیدا کرد و، لە تەك چەند کەسایەتیی ناسراو و ناوداری ئەو دەڤەرەدا زیاتر لە جارێك چاوپێکەوتن و گفتوگۆم بوو.

یەکێك لەو کەسایەتییانە، برای خۆشەویستم مامۆستا ماجیدی رۆحانی بوو، کە هەر ئەویش بوو لەکاتی پێشکەشکردنی بابەتەکەم لە کۆڕەکەدا سەرپەرشتی دانیشتنەکەی دەکرد.

لە دانیشتنێکی تایبەتدا مامۆستا ماجید موژدەی ئەوەی پێدام کە سەرگەرمی وەرگێڕانی کتێبە بەنرخەکەی خوالێخۆشبووی باوکی (مشاهید الکرد)ە بۆ زمانی کوردی، کارەکەیم زۆر بە لاوە پەسەند بوو، زۆرتریش هانم دا بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەو کارە پیرۆزە. بەڵام لە هەمان کاتدا پێموت: کارەکەی باوکت نزیکی نیو سەدەی بەسەردا رۆیشتووە و، لەو کاتەوە تائێستە کاروانی رۆشنبیری کوردی و مێژووی ئەدەب و زانیاری کورد تەکانێکی باشی داوە و، گەلێ شت گۆڕاوە و، زۆر شتی نایاب دۆزراوەتەوە و، ناوی فرە زانای ناو ونبوو ئاشکرا بوون و، رازاندنەوەی کتێبەکە بەم زانیارییە تازانە ئەوەندەی دی پرۆژەکە دەوڵەمەندتر و بە پێزتر دەکات و ئاماژەم بەوەیش کرد: من لە مێژووی زانایانی کورددا دەیان ناوی تازەم خستووەتە سەر خەرمانی مێژووی زانایان و، سواڵەگەلێکی باشیش زانیاری نوێم بۆ شاراکانی ئەو خەرمانە کۆ کردووەتەوە، ئەوانە یارمەتیدەرێکی باش دەبن بۆ دەوڵەمەندکردنی کارەکە.

کـاتێکیش مامۆسـتا ماجیـد وەرگێـڕاوی کتێبەکـەی پێـشکەشی ئـەکادیمیای کوردی کرد و خرایە بەرباس، من هەمان ڕا و بۆچوونی خۆم دووبـارە کـردەوە کـە لە دانیـشتنی ڕۆژی ١٠/١٠/٢٠١٠دا قـسە و بـاس لەسـەر ئـەم کتێبـە کـرا گـەلێ ڕا و بۆچوونی جیاجیا هەبوون. من لەوێدا وتم: "کتێبێکـی باشـە، بـەڵام فارسـییەکەی نزیکەی ٤٠ ساڵ پێش ئێستا نووسـراوە. ئێـستا پێویـستی بـە بابـەتی تـر هەیـە، ئەگەر داوا لە وەرگێڕ بکرێت شتی تازەی بخاتە سەر باشتر دەبێت. چاپکردنیـشی لە لوبنان هەرزانترە وەك لە ئێران".

بەڵام دیارە گوێ بـۆ ڕاکـەی مـن نـەگیرا و کتێبەکـە چـاپ کـراو بـەم شـێوەی ئێستەی کوتە کتێبخانەی کوردییەوە.

**ئەم کتێبە:**

من دەمێکە ئاواتی ئەوە لە مێشك و دەروونمـدا گینگـڵ دەخـوا ئێمـەش وەك گەلانی دراوسێمان و گەلانی دیی جیهان کتێبێکـی گـشتگیری لـە شـێوەی (معجـم المؤلفین)ی عەرەبیمان هەبێت، بە عـەرەبی بـێ یـان بـە کـوردی، نـاو و بەرهـەمی زانایانی کوردی سەرانسەری کوردستان بگرێتە خۆی. لـە چـەند نووسـین و کـۆڕ و کۆبوونەوەدا ـ ئەوەنـدی پـێم کرابێـت ـ هـەوڵی هێنانـەدی ئـەم ئاواتـەم داوە. کـە بوویشم بە ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردستان لەپێش هەموو داوا و پێشنیارێکمەوە داوای ئەم پرۆژە و (فەرهەنگی نازناوی شاعیرانی کورد)م کردو، بەڵام هەر ئاواتە و منیش هەر چاوەڕوانم.

ئەم کتێبەی مامۆستای ڕۆحانیم بە بنەمایەکی باش بۆ ئـەو پـرۆژە زانیـوە و، مامۆستای ڕۆحانی ـ خوا لێی خۆش بێت و پاداشتی بەخێری بداتەوە ـ بە ڕەنـج و ماندووبوون و شـەونخوونییەکی زۆر و پـشوویەکی قووڵـەوە کارەکـەی بـەجۆرێکی زانستییانە و بابەتییانە ئەنجامداوە بەجۆرێك گەلێ جار ئاواتی ئـەوەم خواسـتووە: خۆزگـە بووژاندنـەوەی مێـژووی زانایـانی کوردەکـەی منـیش بەشـێوەیەکی وەهـا ئەنجام بدرایەت. هۆی ئەوەی کە من ئەوەم نەکردووە، یان بـۆم نـەکراوە، بـاس و خواستێکە ئێرە جێگەی نییە.

جا وەك لە سەرەتاوە ئاماژەم بۆ کرد، دەکرا ـ لەمەولایش دەکرێ ـ ئەم کتێبە بە رەنج و ئەرکێکی زیاتر دەوڵەمەندتر بکرێت و زانیارییە نوێکانی بخرێتە سەر و، ناوە نەنووسراوەکانی لە شوێنی خۆیاندا بەپێی ئەو رێبازەی مامۆستای رۆحانیی داینـاوە، دابنـرێن و ئەو کتێبەیان لێ پێك بێت کە ببێتە سەرچاوەی بابەتی خۆی و ئەو کەلێنە گەورەی کتێبخانەی کوردیش پڕ بکاتەوە.

بۆیە مـن ئـەم کتێبـەم وا دەویـست و ویـستەکەیش موسـتەحیل و کـاری نەکردەنی نییە. جگە لەوەیش بە ڕەچاونەکردنی ئەو خاڵە ئەم کتێبە کەلێنی گەورە و ناتەواویی زەقی تێدایە و، رێك نموونەی دانراوێکی پـێش نیـو سـەدەیە و، رەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی ناو گۆڕەپانی ئەدەب و مێژووی ئەدەبی کوردی و زانایانی کوردی پێوە دیار نییە و، خوێنـەرێکی ئـەمڕۆ کـە بـۆ زانیـاریی لەسـەر یەکێك لەو ناودار و زانایانەی پێشوو دەگەڕێت مەبەستی تەواوی خـۆی بـە دەست ناهێنێت و زانیارییەکانی کرچ و کاڵ دەبن.

نموونە بۆ ئەمە لە کتێبەکەدا لەوە زیاترە من بتوانم لە وتارێکی وادا بەسـەری بگرمەوە و بە خوێنەر بڵێم: ناتەواوییەکان لەوێ و لەوێی ئەم کتێبەدان. بەڵام هـەر بۆ ئەوەی بە قسەی رووت و بێ نموونـە هێنانـەوە دەسـت لـە باسـەکە هەڵنـەگرم چەند نموونەیەك دەخەمە روو:

- لـەبارەی حەیدەرییەکانـەوە مامۆسـتای رۆحـانی چـەردەیەکی نووسـیوە و پشتی بە چەند سەرچاوە بەستووە، بـەڵام دوای ئـەوە گـەلێ لـەزانایانی ئـەو بنەماڵە بەشی باشیان لـە لێکۆڵینـەوەی زانـستی و نووسـین لەسـەر مێـژووی کەسایەتییەکانیان و بنەماڵەکەیاندا هەبووە وەك:

ـ زوبێر بیلال ئیسماعیل بەشێکی باشی لە کتێبی (علماء ومدارس في اربيل) بۆ زانایانی بنەماڵەی حەیدەریی تەرخان کردووە.

ـ منـیش لـە بـەرگی شەشـەمی (بووژاندنـەوەی مێـژووی زانایـانی کـورد..) بەشێکی باشم بۆ مێژووی زانایانی ئەم بنەماڵە و دانراوەکانیان بڕداوە.

* * *

- وەك وتم بەسەرنەکردنەوەی ئـەو زانیارییانـەی دوای چـاپی فارسـی (مـشاهير کـرد) هاتوونەتـە کایـەوە رەنگێکـی ناتـەواوی و مـەودا کـورتی بـە کتێبەکـە

دەبەخشێت و چاپی ئێستەی وەك سەرچاوەیەکی مێـژووی زانـا و نـاودارانی کورد دەوڵەمەنـدی بـە خوێنـەر و لێکۆڵـەران نابەخـشێت و، ئـەو لێکۆڵـەرەی تـەنها پـشت بـەم سەرچـاوە ببەسـتێت رەنجەکـەی بـە فـیڕۆ و بەرهەمەکـەی نابەکام دەردەچێت.

بۆ نموونە با ژیانی کاك ئەحمەدی شێخ لێرەدا بخەینە بەرچاو:

ئەم مامۆستا لە بەشە فارسییەکەدا ـ هەروەها لە وەرگێڕانەکەیـشدا ـ شـتێکی کەم لەسەر ژیانی و لەوەیش کەمتر لەسەر بەرهەم و دانراوەکـانی نووسـراوە. لـەم رووەوە نووسراوە:

"لە کاك ئەحمەدی شێخ چەند کتێب سەبارەت بە تەفسیر و حـەدیث و فیقـه بەجێ ماوە، بەڵام زۆربەی نامیلکەکانی ئەپەرژێتە سەر داب و دەسـتووری ئـایینی و دۆعا و مۆچیاری. بۆ وێنە چەند بەرهـەمی فارسـی هەیـە بریتییـە لـە ١٢ بـەش، باسی هاندان بۆ چاکە و بـەرگری لـە خراپـە و ئیـشی موسـڵمانەتی، کـە کـوڕەزای ناوداری شێخ مەحموودی نەمر کۆی کردنەوە و ساڵی ١٣٥٥ك، م. لـە سـێ بەرگـدا لە نەجەف لە چاپی دان". ل: ٤٨١. کوردی.

دەکرێ لێرەدا بوەستین و بڵێین: کەسێك لە سلێمانییەوە دوور بێـت و ئاگـای لە ڕێز و پلەی کۆمەڵایـەتی کـاك ئەحمـەد لـەناو شـاری سـلێمانیدا نـەبێت و، ئـەو سەرچاوانەیشی نەدیبێت کە دوای لەچاپدانی ئەم کتێبە کەوتوونەتە بەردەسـت و، بیەوێت یان داوای لێ بکرێت ـ شـتێ لەسـەر بەرهـەمی کـاك ئەحمـەد بنووسـێت و، بێت پشت بەم سەرچاوە ببەستێت، دەبێ بەری رەنجەکەی چۆن بێت؟ بێ گومان بەرهەمەکەی بەپێی بارودۆخی ئەمڕۆی رۆشنبیری کوردی و زانیـاری زۆر و مـشە و تازە کە لە سەر کـاك ئەحمـەد نووسـراون کـورت دێنـێ و لەوانەیـە کەسـانێك لێـی رابپەڕن و بڵێن: براله ! تۆ لە گوێی گادا نووستوویت، خۆ کاك ئەحمەد ئەوانەی تۆ بە (چەند بەرهەمی فارسی) ناویان دەبەیت زیاتر لە (٩٩) مەکتووبن. بە فارسی لە ئێران لە دوو بـەرگی گـەورەدا بـە کۆشـشی خەلیفـە شـوکروڵڵای دوهـاروت سـاڵی ١٣٨٣ چاپ کراوە. ئەم کارەی خەلیفە شوکروڵڵا (٩٢) دانـەی لـە مەکتووباتـەکان لە نزیکەی ١٠٧٠ لاپەڕەدا گرتووەتەوە. پێش ئەمیش مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس زیاد لە (٥٠) مەکتووبی لەو مەکتووباتانە کـردووە بـە کـوردی و لـە (٥)

بەرگدا بـە چـاپی گەیانـدووە. دوای ئەمـەیش بـە کۆشـش و پێـشەکی مـەحموود حەفید زادە لە دەزگای ئـاراس بـە پیتێکـی ورد لـە دوو بەرگـدا کـە تێکـڕا (٨١٤) لاپەڕەن دوو جار چاپ کراوەتەوە.

جگە لەمانیش لەسەر (معفوات) و (سلم الوصول) و کتێبەکانی دی کـار کـراوە و بڕوانامەی ماجستێریان لەسەر وەرگیراوە و، لەسەر ژیانی بە درێژی نووسراوە.

دیارە ئەم هەموو زانیارییە لە تەك ئەوەدا کە لە وەرگێڕانەکەی مەشاهیرەکەی مامۆستای رۆحانیـدان زۆر لـە یـەك جیـاوازن و هـەر خودایـان یەکـە و، وەك گـوتم نووسەرێك لەسەر ژیانی کاك ئەحمەد بنووسێت و ئاگـای لەمانـە نـەبێت کارەکـەی زۆر کورت دێنێت.

* * *

ئـەو ناتەواوییانـەی بـە هـۆی بەسـەر نەکردنـەوەی زانیارییـە نوێیـەکان و نەگونجاندنیان لە وەرگێڕانەکەدا گەلێ لەوە زیاترن من بتوانم لێرەدا ناویشیان بێنم چ جای ئەوەی بەسەریان بگرمەوە و جێگەیان بکەمەوە.

هەر بۆ نموونە ئاماژە بۆ ناوگەلی وەك:

مامۆستا مەلا محەممەدی ئیبنولحاج و، مامۆستا مەلا عەبدوللای بێتووشـی، و شـێخ مـەعرووفی نـودێیی، و ئیبنوئـادەم، و پـێش ئـەمانیش (یوسـف الاصـم) و مامۆستا مەلا ئەبو بەکری موصەنیف و مـوفتی زەهـاوی و، مـەلا خـدری رواری و، شێخ تاهای سنەیی و، مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان و، نالی و سالم و کوردی و مـەحوی و خـانی و جزیـری و، باتـەیی و... دەیـانی دیکـە، کـە گـەلێکیان ژیـان و بەرهەم و تواناکانیـان بـاش شـی کراونەتـەوە و کتێبێـك ئـەمڕۆ دەربـچێت و نـاوی ئەوانەی تێدابێت و ئەم زانیارییە نوێیانـەی تێدا نـەبێت، جێگـەی پرسـیار و بـاس دەبێت.

جگە لەمانەیش دەکرا ناوی دەیان زانای دیکەی کورد لە شـاعیر و رۆشـنبیر و خاوەن بەهرە و بەرهەمی زۆر کە دوای دانانی ئەو کتێبە - لە مامۆستا دێرینەکان - ناویان و بەرهەمیان دۆزراوەتـەوە و شـتیان لەسـەر نووسـراوە و زانیارییـەکان لـە بارەیانەوە لە دەسـتدان و، لـە سەرچـاوە نوێکانـدا بـە ئاسـانی دەسـتدەکەون...

بکرێن بە گوڵی گوڵدەستە و لە بەرۆکی ئەم وەرگێڕانە بدرێن و هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیدا و بەپێی چەرخ و سەدە و ناوی ئەبجەدی جێگای خۆی بدرێتێ.

جۆرێکی دیش لەو کەموکوورییانەی لە وەرگێڕانی (مشاهیر کرد)دا دروست بووە، لە بیرکردنی یان لەبیرچوونی ناو و تەرجەمەی سەر لەبەری کەسانێکە کە لە دەقە فارسییەکەدا هەن و لە کوردییەکەدا دیار نین و. یەکێك لەوانە شاعیری ناوداری کورد مەلا عومەری رەنجوورییە کە لە چاپە فارسییەکەدا ـ بە هەڵە ـ (ملا سید محمد رنجوری بن سید یوسف) نووسراوە. ئەم ناوە لە بەشە کوردییەکەدا جێگەی لە دوای شێخ محەمەد تاهای مەردۆخی و لەپێش مەهجووری کوردستانییەوە دەبێ. بەڵام لەو شوێنەدا نییە و چەندیشی بۆ گەڕام لە شوێنی دیکەدا نە بە ناوی مەلا عومەر و، نە بەناوی سەید محەمەدەوە نەمدۆزییەوە.

دیارە جگە لەوەیش کە ناوەکەی هەڵەیە و دەبێ چاك بکرێت، ئەگەر بە دروستی لەسەری بنووسرێت، دەبێ ژیانێکی نوێی پڕ لە زانستیی نوێی بۆ بنووسرێت کە لە کاتی خۆی ئەوانە نەزانراون. لە لایەکەوە دیوانی شیعری چاپکراوە و بەشێك لە ژیانی و بنەچە و شوێن و کاری و، لەلایەکی دییەوە بەشێك لە توانای زانستیی ئەو لایەنانەی دەستی تیایاندا بووە و کاری بۆ کردوون، ئاشکرا بوون و دەکرێ ـ ئێستە ـ ژیانی بە شێوەیەکی دروستتر بنووسرێتەوە.

**گلەیی:**

من گلەیی سەرەکیم لە مامۆستا ماجید ئەوەیە کە بەسەر کارەکەی مەرحوومی باوکیدا نەچووەتەوە و، لەبەر رۆشنایی ئەو زانیارییە نوێیانەدا کە دوای چاپبوونی یەکەمی کتێبەکە سەریان هەڵداوە کارەکەی باوکی دەوڵەمەندتر نەکردووە. کەچی مامۆستا ماجید کاتی وا هەیە خۆی پێ نەگیراوە و ئەو کارەی ئەنجامداوە، من بۆ ئەوە دەستخۆشی لێ دەکەم و خۆزگە بۆ هەموو کتێبەکە ئەوەی بکردایە، بەڵام جێگەی گلەیی ئەوەیە کە ـ دوور و نزیك ـ ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە و بە پەراوێزێکیش چییە ئەوەی نەدرکاندووە.

بە نموونەیەك ئەم لایەنە روون دەکەمەوە:

مامۆستای دانەر (شیوا) كە باسی شێخ ڕەزای تاڵەبانی نووسیوە و، لە باسەكەی بووەتەوە (دیوان شیخ رضا، چاپ بغداد ١٣٤٦هـ ق، میژوی ئەدەبی كوردی از ص ٣٤١ـ ٣٦٢) بۆ سەرچاوەی باسەكە دیاری كردووە. بەڵام وەرگێڕ ـ مامۆستا ماجید ـ چەند سەرچاوەی دی وەپاڵ خستووە و بەم شێوەی لێكردووە:

"دیوانی شێخ ڕەزا، چاپی بەغدا، ١٩٤٦ز، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، د. موكەڕڕەم موكوریانی!) چاپی ئاراس ٢٠٠١. دیوانی شێخ ڕەزا، شوكور مستەفا، چاپی ئاراس ٢٠٠١، دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی كۆكردنەوە و ساغكردنەوەی شێخ موحەممەدی خاڵ و ئومێد ئاشنا، ئاراس، ٢٠٠٣، مێژووی ئەدەبی كوردی، ل ٣٤١ تا ٣٦٢".

ئەوەی زیاتر جێگەی گلەییە مامۆستا ماجید بەمەوە نەوەستاوە و دەستی خستووەتە كارەكەی باوكی و كەم و زیادی تێدا كردووە و خۆشی لە باسكردنی بواردووە، بەم شێوەیە:

**كەمكردن و لابردن:**

مامۆستای دانەر بۆ دەرخستنی باری توانایی جۆراوجۆری شێخ ڕەزا چەند پارچە شیعری فارسی شێخ ڕەزای هێناوە، بەڵام مامۆستا ماجید ئەو پارچە شیعرانەی دەراویشتووە، وەك:

مامۆستای دانەر لەسەر پارچەیەك شیعر نووسیویە:

"از اشعار فارسی شیخ رضا، ترجیع بندی است در ستایش پیامبر اكرم ـ علیه السلام ـ كه این چند بند از آن است:

**ای جهان آخرین ثناگویت**

**وی دو عالم معطر از بویت**" ل: ١٠٦ چاپی فارسی، بەرگی دووەم تا كۆتایی بەندی یەكەم.

بەڵام مامۆستا ماجید هاتووە نووسیویە:

"بەندێكی پارچە هەڵبەستێك لە پەسنی پێغەمبەردا (د)" دوای ئەوە بەندی یەكەم دەنووسێت بەندی دووهەم كە ئەمە سەرەتاكەیەتی و:

**ای منادی به کاف ها، یا، عین**

**وی منادی: انا النبی بحنین"**

و بەندی سێیەم کە بە:

**ای همه کائنات خار و توگل**

**وی همه ممکنات جزء توکل"**

دەست پێدەکات کە هەردوو بەندەکە (٢٤) بەیتن ـ ی بێ ئاماژە بۆ کردن ـ قرتاندووە.

دوای پارچەیەکی دی مامۆستای دانەر نووسیویە:

"از اشعار فکاهی شیخ رضا، دربارهء کشتی گرفتنش با عموی خود ستار نام:"

**ستار آنکه هست به نیر و تهمتنا**

**ایزد نیافریده چو او اهریمنا"** ل: ١٠٨.

ئەم پارچەیش کە مامۆستا ماجید وەك ئەوانی پێشوو بواردوویەتی (١٤) بەیتە.

هەر دوای ئەم پارچە کە لە وەرگێڕانەکەدا نەنووسراوە، مامۆستای دانەر نووسیویە:

"در شکوه از روزگار و گردش گردون به طریق هزل:

**از دست تطاول زمانه**

**کس نیست نخورده تازیانه"** ل: ١٠٨ و ١٠٩.

بەڵام مامۆستا ماجید ئەم پارچەیش ـ ی کە ٢٥ بەیتە ـ وەك ئەوانەی پێشوو بواردووە.

* * *

**پاش و پێش و زیادکردن:**

مامۆستای دانەر دوای شیعرە فارسییەکان نووسیویە:

**دو بیت عربی از شیخ رضا:**

**لا ابالی وان امرت بقتلی"** ل: ١٠٩.

بەڵام مامۆستا ماجید ئەم دوو بەیتەی هێناوەتە سەرەتا و پێش بەیتە فارسی و کوردییەکان.

دوای ئەمە مامۆستا ماجید نووسیویە:

چەند شیعری فارسی شێخ رەزا

یەکەم بەیتێك بە جیناسی تاممەوە لە دوو وشەدا:

**شکافی که بینی در ایوان کسرا**

"**هانیست گوید بقانیست کس را**" ل: ٥٦٢ بەرگی دووەم. ئەمە لە چاپە فارسییەکەدا نییە.

لە کۆتایی لاپەڕەی دوای ئەمەدا نووسیویە:

"بۆ ئەتکی حاجی ئەولغەنی ناوێکی چکووسی تارانی داناوە کە گوایە ویستوویە بەخێری خۆی، دەساوێك سازکا:

**حاجی عبدالغنی خلایی ساخت**

**تا بگویند ذکر لو از پس!**

**بهر تأریخ آن (رضا) گفتا**

**توشەی آخرت همینش بس**"

ئەمەش لە چاپە فارسییەکەدا نییە.

لە دوای ئەمانەیشەوە دوو ـ دوو بەیتی و سێ بەیتی کوردی نووسیوە کە لە چاپە فارسییەکەدا نین، ئەوانیش بەم جۆرەن:

دوو بەیتییەك بە سەنعەتی ئیهامەوە:

**تۆ کە خۆت مەیلی جنێوبازی دەکەی شێخ ساڵەح**

**بۆ دەکەی سەرزەنشی من کە (رەزا) هەججاوە**

**غایەتی بەندە جنێوم بە دوو ـ سێ کەس دابێ**

**تۆ هەتا ئێستە بە قوربان بە هەزارت داوە!**

* * *

هێندێك بێ پەردەتر:

**شێخ رەزا پیر بووە رووی مەجلیسی یارانی نییە**

**تاقەتی کەشمەکەش و گەردشی شارانی نییە**

**دەس بە گۆچان دەگەڕێ ئێستە لەبەر زەعفی وجوود**
**مەترەقە سەرزلەکەی قووەتی جارانی نییە**
* * *

دیسان هەڵدراوەتر:

**هەر واقەواقی دڵمە بە دەستی فیراقەوە**
**وەك ڕێوییێ کە هەر دوو گونی بێ بە فاقەوە**
**ئیمان لە تەوقی سەرمەوە وەك واشە دەرپەڕی**
**سمتی کە دەرپەڕاند و سەری نا بە تاقەوە**
**موتریب لە عەشقی یاری عیراقی بە حەسرەتم**
**بۆم هەستە وردە . وردە لە پەردەی عیراقەوە**
* * *

هەر لەم بابەتەی شێخ رەزادا مامۆستا ماجید دوو پەراوێزی بۆ باسەکە دروست کردوون کە بابی رەحمەتی ئاگای لێیان نییە.

ئەمەیش کە رابورد یەکەم جار و یەکەم شت نییە مامۆستا ماجید بێ ئەوەی ئیشارە بۆ کارەکە بکات شتی وا بکات، لە کۆتایی باسی (نالی)شدا کە مەرحوومی بابی نووسیویەتی:

"دیوانی نالی، چاپ عراق، س ١٣٥٠، میژوی ئەدەبی کوردی، ص٢١٤" ل: ٤٠٥ چاپی فارسی.

کاك ماجید کردوویە بە:

"دیوانی نالی، چاپی بەغدا، ١٩٧٦ز، مێژووی ئەدەبی کوردی، ل: ٢١٤" چاپی کوردی ل: ٣٩٥.

مامۆستا ماجید تەنها لە ژیانی شێخ رەزادا گۆڕانکاریی نەکردووە، بەڵکو جێگاگەلی دیش هەن کەم و زیادیان تێدا کرد، ئیتر نازانم لەبیرچوونە یان هەر مامۆستا ماجید خۆی وای بە باش زانیوە. بە هەر حاڵ لەگەڵ گۆڕانکارییەکەدا ئاماژەی بۆ نەکردووە، وەك نموونەیەکی دی لە ژیانی مەولانا خالیدا سێ پارچە شیعری فارسی بوێراون بەم شێوەیە:

١- **بە معمار غمت نو ساختم ویرانە، خودرا**

**بە یادت کعبە کردم عاقبت بتخانەء خودرا** ل: ٣١٠ فارسی

ئەم پارچە شەش بەیتە.

٢- **هرگز تەرحمی بە من مبتلات نیست**

**معلوم شد مرا کە تو بیم خدات نیست**

ئەم پارچەیش هەر شەش بەیتە.

٣- **سادات و سعادت بەهم چون تن و جانند**

**این است کە سادات، سعادت جهانند**

ئەمەیشیان سێ بەیتە.

* * *

لە ژیانی خانای قوبادی و باسی خوسرەو و شیرینەکەیشیدا مامۆستا ماجید کەمێك دەسکاری بەدی هێناوە، لەوانە مەرحوومی باوکی نووسیویە:

(خانا پاشا قوبادی) کەچی مامۆستا ماجید پاشایەتییەکەی پێ ڕەوا نەبینیوە و نووسیویە (خانای قوبادی).

هەروەها پاش و پێشی بە چەند دێڕ کردووە و خۆی ئەمەی لێ زیاد کردووە:

"مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم ڕوونووسێکی ڕێك و پێکی لەم هۆنراوە هێژایە ئامادە کردووە کە ساڵی ١٩٧٥ز، لە ٨٧٤ لاپەڕەدا لە چاپ دراوە. ئەوا پاژێکی:" ل: ٢٤٨، چاپی کوردی.

دوا نموونەم لەم بوارەدا - کە دەکرێ پابەند نەبوونی تەواوی مامۆستا ماجید بە دەقەکەی مەرحوومی باوکیەوە بگەیەنێ - بۆ ژیانی حەیرانی سنەیی دادەنێم کە مامۆستا (شیوا) بە درێژیی لەسەری نووسیوە و لە گەڵێ ڕووەوە وێنەی لە شیعری فارسی و عەرەبی و پەخشانی فارسی و شیعری کوردیی هێناوەتەوە، بەڵام مامۆستا ماجید گوڵبژێری کردوون و هەندێکی لێ لابردوون، بەم شێوەی خوارەوە:

- مامۆستا (شیوا) لە تەرجیعبەندێکی (حەیران) چوار کۆپلەی نووسیوە، بەڵام مامۆستا ماجید نووسیویە:

(دوو بەند لە تەرجیع بەندێك) واتە لێی کەم کردووەتەوە، کەچی لە راستیدا سێ بەندیانی نووسیوە و، تەنها ئەو بەندەی بواردووە کە بە

**"سالکانی که لامکان سفرند**

**رهروان شکسته باڵ و پرند"**

دەست پێ دەکات. ئەم بەندە چواردە بەیتە.

دوای ئەوە مامۆستا (شیوا) نووسیویە:

**"از مثنوی مرشد العشاق حیران:**

**بشنوار خود نیستی دمساز دوست**

**از لب جان بخش نی، آواز دوست"**

ئەم پارچە (٣٠) سی بەیتە، بەڵام مامۆستا ماجید بواردوویەتی. دوای ئەمە مامۆستا (شیوا) نووسیویە:

**"از ساقی نامهء حیران**

**دگر دشنهء دهر خونریز شد**

**زمین و زمان فتنه انگیز شد"**

ئەم پارچەیش کە (٤٦) بەیتە بەر ئەوانە کەوتووە کە مامۆستا ماجید بواردوونی.

دوا بە دوای ئەمانەیش لە سەرەتای نموونەی پەخشانی عەرەبی حەیرانەوە دوو بەیتی عەرەبی هەیە، مامۆستا ماجید لە تەك ئەوەدا پەخشانە عەرەبییەکەی نووسیوە، ئەو دوو بەیتەی لەبیر کردووە. ٤٢٦/١ فارسی ٤٥٣/٢ کوردی.

نموونەیەکی دیش لەو دەسکارییانەی لە وەرگێڕانی (مشاهر کرد)دا روویانداوە، زیادکردنی ناوی سەرچاوەیە بێ زیادکردنی زانیاری لە دەقی وەرگێڕانەکەدا، وەك لە باسی بێتووشیدا هاتووە. مامۆستا (شیوا) لە دوای باسی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشییەوە ئەم سەرچاوانەی نووسیوە:

"البیتوشی، شیخ محمد خال سلیمانیه ای، بغداد، ١٣٧٧هـ، ق. الآداب العربیة في القرن التاسع عشر والربع الاول من القرن العشرین، اب لویس شیخو یسوعی. الاعلام. ج. ٤، ص ٢٧٥. تاریخ سلیمانیه، ص ١٦٩" ل: ٢٨٤ چاپی فارسی.

بەڵام مامۆستا ماجید ئەم سەرچاوانەی ئاوا نووسیوە:

" البیتوشی، شیخ محمد خال سلیمانیه ای، بغداد، ١٣٧٧ك، م. الاعلام ب ٤، ل ٢٧٥. الآداب العربية في القرن التاسع عشر والربع الاول من القرن العشرين، اب لويس شيخو يسوعى. اصفى الموارد فى سلسال احوال الامام خالد، ل ١٠٢. سبائك العسجد، ل٤٠. التعريف بمساجد السليمانية. شيخ محمد قزلجى. تاريخ سليمانيه، ل ١٦٩. گۆڤاری گەلاوێژ ب ١، چاپی ١٩٤٥ز" ل: ٢٩٠ کوردی.

**ئەم گلەییانە بۆ؟**

من کە ئەم گلەییانە لە مامۆستا ماجید دەکەم ـ گلەییش لە دۆست دەکرێت ـ مەبەستم ئەوە نییە کە لەگەڵ هەندێك لەو ئاڵوگۆڕانەدا نەبم کە کردوونی، یان بە هەڵەی گەورەیان دابنێم، بەڵکو گلەییەکەم لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: با کتێبەکە کتێبی باوکی بێت و ئەم زیاتر لە کەسانی دی خاوەنی گەلێ ماف بێت لەو کتێبەدا، ئەمانەتی عیلمی وای دەوێت و داوای ئەوەی لێ دەکات لە پێشەکیی کتێبەکەدا بە ڕوونی ئەو شتانە باس بکات و لەناو کتێبەکەدا کاتی گۆڕانکاری و دەست لە بابەتدان و زیادکردن بە وشەی (وەرگێڕ) خوێنەر لەوە ئاگادار بکاتەوە کە ئەو کارە ئەو ئەنجامی داوە.

دووەم: کە ڕێگەی گوڵبژێر و کورتکردنەوە و لابردنی بە خۆی دا نەدەبوو لە هەندێ جێگەدا و بۆ هەندێ کەس بیکات و، لە عاستی کەسانی دیدا بێدەنگ بێت.

سێیەم: دەتوانم لە پەنای ئەم خاڵانەدا ئەوەیش بنووسم: کە مامۆستا ماجید کتێبی تەرجەمە کردووە لە فارسییەوە بۆ کوردی یان دەبوو هەموو کتێبەکەی بکردایە بە کوردی و هیچی نەبواردایە، یان ئەوانەی کە نەیکردوون بە کوردی لە کتێبەکەی دەربهێنایەن، بەڵام لە کارەکەی مامۆستا ماجید دا دەیان پارچە شیعر و پەخشانی عەرەبی و فارسی هەیە کە وەك خۆیان نووسراون و لە پێشەکیشدا باسیان نەکراوە.

**هەڵە لە ناوی کەس و شوێندا:**

لایەنێکی دیکەیش لە کارەکەی مامۆستا ماجیددا کە جێگەی سەرنجە و، دەبوو وا نەبوایەت هەڵەیە لە هێنانەوە سەر ڕێنووسی ناوی کەسایەتی و

شوێنەکاندا، نموونەی ئەم لایەنەیش کەم نییە و، لەم شوێنەشدا جێگەی هەمووی نابێتەوە، بەڵام بێ ئەوەی نموونەی لێ بخەمە بەرچاو بە باشی نابینم بەسەریدا بڕۆم.

- السهروردي. کە بکرێ بە کوردی دەبێ بە (سووورەوەردی) نەك (سوورەبەردی) ل: ٨٠، ١٣٩، ٥٣٥....
- فەقێ تایران: دروست (فەقێ طەیەران) و (فەقی تەیەران). ل: ١٩٨.
- شێخ عەبدوڵڵای ریتکی: شێخ عەبدوڵڵای رەبتەکی دروستە. (رەبتەك) گوندێکە لە نزیکی موصل. ل: ٢٣٨.
- مەحیەدینی بەرزنجی: ل: ٢٦٠، چەند جێگەی دیش (محی الدین): ناوێکی عەرەبییە کە بکرێت بە کوردی، واتە بنووسێ (موحیدین) یان بە سووککراوی و کوردانەتر (محێدین).
- فەیز: ئەمە نازناوی موفتیی زەهاوی و چەند کەس لە نەوەکانی وەها نووسراوە، بەڵام هەڵەیە و دروستەکەی (فەیضی = فەیزی)یە. ل: ٤٨٨...
- شێخ مەحموودی شووریجە: ئەمەیش دروستەکەی (شۆڕیجە)یە کە گەڕەکێکی کوردنشینی شاری کەرکووکە. ل: ٥٠٩.
- شێخ عەبدولکەریمی وەلیانی ل: ٤٠٦، دروستەکەی (ولیانی)یە، (ولیان) گوندێکی ناسراوی سەر بە قەزای قەرەداخە.
- مەلا عەبدوڵڵای بەیتواتی: ل: ٦٩٣. ئەمەیش دروستەکەی (بێتواتی) یان (بێتواتەیی)یە، چونکە دوو گوند لە شارباژێڕ و پشدەر هەن بەناوی (بێتوات) و (بێتواتە).
- مەلا محەمەدی چڕستانی ل: ٨١٠. ئەمەیش دروستەکەی (چروستانی)یە چونکە لە دەوروبەری هەڵەبجە (چروستان) و (چروستانە) هەیە کە مامۆستای ناوبراو خەڵکی ئەوێ بووە.
- مەلا ئەبوبەکری پیر ڕۆستەمی، راستییەکەی (میر رۆستەمی) ل: ٣٤٥.

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لەو ناوانەی بە هەڵە خراونەتە سەر رێنووسی کوردی و ئەمانە نموونە بوون و لەمانەیش زیاتر لەناو کتێبەکەدا هەیە و، بوونیان شتێکی جوان نییە.

هەروەها دەتوانین یەك دەست نەبوونی ناو و ناونیشان بخەینە پاڵ ئەم خاڵە، بۆ نموونە: بۆ (الیاس) دوو جۆر بەکاربراوە جارێك نووسراوە (شێخ ئەلیاسی گۆرانی ل: ٢٣٠) جارێکی دی نووسراوە (مەولانا ئیلیاسی کەبیری سەردەشتی).

هەر لەپاڵ ئەم خاڵەدا باسی ئەوەیش دەکرێت کە لە ناو نامەکەدا دووجار ناوی نالی هاتووە، جارێك بە (نالی مەلا خدر) جارێکی دی (مەلا خدر نالی) ل: پەنجاوپێنج.

**ئەم کتێبەم چۆن دەویست؟**

وەك لە سەرەتاوە ئاماژەم بۆ کرد ئەم کتێبە دەکرا لە شێوەی ئێستەیدا نەبووایەت و، گۆڕانکاریی لە گەلێ رواڵەتیدا بەدی بهاتایەت، ئەوسا دەبوو بە کتێبێك گەلێ لە ئێستەی رازاوەتر و، زۆر لەم بارەی تیایدایە بە خزمەتتر و بەبارەتر بۆ لێکۆڵەران و رۆشنبیرانی کورد.

ئێستەیش نەچووە بچێت و دەکرێ ئەم کتێبە وەك سەرچاوەیەکی پڕ بایەخ و پێویستی مێژووی کورد چەندین جاری دی چاپ بکرێتەوە، بۆیە وەك پێشنیارێك بۆ برای بە نرخم مامۆستا ماجید داوای ئەوە دەکەم ـ و داواکەیش وا بزانم داوای سەردەمی رۆشنبیرانی کوردە ـ قۆڵی دڵسۆزانە و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵبکات و سەرلەنوێ بە کاوەخۆ بەم پرۆژەیەدا بچێتەوە و رەچاوی کار و پرۆژەی لەم شێوەی گەلانی دراوسێمان لە فارس و عەرەب و غەیری ئەوانیش بکات و، ئەم پرۆژە لەم حاڵەتەی ئێستەیەوە بگوێزێتەوە بۆ حاڵەتی کتێبێکی مێژوویی زانایان وەك (الاعلام) و (معجم المؤلفین)ی زمانی عەرەبی.

مەبەستم لەو گواستنەوە ئەوەیە کارەکە بخاتە شێوەیەکی ئەکادیمی و، پوخت و کورت و پڕ لە زانیاری و دەوڵەمەند بە سەرچاوە. واتە دەکرێ ئەو هەموو شیعر و پەخشان و باسانەی لە ناوەرۆکی کتێبەکەدان هەموویان ـ کەمێکی زۆر کەمیان نەبێ ـ لابرێن و، دەست لەسەر پوختەی ژیانی کەسایەتییەکان دابگیرێت و، هەوڵ بدرێت ئەو سەرچاوانەی ـ بە کۆن و نوێوە ـ باسی ئەو کەسایەتییانە دەکەن لە پەراوێزەوە بە چڕی و خەستیی بنووسرێن. وەك ـ دووبارە دەیڵێمەوە ـ (معجم المؤلفین) و (الاعلام) و هاوێنەکانیان تیایاندا کراوە.

ئەو کاتە دوای تەواوبوونی ئەم پرۆژە لەو بەرگ و قاڵبە نوێیەدا بە راستی کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ دەکرێتەوە و خزمەتێکی شیاو بە رۆشنبیران و لێکۆڵەرانی کورد دەکرێت.

**گلەیی لە ئەکادیمی:**

وا بزانم دوای ئەم هەڵسەنگاندنە زۆر کورتە خوێنەر ئەو پرسیارەی لا قوت دەبێتەوە: ئەی ئەم کتێبە چۆن لە دەزگایەکی وەك ئەکادیمیای کوردییەوە دەرچووە و بەو کەم و کووڕیی و ناتەواوییانە نەزانراوە؟ دووبارە - وا بزانم - وەڵامی پرسیارەکەمان لەوەدا دەستدەکەوێت کە مامۆستا ماجیدی رۆحانی لە پێشەکی کتێبەکە و چۆنیەتی رێگە خۆشبوون و رێگە بۆ خۆشکردنی چاپکردنی کتێبەکەدا لێی دواوە و دەڵێ: (دەوری مانگێك پاش ئەو دیدارە دوکتور ئازاد ئەحمەد سکرتێری ئەکادیمیا بۆ خۆی هات بۆ سنە و ئامادەبوونی ئەو شوێنەی بۆ چاپکردنی کتێبەکە، پێم راگەیاند).

جارێکی تر من - وا دەزانم - ئەگەر ئەکادیمیا ئەوەندە بە پەرۆشی پەلەکردن لە چاپکردنی ئەم کتێبەدا نەبوایەت کە سکرتێری ئەکادیمیا بنێری بۆ سنە بۆ راگەیاندنی ئامادەبوونی ئەکادیمیا بۆ چاپکردنی کتێبەکە و، کەمێك لەسەرخۆ رەفتاری لەگەڵ بابەتەکەدا بکردایەت و، وەك لە ئەکادیمیادا بۆ کتێبەکانی دی پەیڕەو دەکرێت وەهای بکردایەت و، ئەم کتێبەی پیشانی یەك دوو شارەزای بە توانای بەتەنگەوەهاتووی کارەوە بدایەت، لەوانە بوو ئەمانە تێنەپەڕن و، مامۆستا ماجیدیان لێ ئاگادار بکرایەتەوە و، ئەوسا ئەویش خۆی خاترخۆ دەبوو لەوەدا کتێبەکەی چاك بکات، یان بەو شێوەی ئێستەی - نەك لە ئەکادیمیا - لە شوێنێکی دی چاپی بکات.

**کتێبەکە:**

ئەم کتێبە مێژووی ناودارانی کورد، لە دوو بەرگدا بە چاپێکی جوان و بەرگی تۆکمەوە بە قەوارەی (٩٩٢) لاپەڕە تیراژی (٣٠٠٠) دانە، بێ ناوی چاپخانە، چاپ

بووە، ئەسڵی کتێبەکە دانراوی بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی (شیوا)یە و بە زمانی فارسییە، مامۆستا ماجید ڕۆحانی کوڕی مامۆستا (شیوا) کردوویە بە کوردی.

* ڕاستە کاك ماجید مەردۆخ ڕۆحانی، لە پێشەکییەکەیدا ناودارانی کورد (بەرگی یەکەم: ل٩) پەنجەی بۆ سەردانەکەی من درێژ کردووە، بەلاّم لە ڕاستیدا من بە بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتیی ئەکادیمیا کۆنووسی ژمارە ٧٥ لە ٢٠١٠/١١/١٩، سەردانی ڕۆژهەلاّتم کرد بۆ سۆراخکردنی کتێبخانەی عەبدولڕەحمانی مسباح و هێنانی دەستخەتەکانی کولیاتی وەفایی عوبیدوڵڵای ئەیوبیان، بەلاّم لە سنە چاوم بە کاك ماجید کەوت و باسی چاپکردنی کتێبەکەشمان کرد. واتا وەك م. قەرەداغی باسی دەکات ئەکادیمیا منی بۆ مەسەلەی کتێبی ناودارانی کورد ڕەوانەی ڕۆژهەلاّت نەکردووە.

**د. ئازاد ئەحمەد**

# ادارة اربيل في عهد مظفرالدين گوگبوري من خلال كتاب قلائد الجمان

د. محسن محمد حسين
عضو لجنة الوثائق والمخطوطات في الاكاديمية الكردية
عضو تدريسي في قسم التاريخ ـ كلية الاداب
جامعة صلاح الدين ـ اربيل

## المقدمة

لسنا نبالغ إن قلنا ان كتاب كمال الدين المبارك، الموسوم قلائدُ الجُمان[١] يُعدّ أهم من كتاب (وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان) لابن خلكان الكردي ابن اربيل[٢] فيما يخص تاريخ مدينة اربيل في العهد الأتابكي، لأن هذا الاخير غادر اربيل في عمر يافع، لم يتجاوز الثامنة عشرة، في حين وصل ابن الشعار الى هذه المدينة وهو على عتبة العقد الرابع من عمره، وبقى فيها ست سنوات، اي انه بلغ مرحلة النضج، وصار يسأل ويحقق ويكتب بوعي في حين كانت كتابات ابن خلكان عن تاريخ مدينته بمثابة إستعادة لذكريات طفولته وبداية تكوينه التي قضاها في مسقط رأسه، الأ أنّ بعض الاحداث التي رواها كان فيها شاهد عيان. وكذلك فان مساحة المعلومات التي اوردها ابن الشعار تفوق في أهميتها تلك التي يوردها مؤرخ اربيل المعروف المبارك بن احمد بن المبارك (المستوفي) في كتابه (نباهة البلد الخامل ومن ورد عليه من الاماثل في تاريخ اربل)، والسبب ـ في هذه الحالة ـ هو ضياع أجزاء من كتابه هذا، ولم يتم العثور سوى على جزء واحد من الأجزاء الأربعة، لحد الآن.

صحيح ان جزأين من كتاب ابن الشعار في عداد الكتب المفقودة كذلك، ولكن تم العثور على نسخة فريدة للاجزاء الثمانية الباقية في المكتبة السليمانية باستانبول، ويزيد عدد صفحاتها عن (٤٤٥٠) صفحة ولو أخذ بهذا القياس وجب ان تكون

صفحات الكتاب، من ضمنها صفحات الجزء الثاني والثامن المفقودين في حدود (٥٥٧٠) صفحة، حسب تقدير محقق الكتاب[٣].

قلنا صحيح ان جزأين من هذا الكتاب الثمين مفقودان، لكن الاجزاء الباقية تضمّ معلومات ثرّة عن تاريخ الكرد، ولاسيما تاريخ اربيل التي قضى فيها تلك السنوات الطوال نسبياً.. وبالتالي فإن كتابه أشبه بموسوعة او دائرة معارف قيّمة للادباء الذين نظموا نتاجهم يومئذ، ولاسيما وأن الكتاب تراجم لأعداد ضخمة من رجالات العصر المبثوثين في أنحاء العالم الاسلامي المختلفة، من رجال الدولة والقضاة ورجال الجيش والعلم والأدب، لذلك فان أهمية كتاب ابن الشعار لاتتأتى من كونه يقتصر على الحياة الأدبية وحدها، إنما تكمن أهميته كذلك في تدوين تاريخ المناحي السياسية والاجتماعية والدينية. لكننا في بحثنا هذا سنقتصر بالحديث عن رجالات ادارة اربيل في دولة الملك المعظم مظفرالدين گوگبوري.

**البحث**

من المفيد ان نبدأ من نائب الملك المعظم مظفرالدين گوگبوري[٤] وكان شخصية تطفح بها صفحات من مجلدات الكتاب، نقصد شخصيته (قرطايا بن عبدالله الاربلـي) ـ وكـان ـ حسب وصفه ـ أعظـم امـير في دولـة الملـك المعظـم، ينـوب عنـه في ادارة مملكته، أي أنه كان نائباً له، وكان رفيع المنزلـة لـدى الملـك، إلا انـه لم يـسلم مـن عقابه، فاعتقله بقلعة كـرخيني ـ كركـوك ـ ولم يطلـق سـراحه حتّـى مـات محبوسـاً. ويكاد يكون اعتقال وحبس العديد من شخصيات الحكم أمراً عادياً، وبينهم مـن مـات في السجن، وكان لامارة اربيل اكثر من سجن، سواء في مدينة اربيل او خارجها.

كان قرطايا يميل الى أهل العلم، ويقرّبهم اليه، ولتوجيه وتعليم ولده احمد الـذي جدّ في تربيته، فكان يسمع الحديث ويجالس فضلاء المجتمع، فبات ـ اي ولده أحمد ـ اميراً كبيراً نبيلاً متأدباً جليلاً مقبولاً عند ملوك زمانه، وافـر الحرمـة لـدى سـلاطين اوانه.

صار احمد اميراً جليل المنظر، فيـه بِشر وحيـاء، جميـل التعـبير نظمـاً ونثـراً، ودرس علم النجوم والاسطرلاب[٥]. وحين سأله المؤلف عـن مـسقط رأسـه أعلـن انـه ولد بـ (دربند) ـ اي مضيق ـ بقرية تعرف بالراية (رايات الحالية)[٦].

يذكر ابن الشعار انه تردد إليه أيـام مقامـه في اربيـل، وكـان ينـشده أشـعاره في الغزل. ثم غادر أحمد مدينته وتوّجه نحو مدينة حلـب سـنة ٦٣٠هـ/ ١٢٣٣م، اي في سنة وفاة الملك مظفرالـدين. وفي هـذه المدينـة أقبـل عليـه الـسلطان الأيـوبي الملـك العزيز غياث الدين محمد بن غازي بن صلاح الدين يوسف، وأنعم عليه إنعاماً عظيماً. وحاول أحمد أن يصلح ذات البين بين الملكين الايوبيين، اي بين غياث الـدين محمـد المذكور وبين ابن عم والده، الملك الكامل محمد بن ابي بكر بن ايوب.

ثـم اسـتدعي أحمـد بـن قرطايـا الى بغـداد بطلـب مـن ديـوان الخليفـة العباسـي المستنصر بـالله (٦٢٣-٦٤٠هـ/١٢٢٦-١٢٤٢م)، فوصـلها في (شـعبان ٦٣٥هـ/ آب ١٢٣٧م)، ومنحه الخليفة القابـاً فخريـة عديـدة، كمـا منحـه أقطاعـاً يليـق بمقامـه في منطقة البطائح (جنوبي العراق)

عرف عن الأمير أحمـد انـه كـان يمـارس رياضـة اللعـب بـالكرة، وسـباق الخيـل والصيد بطيور الجوارح وبالكلاب.

من أشعاره التي سمعها عنه ابن الشعار، أثناء نزوله قرية عمكاباذ ـ ويقصد ـ عينكاوه ـ وهي قرية على باب اربل ـ حسب وصفه، فيها يباع الخمر، ويقصدها أهل البطالة والخلعاء وأرباب الحرف من الناس يشربون بها، وفيها شخص يبيع الخمر اسمه نيسان:

**ولمّا نزلنا عمكاباذَ شاقَنا زيارة نيسان وحانته الكبرى**
**ذكرنا بها ليلاتِ لهوٍ حميدةٍ تقضَّت مع الأحباب اكثرها شكرا**
**فيا ضيعة الاعمار إن كنتُ بعدها أعُدُّ زماني كُلَّهُ أبداً عمرا**[٧،٨]

ولقرطايا ولد ثان هو محمد، وكان أميراً ذا منظر ورواء وجمال رائع وبهاء، ولم يزل يتولع بصناعة القريض (نظم الشعر) ويصرف همّتهُ الى إنشائه، حتى صدر عن خاطره ما استحسن معناه، واستّجلي مغزاه.

لقيتُه ـ يقول ابن الشعار ـ باربل، وكان في خدمة سلطانها مظفرالدين گوگبوري... فلما مات السلطان غادر مدينته واستقرّ في حلب، وخدم مليكها المذكور "الملك العزيز" وتقدم لديه، وانعم عليه انعاماً وافراً، وصار نديمه في مجالسه. وحافظ على مكانته بعد موت الملك.

لحق به ابن الشعار في حلب، وزاره في منزله سنة ٦٣٤هـ/١٢٣٦م، وتردد اليه ثلاث مرات بسبب مرض ألمّ به، ومات وهو في شرخ شباب في السنة المذكورة، وهو في السابعة والعشرين من عمره[٩].

بعد نائب صاحب (او ملك) اربل، وسيرة ولديه أحمد ومحمد، نتحدَّث عن الوزارة في عهد هذا الملك، كما وردت في الكتاب. وكان الوزير في العهود الاسلامية المختلفة، يلي الحاكم الاعلى في دست الحكم، سواء كان الحاكم خليفة او سلطاناً او ملكاً. وهنا لانبغي الكلام عن الصلاحية الممنوحة للوزير، وهل كان يتمتّع بصلاحيات واسعة، كأن يكون وزيراً للتفويض، فوّضه الحاكم صلاحيات شبه مطلقة، ام كان وزيراً للتنفيذ، حين يكون منفذاً لأمراء او تعليمات الحاكم.

ويبدو ان الوزارة في اربيل كان من النوع الثاني، نعرف ذلك من تفاصيل ماحصل لوزرائه، سواء في قصر فترة وزاراتهم، او حبس اكثر من وزير، حتى طال الاعتقال المستوفي[١٠] نفسه، وبه نبدأ كلامنا عن الوزارة في اربيل، ليس لانه اول من تسنّمها ـ

وهو لم يكن الاول فعلاً ـ بل لانه كان أشهر شخصية أنجبتها اربيل، على الأصعدة كافة، كما سنرى.

المبارك بن احمد بن موهوب.. ابو البركات بن ابي الفتح المستوفي. هكذا يذكره ابن الشعار، ويصفه بالوزير الصاحب، الكافي العالم، الأديب الحافظ، الكاتب النحوي الشاعر المصنف. ثم يورد كلمات ثناء واشادة بشخصيته وثقافته، ويضيف: المذعن بمحبة السادة العلوية[11]، شمس اربل وبدرها، وعالمها البارع وصدرها، وفخر أماثلها... من لم تر الدنيا له نظيراً، ولاسمعت بمثله جليلاً ولاخطيراً[14].

وهو "أعلم هذا الزمان بعلمي المعاني والبيان... والاطلاع على التواريخ وسير المتقدّمين.... وما يتعلق بفن المسافة والاشغال الديوانية". لقد كانت ترجمة ابن الشعار إحدى أطول التراجم في كتابه، إن لم تكن أطولها، فقد بلغت نحو سبع وعشرين صفحة[15].

كان المستوفي في استقبال الملك المعظم مظفرالدين، لدى وصوله، او عودته الى ـ اربيل قادماً من امارته التي كانت تضم الرها ـ اورفة ـ حرّان والموزر وسميساط، وقد تنازل عنها ليعود الى مدينته اثر وفاة اخيه في الناصرة بفلسطين أثناء حصار عكا الطويل، وكان ـ أخوه يوسف ينالتگين يحكمها مدة زادت على عشرين سنة، اي منذ وفاة والدهما زين الدين علي سنة ٥٦٣هـ/١١٦٨م، حتى وفاته هو ـ ينالتگين ـ في الناصرة سنة ٥٨٦هـ/١١٩٠م. وعند استقبال المستوفي له القى ابياتاً طويلة من شعره جاء فيه:

رأى دار ليلى بين اكتبةِ الحِمى ... فعاجَلَهُ داعي الهوى أن يُسَلِّما

وظن به الواشون صبراً عن الهوى ... وكانَ الذي ظنُّوهُ غيباً مُرَجَّماً

تباريُح شوقٍ لاتزالُ تَعودُهُ ... فتُذْكرُهُ ذاك الهوى المُتقَدِّما

## مؤلفات المستوفي:

صنّف تآليف غزيرة في مجالات عديدة هي:

١ـ نباهة البلد الكامل[16] ومن ورد عليه من الاماثل في تاريخ اربل. يتضمن تراجم رجالات اربيل، ومن زارها من الملوك والامراء والزهاد والعلماء والشعراء والكتّاب[17].

٢ـ الامثال والأضداد في سرقات الشعراء، ويتضمّن حالات شعراء يسطون على نتاج غيرهم، سواء اكانت سرقات محمودة او مذمومة، مع ذكر أسمائهم. وقد بوّبه المستوفي حسب أفاتين الشعر.

٣ـ صناعة البديع.

٤ـ كتّاب نبّه فيه على مواضع من كتاب (الأنيس والجليس) للمعافي بن زكريا الدريري النهرواني.

٥ـ كتاب (حاجة الكاتب والشاعر) فيه ضرورة الشعر، وشيء من علم العروض والقوافي.

٦ـ (الممتع المؤنس) ذكر فيه شعراء صدر الدولة العباسية المشاهير، بدءاً من بشار بن برد الى الشاعر محمد بن يوسف بن محمد، موفق الدين الاربلي (ت ٥٨٥هـ/١١٨٩م).

٧ـ كتاب (إثبات المحصل من نسبة أبيات المفصَل) ذكر فيه قائل الابيات التي استشهد بها الزمخشري (ت ٥٣٩هـ/١١٤٤م) في كتابه الشهير (المفصّل)، وبيان معانيها، او شرح غموضها، ثم تكلم عن نحوها، وبيان قصصها وأمثالها، ونبّه على اسماء قائليها وأنسابهم، وأورد فيه جملاً من كلام النحويين، فجاء الكتاب كأجود مايكون.

٨ـ سرّ الصنعة، صنّفه للوزير ولي الدين محمود بن محمد بن فارس الحرّاني، وزير الملك المعظم مظفرالدين گوگبوري بأربيل، ضمّنه ذكر من أسدى صنيعة او فعل خير ومكرمة من الرجال الاجواد والأسخياء.

٩ـ كتاب (موجبات الصبوة وعزائم السلوه) يتضّمن نُبذاً من أمور العشق وأسبابه وأصنافه، وأشعار في الصبابة (اي الشوق ولوعة الحب)، ومايجري مجراها، وهو مرتّب على ترتيب كتاب "الزهرة" لابي بكر محمد بن داود الأصفهاني.

١٠ـ تاريخ معرفة الدول. ويبدو من إسم هذا الكتاب انه يتّناول تاريخ دول.

١١ـ كتاب (شرح شعر أبي الطيب المتنبي) وقد قام الدكتور خلف رشيد النعمان بتحقيق الكتاب، وتم طبعه ونشره بين سنتي ١٩٨٩–٢٠٠١، وطبعته دار الشؤون الثقافية العامة ـ بغداد، في عشرة مجلّدات.

١٢ـ كتاب (شرح شعر ابي تمام).

١٣ـ كتاب (الخيل) الّفه استدراكاً على كتاب الحسن بن أحمد بن محمد الغندجاني.

١٤ـ جامع الاوراق.

١٥ـ قناعة الناظر وكفاية المحاضر.

١٦ـ كتاب (مشارق الانوار ومطالع العذار).

١٧ـ رسائل المبارك بن أحمد بمن المبارك بن موهوب. حقّقه ونشره الدكتور هلال ناجي، ط بيروت ١٩٩٩.

وغير ذلك من المؤلفات والرسائل والدواوين.

يذكر ان ابن الشعار ورد محروسة اربل مع بداية سنة ٦٢٥هـ/ نهاية سنة ١٢٢٧م، وقصد منزل المستوفي المعمور في القلعة، وابتهج برؤيته، وانس بمحاورته، ورآه ظاهر البشر والكياسة، شريف النفس، واسع المروءة، متحلياً بالأخلاق... الخ.

وصل جدّ الرئيس ابو البركات المبارك بن موهوب من الموصل، وكان من أبناء رؤسائها، ومن ذرّية الملك النعمان، وانتقل الى اربيل هو واولاده خلال حكم صاحبها الأمير ابي الهيجاء الحسين بن الحسن بن موسى بن جلويه الكردي الهذباني، فتولى مهمة تحصيل "استيفاء" الضرائب فيها، ولهذا لقب بالمستوفي، وقد اوكلت اليه هذه المسؤولية لأنه كان ذا سمعة طيبة. فهم من بيت معروف بالجلالة والرئاسة والأصالة، وقد أسندت المهمة اليه والى والده وجدّه وجد أبيه، وعمّه واخوانه، وكل يعرف بالمستوفي(١٨).

لكن ابا البركات كان واسطة عقد البيت، به اكتملت سيادتهم، واليه إنتهت رئاستهم، فزيّن عترته وعزّ أسرته. خدم السلطان الملك المعظم مظفرالدين گوگبوري بن علي بن بكتگين في ديواني الوقوف والاستيفاء معاً، كما صار كاتب إنشاء ديوان الملك، اي انه تولّى كتابة رسائل الديوان، وتوجيهها الى ذوي العلاقة، واستمر على هذا المنوال مدة اربعين سنة، دون مقابل، اي انه لم يتناول أجراً ولا جراية (الجراية ـ أجرة يوم واحد)، في محاولة لإبعاد أية شبهة عنه، او تبريراً لاعتقال الملك المعظم له، "ويرجو السلامة والخلاص منه"، ومع ذلك لم يتم له ذلك، فاعتقله الملك وقيدهّ، وصادر منه سبعة آلاف دينار "قطعة ذهب" وحين لم يستطع دفع المبلغ إستدان بعضها، والباقي جمعه من ناتج محاصيل بساتينه في اطراف اربيل. وإلا فما أحرز

درهماً ولا ديناراً، ولم يلتمس من أحد رشوة، لنزاهتـه ونفسه الأبيـة[١٩]. والواقـع ان اعتقــال شخــصيات في اربيــل كــاد أن يتحــوّل الى ظــاهرة في دولــة مظفرالــدين گوگبوري[٢٠].

والواقع ان المستوفي تولّى الوزارة، بعد مهمة الاستيفاء، حين القى الملك المعظم القبض على وزيره إبـراهيم بـن علـي بـن الـوالي، ورأى في المـستوفي المبـارك كفايـة بالامور الادارية (السلطانية) ونهوضه بأدوات المملكة، ففوّض اليه امر وزارته، وقبله الرجل على مضض "كارهاً لذلك، غير مجيب الى مادعي اليـه" لكـن استبـشر النـاس يُمن طلعته، وقضيت حوائجهم وأشغالهم، وحَسُنَتْ احوالهم في الديوان.

بعد وفاة مظفرالدين گوگبوري، تـولّى الأمـير شمـس الـدين بـاتگين حكـم اربيـل نيابة عن الخليفـة العباسـي الـذي اسـتطاعت قواتـه إقتحـام اربيـل عنـوة بعـد ثـلاث حملات شديدة عليها وتخريبهـا، وإحـراق بوابـة عينكـاوه، (البوابـة الـشمالية)[٢١،٢٢]، وسلَم الخليفة حكم المدينة الى باتگين، فطلب هذا من المـستوفي ان يظـل وزيـراً، وأن يكون نائبه في الأشغال الديوانية (حكم الامارة) كما حكّمـه في الأمـر والنهـي، والقـى إليه مقاليد الأمور. وخصص له راتباً سـنيّاً يـصل إليـه كـل شـهر. الا ان المـستوفي اعتذر وامتنع عن تولّي الأمر. وكانت حجته انه صار شـيخاً يـصعب عليـه العمـل، إذ صار في منتصف العقد السابع من عمـره، ورغـم ذلـك ظـلّ يقـدّم مـشورته الى الامـير باتكين. إضافة الى استدعائه للسؤال عن قضايا تخص الثقافة ويكرمه.

لزم المستوفي منزله منكبّاً على المطالعة والتأليف والنسخ، الى أن حلّـت باربيـل كارثة هجوم التتار (المغول) بقيادة بجكتاي في سنة ٦٣٤هـ/١١٣٦م، واسـتولوا علـى المدينة ـ أسفل القلعة ـ وقتلوا كل من قابلوه، فاضطر النـاس الى اللجـوء الى القلعـة، واستطاع المغيرون إقتحامها بعد قتال مرير. ولم يكـن ابـن الـشعار في اربيـل يومئـذ، لكنه يصف هروب الناس الى القلعة، وظلوا يقاومون الغزاة حتـى هلـك النـاس عطـشاً وجوعاً، فاضطر الأمير بـاتكين إلى مـصالحتهم مقابـل مـال كـبير، لوضـع حـدٍ لهـذه المذبحة، بعد ان وضعوا منجنيقات لقـذف القلعـة ودك أسـوارها، وبعـد ان قتلـوا مـن سكانها مالايحصى عدداً، فتركوا اربيل كجوف حمار[٢٣].

قلنا ان ابن الشعار لم يكن موجوداً في المدينة، لكنـه واصـل كلامـه عمـا حـصل فيها، ووضع المستوفي فيها، فذكر ان بعض وجهاء اربيل لما رأوا مـاجرى لمـدينتهم

بأيدي التتار من أعمال القتل والنهب، وتخريب أسواقها، ولاسيما القيصرية المظفرية التي لم يمر على بنائها اكثر من اربعة عقود(٢٤). تـأهبوا لمغـادرة اربيـل والتوجـه الى بقاع أخرى، ولاسيما الموصل، وكان بينهم ابو البركات المستوفي، فارتحل عنها.

عندما سمع صاحب الموصل الملك الرحيم بدرالدين لؤلـؤ، الـذي حكـم الموصـل نحو نصف قرن، خبر تحرّك المـستوفي، ارسـل جمـالاً وبغـالاً تحمـل امتعتـه، فـدخل الموصل، واستقبله بدرالدين لؤلؤ بنفسه بالاكرام الـوافر والتبجيـل والحرمـة التامـة، وانزله في دار هيّأت له برسمه، ونزل بها، ورتّـب لـه مرتبـاً، وبقـى فيهـا حتـى وافـاه الأجل المحتوم سنة ٦٣٧هـ/١٢٣٩م. ودفن بمقبرة خارج باب الجصاصين(٢٥).

ترك المستوفي الكثير من الأشعار، بينها ما أنشده في مدح أهل البيـت، وقـصائد غزيرة تملأ صفحات عديدة من الكتاب(٢٦). نختار منها هذه الأبيات التي يخاطب فيها الملك المعظم مظفرالدين گوگبوري، حين وثب عليـه رجـل لـيلاً، اراد قتلـه، وضـربهُ بسكين:

| | |
|---|---|
| يا أيّها الملك الذي سَطَواتُـــهُ | من فِعْلها يتعجّبُ المـرّيـــخُ |
| ابياتُ جودك مُحْكَمٌ تَنْزيلُهـــا | لاناســخٌ فيها ولا منســـوخُ |
| أشكو إليكَ ومابُليتَ بمثلهـــا | شنعاءَ ذِكرُ حديثها تاريـــخُ |
| هي ليلةٌ فيها وُلِدْتَ وشاهدي | فيما ادَّعَيْتُ القَمْطُ والتمريخُ |

وله في رثاء اربيل حين غادرها بعد تدميرها بيد المغول:

| | |
|---|---|
| حَيّا الحيا وطنا بإربل دارســـاً | أحنْت عليــه حوادثُ الأيّام |
| أَقْوَت مرابعُـــهُ وأوحشَ أُنسـُهُ | وخلــتْ مَراتِعُهُ مـن الآرامِ(٢٧) |
| عُنِيَ الشـَتاتُ بأهلهِ فتفـــرّقوا | أيدي سبا في غيرِ دار مُقـامِ |
| إن يُمسِ قد لعبْت به أيدي البلى | عافي المعاهد دارس الأَعلامِ |
| فما قضـــيتُ به لباناتِ الصـبا | مع فِتْية شُمِّ الانوف كـــرامِ |

....

| | |
|---|---|
| إن يأت مهجورَ الحمى فيما غدا | مأوى العُفاةِ ومْوئلَ الأيتامِ |

... الخ

وله في شكوى الفراق

**أحْبابنا مازال داعي النوى يُهيجُ للأنفُسِ أشواقَها**

**فارْقتكُمْ كرها ونارُ الأسـى تبعثُ للاكبادِ إحراقَها**

**فما رأتْ عينـــيَ فيما رأتْ بعدَكُمُ من حَسَنٍ راقَها**

وتطفـح صـفحات الكتـاب بقـصائد عـشرات مـن شـعراء العـصر الـذين اشـادوا بالمستوفي، ونكاد نجزم ان الشعراء من زّوار اربيل لم يغادروا المدينة قبل أن يتغنّـوا بمجلس هذا الرجل وبثقافته الثّرة ونزاهته وكرم ضيافته وسمّو أخلاقه وبمقامه لدى أبناء مجتمعه، وفي قمّـة هـرم الـسلطة، فنـذكر ان غـازي بـن مـودود بـن الخـضر بـن سودكين، وكان من أبناء الجند، ورد اربل، وتعلق بخدمة سـلطانها، فـولّاه هـذا أمـر بلدة بشتدر (پشدەر)[٢٨] وأعمالها، فبقى بها مدة، فلم يطب لـه البقـاء فيهـا، فكتـب الى الصاحب أبي البركات المبارك بن أحمد المستوفي، وكان يومئذ يتولّى الاسـتيفاء بالديوان المظفري المعظمي، يذمّ مقامه بـ(بشتدر) ويشكو اليه ممّا عاناه من الفئران والعقارب والبراغيث والعقارق (الضفادع) وأنشد فيها ـ كما يقول إبن الشعار ـ في سنة ٦٢٥هـ/١٢٢٨م ـ بمنزله بمحروسة اربل، يقول فيه:

**بالسيّد الشرَفِ[٢٩] أستجيـ ـرُ من المُقام بشـــتدْر**

**الصاحبِ[٣٠] المولى الوزيـ ـرِ ومن به الخلقُ أفتخرْ**

....

**الماجد المولى الذي إنعـــامُهُ عـمَّ البشـــرْ**

....

بعد ابيات عديدة من الاشادة بالمستوفي، يقول:

**الفأرُ يصوي دائَباً من جوُعِه لا من بَطـــرْ**

**وعقاربٌ صُغرٌ يَطا يرُ سُمُّها مثلَ الشَّـــررْ**

**وبراغِثٌ يَعْبَثْنَ بي فكأنهـــا وَخْـــزُ الأبـــرْ**

**وعقارقٌ يَنْعَبْنَ منْ وقتِ العشاءِ الى السَحَرْ**

ويختم قصيدته بأبيات أُخَرْ.

لقد كان المستوفي أشهر مستوفي ووزير في اربيل أيام گوگبوري، رغم وجود وزراء دامت مدة تولّيهم للمسؤولية مدة أطول. ومما يذكر ان الوزارة ظهرت في هذه المدينة قبل العهد الأتابكي، فالطغرائي الأصبهاني الحسين بن محمد بن الحسين بن علي، تولّى الوزارة(٣١) فيها في فترة حكم الاسرة "القبيلة" الهذبانية" الكردية باربل.

اما ولده محمد بن الحسين، ابو المؤيد (٥٤٩-٦٠٧هـ/١١٥٤-١٢١٠م) فقد وصفهُ المستوفي في كتابه (نباهة البلد الخامل... في تاريخ اربل) قائلاً: الوزير الامام سيد الافاضل، وصدر الاماثل، وواحد الأكابر، يضرب به المثل في فكره المتوقد، وبديهّيته، ومعرفته بعلوم الاوائل (علوم الاغريق). كما وصفه أحد القضاة قائلاً: كان الوزير ابو المؤيد فاضلاً عالماً، واسطة خير عند مخدومه، يقصد صلاح الدين يوسف بن ايوب، ثم ولده الملك الظاهر غياث الدين غازي، فقد خدمهما ابو المؤيد بعد ان غادر اربل الى حلب(٣٢).

اما أبرز وزراء اربيل، ربما في بدايات ظهور الوزراء في هذه الامارة، فكان محمد بن محمود بن محمد بن مقدار بن فارس الحراني، وقد جلبه مظفرالدين گوگبوري معه من حرّان، حين كان يحكم هذه المدينة (ومدن اخرى) قبل أن يعود الى مدينة والده زين الدين علي، إثر وفاة حاكمها اخيه يوسف ينالتگين في الناصرة بفلسطين، فغادر گوگبوري حرّان وفي معّيته اشخاص عديدون، بينهم هذا الحرّاني، واستقر في اربيل.

وكان هذا الوزير قد تولّى ديوان (النظر في المظالم) مدة طويلة، ومهمات هذا الديوان مهمّات خطيرة في التاريخ الاسلامي، بسبب حساسيتها لتعلّقها بإنصاف المظلومين، ولهذا كان على متولي هذا الديوان أن تتوَفّر فيه جملة شروط، منها أن يكون جليل القدر، نافذ الامور، عظيم الهيبة، قليل الطمع كثير الورع(٣٣).

وعن مدى توّفر هذه الشروط على (محمد بن محمود الحرّاني) تحدّث ابن المستوفي الى ابن الشعار قائلاً كان لدى هذا الرجل قحّة (صلافة) كما له هيبة يخافه الناس، وقد رافق ابن المستوفي مدة.. ويضيف: ولم اعلم زمن ومدة ولايته رغم ترددي اليه... وتوفي الرجل في اربيل سنة ٦١٢هـ/١٢١٥م، ودفن ظاهر (في اطراف) البلد، بالقرب من باب المدينة المعروف بـ(باب عشائر)(٣٥).

ولم يسلّم محمد من غضب وعقوبة مظفرالدين گوگبوري، فعندما القى القبض عليه ولّى الوزارة علي بن شماس بن هبة الله بن ابراهيم (٥٤٤–٦٢٢هـ/١١٤٩–١٢٢٥م)، الاربلي المولد والمنشأ، وكان هذا الرجل يتولّى امور ديوان الانشاء قبل ذلك، وعرف بانضباطه في العمل حتى نال حظوة ومرتبة رفيعة عند گوگبوري لم ينلها أحد قبله.

ثم جرت له نَبْوة (نفور ومجافاة) مع گوگبوري ـ هو الآخر، فاعتقله وارسله الى قلعة هرور من أعمال اربيل[٣٦]، فمات في معتقله.

كان علي بن شماس ـ كما يصفه ابن الشعار ـ من محاسن زمانه، وظرفاء الدهر وأعيانه، لطيفاً جليلاً عاقلاً حصيفاً، يرجع الى فضل وذكاء ودهاء، بصيراً بالامور السلطانية "ادارة شؤون الدولة"، ذا رأي ثاقب، وحزم شديد، تاركاً للتكلف، يكره الرئاسة، ويتبسّط مع الاصدقاء والأصحاب، ويظهر البشر والبشاشة بينهم، ويتعصّب "يميل" للغرباء، كما يميل للأدب والشعر[٣٧].

كتب قصيدة الى الأمير عزالدين محمد بن بدر الكردي، احد كبار أمراء مظفرالدين گوگبوري، يعاتبه من السجن، عله يستطيع أن يؤثر على گوگبوري لاطلاق سراحه، الا ان محاولاته ذهبت أدراج الرياح. ننقل أبياتاً قليلة من شعره وهو يخاطب الأمير الكردي:

| | |
|---|---|
| ونأمنُ روعاتِ الحُبوُسِ وينجلي | شحوب على حُرّ الوجوه يلوحُ |

...

| | |
|---|---|
| الى الله يشكو قسوةَ الدهرِ عاجزٌ | ذليلٌ على فَرْشِ الهوانِ طريحُ |

...

| | |
|---|---|
| الا مُبلغٌ عنّي ابنَ بدر رسالةً | لها نفحاتٌ بالعتابِ تفوحُ |

ومادمنا تحدّثنا عن لجوء مظفرالدين گوگبوري الى حبس وزرائه ومسؤولي امارته الآخرين، فاننا نضيف اعتقال وزير آخر وهو الوزير ابراهيم بن علي بن أبي حرب، وقد حبسه حين كان هذا يدير اعمالاً حسابية مع جماعة معه[٣٨]. وقد عبّر عن هذا الوضع الشاعر ابو المجد النشابي، الكاتب أسعد بن ابراهيم بن الحسن بن علي الاربلي، بشعره، وكان هذا الشاعر ملماً بالفساد الذي إستشرى ـ كما يبدو ـ في

ديوان الامارة، إذ كان مسؤولاً عن كتابة الرسائل التي يوجهها گوگبوري الى الجهات المعنية، داخل وخارج الامارة، رغم انه لم يسلم هو الآخر عن تهمة الفساد، ومن ثم حبسه، فقال هذا الشاعر حول الفساد:

| | |
|---|---|
| قد قسمنا الديوانَ خمسةَ أقسا | م عليها لكلِ قولٍ دليلُ |
| رُبّ حّقٍ ولايُطاعُ ومنسو | بٌ إلى الظلمِ قولُهُ مقبولُ |
| ثم شخصٌ كأنّه الحرفُ في انحـ | وفلا فاعلٌ ولا مفعولُ |
| ومصرٌّ على التجنُّف[39] والظُلـم | بعيدٌ عن الصوابِ جهولُ |
| وأخو حاجةٍ يمشى أحوالاً | لديه إن جاءه البرطيلُ[40] |
| أتراهُم لمْ يَعلمّوا أنّ كُلاّ | منهُم عن أفعالهِ مسؤولُ[41] |

وله في إدانة الفساد كذلك:

| | |
|---|---|
| جماعةُ الديوانِ في | ليلةِ سخطٍ مُظلمَة |
| وقد غدْت أيدي الوز | يرِ منهم منتقمَة |
| لارحم اللهُ الذي | يرحمُ قوماً ظلمَة |

ولد النشابي بمدينة اربيل في ٥٨٢هـ/١١٨٦م، ثم فارق مدينته الى بلاد الشام، ثم عاد اليها، فقلده مظفرالدين گوگبوري الاشراف على ديوان الرسائل، وصار له الأمر والنهي، فتمتّع بمنزلة كبيرة نافذة، ولم يزل كذلك حتى تمّ القبض عليه سنة ٦٢٩هـ/١٢٣٢م، واودع سجن قلعة الكرخيني (كركوك) لأمر أبلغ عنه، وكان الرجل قد قرأ بعضاً من قصائده على مسامع ابن الشعار، فيقول: أنشدني النشابي لنفسه، لما حبس يعقوب بن اسماعيل البابوري المشرف على ديوان اربل، وتولّى مكانه المختص ابو الحسن بن القابض النصراني:

| | |
|---|---|
| فرِحْنا بيعقوبَ اللعين وحَبْسه | لما أتانا مايَطيبُ به القلبُ |
| فلمّا وَليَ المختصُّ فالكلُّ واحدٌ | إذا مامَضى كلبٌ اتى بَعْدَهُ كلبُ |

وقال في يعقوب البابوري ايضا يهجوه:

| | |
|---|---|
| قد خسرَتْ دولةُ من يرتجي | عندكَ يايعقوبُ إصلاحَها |
| وكم أُجيجْت إربلُ مَرّةً | وغيرُ تدبيرِكَ ما أجتاحَها |
| وإن أقُل أحسنْتَ مُستهزئاً | ياصدرَ بابوري وفَلاّحَها |

وكتب يناشد الملك المعظم گوگبوري بضرورة إعتقال يعقوب:

**ياأيّها الملكُ المعظمُ إنّها لمشــورةٌ ونصيحـــة لاتهمـــلُ**

**يعقوبُ قد نهبَ البلاد وضعضعَ الأجنادَ واستغنى غَناءً يذهلُ**

**فاعجل عليه بقبضه فلَرُبّما هو لاخلافَ بقَبْضِ مالِكَ أعجلُ**[٤٢]

مازلنا نتحدث عن الوزراة في اربيل

فقد تولاها ابراهيم بن علي بن ابي حرب، وكانت اسرته تعرف ببيت الوالي... لكن سرعان ماشمله غضب الملك گوگبوري فقبض عليه وعلى اولاده سنة ٦٢٨هـ/١٢٣٠م، وكان ولده الشاعر عبدالعزيز ينوب عنه أيام وزارته، كما كان مظفرالدين گوگبوري ينفذه رسولاً عنه الى الديوان العزيز، اي الى الخليفة العباسي، اكثر من مرة، واستقبل في بغداد إستقبالاً لائقاً، وأنعم عليه الخليفة.

بعد وفاة گوگبوري ٦٣٠هـ/١٢٣٣م، افرج عن الوزير واولاده، وقد اجتمع ابن الشعار الى عبدالعزيز سنة ٦٢٥هـ/١٢٢٧م، في داره في اربيل، وذكر أبياتاً من أشعاره[٤٣]، كما وصف وسامته وتأنقه في ملبسه ومأكله مالم يفعل أحد من الرؤساء في زمانه، كما كان فيه خيلاء "إعجاب بالذات" حتى تجاوز فيه الحدود، وهذا مايلقي ضوءاً على بعض جوانب الحياة الاجتماعية في اربيل يومئذ.

## الهوامش:

(١) قلائد الجُمان في فرائد شعراء هذا الزمان، الذي عرف بـ (عقود الجمان) كذلك، لمؤلفه كمال الدين ابي البركات المبارك (٥٩٥–٦٥٤هـ/١١٩٩–١٢٥٦م).

(٢) ابن خلكان، شمس الدين احمد بن محمد بن ابراهيم. ولد في اربيل، كما روى ذلك بنفسه لكمال الدين ابن الشعار (القلائد ج١/ ترجمه ابن خلكان/ احمد) بمدرسة الملك المعظم مظفر الدين. ويبدو أن قرية صارت تنسب الى هذه الاسرة، وليس العكس، فيذكر ابن المستوفي ان الفقيه عمر بن خلكان (ت ٦٠٩هـ/١٢١٢م) "من قرية معروفة بجّده منسوبة اليه على الطريقة الكردية" انظر كتابه (نباهة البلد الخامل ... في تاريخ اربل) ترجمة رقم ١٨٢، ص: ٢٨٣. وانظر ماكتبه الاستاذ د. احسان عباس محقق (وفيات الأعيان) ط بيروت ١٩٧١، ج١، ص: ١٧٠. وانظر كتابنا "اربيل في العهد الاتابكي" هامش ص: ٢٧١.

(٣) محقق الكتاب هو الاستاذ السيد كامل سلمان الجبوري، الناشر دار الكتب العلمية ـ بيروت ٢٠٠٥، ج١، ص: ٢٩.

(٤) لاداعي للكلام عن سيرة گوگبوري نفسه، فقد تحدّثنا عنها في مجالات عديدة.

(٥) الاسطرلاب: جهاز خاص برصد قياس مواقع الكواكب، ومعرفة ساعات الليل والنهار.

(٦) رايات: مركز قضاء حالياً، قرب الحدود بين كردستان الجنوبية والشرقية (بين العراق وايران).

(٧) القلائد: ٢٧٥/١.

(٨) بقية أشعار احمد بن قرطايا في: ٢٦٩/١–٢٧٦.

(٩) أشعاره في الجزء السابع، ص: ١٢٦–١٢٧.

(١٠) ربما ينفرد ابن الشعار بذكر اسم شهرة، او المهنة الاساسية التي تولاها هو وآباؤه، اي الاستيفاء ـ استيفاء المال ـ فيذكره بـ(المستوفي) وليس (ابن المستوفي) مثل ماورد في المصادر الأخرى، وكلتا التسميتين صحيحتين، وربما كانت التسمية الثانية بتأثير من ابن خلكان، ونقل منه المؤرّخون الآخرون.

(١١) نسأل: هل أشهر المستوفي تشيّعه؟ وقد لاحظنا إنتشار مذهب التشيع بين رجالات الفكر، وبينهم شعراء الفترة الذين كتب ابن الشعار سير حياتهم. وقد ذكر أ. د. سوادي عبد محمد الرويشدي عن هذه الظاهرة في كتابه (امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ٦٠٦–٦٦٠هـ/١٢٠٩–١٢٦١م، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٧١، ص ص: ٣٧–٤٤. والواقع ان الخليفة العباسي في بغداد قد ركب الموجة التي انتشرت في العراق في العقود الأخيرة من تاريخ الدولة العباسية. انظر على سبيل المثال:

ولتحقيق ذلك يلعب المثقف دوره في تغيير الأفكار والمفاهيم والقناعات بعد ان يشهد الحقائق على أرض الواقع ويتخلى عن أفكاره السابقة لأن المثقف العضوي كما يقول ادوارد سعيد "مرتبط بالمجتمع على نحو فعال، إنه يناضل باستمرار لتغيير القناعات، فهو ـ ومن معه ـ في حركة وتجدد دؤوب"[٢٠] وتاكيداً على ماذهب اليه ادوارد سعيد "علينا الاّ نضع المستشرقين جميعاً في سلة واحدة، لأن من بين المستشرقين من ناهض سياسة بلاده تجاه المستعمرات، فقد وقف المستشرقان الفرنسيان جاك بيرك ومكسيم رودنسون، يطالبان بلادهما بالأنسحاب من مستعمراتها في بلدان شمال افريقيا، خاصة الجزائر، ومنحها الأستقلال في حين ظل حفيد المجاهد الشهير عبدالقادر الجزائري يدعو الى بقاء بلاده تحت السيطرة الفرنسية"[٢١].

ان موقف المستشرقين يعتمد النظرة الانسانية والاستناد الى المنطق، فبقدر ماوقف الغربيون ضد حملات الفتوحات الاسلامية يقف المسلمون ايضاً بالضد من احتلال البلدان الأسلامية من قبل الغرب ويؤازرهم في هذا الاتجاه مستشرقون ومفكرون غربيون متنورون الذين اعتمدوا العقل والمنطق والفلسفة بعكس العلماء المسلمين المتزمتين الذين ربطوا الفلسفة والعلم بالألحاد واعتبروا الاشتغال بها خروجاً عن الدين كما فعل الامام الغزالي الذي فضل الشريعة على العقل وحارب الفلسفة في كتابه (تهافت الفلسفة) حيث رد عليه ابن رشد في كتابه (تهافت التهافت)[٢٢] ولكن الغريب كل الغرابة جرى تكفير كلا الرجلين معاً، وحرق كتبهما، الاّ ان الغرب استفاد من كتاب ابن رشد دون كتاب ـ تهافت الفلاسفة ـ واغرب مما ذكرنا ان طيباوي وسيد قطب لايعترفان بالمناهج العلمية/ التحليلية والنقدية، وبشكل خاص سيد قطب ينظر الى فلاسفة الاسلام الكبار نظرة متجنية على الفلسفة ويعتبرهم منحرفين وهراطقة حسب الفهم الرسمي للدولة الأسلامية التي "ترفض تطبيق منهجيات "الغرب" في العلوم الأنسانية والاجتماعية لدراسة الفكر الاسلامي، رغم ان تلك المنهجيات باتت ملكاً للبشرية كلها، وليست حكراً على واضعيها او مبتدعيها"[٢٣] وان خوف الفقهاء المسلمين من اعمال العقل والمنطق يدل على موقعهم الضعيف وعدم قدرتهم على النقاش، والأنفتاح على عالم الفكر العقلاني المتمنطق والخروج من الفكر الجامد المنغلق، وحين تسقط حججهم الواهية امام

المنطق السليم والتفكير العلمي الصحيح يتذرعون بمقولة مهزوزة "من تمنطق تزندق" أي من تعلّم علم المنطق تهور في الزندقة على أساس ان الزنديق هو الكافر باطناً ومؤمن ظاهراً، في حين ان كلمة الزنديق مشتقة من زندي، وزند عشيرة معروفة في كردستان ايران من اشهر شخصياتها التي تولت حكم بلاد ايران كريم خان زند، وقد اضيفت ياء النسبة الى زند، واصبحت الكلمة زندي ثم طرأ عليها تحول فصارت (زنديق)، كما سمي الرجل الذي يحمل الراية في الحرب وهو واقف (پياده) أي الراجل، ثم أخذ مدلولاً آخر فتحولت الكلمة الى (بيدق) وفي الكردية (بەيداغ) اي العلم او الراية. فكلمة زنديق محورة من (زندي) وليست فارسية إنما هي كردية، وقد اشتهر الكرد والفرس بالاعتماد على الفلسفة والمنطق في الجدال والحوار، وقد اطلقت تسمية الزندي المنطقي زنديقاً من قبل فقهاء العرب السلفيين الذين كانوا يعدون اي تحليل علمي ومنطقي كفراً وانحرافاً في امور الدين وخاصة في المسائل الشرعية. وقد تحولت آية "وجادلهم بالتي هي احسن" الى الانغلاق الفكري وسدّ باب النقاش والجدل العلمي واتهم وكل من تمسك بالمنطق العقلي في التوصل الى الحقائق بالزنديق اي الكافر الملحد، وكل من استعان بالفلسفة منحرفاً وخارجاً عن الدين.

واخيراً وفي الختام يسأل الدكتور محسن: هل الاستغراب ممكن؟ الدعوة اليه، اي الدعوة للحوار تكون بين (الأنا والآخر) بهدف التحرر من هذا الآخر، وتقوم على تمثل مسارين للطرفين في شكل خطين بيانيين يتقاطعان كل سبعمائة سنة، حسب جدول حسن حنفي الغريب ـ بحيث يتبادلان الوقع بين الصعود الى القمة والهبوط الى قاع الهاوية، كأنهما في مباريات خيالية دورية لايحتاج الطرفان الى مجهود كبير.... ينقد الباحث الدكتور محسن هذا الزعم الباطل والذي لايمكن تأسيس عالم الاستغراب بذريعة الذود عن التراث الاسلامي من مغبة الذوبان، بأعتبار ان مواجهة الآخر على مستوى حضاري، ليست قراراً يتخذ بإملاء مايجب القيام به قبل توفير مناخات حوارية... أضف الى ذلك اننا لم نحدد معاني مصطلحات خطيرة بتنا نرددها دون أن نعي معانيها الحقيقية أو نفهمها، مثل "ماهية الدولة، والقوانين... الخ" فاذا لم ينجز مثل هذا العمل فسنظل نستهلك المنتجات الثقافية "المستوردة" وسوف نظل نعبرّ عن غضبنا واحساسنا بالسخط والمرارة تجاه عالم جائر لايعبأ بنا كما يقول المفكر الكبير محمد اركون. وحتى اذا جرى القم بالأستغراب هل سيتم ذلك بالبدء من

دراسة أنفسنا، بدراسة "الأنـا" أم الآخـر؟ أم بالانفتـاح للأسـتفادة مـن علـوم الآخـر ومناهجه؟ أم بتقليد استشراقه عبر استغراب مضاد، استغراب لم تنضج ظروفـه ولم تكتمل عناصره بعد؟ فمهمة الاستغراب في مثل هذه الحالة أمست مستحيلة مـن هنـا فان مشروع حسن حنفي الطموح مؤجل بقوة في عصرنا[٢٤].

وبعد قراءتي المتأنية لكتاب "الاستشراق برؤية شـرقية" لابـد لـي ان أقـر بـأن قراءتي له تصور اساساً الى طبيعة البؤرة المتحركة المستوطنة في وعيـي واحـساسي لفكره المتطابق لفكري والذي تكون وتطور وتبلور في السياق الزمني، متخطياً رؤيته النقدية التحليلية في شهادتيه الجامعيتين بخلاف معظم الجامعيين الأكـاديميين الـذين يجترون منجزاتهم منذ البداية الى يومنا هذا متصورين ان اللقب الجامعي كفيل ودليل اعتراف بمستواهم الثقافي ولكن هيهات...

ان الدكتور محـسن في كتابـه القـيم يـضيء لنـا امـاكن بالغـة الحساسية بنهجـه العقلاني الحر ونسغه الفكري المتطور فهو يتقاطع بـشجاعة ورؤيـة في جدليـة محكمـة مع منطلق فتح البلدان ومبرراته غـير المستـساغة عقليـاً ووجـدانياً، وكـذلك مـع آراء ومنطلقات بعض المستشرقين وحتى الكتاب العرب المـسلمين في نظـرة تعاملـهم مـع الآخر. إن الغرب بشكل عام تخلى عن عنجيتـه واسـتعلائه ونظرتـه الدونيـة للـشرق، واخذ يعترف به ويدعو الى فتح صفحة جديدة في العلاقـات، ونـسيان الماضـي، ولكـن العالم الاسلامي مازال متمسكاً بانغلاقه العقلي واعتبـار نهجـه الـسلفي الاصـولي هـو الصحيح والناسخ لجميع الأديان والمذاهب والمفاهيم والافكار المتعلقـة الطموحـة الى المستقبل المشرق للبشرية في اجواء السلام والمحبة والتعـايش الانـساني علـى ارض الواقـع، فـاذا مـاتخلى عـالم الـشرق عـن تزمتـه ونهجـه العـدائي لجميـع المبتكـرات والابـداعات والانجـازات الحـضارية في الغـرب يمكـن ان يلتقـي العالمـان المتـصارعان يجمعهما قاسم مشترك في ارساء صرح الحضارة والمدنية التي تخدم العالم المتحضر. واخيراً ان الذي عزز موقعه الفكري في تأليف هذا الكتاب هو ذاكرته التاريخية الغنيـة بموروث التـاريخ القـديم والحـديث في سـياق تحولاتـه وتطوراتـه، لكـي يـدخل مجـال الاستـشراق مـدخل صـدق بـنفس طويـل ورؤيـة وأنـاة، وعقلانيـة منفتحـة لاسـتثمار مـشروعه التحليلـي النقـدي مـن مختلـف الجوانـب تواؤمـاً واختلافـاً ولكـن في نهايـة المطاف ومن منطلق الضمير الحي يرى ان الجانب المشرق الايجابي مـن الأستـشراق

يطغى على الجانب المظلم السلبي فيه. ولهذا فإن هذا الكتاب جدير بالقراءة المتأنيـة الواعية قراءة تحليلية نقدية مقارنة إن أمكن القاريء ذلـك في ضـوء اعجابـه المتـبطن مقاربة من الرؤية الفكرية السليمة للمؤلف المخلص لمنجزه التحليلي ادراكاً منه بأنه يتصدى لقضية ليست من السهولة النهوض بها . وبعد القراءة الممتعـة الفاعلـة الـتي حملتني على الإحساس بالإشعاع النفسي والفكري ويتلاقى وجهة نظري بوجهـة نظـر المؤلف، استطيع أن أقول ان عملية القراءة التحليلية قد أدت دورها من حيث التأثير المتبادل بين خطاب الدكتور محسن وأنا المتلقي القارىء.

## الهوامش

١- الاستشراق برؤية شرقية - د. محسن محمد حسين، الطبعة الاولى، شركة بيت الوراق للنشر المحدودة - بيروت - لبنان ٢٠١١، ص ١٧٥.
٢- الأسلام والنزعة الانسانية العلمانية - صادق جلال العظم - ترجمة فالح عبدالجبار - الطبعة الاولى - دار المدى - العراق ٢٠٠٧، ص ٨.
٣- المصدر السابق نفسه ص ٩.
٤- الاستشراق برؤية شرقية ص ١١.
٥، ٦، ٧- مدخل الى التنوير الأوربي - هاشم صالح - دار الطليعة - بيروت - الطبعة الاولى ٢٠٠٥، ص ٥٩، ٦٠، ٦١.
٨- الانسداد التاريخي - لماذا. فشل مشروع التنوير في العالم، هاشم صالح - دار الساقي - بيروت - لبنان - الطبعة الاولى ٢٠٠٧، ص ٦٢.
٩- جريدة الشرق الاوسط - العدد ١١٤٤٨ في ٢ حزيران ٢٠١٠.
١٠- الاستشراق برؤية شرقية ص ٢٣٧.
١١- رؤية نقدية في تحليل الخطاب الشعري قصيدة أبي إسحاق الألبيري في التحريض على اليهود نموذجاً. المحاضرتان الخامسة والسادسة للنقد الأدبي الحديث على طلبة دكتوراه جامعة سانت كليمينتس العلمية.
١٢- القرآن الكريم.
١٣- الحركات الأسلامية والديمقراطية - دراسات في الفكر والممارسة - مركز دراسات الوحدة العربية - بيروت - لبنان - الطبعة الثانية نوفمبر ٢٠٠١- فهمي هويدي - الأسلام والديمقراطية ص١٩.
١٤- الاستشراق برؤية شرقية ص ١٨٤.
١٥- المصدر السابق نفسه ص ١٨٦.
١٦- المصدر السابق نفسه ص ١٩٨.
١٧- المصدر السابق نفسه ص ٢٠٢.
١٨- الدين والعقل الحديث - ولتر ستيس - ترجمة/ أ. د. امام عبدالفتاح إمام - الطبعة الثالثة - بيروت - لبنان ٢٠٠٩، ص٣٢٧.
١٩- الاسلام والنزعة الانسانية ص ٣٩.
٢٠- الاستشراق برؤية شرقية ص ٢٣٢.
٢١- المصدر السابق نفسه ص ٢٢٠، ٢٢١.
٢٢- المصدر السابق نفسه ص ٢٥٠.
٢٣- المصدر السابق نفسه ص ٢٥٢.
٢٤- المصدر السابق نفسه ص ٢٦٢، ٢٦٣، ٢٦٤، ٢٦٥.

# پوختە

کتێبی " الاستشراق برؤية شرقية " لێکۆڵینەوەیەکی ورد و قووڵە لە بارەی ڕۆژهەڵاتناسییەوە، کە نووسەر بە عەقڵێکی کراوەی بێ لایەنانەی زانستییانە کارەکەی ئەنجام داوە و، ڕاو بۆچوونی خۆی بوێرانە دەربڕیوە بێ سڵەمینەوە، لە نووسینەکەیدا پەیوەندییەکی دایلێکتیکی لەنێوان عەقڵ و ئازادیدا ڕایەڵ کردووە و، بەپێی ئەو باکگراوەندە ڕۆشنبیرییەی کە کەڵەکە بوونی خوێندنەوەی چەند ساڵە و بەپێی ئەو زانیارییە زۆرەی لە بواری مێژووی کۆن و نوێدا هەیە توانیویەتی بەرهەمێکی بەپێز پێشکەشی خوێنەر بکات، بە زمانێکی سفت و سۆڵ و ڕەوان، کە ئێستا نووسەرێکی کورد نەهاتووە بەو شێوازە لەبارەی بابەتی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژهەڵاتناسان بدوێ، کە ئەو جۆرە بابەتانە ئەوەندە سانا و بێ ئەرك نین کە هەر کەسێ بیەوێ شانی بداتە بەر سەرکەوتن وە دەست بێنێ.

ئەم کتێبە شیاوی خوێندنەوەیە و لەڕووی هزرییەوە پێگەی خۆی لەبواری ڕۆشنبیریی عەقڵانی کراوەدا هەیەو ڕۆڵی خۆی دەبینێ و، لە کتێبخانەدا جێگەی شیاوی خۆی دەکاتەوە.

# ڕاپۆرتی خولی یەکەمی ئەکادیمیا
# ٢٠٠٧، ٢٠٠٨ – ٢٠١١

**د. ئازاد ئەحمەد**
**سکرتێری ئەکادیمیا**

**پێناسەی ئەکادیمیا:**

ئەکادیمیا دەزگایەکی زانستی و مەعنەوی سەربەخۆیە، ڕاستەوخۆیش بە سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستانەوە بەستراوەتەوە.

**ئامانجی ئەکادیمیا:**

پاراستن و بوژاندنەوە و پێشخستنی زمان و کەلتوور و مێژووی کوردە، کارکردن بۆ یەکخستنی مفرەداتی زمانی کوردی لە نێوان دیالێکتە جیاوازەکاندا و دانانی فەرهەنگیی زانستی و زمانی.

**قانوونی ئەکادیمیا:**

ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، لە دانیشتنی ئاسایی خۆیدا، لە ڕێکەوتی ١٩٩٧/١٢/٢٨، قانوونی ژمارە (١٢) لە ساڵی (١٩٩٧) تایبەت بە ئەکادیمیای کوردی پەسەند کردووە، ئەم قانوونە لە شەش بەش پێك دێت.

**دامەزراندنەوەی ئەکادیمیا:**

پاش ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆڕی زانیاری کوردستانی دا، بەڕێزان: د. شەفیق قەزاز و د. کەمال فواد ڕاسپێردران بۆ ئەوەی کاری دامەزراندنەوەی ئەکادیمیا لە ئەستۆ بگرن، ئەکادیمیای کوردی، کە درێژکراوە و بەردەوامبوونی کۆڕی زانیاری کورد و کۆڕی زانیاری کوردستانە، بە بڕیاری ژمارە (١٧٤٠) لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٧/١٢ی ئەنجومەنی وەزیران دامەزراوە، یازدە ئەندام: د. شەفیق قەزاز، د. کەمال فواد، د. کەمال مەزهەر، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف،

محەمەدی مەلا کەریم، جەمال عەبدول، د. موحسین محەمەد حوسێن، محەمەد عەلی قەرەداغی، ڕەشید فندی. وەك دەستەی دامەزرێنەر دەستنیشان کران. دەستەی دامەزرێنەر جگە لە خوالێخۆشبوو د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کە چەند ڕۆژێك بەر لە دەستبەکاربوون، بە کارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد، لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٧/٢٩، دەستیان بەکار کرد و یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئەکادیمیایش کرا. شایانی باسە لەبەرئەوەی د. کەمال مەزهەر لە ئەورووپا بوو، لەم کۆبوونەوەیە و چەندین کۆبوونەوەی دواتر ئامادە نەبوو، هەر لەم کۆبوونەوەیەدا، ئەنجومەنی ئەکادیمیا بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان، د. شەفیق قەزازی وەك بەرپرسی کاتی سەرپشك کرد. لە کۆبوونەوەی ژمارە ٤ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/٨/٢٩، (١٥) پاڵێوراو بۆ ئەنجومەنی ئەکادیمیا دیاری کران، لە کۆبوونەوەی ژمارە ٧ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/١١/١٨ هەریەك لە بەڕێزان: د. جەبار قادر، د. وریا عومەر، موئەید تەیب، د. محەمەد مەعرووف فەتاح، د. نووری تاڵەبانی، بە دەنگدانی نهێنی بوون بە ئەندامی کارا، لە کۆبوونەوەی ژمارە ٨ ئامادەبوون و بەشداری کۆبوونەوەی ئەنجومەنیان کرد. پرۆسەی هەڵبژاردنی دەستەی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی ئەکادیمیا، لە کۆبوونەوەی ژمارە ٩ لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/١٢/٩، بە ئامادەبوونی (١١) ئەندام لە کۆی (١٥) بەڕێوەچوو. دەستەی سەرۆکایەتی پاش دەنگدانی نهێنی بەم شێوە پێکهات:

١) د. شەفیق قەزاز سەرۆك بەتێکڕای دەنگ.

٢) ڕەشید فەندی ج سەرۆك بە کۆی ٨ دەنگ.

٣) د. موحسین محەمەد حوسین ئەندامی تەرخان کراو بەکۆی ١٠ دەنگ بەرامبەر بە کارتێکی سپی. دواتر لەسەر داوای خۆی ئەندامێتی تەرخانکراوی ڕەتکردەوە.

د. کەمال فواد لە ڕێکەوتی ٢٠١٠\٩\٢١ بەڕەزامەندی خۆی دەستی لە ئەندامێتی کارای ئەکادیمیا کێشایەوە، بە ئەندامی شکۆمەندی ئەکادیمیا داندرا.

ئێستا پێکهاتەی ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- د. شەفیق قەزاز سەرۆك.

٢- ڕەشید فندی ج سەرۆك.

| | |
|---|---|
| ٣- د. ئازاد ئەحمەد | سکرتێری ئەکادیمیا. |
| ٤- د. نەجات عەبدوڵڵا | ئەندامی تەرخانکراو. |
| ٥- د. کەمال مەزهەر | ئەندام |
| ٦- د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول. | ئەندام |
| ٧- محەمەدی مەلا کەریم. | ئەندام |
| ٨- د. عبدالفتاح عەلی بۆتانی. | ئەندام |
| ٩- د. موحسین محەمەد حوسێن. | ئەندام |
| ١٠- د. جەبار قادر . | ئەندام |
| ١١- د. نووری تاڵەبانی. | ئەندام |
| ١٢- موئەید تەیب. | ئەندام |
| ١٣- جەمال عەبدول. | ئەندام |
| ١٤- د. وریا عومەر. | ئەندام |
| ١٥- م. محەمەد عەلی قەرەداغی | ئەندام |

ئەندامانی شکۆمەند: ١٠ ئەندام.

لازاریف

د. ئیسماعیل بێشکچی

یەشار کەمال

د. عسمەت شەریف وانلی

ئیحسان شێرزاد

د. شاکر خەسباك

د. جەمال نەبەز

د. کەمال فواد

د. ئەمین موتابچی

د. نادری نادرۆڤ

ئەندامانی یاریدەدەر: ١٥ ئەندام.

د. جەلیلی جەلیل

محەمەد ئەمین بوز ئەرسەلان

عەبدوڵڵا زەنگەنە
حەمە کریم هەورامی
میهردادی ئیزادی
د. فارووق عومەر سدیق
ئازاد ئەحمەد/ ئێستا جێگری سەرۆکی ئەکادیمیایە
عەبدوڵڵا حەسەن زادە
د. عەبدوڵڵا غەفوور
د. جەزا تالیب
مایکل چایت
کەریم شارەزا
عەبدولڕەززاق بیمار
کەمال غەمبار
تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

تا ئەمڕۆ، ئەنجومەنی ئەکادیمیا (٨٦) کۆبوونەوەی ئاسایی و، دەستەی سەرۆکایەتیش (٩٥) کۆبوونەوەیان کردووە.

**چالاکییەکانی ئەکادیمیا:**

**أ) کۆنفرانس:**

(١) کۆنفرانسی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، بەمەبەستی دانانی ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی، ئەکادیمیا بۆ پسپۆڕان و ئەکادیمیان و شارەزایانی بواری زمان، لە ڕۆژانی ٢٠٠٨/٤/١٢، ٢٠٠٩/٨/٩ کۆنفرانسی کرد. بەرهەمی کۆنفرانسەکە کە نامیلکەیەکی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردییە، لە لایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بەنووسراوی ژمارە ٣٢٩ لە ٢٠١١/٢/٦ پەسەندکراو، ئەکادیمیایش بەسەر سەرجەم دامودەزگا حکوومی و نا حکوومییەکانی هەرێمی کوردستانی دابەش کرد.

(٢) کۆنفرانسی زمانی فەرمی: بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەسەر زمانی فەرمی و هەنگاوەکانی زمانی ستاندار، ئەکادیمیای کوردی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ٢١، ٢٢،

٢٠٠٩/١٢/٢٣، بە ئامادەبوونی (١٩) کەسی پسپۆر و شارەزا، لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێم، کۆنفرانسێکی ڕێکخست، هەرچەندە ئەم کۆنفرانسە بابەتەکەی یەکلایی نەکردەوە و هیچ بڕیارێکیشی نەدا، بەڵام وەك ئەرکێکی ئەکادیمیا هەژمار کرا.

**ب ) کۆڕ و سمینار:**

ئەکادیمیای کوردی، لە تەمەنی خولی یەکەمیدا، بۆ ئەندامانی کارای ئەکادیمیا، مامۆستایانی زانکۆ، شارەزایان و پسپۆران، لە بوارە جیاجیایەکان (٣١) کۆڕ و سیمیناری کردووە. شایانی وتنە، ئەم چالاکییانە، جگە لە سیمینارێك لە زاخۆ و یەکێکی تر لە سلێمانی، ئەوانی تر لە هۆڵی مەلا مەحموودی بایەزید لەناو تەلاری ئەکادیمیا بەڕێوەچوون.

**پ ) کۆڕی تایبەت:**

جگە لە چالاکییەکانی سەرەوە، ئەکادیمیا سێ کۆڕی تایبەتی لەناو تەلاری ئەکادیمیا بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە:

أ) کۆڕێکی تایبەت بۆ کۆچی دوایی و چلەی لازاریف، ئەندامانی کارای ئەکادیمیا و شارەزایانی دەرەوەی ئەکادیمیا بەشدار بوون.

ب) کۆڕێکی تایبەت بۆ کریس کۆچێرا و هاوسەرەکەی، سەبارەت بە ڕەوشی کورد و کوردستان و هەنگاوەکانی دروست و پێویست

ت) سیمینارێکی تایبەتی زمانەوانی بەناوی سیمیناریساڵیادی د. محەمەد مەعرووف فەتاح بۆ مامۆستایانی زانکۆی سلێمانی و سەلاحەددین بە ئامادەبوونی کەس و کار و خێزانی خوالێخۆشبووی ناوبراو.

**ت ) چاپکردنی کتێب و فەرهەنگ:**

ئەکادیمیا لە تەمەنی خولی یەکەمیدا پتر لە ٩٥ کتێبی هەمەجۆری بە چاپ گەیاندووە، کە دواتر لە چالاکیی لێژنەکەدا باس کراوە.

**ج ) پرۆژە جێبەجێ کراوەکان:**

ئەم پرۆژانەی خوارەوە، ئەکادیمیا لە خولی یەکەمیدا جێبەجێی کردووەن:

١- بیبلۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا.
٢- بیبلۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە فەرەنساییەکاندا.
٣- بیبلۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ڕووسیاییەکاندا.
٤- ئاسوورییەکانی دۆڵی نەهلە.
٥- کەلتووری ماددیی کوردی.
٦- فەرهەنگی ژابا کوردی - فەرەنسایی.
٧- گەشتنامەی پوژۆلا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧.
٨- کتێبی ڕێزمانی کوردی، نووسینی پۆل بێدار
٩- کۆکردنەوەی پتر لە ٦٠٠ - ٧٥٠ وشە و زاراوەی هەمەجۆری کوردی لە دەڤەرەکانی بەرانەتی و زرارایەتی و خۆشناوەتی (خەلیفان)، هەندێك وێنەی دەگمەن و تۆمارکردنی بابەتی کۆن و کلاسیکی بە دەنگی کەسانی بەتەمەن لەسەر شریتی و کاسیت.
١٠- کڕینی پتر لە ٢٧٥٠ کتێبی دانسقەیی و بەسوود بە زمانەکانی کوردی و عارەبی و ئینگلیزی، ئینسایکۆپیدیای بەریتانی ٢٠١٠ وەك نموونە، دەیان کتێبی بەنرخی تر. وێڕای ئەمەیش کڕین و پەیداکردنی سەدان دەستنووس و بەڵگەنامە و لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرتی دەگمەن لەلایەن لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامەکان کە دواتر ئاماژەیان پێ دەکرێت.
١١- بە کوردی کردنی پتر لە ٣٥٦٤ زاراوە لە بواری ئاماردا، کە دواتر لە لێژنەی زاراوە باس دەکرێت.
١٢- پێداچوونەوە و ساغکردنەوە و تەتەڵەکردنی فەرهەنگی قانوونی بەڕێز: د. نووری تاڵەبانی.
١٣- دانانی لێژنەیەك بۆ پێداچوونەوە بە ناوی شەقام و تابلۆ... هەرچەندە ئەم لێژنەیە دواتر ئاماژەی پێ دەکرێت بە هۆی دواکەوتنی هەموارکردنەوەی قانوونی ئەکادیمیا بە درەنگەوە پێکهێندرا، بەڵام دەستبەکار بووە.
١٤- پرۆژەی یەك ملیۆن کتێبی ئەلکترۆنی بۆ کتێبخانەی ئەکادیمیا، کە نیو ملیۆنی تەواو بووە نیوەکەی تریش لە دوای ٢٠١١/٩/٢٥ تەواو دەبێت.
١٥- پرۆژەی ڕازاندنەوەی تەلاری ئەکادیمیا بە شێوازی گونجاو و سەردەمیانە.

١٦- پرۆژەی ئینسایکلۆپیدیای کوردستان، کەوتۆتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، لەلایەن سەرۆکی حکوومەتەوە بڕی ٥٠٠٠٠$ بۆ ساڵی یەکەمی تەرخانکراوە.

١٧- پرۆژەی نوێکردنەوە و فراوانکردنی کتێبخانەی ئەکادیمیا، کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بڕی ٢٤٠٠٠$ ی بۆ تەرخانکراوە، قۆناغی دەستپێکی بەم زووانە ڕادەگەیەنرێت و جێبەجێ دەکرێت.

١٨- پرۆژەی ئامادەکردن و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی، ناوی کەسایەتی و شوێن و ڕووداو...، هەر شتێك کە پێوەندی بە کورد و کوردستانەوە هەبێت و لە کتێبی (د هخدا)دا باس کرابێت.

١٩- دامەزراندنی سایتی ئەکادیمیا.

٢٠- کارکردن و دەستکاری کردنی قانوونی ئەکادیمیا بە نیازی هەموارکردنەوە.

٢١- پرۆژەی چاپکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردستان (١٩٥٩ - ١٩٦٤)ی ئێران، تەنیا چاپکردنی ماوە.

٢٢- پرۆژەی چاپکردنی ناودارانی کورد، بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی. وەرگێڕانی: ماجید مەردۆخ ڕۆحانی

٢٣- ئامادەکردنی پڕۆژەی زمانی ستاندارد لەلایەن ئەندامانی کارا: د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول، م. جەمال عەبدول، د. محەمەد مەعرووف فەتاح، موئەید تەیب.

٢٤- پرۆژەی ئامادەکردنی کوللیاتی وەفایی، عوبیدەڵلای ئەیوبییان... هتد.

**چ ) گۆڤاری ئەکادیمی:**

گۆڤاری ئەکادیمی، گۆڤارێکی وەرزییە و زمانحاڵی زانستیی ئەکادیمیایە، لە ڕووی زانستییەوە لەلایەن هەندێ لە زانکۆکانی هەرێمەوە پەسەند کراوە، نووسراو بۆ زانکۆکانی تریش نێردراوە و گۆڤارەکە لە چاوەڕوانی وەڵام دایە. لە تەمەنی خولی یەکەمی ئەکادیمیادا دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، کە دواتر باسی دەکەین (١٣) ژمارەی بە چاپ گەیاندووە، بابەتەکانی گۆڤار بریتین لە: زمان و ئەدەب و کەلتوور و مێژوو... هەموو جۆرە بابەتێك کە پێوەندی بە کوردەوە هەبێت.

**ح ) پرۆژە تەواو نەکراوەکان:**

ئەکادیمیا چەند پرۆژەیەکی هەیە و بڕیاریان لەسەر دراوە، لەبەر هەندێ هۆ کە تایبەتن بە ئەکادیمیا و هەندێکی تریش تایبەتن بە لایەنی ئەنجامدەر، بەردەوامن و تەواو نەکراون، تەواو کردنیان دەکەوێتە خولی دووەمی ئەکادیمیا، پرۆژەکان:

١- بیبلۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ئەڵمانیاییەکاندا.
٢- ئەدەبیاتی ناوچەی موکریان.
٣- ئەدەبی داستانی کوردی.
٤- فەرهەنگی جوگرافیایی باشووری کوردستان.
٥- کۆنفرانسی پرۆژەی گرامەری کوردی. لە ٧/٢١/ کۆبوونەوەی یەکەمی خۆی کردووە.
٦- کۆنفرانسی پرۆژەی کوردۆلۆجی.
٧- پرۆژەی وەرگێڕانی (٥) کتێبی دانسقەیی بۆ سەر زمانی کوردی، وەرگێڕانی شیعرە فارسییەکانی شێخ عەبدولڕەحمانی خالس، بە نموونە، قۆناغی یەکەمی بڕیووە.
٨- هەوڵدان بۆ ئەوەی پێوەندی لە نێوان ئەکادیمیای کوردی و هەندێ لە ئەکادیمیای جیهان ببەسترێن، هەنگاو بۆ ئەکادیمیای فەرەنسا و ئەڵمانیا هاویشتراوە.
٩- پرۆژەی فەرهەنگی نەتەوە، میکانزمی کارکردن و ئامادەباشی بۆ کراوە، ئەکادیمیا چاوەڕوانی یارمەتی حکوومەتی هەرێم دەکات، دواتر لەگەڵ لێژنەی فەرهەنگدا باسی دەکەین.
١٠- تەواوکردن و چاپکردنی بەرهەمەکانی لێژنەی ڕێزمان، دواتر باسی دەکەین.
١١- پرۆژەی فێرکردنی زمانی کوردی لەسەر سایتی ئەکادیمیا... هتد.

**خ ) لێژنەکانی ئەکادیمیا:**

کاری لێژنەکانی ئەکادیمیا کرۆکی کاروچالاکیی ئەکادیمیان، ئەنجومەنی ئەکادیمیا لە کۆبوونەوەی ژمارە (١٠) لە ڕێکەوتی ٢٠٠٧/١٢/١٦ بڕیاری

لەسەر (٩) لێژنەدا و، سەرۆك بۆ لێژنەکان داندران، پاشان لە کۆبوونـەوەی ژمـارە ١٥ لـە ڕێکـەوتی ٢٠٠٨/٢/٣، بڕیـار لەسـەر لێژنـەی بیبلیۆگرافیـا و ئینسایکلۆپیدیا درا، ناوی ئەندامانی گشت لێژنەکان پەسەند کران. ئەگـەر سەرۆکی هەر لێژنەیەك بـە یاداشـت ئـاڵوگۆڕی بـە ئەنـدامانی کردبێـت یـان داوای پترکردنی ژمارەی ئەنـدامی کردبێـت، ئـەوا فـەرمانی کارگێڕییـان بـۆ دەرچووە، بەپێی ناوەرۆکی یاداشتەکە، کار ئەنجام دراوە.

**لێژنەکان:**

١- لێژنەی بیبلۆگرافیا، سەرۆکی لێژنە: د. وریا عومەر ئەمین، لێژنەکە لە (٦) ئەندام پێکهاتووە، بەرهـەمی یەکـەمی خۆیـان بـەناوی (زمـان) پێـشکێش کـردووە، وا بڕیـارە بـەم نزیکانـە بیبلۆگرافیـای مێـژوویش پێـشکێش بـە ئـەکادیمیا بکـەن. لێژنـەی سـاڵنامەی کـوردی، کـە بەشـێکە لـە لێژنـەی بیبلۆگرافیـا لـە (٥) ئەنـدام پێکهـاتووە، سـاڵی ٢٠١٠ سـاڵنامەی کـوردی پێشکێش کرد.

٢- لێژنـەی ئینـسایکلۆپیدیا، سـەرۆکی لێژنـە: د. وریـا عومـەر ئـەمین، هـەر چەندە ئەم لێژنەیە بە ڕەزامەندی ئەنجومـەنی ئـەکادیمیا دامـەزراوە، (٥) ئەنـدامی بـۆ تـەرخانکراوە، بـەڵام لێژنەکـە نەکۆبوونـەوەیان کـردووە، نەبەرنامەی کاریان هەبوو..

٣- لێژنەی مێژوو، سەرۆکی لێژنە: د. جەبار قادر، کاتی خـۆی لـە نـۆ ئەنـدام پێکهاتبوو، بەڵام بە فەرمانی کارگێڕی ئاڵوگۆڕی تێدا کرا.
کارەکانی لێژنەکە:

- زاراوەی مێـژووییان ئامـادە کـردووە، بـە ئەڵقـە لـە گۆڤـاری ئـەکادیمی بڵاودەبێتەوە.
- ئەو بابەتانەی کـە پێوەنـدییان بـە مێـژووی کـوردەوە هـەبێت و بـە نیـازی چاپکردن بۆ ئەکادیمیا دێن، هەڵیاندەسەنگێنێت.

٤- لێژنەی زمـان (ڕێزمـان)، سـەرۆکی لێژنـە: د. محەمـەد مـەعرووف فـەتاح، پاشـی مردنـی کـەس لـە شـوێنی دانەنـدراوە، لێژنەکـە لـە (٩) ئەنـدام

پێکهاتووە، بەڵام کارەکان تەنیا لە نێوان ئەندامانی دانیشتووی هەولێر دابەش کرا بوو، کە تا ئێستا بەردەوامن.

کاری لێژنەکە:

- ئامادەکردنی کتێبێك لە ڕووی ڕستەسازی کوردییەوە.
- ئامادەکردنی کتێبێك لە ڕووی وشەسازی کوردییەوە.
- ئامادەکردنی کتێبێك لە ڕووی واتاسازییەوە.
- ئامادەکردنی کتێبێك لە ڕووی فۆنەتیکەوە.
- ئامادەکردنی پرۆژەی زمانی فەرمی لە هەرێمی کوردستاندا.

ئێستا کتێبەکەی ڕستەسازی پێشکێش بە لێژنەی چاپکردن کراوە و لە ماوەیەکی نزیکدا بە چاپ دەگەیەندرێت.

٥- لێژنەی ڕێنووس، سەرۆکی لێژنە: م. محەمەدی مەلا کەریم، ئەم لێژنەیە لە (٧) ئەندام پێکهاتووە، بەڵام پرۆژەی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی لەلایەن م. جەمال عەبدولەوە بەتەنیا ئامادەکراوە، ئەوەبوو دوو کۆنفرانسی بۆ بەسترا، لە ئەنجامدا لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بە نووسراوی (٣٢٩) لە ڕێکەوتی ٢٠١١/٢/٦ پەسەندکرا.

٦- لێژنەی زاراوە، سەرۆکی لێژنە: م. جەمال عەبدول، هەرچەندە لێژنەکە لە (٧) ئەندام پێکهاتووە، بەڵام سەرۆکی لێژنە بڕوای بە کاری تاکەکەسی پترە وەك لە ڕاپۆرتەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات و ئەمەی ئاشکرا کردووە، هەوڵی چەندین کاری تاکەکەسی داوە بەکورتی:

١) ئامادەکردنی پرۆژەی ڕێنووسی کوردی.

٢) سەرۆکی لێژنەی زاراوە، وەك ئەندامی کارای ئەکادیمیا لەگەڵ وەزارەتی پەروەردە کۆمەڵەك کاری کردووە و ئێستاش بەردەوامە.

- پێداچوونەوە بە فەرهەنگی پزیشکی، د. جەمال ڕەشید.
- وەرگێڕان و پێداچوونەوەی زاراوەکانی ئامار کە نزیکەی ٣٥٦٤ زاراوە دەبێت. کاتی خۆی بۆ ئەکادیمیا هات لەلایەن وەزارەتی پلاندانانەوە م. جەمال عەبدول داوای لێکرا ئەم کارە بکات، تەواو کراوە لە لێژنەی چاپکردن چاوەڕێی چاپکردنە.

- ئامادەکردنی فەرهەنگێکی زاراوەکانی هەڵبژاردن.
- سازکردن و ئامادەکردنی فەرهەنگێکی هونەری.
- پێداچوونەوە بە فەرهەنگی ئاو.
- کارکردن لە فەرهەنگی زاراوە: سەربازییەکان، زاراوەی دەرمانسازی، زاراوەی پەروەردەیی هەمەجۆر، زاراوەی یاسایی تۆمار کردنی خانووبەرە.
- پێداچوونەوە بە فەرهەنگی قانوونی، د. نووری تاڵەبانی.
- لەگەڵ لێژنەی فەرهەنگ، کار لە زاراوە کارگێڕیەکان دەکات.
- تەواو کردنی فەرهەنگی پزیشکی د. ئەوڕەحمان عەبدوڵڵا.
- ئامادەکردنی کتێبێك بەناوی بەرکولێکی زاراوە سازی کوردی.

٧- لێژنەی فەرهەنگ: سەرۆکی لێژنە، د. شەفیق قەزاز، ژمارەی ئەندامان: ٣ ئەندام.

**کارەکانی:**

- پێداچوونەوە و ئاگادار بوون و ڕەزامەندی دان لەسەر فەرهەنگەکانی: وشەنامە، فەرهەنگی کانی، فەرهەنگی ئابووری، فەرهەنگی میدیا، فەرهەنگی ئاو، فەرهەنگی ناهید...
- پێداچوونەوە و ئامادەکردنی، فەرهەنگی زاراوە کارگێڕییەکان بەهەرسێ زمانانی، کوردی، عارەبی، ئینگلیزی.
- پێداچوونەوە و ئامادەکردنی فەرهەنگی هەرزە.
- ئامادەکردنی پرۆژەی فەرهەنگی نەتەوە.

٨- لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامەکان، سەرۆکی لێژنە: د. عەبدولفەتاح عەلی. ئەندامانی لێژنە: ٥ ئەندام. لێژنەیەکی چالاکە و بەرنامە و کارو چالاکی لە چەند تەوەرێکدا خۆی دەبینێتەوە، لەوانە:

- دەیان دەستنووسی ئەسلی و کۆپیکراو و تۆماری سەر (CD) کرپیوە.
- دەیان بەڵگەنامەی عێراقی و بەریتانیایی و فارسی و عوسمانی کڕاون و پۆلێنکراون، پۆلێنکردنیش بەردەوامە.

- پەیداکردنی لێکۆڵینەوە و ڕاپۆرتی تایبەت و دەگمەن لەبارەی عێراق و هەرێمی کوردستانەوە.
- کڕین و فۆتۆکۆپی کردنی کتێبی نایاب، وەك هەشت بەشەکەی (فهرس)، دەستنووسەکانی ئەوقافی موسڵ و نۆ بەشەکەی کتێبی (قلائد الجمان) و زۆرانی تر.
- ساغکردنەوە و لێکۆڵینەوەی چەندین دەستنووسی گرینگ و نایاب.
- پێشەکی نووسین و پەراوێز دانانی چەندین بەرهەم.
- شاند و سەفەری ئەندامانی لێژنە: ناردنی (٣) ئەندام بۆ تورکیا، (٢) ئەندام بۆ دیمەشق، جارێکی دیکەیش (٢) ئەندام بۆ تورکیا، بەمەبەستی کڕین، فۆتۆکۆپی کردن، بەدەستهێنانی کتێب و سەرچاوە و بەڵگەنامە و دەستنووس.
- چەند کارێکیان تاکو ئێستا تەواو نەبوو، بەردەوامن لە کارکردن وەك ساغکردنەوەی کتێبی (قلائد الجمان)، کتێبی مێجەرسۆن (گرامەرا زمانێ کرمانجی، بەڵگەنامەکانی نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی بەغدا، زۆر کاری تر.

٩- لێژنەی گۆڤار: سەرەتا سەرۆکی لێژنە، د. موحسین محەمەد حوسێن بوو. ژمارەی دەستەی نووسەران، ٩ کەس بوو.

ئەم دەستەیە (٧) ژمارەی لە گۆڤاری ئەکادیمی بە چاپ گەیاند. پاشان ئەنجومەنی ئەکادیمیا لە کۆبوونەوەی ژمارە (٥٦) لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١/١٠، بەندی (٤)ی کۆنووس، ڕەزامەندی دا لەسەر دەست لە کارکێشانەوەی دەستەی نووسەران و، دانانی د. محەمەد مەعرووف فەتاح وەك سەرنووسەر، لە کۆبوونەوەی ژمارە ٥٨ لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/٢/٧ ئەنجومەن، دەستەی نووسەران و ڕاوێژکارانی گۆڤارەکەی پەسەند کرد. بەڵام بەداخەوە لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا، سەرنووسەر کۆچی دوایی کرد، دەستەی نووسەران و ڕاوێژکاران درێژەیان بە کاروچالاکیی گۆڤارەکە دا، تا ئێستا بەردەوامن هەموویان بەمەبەستی کارکردن خۆیان بەسەرنووسەر دادەنێن.

- لێژنـەی گۆڤـار تـاکو ئێـستا (١٤) ژمـارەی لـە گۆڤـاری ئـەکادیمی چـاپ کردووە.
- بابەتەکانی گۆڤار هەمەجۆرەن: زمـان، ئـەدەب، مێـژوو، کـەلتوور... هـەر بابەتێك پێوەندی بە کوردەوە هەبێت.
- هەموو بابەتەکان لەلایەن شارەزایان هەڵدەسەنگێندرێن.
- ڕەزامەنـدی زانـستی لـە دوو زانکـۆی هـەرێم وەرگرتـووە، لـە مـاوەی ڕابردووەدا بۆ هەمان مەبەست نووسراو بۆ سەرجەم زانکۆکانی کوردستان ناردراوە لە چاوەڕوانی وەڵام دان.
- بڵاوبوونـەوەی بابـەتی گۆڤارەکـە بـۆ بەرزکردنـەوەی نازنـاوی زانـستی مامۆستایانی زانکۆ بەکاردێت و بەسوودە.
- بابەتەکان بەهەر سێ زمانانی: (کوردی، عـارەبی، ئینگلیـزی)، بەمـەرجێ پێوەندی بە کوردەوە هەبێت، بڵاودەکاتەوە.
- گۆڕان لە ڕووی تەکنیکی و هونەری و بابەتی لە گۆڤارەکە کراوە کە جێـی ڕەزامەندی خوێنەران بێت.
- ئەندامانی ئەنجومەن، مامۆستایانی زانکۆ، شارەزایان و پـسپۆران، بابـەت بۆ گۆڤارەکە دەنووسن.

١٠- لێژنەی چاپکردن، سـەرۆکی لێژنـە: ڕەشـید فنـدی، ژمـارەی ئەنـدامان ٤ ئەندام.

ئـەم لێژنەیـە لـە مـاوەی چـوار سـاڵی تەمـەنی ئـەم خولـەدا ئـەم کارانـەی کردووە:

- پتر لە (٩٥) کتێبی هەمەجۆر: زمان، ئەدەب، مێژوو، جوگرافیا، یاداشـت، فەلسەفەی زمان، فەرهەنگ... چاپ کردووە.
- چەند نامەی ماجستێر و دوکتورا لە بوارە جیا جیایەکان کە پێوەندیان بە کوردەوە هەبوو بەچاپ گەیاندووە.
- هەموو کتێبەکان پاش ڕەزامەندی لێژنەکـە، دەدرێـن بـە شـارەزایەك یـان دوو شارەزا بۆ هەڵسەنگادن.

- چـــەندین کتێــب چــونکە شـــارەزایان ڕەزامەنـــدیان لەســـەر نـــەداوە، ڕەتکراونەتەوە.
- خاوەن کتێب بـە پێـی ڕەزامەنـدی دەسـتەی سـەرۆکایەتی بـڕی کتێـب و پاداشت وەردەگرێت.
- هەرچەندە هەندێك کتێب شایانی ئەوە نەبوون لە ئەکادیمیا چاپکرێن وەك کتێبی (گەپنامەی مێرگولان — ڕەسوول دەروێش) چـونکە ناوەرۆکەکـەی کزە، یان کتێب هەبووە لەهیچ بوارێکدا پێوەندی بە کوردەوە نـەبوو وەك (الوسائل التعليمية فى درس العلوم — ڕەشید فندی) یان کتێب هەیە لەبـەر زۆری هەڵـەکان تاموچـێژی نـەماوە وەك (ژیـانی کـوردەواری — حەمیـد ڕەشاش)، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە کتێبـی نایـاب و دانـسقەیی و بەسـوود لەلایەن ئەم لێژنەیە بەچاپ گەیندراون، کە جێگای ڕەزامەنـدی خوێنـەران بوون و کتێبخانەی کوردی و زانکۆکانیان دەوڵەمەند کردووە.

١١- لێژنـــەی ئـــەدەب و کەلـــەپوور، ســـەرۆکی لێژنـــە: د. عیـــزەدین مـــستەفا ڕەسووڵ، ژمارەی ئەندامان: ٥ ئەندام.

ئەم لێژنەیە یەك کۆبوونەوەی کردووە. سەرۆکی لێژنـە بـاوەڕی وایـە ئـەو کتێبانەی کە ئەکادیمیا چاپیان دەکـات، زۆرانیـان پێوەنـدیان بـە لێژنـەی ئەوەوە هەیە.

- سەرۆکی لێژنەی ناوبراو ئەو بابەت و نامانەی کە بـە نیـازی چـاپکردن بـۆ ئەکادیمیا دێن هەلیاندەسەنگێنێت.

١٢- لێژنەی پێداچوونەوە، سەرۆکی لێژنـە: د. نـووری تاڵـەبانی بەشـێوەیەکی کاتی. ژمارەی ئەندامان: ٥ ئەندام.

ئەم لێژنەیە لەم خولەدا بە درەنگەوە پێکهـات، چـونکە هەموارکردنـەوەی قانوونی ئەکادیمیا کە بەنـدێکی پێوەنـدی بـەم لێژنەیـەوە هەیـە تائێـستا نەکراوە، کاری ئەم لێژنەیە کارکردنە لەگەڵ لایەنە پێوەندیـدارەکان وەك: پارێزگا، قائمقامیـەت، شـارەوانی ... بـۆ پێداچـوونەوە بـەناوی شـەقام و تابلۆ ... بە کوردی کردنیان، بۆ ئـەوەی سیمای هـەرێمی کوردسـتان لـە مۆرکی کوردایەتی دوور نەکەوێتەوە.

- دوو کۆبوونەوەی ئەنجام داوە.
- نووسراو بۆ: پارێزگا، شارەوانی نووسراوە بەمەبەستی هەماهەنگی و دانانی میکانزمی کارکردن لەژێر چەتری ئەکادیمیای کوردیدا.

**دوا بابەت:**

ئەو ئەندامانەی کە بە بەرهەم و چالاکیی وەك کتێب، لێکۆڵینەوە، کۆڕ و سیمینار... بەشداری ئەکادیمیایان کردووە ئەمانەن:

| | کتێب | سیمینار | لێکۆڵینەوە |
|---|---|---|---|
| ١) م. محەمەد عەلی قەرەداغی، | ٢ | ٢ | ٣ |
| ٢) م. جەمال عەبدول، | ١ | | |
| ٣) د. عبدالفتاح بۆتانی | ٣ | | |
| ٤) ڕەشید فندی | ١ | ١ | |
| ٥) د. موحسین محەمەد حسێن، | | ١ | ٣ |
| ٦) د. ئازاد ئەحمەد، | ١ | | ٢ |
| ٧) د. جەبار قادر، | ١ | | ١ |
| ٨) د. کەمال مەزهەر، | | ١ | |
| ٩) د. نووری تاڵەبانی، | ١ | | ٢ |
| ١٠) د. عیزەدین مستەفا، | ١ چاپکردنەوە. | | |
| ١١) د. وریا عومەر، | ١ | | |
| ١٢) د. نەجات عەبدوڵلا، | | | ١ |

**دوا بابەت:**

ئەنجومەنی ئەکادیمیا، ڕۆژی سێشەمە، ڕێکەوتی ٢٠١١/٩/١٣، کات ١٠,٣٠ خولەکی بەیانی، یەکەمین کۆبوونەوەی لە خولی دووەمدا کرد، ئەم کۆبوونەوەیە تایبەت بوو بە پرۆسەی هەڵبژاردن بۆ خولی دووەم. بە لەبەرچاوگرتنی ماددەکانی: (١٠، ١١، ١٣) لە قانوونی ئەکادیمیا، میکانزم بۆ پرۆسەکە داندرا، بۆ پۆستی

سەرۆك، ئەندامی كارا د. نووری تاڵەبانی بێ ڕكابەر خۆی پاڵاوت و بە تێكڕای دەنگ دەرچوو، بۆ پۆستی جێگری سەرۆكیش، هەر یەك لە ئەندامانی كارا: د. ئازاد ئەحمەد و ڕەشید فندی خۆیان پاڵاوت، لە ئاكامدا، د. ئازاد ئەحمەد بە زۆرینەی دەنگ سەركەوتنی بەدەست هێنا، بۆ ئەندامی تەرخانكراو د. نەجات عەبدوڵڵا بێ ڕكابەر خۆی پاڵاوت و بەتێكڕای دەنگ سەركەوتنی بەدەست هێنا، ئێستا پێكهاتەی خولی دووەمی ئەكادیمیای كوردی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

| | |
|---|---|
| د. نووری تاڵەبانی | سەرۆك |
| د. ئازاد ئەحمەد | جێگر سەرۆك |
| د. نەجات عەبدوڵڵا | ئەندامی تەرخانكراو |
| د. شەفیق قەزاز | ئەندام |
| د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | ئەندام |
| د. كەمال مەزهەر | ئەندام |
| د. عەبدولفەتاح عەلی | ئەندام |
| د. موحسین محەمەد حوسێن | ئەندام |
| د. جەبار قادر | ئەندام |
| د. وریا عومەر ئەمین | ئەندام |
| جەمال عەبدول | ئەندام |
| موئەید تەیب | ئەندام |
| محەمەدی مەلا كەریم | ئەندام |
| محەمەد عەلی قەرەداغی | ئەندام |
| ڕەشید فندی | ئەندام |

## ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
## لە گۆڤاری (ئەکادیمی) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

## ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەڕۆک و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێک لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەرە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێک هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بڵاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەڵام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش **Abstract**، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەڕۆک و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (**Abstract**) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێک لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەڕۆک و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی بڵاوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێک لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەرەچاوکردنی بیرۆکەی بنەرەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی دارشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بلاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) لێکۆڵینەوەکە بە زمانی کوردی بوو بە فۆنتی Ali_K_Sahifa ، وە بۆ زمانی عەرەبیش بە فۆنتی Ali_A_Sahifa بنووسرێت و لەسەر (**CD**) تۆمار بکرێت و سێ دانەی راکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، رەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بلاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر
نۆ فیسی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە ۲/ ٨٩٢٩

مێژووی زاینی ۲ / ٥ / ۲۰۰۸
مێژووی کوردی ۱۰ / ۲ / ۲۷۰۸

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ ڕەزامەندی**

**سلاو و ڕێز** ..........

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /۳٥٤ لە ۲۰۰۷/۱۱/۱۹ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بلاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (۸) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ۱/ ٤/ ۲۰۰۸ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ۲۳٥ لە ۲۰۰۸/٥/۱۷ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووك ......... لەگەڵ ڕێزدا

**هاو پێچ//**

- تێبینیەکان

**د. محمد صدیق محمد**
**سەرۆکی زانکۆ**

**وێنەیەك بۆ//**

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان
  لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە

Kurdistan Regional Government
Presidency of Ministers Council
Ministry of Higher Education
and Scientific Research
Presidency of University of Koya
Office of President




حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە
نووسینگەی سەرۆك

ژمارە: ٧ / ٢٩ / ٢١٨٦      بەروار: ٢ / ٦ / ٢٠٠٨

﴿فەرمانی زانکۆیی﴾

بابەت / ناساندنی گۆڤار

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :
ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت .

پ. د. خدر مەعصوم
سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- ڕاگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org      dnya

